# السراج المنير

## في ترتيب أحاديث

# صحيح الجامع الصغير

## به كوردى

**بەرگی دووەم**


الحافظ جلال الدين السيوطي
العلامة محمد ناصر الدين الألباني

رتبه وعلق عليه
عصام موسى هادي

وەرگێرانی:

غازى حمه امين — إحسان برهان الدين

پێداچوونەوەی / م. ئەحمەدی شەریعە

# السراج المنير

## في ترتيب أحاديث

# صحيح الجامع الصغير

## به كوردى


الحافظ جلال الدين السيوطي

العلامة محمد ناصر الدين الألباني

رتبه وعلق عليه

عصام موسى هادي

وەرگێڕانی..

غازی حمه امین - إحسان برهان الدین

پێداچونەوەی..

م. ئەحمەدی شەریعە

دیزاین .. سرمد



لە بڵاوکراوەکانی کتێبخانەی تیشك - چاپی یەکەم ٢٠١٣

لە لایەن بەڕێوبەرایەتی کتێبخانە گشتی یەکانەوە

ژمارەی سپاردنی ( ١٨٧٩ ) ساڵی ٢٠١٢ ی وەزارەتی ڕۆشنبیری پێدراوە.

# السراج المنير

## في ترتيب أحاديث

# صحيح الجامع الصغير

## به كوردی

**بەرگی دووەم**


الحافظ جلال الدين السيوطي
العلامة محمد ناصر الدين الألباني

رتبه وعلق عليه
عصام موسى هادي

وەرگێڕانی:
إحسان برهان الدين

پێداچوونەوەی / م. ئەحمەدی شەریعە

# پەڕاوى كڕين و فرۆشتن

## بابەتى مەرجەكانى و ئەو شتانەى قەدەغە كراون تيايدا

٢٤١٦- إذا باع أحدكم الشاة أو اللقحة فلا يحفلها.

(صحيح) ( ن ) عن أبي هريرة . (الصحيحة ٣٢٣٦)

**٢٤١٦- ئەگەر كەسێكتان مەڕێك يان وشترێكى فرۆشت ، با شير لە گوانياندا نەهێڵێتەوە.**

٢٤١٧- إذا بايعت فقل لا خلابة.

(صحيح) ( مالك حم ق د ن ) عن ابن عمر ( ٤ ) عن أنس . (الصحيحة ٢٨٧٥)

**٢٤١٧- ئەگەر شتێكت فرۆشت بڵێ بە بێ خەڵەتاندن .**

٢٤١٨- إن بعت من أخيك تمرا فأصابه جائحة فلا يحل لك أن تأخذ منه شيئا بم تأخذ مال أخيك بغير حق ؟!

(صحيح) ( م د ن ) عن جابر . (الإرواء ١٣٦٥)

**٢٤١٨- ئەگەر خورمات بە براكەت فرۆشت و تووشى كارەساتێك بوو ، ڕەوا نييە بۆت هيچى لێ وەربگريت لەبەر چى ماڵى براكەت بە ناهەق وەردەگرێت ؟**

٢٤١٩- إن التجار هم الفجار.

(صحيح) ( حم ك هب ) عن عبدالرحمن بن شبل ( طب ) عن معاوية . (الصحيحة ٣٦٦)

**٢٤١٩- بازرگانەكان خۆيان خراپەكارن .**

٢٤٢٠- بسم الله الرحمن الرحيم هذا ما اشترى العداء بن خالد بن هوذة من محمد رسول الله صلى الله عليه وسلم اشترى منه عبدا أو أمة على أن لا داء و لا غائلة و لا خبثة بيع المسلم للمسلم.

(حسن) ( ت هـ ) عن العداء بن خالد . (المشكاة ٢٨٧٢)

**٢٤٢٠- بسم الله الرحمن الرحيم ، ئەمە بوو** (العداء بن خالد بن هوذة) **كڕی لە موحەممەد پێغەمبەری خوا ﷺ ، کۆیلەیەك یان کەنیزەکێکی کڕی ، بە مەرجێ بێ نەخۆشی ، دزراو و ، حەرام نەبێت ، فرۆشتنی ، موسوڵمان بە موسوڵمان.**

٢٤٢١- ليس منا من غش.

(صحيح) ( حم د هـ ك ) عن أبي هريرة. (الإرواء ١٣٠٧)

**٢٤٢١- لە ئێمە نی یە کەسێك فێڵ بكات.**

٢٤٢٢- ما هذا يا صاحب الطعام ؟ ! أفلا جعلته فوق الطعام حتى يراه الناس ؟ من غش فليس مني.

(صحيح) ( م ) عن أبي هريرة. (الإرواء ١٣١٩)

**٢٤٢٢- ئەوە چی یە ئەی خاوەنی خۆراك ؟! ئایا بۆ نە تخستە سەر خۆراکەکەی تا خەڵکی ببینێت .**

٢٤٢٣- من ابتاع نخلا بعد أن تؤبر فثمرتها للبائع إلا أن يشترط المبتاع و إن ابتاع عبدا و له مال فماله للذي باعه إلا أن يشترط المبتاع.

(صحيح) ( حم خ هـ ) عن ابن عمر ( هـ ) عن عبادة بن الصامت. (الإرواء ١٣٠٣)

**٢٤٢٣- ئەگەر کەسێك دارخورمای کڕی پاش چاککردنی ، بەرو بوومەکەی بۆ فرۆشیارە ، مەگەر لە حاڵەتێکدا کڕیار بیکا بە مەرج ، ئەگەریش کۆیلەیەکی کڕی ماڵی هەبوو ، ماڵەکەی بۆ فرۆشیارەکەیەتی مەگەر کڕیار مەرجی لەسەر بکات.**

٢٤٢٤- من باع ثمرا فأصابته جائحة فلا يأخذ من مال أخيه شيئا علام يأكل أحدكم مال أخيه المسلم ؟ !

(حسن) ( هـ حب ك ) عن جابر. (الإرواء ١٣٦٥)

**٢٤٢٤- کەسێك لە ئێوە بەروبومێکی فرۆشت و تووشی کارەساتێك بوو لە ناوی برد ، با هیچ لە ماڵی براکەی وەرنەگرێت ، بۆچی دەبێت کەسێك لە ئێوە ماڵی برا موسوڵمانەکەی بخوات ؟!**

٢٤٢٥- من غش فليس منا.

(صحيح) ( ت ) عن أبي هريرة. (الإرواء ١٣٠٧)

**٢٤٢٥- کەسێك فێڵ بکات لە ئێمە نییە.**

٢٤٢٦- من غشنا فليس منا.

(صحيح) ( هـ ) عن أبي الحمراء. (الإرواء ١٣٠٧)

**٢٤٢٦- کەسێك فێڵمان لێ بکات لە ئێمە نییە .**

٢٤٢٧- المؤمن أخو المؤمن فلا يحل للمؤمن أن يبتاع على بيع أخيه و لا يخطب على خطبة أخيه حتى يذر.

(صحيح) ( م ) عن عقبة بن عامر. (الإرواء ١٣٠٩)

**٢٤٢٧- ئیماندار برای ئیمانداره ، ڕەوا نی یە بۆ هیچ خاوەن باوەڕێك كڕین بكاتە سەر كڕینی براكەیدا ، نە خوازبێنیش بكاتە سەر براكەیدا تاكو واز دەهێنێت .**

٢٤٢٨- المسلم أخو المسلم و لا يحل لمسلم باع من أخيه بيعا فيه عيب إلا بينه له.

(صحيح) ( حم هـ ك ) عن عقبة بن عامر. (الإرواء ١٣٠٩)

**٢٤٢٨- موسوڵمان برای موسوڵمانە ، ڕەوا نی یە بۆ هیچ موسوڵمانێك شتێكی عەیبدار بە براكەی بفرۆشێت و بێ ئەوەی باسی عەیبەكەی بكات .**

٢٤٢٩- قاتل الله اليهود إن الله عز و جل لما حرم عليهم الشحوم جملوها ثم باعوها فأكلوا أثمانها.

(صحيح) ( حم ق ٤ ) عن جابر ( ق ) عن أبي هريرة ( حم ق ن هـ ) عن عمر. (الإرواء ١٢٧٧)

**٢٤٢٩- لەعنەتی خوا لە جوولەكەكان ، خوای گەورە بەزی لەسەر قەدەغەكردن ، ئەوانیش تواندیانەوە و فرۆشتیان و نرخەكەیان خوارد .**

٢٤٣٠- لعن الله اليهود إن الله حرم عليهم الشحوم فباعوها و أكلوا ثمنها و إن الله إذا حرم على قوم أكل شيء حرم عليهم ثمنه.

(صحيح) ( حم د ) عن ابن عباس. (غاية المرام ٣١٨)

**٢٤٣٠- لەعنەتی خوا لەجوولەكەكان ، خوای گەورە بەزی لەسەر قەدەغەكردن ، ئەوان دەیانفرۆشت و نرخەكەیان دەخوارد ، خوای گەورەش خواردنی شتێك لەسەر خەڵكانێك قەدەغە بكات ، نرخەكەشی هەر قەدەغەیە لەسەریان .**

٢٤٣١- نهى عن المحاقلة و المخاضرة و الملامسة و المنابذة و المزابنة.

(صحيح) ( خ ) عن أنس. (الإرواء ٩٣٤٢)

**٢٤٣١- پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی كردووە لەفرۆشتنی گوڵە گەنم بەنرخی گەنم و فرۆشتنی دانەوێڵە و بەروبووم پێش پێگەیشتنیان و، هەروەها لەدەست پێوەدان و، فڕێدان و، گۆڕینەوە.**

٢٤٣٢- نهى عن المنابذة و عن الملامسة.

(صحيح) ( حم ق د ن هـ ) عن أبي سعيد. (صحيح الترمذي ١٣١٠)

**٢٤٣٢- پێغەمبەر ﷺ نەهى كردووە لەفرۆشتنى فرپێدان و دەست پێومدان.**

٢٤٣٣- نهى عن النجش.

(صحيح) ( ق ن هـ ) عن ابن عمر. (الإرواء ١٣٠٧)

**٢٤٣٣- پێغەمبەر ﷺ نەهى كردووە لەنرخ بەرز كردنەوە.**

٢٤٣٤- نهى عن بيع الحصاة و عن بيع الغرر.

(صحيح) ( م ٤ ) عن أبي هريرة. (الإرواء ١٢٨١)

**٢٤٣٤- پێغەمبەر ﷺ نەهى كردووە لەفرۆشتنى بەرد فڕمدان و، فرۆشتنى ناديار.**

٢٤٣٥- نهى عن بيع السنين.

(صحيح) ( حم م د ن هـ ) عن جابر. (الإرواء ١٣٦٨)

**٢٤٣٥- نەهى كردووە لەفرۆشتنى سالأنە.**

٢٤٣٦- نهى عن بيع المحفلات.

(صحيح) ( البزار ) عن أنس. (الصحيحة ٣٢٣٦)

**٢٤٣٦- پێغەمبەر ﷺ نەهى كردووە لەفرۆشتنى ئەو ئاژەلأنەى شير لەگوانيان كۆ دەبێتەوە.**

٢٤٣٧- نهى عن بيعتين في بيعة.

(صحيح) ( ت ن ) عن أبي هريرة. (الإرواء ١٣٩٥)

**٢٤٣٧- نەهى كردووە لەفرۆشتن لەفرۆشتنێكدا.**

٢٤٣٨- نهى عن تلقي البيوع.

(صحيح) ( ت ) عن ابن مسعود. (غاية المرام ٣٣)

**٢٤٣٨- پێغەمبەر ﷺ نەهى كردووە لە پێشوازى كردنى فرۆشيارەكان.**

٢٤٣٩- نهى عن تلقي الجلب.

(صحيح) ( هـ ) عن ابن عمر. (غاية المرام ٣٣٢)

**٢٤٣٩- پێغەمبەر ﷺ نەهى كردووە لەبەرگرتن لەكالأ هێنراوەكان.**

٢٤٤٠- نهى عن ثمن الكلب إلا كلب الصيد.

(حسن) ( ت ) عن أبي هريرة. (الصحيحة ٢٩٧١)

**٢٤٤٠- پێغەمبەر ﷺ نەهى كردووە لە نرخى سەگ، سەگى ڕاو نەبێت.**

٢٤٤١- نهى عن ثمن الكلب إلا الكلب المعلم.

(حسن) ( حم ن ) عن جابر. (الصحيحة ١٣٠٣)

**٢٤٤١- پێغەمبەر ﷺ نەهی کردووە لە وەرگرتنی نرخی سەگ، سەگی فێرکراو نەبێت.**

٢٤٤٢- نهى عن ثمن الكلب و ثمن الخنزير و ثمن الخمر و عن مهر البغي و عن عسب الفحل.

(صحيح) ( طس ) عن ابن عمرو. (صحيح النسائي ٤٦٧٣)

**٢٤٤٢- نەهی کردووە لەنرخی سەگ و، بەراز و، مەی و، کرێی ئافرەتی داوێن پیس و، کەڵ پەڕاندنە سەر مێینەکاندا.**

٢٤٤٣- نهى عن ثمن الكلب و ثمن الدم و كسب البغي.

(صحيح) ( خ ) عن أبي جحيفة. (المشكاة ٢٧٦٥)

**٢٤٤٣- نەهی کردووە لەنرخی سەگ و، نرخی خوێن و، دەستکەوتی ئافرەتی داوێن پیسی.**

٢٤٤٤- نهى عن ثمن الكلب و عن ثمن السنور.

(صحيح) ( حم ٤ ك ) عن جابر. (المشكاة ٢٩٧١)

**٢٤٤٤- نەهی کردووە لەنرخی سەگ ، هەروەها لەنرخی پشیلە.**

٢٤٤٥- نهى عن ثمن الكلب و مهر البغي و حلوان الكاهن.

(صحيح) ( ق ٤ ) عن أبي مسعود. (الإرواء ١٢٧٨)

**٢٤٤٥- نەهی کردووە لەنرخی سەگ و، ئافرەتی داوێن پیس و، دەسکەوتی فاڵچی.**

٢٤٤٦- نهى عن سلف و بيع و شرطين في بيع و بيع ما ليس عندك و ربح ما لم تضمن.

(صحيح) ( طب ) عن حكيم بن حزام. (المشكاة ٢٨٧٠)

**٢٤٤٦- پێغەمبەر ﷺ نەهی کردووە لەداوای قەرز کردن بە فرۆشتن ، هەروەها دوو مەرج لەیەك فرۆشتندا و، فرۆشتنی شتێك کەلەلای نەبێت و، فرۆشتنی شتێك کەدڵنیا نەبوویتە لە بەدەست هێنانی.**

٢٤٤٧- لا تستقبلوا السوق و لا تحفلوا و لا ينفق بعضكم لبعض.

(حسن) ( حم ت ) عن ابن عباس. (صحيح الترمذي ١٢٦٨)

**٢٤٤٧- مەچنە پێشوازی ئەوانەی دێنە بازار، شیریش لەگوانی ئاژەڵدا مەهێڵنەوە بۆ خەڵەتاندنی کڕیار، کەستان لەسەر کەستان نرخ بەرز مەکەنەوە.**

٢٤٤٨- لا تلقوا الجلب فمن تلقى فاشترى منه شيئا فصاحبه بالخيار إذا أتى السوق.

(صحيح) ( حم م ت ن هـ ) عن أبي هريرة. (الإرواء ١٣٠٦)

**٢٤٤٨- مەچنە پیری ئەوانەی دێن بەرەو بازاڕ ، ئەگەریش کەسێکتان وایکرد خاوەن کاڵاکە ئازادە کاتێك گەیشتە بازاڕ.**

٢٤٤٩- لا تلقوا الركبان للبيع و لا يبع بعضكم على بيع بعض و لا تناجشوا و لا يبع حاضر لباد و لا تصروا الغنم و من ابتاعها فهو بخير النظرين بعد أن يحلبها إن رضيها أمسكها و إن سخطها ردها و صاعا من تمر.

(صحيح) ( خ د ن ) عن أبي هريرة. (المشكاة ٢٨٤٧)

**٢٤٤٩- مەچنە پیری کاروانەوە بۆ فرۆشتن و کەستانیش لەسەر کەستان شت مەفرۆشن، نرخیش بەرز مەکەنەوە، شارنشینیش شت نەفرۆشێنە بیابان نشین، ئینجا شیر لەگوانی مەڕ مەهێڵنەوە، کەسێکیش بیکڕێت ئازادە پاش دۆشینی ئەگەر پێی ڕازی بوو دەیهێڵێتەوە، ئەگەریش پێی خۆش نەبوو دەیگەڕێنێتەوە لەگەڵ یەك پێوانە خورما.**

٢٤٥٠- لا تلقوا الركبان و لا يبع حاضر لباد.

(صحيح) ( ق ) عن ابن عباس. (الإرواء ١٣٢٠)

**٢٤٥٠- مەچنە پێشوازی کاروانەوە، شارنشینیش باشت نەفرۆشت بەبیابان نشین.**

٢٤٥١- لا تهاجروا و لا تدابروا و لا تجسسوا و لا يبع بعضكم على بيع بعض و كونوا عباد الله إخوانا.

(صحيح) ( م ) عن أبي هريرة. (المشكاة ٥٠٢٨)

**٢٤٥١- لەیەکتر زیز مەبن و، پشت لەیەکتر هەڵمەکەن و، سیخوڕی مەکەن و، لەسەر فرۆشتنی یەکتر شت مەفرۆشن، ببنە براو بەندەی خوا.**

٢٤٥٢- لا جلب و لا جنب في الرهان.

(صحيح) ( د ) عن عمران بن حصين. (المشكاة ٢٩٤٧)

**٢٤٥٢- لەگرەودا نەتێخوڕین ڕەوایە و نە بە پاڵ خۆخستن.**

٢٤٥٣- لا يبع أحدكم على بيع أخيه.

(صحيح) ( خ ن هـ ) عن ابن عمر. (صحيح ابي داود ١٨١٥)

**٢٤٥٣- کەستان فرۆشتن نەکاتە سەر فرۆشتنی براکەیدا.**

٢٤٥٤- لا يبع الرجل على بيع أخيه حتى يبتاع أو يذر.

(صحيح) ( ن ) عن ابن عمر. (صحيح ابي داود ١٨١٥)

**٢٤٥٤- کەس هیچ نەفرۆشێت لەسەر فرۆشتنی براکەی تاکو دەیکڕێت یان وازی لێدەهێنێت.**

٢٤٥٥- لا يبع بعضكم على بيع بعض و لا تلقوا السلع حتى يهبط بها إلى السوق.

(صحيح) ( حم ق د ) عن ابن عمر. (الإرواء ١٢٨٤)

**٢٤٥٥- هەندێکتان مامەڵە مەکەن بەسەرمامەڵەی یەکتردا، بەر لە کاڵاکانیش مەگرن تا دادەبەزێتە بازاڕ.**

٢٤٥٦- لا يبع بعضكم على بيع بعض و لا يخطب بعضكم على خطبة بعض.

(صحيح) ( ت ) عن ابن عمر. (الإرواء ١٢٩٧)

**٢٤٥٦- مامەڵە مەکەن لەسەر مامەڵەی یەکتر، خوازبێنیش مەکەن لەسەر خوازبێنی یەکتر.**

٢٤٥٧- لا يبع حاضر لباد و لا تناجشوا و لا يبع الرجل على بيع أخيه و لا يخطب على خطبة أخيه و لا تسأل المرأة طلاق أختها لتكفأ ما في إنائها و لتنكح فإنما لها ما كتب الله لها.

(صحيح) ( خ ت ن هـ ) عن أبي هريرة. (الصحيحة ١٠٣٠)

**٢٤٥٧- شارنشینی باشت نەفرۆشێت بەبیابان نشینی، نرخیش لەسەر یەکتر زیاد مەکەن، کەس لەسەر براکەی مامەڵە نەکات و، خواز بێنی لەسەر خوازبێنی براکەی نەکات و، هیچ ئافرەتێك داوای تەڵاقدانی خوشکەکەی نەکات بۆ ئەوەی خۆی مارە بکرێت، چونکە ئەوەی خوا بۆی نوسیوە هەر دەستی دەکەوێت.**

٢٤٥٨- لا يبيع الرجل على بيع أخيه و لا يخطب على خطبة أخيه إلا أن يأذن له.

(صحيح) ( حم م د ن ) عن ابن عمر. (الإرواء ١٨١٦)

**٢٤٥٨- کەس مامەڵە لەسەر مامەڵەی براکەی نەکات و، خوازبێنی لەسەر خواز بێنی براکەی نەکات تا ڕێگەی پێ نەدات.**

٢٤٥٩- لا يبيع الرجل على بيع أخيه و لا يسوم على سوم أخيه.

(صحيح) ( هـ ) عن أبي هريرة . (الإرواء ١٢٩٨)

**٢٤٥٩- کەس هیچ نەفرۆشێت بەسەر فرۆشتنی براکەیداو، کەس بەسەر مامەڵەی براکەیدا مامەڵە نەکات.**

٢٤٦٠- لا يبيع حاضر لباد ( و إن كان أخاه أو أباه ) .

(صحيح) ( د ن ) عن أنس. (الصحيحة ١٠٣٠)

**٢٤٦٠- شارنشین شت نەفرۆشێت بەبیابان نشین.**

٢٤٦١- لا يبيعن حاضر لباد دعوا الناس يرزق بعضهم من بعض.

(صحيح) ( حم م ٤ ) عن جابر. (الصحيحة ١٠٣٠)

**٢٤٦١- شارنشین با هیچ نەفرۆشێت بەبیابان نشین، واز لەخەڵکی بهێنن با ڕۆزی یەکتری دابین بکەن.**

٢٤٦٢- لا يحل سلف و بيع و لا شرطان في بيع و لا ربح ما لم يضمن و لا بيع ما ليس عندك.

(صحيح) ( حم ٤ ك ) عن ابن عمرو. (الإرواء ٢٨٧٠)

**٢٤٦٢- ڕەوا نییە قەرزو فرۆشتن پێکەوە، هەروەها دوو مەرج لەفرۆشتندا، یان قازانج بەبێ دەستە بەرکردن، یان فرۆشتنی شتێك کە لەلات نییە.**

٢٤٦٣- إذا ابتعت طعاما فلا تبعه حتى تستوفيه.

(صحيح) ( م ) عن جابر . (الإرواء ١٣١٧)

**٢٤٦٣- ئەگەر خۆراکێکت کڕی مەیفرۆشە تاکو دێتە ژێر دەست.**

٢٤٦٤- إذا اشتريت مبيعا فلا تبعه حتى تقبضه.

(صحيح) ( حم ن حب ) عن حكيم بن حزام . (صحيح النسائي ٤٦٠٣)

**٤٢٦٤- ئەگەر فرۆشراوێکت کڕی مەیفرۆشە تاکو بەدەستی دەهێنی.**

٢٤٦٥- إذا جاء أحد يطلب ثمن الكلب فاملأ كفه ترابا.

(صحيح) ( د هق ) عن ابن عباس . (الصحيحة ١٥٠٣)

**٢٤٦٥- ئەگەر هات داوای نرخی سەگی کرد لە پی پڕ بکە لەخۆڵ.**

٢٤٦٦- إن الله و رسوله حرم بيع الخمر و الميتة و الخنزير و الأصنام.

(صحيح) ( حم ق ٤ ) عن جابر . (الإرواء ١٢٧٧)

**٢٤٦٦- خوای گەورە و پێغەمبەرەکەی نارەق و، تۆپی و پیس و، بەراز و، بتیان قەدەغە کردووە.**

٢٤٦٧- ثلاث لا يمنعن: الماء و الكلأ و النار.

(صحيح) ( هـ ) عن أبي هريرة . (الإرواء ١٥٥٠)

**٢٤٦٧- سێ شت قەدەغە ناکرێت: ئاو و، لەوەڕ و، ئاگر.**

٢٤٦٨- حرام شف ما لم يضمن.

(حسن) ( هق ) عن ابن عمرو . (الصحيحة ١٢١٢)

**٢٤٦٨- نارەوایە قازانجی شتێك کە دەستە بەر نەکراوە.**

٢٤٦٩- حرمت التجارة في الخمر.

(صحيح) ( خ د ) عن عائشة . (صحيح ابي داود ٣٤٩٠)

**٢٤٦٩- حەرامە بازرگانی کردن بەئارەق.**

٢٤٧٠- من ابتاع طعاما فلا يبعه حتى يستوفيه.

(صحيح) ( حم ق ن هـ ) عن ابن عمر ( ق ٤ ) عن ابن عباس ( حم م ) عن أبي هريرة. (الإرواء ١٣١٧)

**٢٤٧٠- ئەگەر کەسێك خۆراکێکی کڕی با نەیفرۆشێت تاکو دەگەیەتە دەستی.**

٢٤٧١- من منع فضل ماء أو كلأ منعه الله فضله يوم القيامة.

(صحيح) ( حم ) عن ابن عمرو. (الصحيحة ١٤٢٢)

**٢٤٧١- هەر کەسێك زیادەی ئاوو لەوەڕی قەدەغە کرد لەخەڵکی، خوای گەورە فەزڵی خۆی لێی قەدەغە دەکات لەڕۆژی قیامەتدا.**

٢٤٧٢- المسلمون شركاء في ثلاثة: في الكلأ و الماء و النار.

(صحيح) ( حم د ) عن رجل. (الإرواء ١٥٥٠)

**٢٤٧٢- موسڵمانان لە سێ شتدا هاوبەشن: لەوەڕ و، ئاو و، ئاگر.**

٢٤٧٣- المسلم أخو المسلم يسعهما الماء و الشجر و يتعاونان على الفتان.

(حسن) ( د ) عن صفية ودحيبة ابنتي عليبة. (صحيح ابي داود ٣٠٧٠)

**٢٤٧٣- موسوڵمان برای موسوڵمانە بەشدارن لەئاوو درەختدا و، هاوکاری یەکترن لەدژی شەیتان.**

٢٤٧٤- نهى أن يمنع نقع البئر.

(صحيح) ( حم ) عن عائشة. (الصحيحة ٢٣٨٨)

**٢٤٧٤- پێغەمبەر ﷺ نەهی کردووە زێدە ئاوی بیر قەدەغە بکرێت.**

٢٤٧٥- نهى عن المزابنة.

(صحيح) ( ق ن هـ ) عن ابن عمر. (الصحيحة ١٧١٥)

**٢٤٧٥- پێغەمبەر ﷺ نەهی کردووە لەفرۆشتنی خورمای تەڕ بەخورمای وشك.**

٢٤٧٦- نهى عن بيع الثمار حتى تنجو من العاهة.

(صحيح) ( طب ) عن زيد بن ثابت. (الإرواء ١٣٥٥)

**٢٤٧٦- پێغەمبەر ﷺ نەهی کردووە لەفرۆشتنی بەرو بووم تاکو لەئافات ڕزگاری دەبێت.**

٢٤٧٧- نهى عن بيع الثمار حتى يبدو صلاحها و تأمن العاهة.

(صحيح) ( حم ) عن عائشة. (الإرواء ١٣٥٥)

**٢٤٧٧- پێغەمبەر ﷺ نەهی کردووە لەفرۆشتنی بەرو بووم تاکو چاك بوونی دیار دەدا و ڕزگاری دەبێت لەئافات.**

٢٤٧٨- نهى عن بيع الثمر بالتمر.

(صحيح) ( ق د ) عن سهل بن أبي حثمة. (صحيح ابن ماجه ٢٢٦٥)

**٢٤٧٨- پێغەمبەر ﷺ نەهی کردووە لەفرۆشتنی خورمای تەڕ بەخورمای وشك.**

٢٤٧٩- نهى عن بيع الثمر بالتمر كيلا و عن بيع العنب بالزبيب كيلا و عن بيع الزرع بالحنطة كيلا.

(صحيح) ( د ) عن ابن عمر. (صحيح ابن ماجه ٢٢٦٥)

**٢٤٧٩- پێغەمبەر ﷺ نەهی کردووە لەفرۆشتنی خورمای تەڕ بە خورمای وشك بە پێوانە، هەروەها ترێ بەمێوژ بە پێوانە، ڕووەکیش بەگەنم بە پێوانە.**

٢٤٨٠- نهى عن بيع الثمر حتى يطيب.

(صحيح) ( حم ق ) عن جابر. (الإرواء ١٣٦٧)

**٢٤٨٠- پێغەمبەر ﷺ نەهی کردووە لەفرۆشتنی بەرو بووم پێش دەرکەوتنی چاکێتی.**

٢٤٨١- نهى عن بيع الثمرة حتى يبدو صلاحها و عن النخل حتى تزهو.

(صحيح) ( خ ) عن أنس. (الإرواء ١٣٥٥)

**٢٤٨١- پێغەمبەر ﷺ نەهی کردووە لەفرۆشتنی بەرو بووم تا دەرکەوتنی بەکەڵك بوونی، هەروەها لەفرۆشتنی دار خورما پێش بەرهەم هاتنی.**

٢٤٨٢- نهى عن بيع الطعام حتى يجري فيه الصاعان فيكون لصاحبه الزيادة و عليه النقصان.

(حسن) ( البزار ) عن أبي هريرة. (الصحيحة ٢٨٠١)

**٢٤٨٢- پێغەمبەر ﷺ نەهی کردووە لەفرۆشتنی خۆراك تاکو نەگاتە دوو ئەندازە، زیادەکەی بۆ خاوەنەکەی بێت و کەم وکوڕیشی لەسەر دەژمێردرێت.**

٢٤٨٣- نهى عن بيع المضامين و الملاقح و حبل الحبلة.

(صحيح) ( طب ) عن ابن عباس. (صحيح الترمذي ١٢٢٩)

**٢٤٨٣- پێغەمبەر ﷺ نەهی کردووە لەفرۆشتنی کۆرپە لەسکی دایکدا و، بەچکەی بەچکەی وشتر.**

٢٤٨٤- نهى عن بيع النخل حتى يزهو و عن السنبل حتى يبيض و يأمن العاهة.

(صحيح) ( م د ت ) عن ابن عمر. (الإرواء ١٣٦٣)

**٢٤٨٤- پێغەمبەر ﷺ نەهی كردووە لەفرۆشتنی دار خورما پێش پێگەیشتنی و، لە گوڵەگەنم پێش پێگەیشتنی و ڕزگار بوونی لەئافات.**

٢٤٨٥- نهى عن بيع الولاء و عن هبته.

(صحيح) ( حم ق ٤ ) عن ابن عمر. (المشكاة ٢٨٧٨)

**٢٤٨٥- پێغەمبەر ﷺ نەهی كردووە لەفرۆشتنی كۆیلە و بردنی میراتییەكەی یان دیارییەكەی.**

٢٤٨٦- نهى عن بيع حبل الحبلة.

(صحيح) ( حم ق ٤ ) عن ابن عمر. (المشكاة ٢٨٥٥)

**٢٤٨٦- پێغەمبەر ﷺ نەهی كردووە لەفرۆشتنی بەچكەی بەچكەی وشتر.**

٢٤٨٧- نهى عن بيع ضراب الجمل و عن بيع الماء و الأرض لتحرث.

(صحيح) ( حم م ن ) عن جابر. (المشكاة ٢٨٥٧)

**٢٤٨٧- پێغەمبەر ﷺ نەهی كردووە لەوەرگتنی كرێی كەڵ و، لەفرۆشتنی ئاو و، كرێدانی زەوی بۆ كێڵان.**

٢٤٨٨- نهى عن بيع فضل الماء.

(صحيح) ( م ن هـ ) عن جابر ( حم ٤ ) عن إياس بن عبيد. (المشكاة ٢٨٥٨)

**٢٤٨٨- پێغەمبەر ﷺ نەهی كردووە لەفرۆشتنی زیادەی ئاو.**

٢٤٨٩- نهى عن عسب الفحل.

(صحيح) ( حم خ ٣ ) عن ابن عمر. (المشكاة ٢٨٥٦)

**٢٤٨٩- پێغەمبەر ﷺ نەهی كردووە لەوەرگرتنی كرێی ئاژەڵ بۆ كەڵدان.**

٢٤٩٠- نهى عن عسب الفحل و قفيز الطحان.

(صحيح) ( قط ) عن أبي سعيد. (الإرواء ١٤٧٠)

**٢٤٩٠- پێغەمبەر ﷺ نەهی كردووە لەوەرگرتنی كرێی كەڵ و، قەفیزی ئاشەوان.**

٢٤٩١- لا تبتاعوا التمر حتى يبدوا صلاحه و لا تبتاعوا التمر بالتمر.

(صحيح) ( م ) عن أبي هريرة ( ق ن ) عن ابن عمر. (الإرواء ١٣٥٥)

**٢٤٩١- خورما مەكڕن پێش پێگەیشتنی، خورمایش بەخورما مەكڕن.**

٢٤٩٢- لا تبتاعوا الثمرة حتى يبدو صلاحها و تذهب عنها الآفة.

(صحيح) ( م ) عن ابن عمر. (الإرواء ١٣٥٥)

**٢٤٩٢- بەرو بووم مەکڕن تا پێگەیەت و سەلامەت دەبێت لەئافات.**

٢٤٩٣- لا تبع طعاما حتى تشتريه و تستوفيه.

(صحيح) ( حم ن ) عن حكيم بن حزام. (صحيح النسائي ٤٦٠١)

**٢٤٩٣- خۆراکێك مەفرۆشە، تاکو نەیکڕیت و وەرینەگریت.**

٢٤٩٤- لا تبع ما ليس عندك.

(صحيح) ( حم ٤ ) عن حكيم بن حزام. (المشكاة ٢٨٦٧)

**٢٨٩٤- شتێك مەفرۆشە کە لەلات نییە.**

٢٤٩٥- لا يباع فضل الماء ليباع به الكلأ.

(صحيح) ( م ) عن أبي هريرة. (المشكاة ٢٨٥٩)

**٢٤٩٥- زیادەی نابێت بفرۆشرێت بۆ ئەوەی لەوەڕی پیْ بفرۆشرێت.**

٢٤٩٦- لا يحل ثمن الكلب و لا حلوان الكاهن و لا مهر البغي.

(صحيح) ( د ن ) عن أبي هريرة. (صحيح النسائي ٤٢٩٣)

**٢٤٩٦- ڕەوا نییە نرخی سەگ و، دەستکەوتی فەشە و، دەستکەوتی داوێن پیس.**

٢٤٩٧- لا يحل لامرئ يؤمن بالله و اليوم الآخر أن يسقي ماءه زرع غيره و لا أن يبتاع مغنما حتى يقسم و لا أن يلبس ثوبا من فيء المسلمين حتى إذا أخلقه رده فيه و لا يركب دابة من فيء المسلمين حتى إذا أعجفها ردها فيه.

(حسن) ( حم د حب ) عن رويفع بن ثابت الأنصاري وروى ( ت ) صدره. (الإرواء ١٨٧)

**٢٤٩٧- ڕەوا نییە بۆ کەسێك باوەڕی هەبێت بەخوا و ڕۆژی دوایی، ئاوی خۆی بخاتە سەر ڕووەکی کەسێکی تر، یان شتێك لەدەستکەوتی موسوڵمانان لەبەر بکات پاش کۆنە کردنی بیگێڕێتەوە، یان سواری ووڵاخێك بێت لەدەستکەوتی موسوڵمانان وماندووی بکات و دوایی بیگێڕێتەوە ناوی.**

٢٤٩٨- لا يمنع أحدكم فضل الماء ليمنع به الكلأ.

(صحيح) ( ق د ت هـ ) عن أبي هريرة. (المشكاة ٢٨٥٩)

**٢٤٩٨- کەس لە ئێوە زیادەی ئاو قەدەغە نەکات بۆ ئەوەی لەوەڕی پیْ قەدەغە بکات.**

٢٤٩٩- لا يمنع فضل الماء و لا يمنع نقع البئر.

(صحيح) ( هـ ك ) عن عائشة. (الصحيحة ٢٣٨٨)

**٢٤٩٩- ئەوەى لەناو دەمێنێتەوە نابێت قەدەغە بكرێت، بەهەمان شێوە ئاوى بن بيريش كەدەمێنێتەوە.**

٢٥٠٠- إذا سميت الكيل فكله.

(صحيح) ( هـ ) عن عثمان . (الإرواء ١٣٢٠)

**٢٥٠٠- كە پێوانەكەت ديارى كرد قورس بيپێوە.**

٢٥٠١- إذا وزنتم فأرجحوا.

(صحيح) ( هـ الضياء ) عن جابر . (الصحيحة ٣٩٤٢)

**٢٥٠١- ئەگەر كێشانەتان كرد قورس بيكێشن.**

٢٥٠٢- زن و أرجح.

(صحيح) ( حم ٤ ك حب ) عن سويد بن قيس. (المشكاة ٢٩٢٤)

**٢٥٠٢- بكێشە و زيادى بدەرێ.**

٢٥٠٣- كيلوا طعامكم فإن البركة في الطعام المكيل.

(صحيح) ( ابن النجار ) عن علي. (صحيح ابن ماجه ٢٢٣١)

**٢٥٠٣- خۆراكەكانتان بپێون؛ پيرۆزى لەخواردەمەنى پێوانە كراو دايە.**

٢٥٠٤- كيلوا طعامكم يبارك لكم فيه.

(صحيح) ( حم خ ) عن المقدام بن معد يكرب ( تخ هـ ) عن عبدالله بن بسر ( حم هـ ) عن أبي أيوب ( طب ) عن أبي الدرداء. (صحيح ابن ماجه ٢٢٣١)

**٢٥٠٤- خواردنەكانتان بكێشن بۆ ئەوەى خوا پيرۆزى بكات لێتان.**

٢٥٠٥- خمس بخمس ما نقض قوم العهد إلا سلط عليهم عدوهم و ما حكموا بغير ما أنزل الله إلا فشا فيهم الفقر و لا ظهرت فيهم الفاحشة إلا فشا فيهم الموت و لا طففوا المكيال إلا منعوا النبات و أخذوا بالسنين و لا منعوا الزكاة إلا حبس عنهم القطر.

(حسن) ( طب ) عن ابن عباس . (الترغيب ٧٦٥)

**٢٥٠٥- پێنج بە پێنج: هەركەسێك پەيمانيان لەگەڵ خوا بشكێنن خواى گەورە دوژمنەكەيان بەسەريان زاڵ دەكات، هەركاتيكيش خەڵكانێك حوكم بكەن بەشتيكى تر**

**جگە لەقورئان هەژاریان تیا بڵاودەبێتەوە. خراپەکاریشیان تیا بڵاوببێتەوە مردنیان تیا بڵاو دەبێتەوە، تەرازوویش سووك بكەن ڕووەکیان لێ قەدەغە دەکرێت و گرانیان بەسەردا دێت، ئەگەر زەکاتیش نەدەن بارانیان لێ دەگیردرێتەوە.**

٢٥٠٦- نهى عن المزابنة و المحاقلة.

(صحيح) ( ق ) عن أبي سعيد. (غاية المرام ٣٦٦)

**٢٥٠٦- پێغەمبەر ﷺ نەهی کردووە لە ( موزابەنە ) و، ( موحاقەلە ).**

٢٥٠٧- نهى عن المخابرة.

(صحيح) ( حم ) عن زيد بن ثابت. (الإرواء ١٤٧١)

**٢٥٠٧- پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی کردوە باخەوانی لەسەر شتێکی دیاری کراو لەبەرو بومی ئەو کشت و کاڵەی باخەوانی دەکات.**

٢٥٠٨- من باع دارا ثم لم يجعل ثمنها في مثلها لم يبارك له فيها.

(حسن) ( هـ الضياء ) عن حذيفة. (الصحيحة ٢٣٢٧)

**٢٥٠٨- کەسێك خانوویەکی فرۆشت و نرخەکەی نەخستە شتێکی هاوشێوەی خوای گەورە لێی پیرۆز ناکات.**

٢٥٠٩- من باع منكم دارا أو عقارا فليعلم أنه مال قمن أن لا يبارك له فيه إلا أن يجعله في مثله.

(حسن) ( حم هـ ) عن سعيد بن حريث. (الصحيحة ٢٣٢٧)

**٢٥٠٩- کەسێك لەئێوە خانوویەرە، یان زەویەکی کڕی، با چاك بزانێت ئەوە ماڵێکە شایستەی ئەوەیە خوای گەورە پیرۆزی نەکات لێی تا نەیخاتە شتێکی هاوشێوەی خۆی.**

٢٥١٠- إياكم و كثرة الحلف في البيع فإنه ينفق ثم يمحق.

(صحيح) ( حم م ن هـ) عن أبي قتادة . (المشكاة ٢٧٩٣)

**٢٥١٠- خۆتان بپارێزن لە زۆر سوێند خواردن لە فرۆشتندا، چونکە بازاڕ گەرم دەکات و دوایی پیت و بەرەکەتی ناهێڵێ.**

٢٥١١- ثلاثة لا يكلمهم الله يوم القيامة و لا ينظر إليهم: رجل حلف على سلعته لقد أعطي بها أكثر مما أعطي و هو كاذب و رجل حلف على يمين كاذبة بعد العصر ليقتطع بها مال رجل مسلم و رجل منع فضل مائه فيقول الله: اليوم أمنعك فضلي كما منعت فضل ما لم تعمل يداك.

(صحيح) ( ق ) عن أبي هريرة . (المشكاة ٢٩٩٥)

**٢٥١١- سیٚ كەس هەن خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەت دا نایاندوێنی و تەماشایان ناكات : پیاوێك سوێند بخوات لەسەر كاڵاكەی كە لەوە زۆرتری پێدراوە كە ئەو كەسە دەیدات و خۆشیی درۆ دەكات ، پیاوێكیش سوێند بە درۆ بخوات دوای عەصر بۆ ئەوەی بەشێك لە ماڵی موسوڵمانێك بۆ خۆی دابڕێت ، پیاوێكیش ئاوی زیادەی خۆی قەدەغە بكات لەوكەسەی پێویستی پێیەتی ، جا خوای گەورە دەفەرموێت : منیش فەزڵی خۆمت لەسەر قەدەغە دەكەم وەكو تۆ زیادەی ئەوەت قەدەغە دەكرد كەخۆت بەدەست نەهیناوە .**

٢٥١٢- ثلاثة لا يكلمهم الله يوم القيامة و لا ينظر إليهم و لا يزكيهم و لهم عذاب أليم: المسبل إزاره و المنان الذي لا يعطي شيئا إلا منه و المنفق سلعته بالحلف الكاذب.

(صحيح) ( حم م ٤ ) عن أبي ذر . (الإرواء ٨٩٢)

**٢٥١٢- سی كەس هەن خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەت قسەیان لەگەڵ ناكات و تەماشایان ناكات و پاكانەیان بۆ ناكات، سزای سەختیش چاوەڕوانیان دەكات : ئەو كەسەی پۆشاكی شۆڕ دەكاتەوە و ، منەتكاریش كە هەرچی ببەخشێت منەتی لەسەر دەكات ، ئەو كەسەش سوێندی درۆ دەخوات بۆ ئەوەی بازاڕی خۆی گەرم بكات.**

٢٥١٣- ثلاثة لا يكلمهم الله يوم القيامة و لا ينظر إليهم و لا يزكيهم و لهم عذاب أليم: رجل على فضل ماء بالفلاة يمنعه من ابن السبيل و رجل بايع رجلا بسلعة بعد العصر فحلف له بالله لأخذها بكذا و كذا فصدقه و هو على غير ذلك و رجل بايع إماما لا يبايعه إلا لدنيا فإن أعطاه منها وفى و إن لم يعطه لم يف.

(صحيح) ( حم ق ٤ ) عن أبي هريرة . (الترغيب ١٧٨٩)

**٢٥١٣- سیٚ كەس هەن خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەت دا ، تەماشایان ناكات و پاكیان ناكاتەوە و سزای سەختی بۆ داناون ، پیاوێك ئاوی زیادەی پیٚ بێت لە چۆڵەوانیداو لەڕیبوارانی قەدەغەبكات ، پیاوێكیش پاش عەسر كاڵایەك بفرۆشێت بە پیاوێك و سوێند بخوات بەوەندەی كڕیوە و ، ئەویش باوەڕی پیٚ بكات ، و خۆیشی وا نەبێت ، پیاوێكیش بەیعەت بدات بە پێشەوایەك ، بەیعەتیشی پیٚ نەدات تەنها لە پێناو دونیا دا نەبێت ، ئەویش ئەگەر شتی پیٚ بەخشی بە ئەمەك دەبێت بۆی ، ئەگەر هیچیشی پیٚ نەبەخشی شپڵە بێت بەرامبەری.**

٢٥١٤- الحلف منفقة للسلعة ممحقة للبركة.

(صحيح) ( ق د ن ) عن أبي هريرة . (الإرواء ٣٣٨)

**٢٥١٤- سوێند خواردن ، بازاڕ گەرمی یە و بەرەکەت نەهێشتنە .**

## بابەتی سەرپشك بوون لە مامەڵەدا

٢٥١٥- أدخل الله الجنة رجلا كان سهلا مشتريا و بائعا و قاضيا و مقتضيا .

(حسن) (حم ن هـ هب) عن عثمان . (الصحيحة ١١٨١)

**٢٥١٥- خوای گەورە پیاوێکی خستە بەهەشتەوە ڕوخۆش بوو لە کڕین و فرۆشتن و دادوەری کردن و داواکردن دا .**

٢٥١٦- إذا اختلف البيعان فالقول قول البائع و المبتاع بالخيار.

(صحيح) ( ت هق ) عن ابن مسعود . (الإرواء ١٣١٢)

**٢٥١٦- ئەگەر کڕیار و فرۆشیار ناکۆك بوون ، قسە قسەی فرۆشیار و کڕیارە بە پێی سەر پشك کردن[1] .**

٢٥١٧- إذا اختلف البيعان و ليس بينهما بينة فهو ما يقول رب السلعة أو يتتاركان.

(صحيح) ( د ن ك هق ) عن ابن مسعود . (الصحيحة ٧٩٨)

**٢٥١٧- ئەگەر کڕیار و فرۆشیار ناکۆك بوون و بەڵگە نەبوو لە نێوانیاندا قسە قسەی خاوەن ماڵەکەیە یان هەردوو لایان وازبهێنن.**

٢٥١٨- إذا اختلف البيعان و ليس بينهما بينة و المبيع قائم بعينه فالقول ما قال البائع أو يتركان البيع.

(صحيح) ( هـ ) عن ابن مسعود . (الإرواء ١٣١٠)

**٢٥١٨- ئەگەر کڕیار و فرۆشیار ناکۆك بوون و شاهیدیش نەبوو لە نێوانیاندا ، شتە فرۆشراوەکەیش هەروەکو خۆی مابوویەوە ، قسە قسەی فرۆشیارە یا با واز لەو فرۆشتنە بهێنن .**

٢٥١٩- إذا تبايع الرجلان فكل واحد منهما بالخيار ما لم يتفرقا و كانا جميعا أو يخير أحدهما الآخر فإن خير أحدهما الآخر فتبايعا على ذلك فقد وجب البيع و إن تفرقا بعد أن تبايعا و لم يترك واحد منهما البيع فقد وجب البيع.

(صحيح) ( ق ن هـ ) عن ابن عمر . (الإرواء ١٢٩٩)

---

[1] واتە دەتوانن جێ بەجێ بکەن و دەتوانن تێکشی بدەنەوە.

**٢٥١٩- ئەگەر دوو کەس کڕین و فرۆشتنیان کرد ، هەردوولایان سەرپشکن تا لە یەکتر جیا دەبنەوە ، یان یەکێکیان ئەوی تریان سەرپشك بکات ، ئەگەر ئەوە کرا ئیتر فرۆشتنەکە پێکدێت ، ئەگەر لە پاش ئەوە لە یەکتر جیادەبوونەوە و کەسیان وازی نەهێنا لە فرۆشتنەکە ، پێکدێت و سەر دەگرێت.**

٢٥٢٠- اسمحوا يسمح لكم.

(صحيح) ( عب ) عن عطاء مرسلا . (الصحيحة ١٤٥٦)

**٢٥٢٠- گونجاوبە و چاوپۆشی بکەن با چاوپۆشیتان لێ بکرێت .**

٢٥٢١- اسمح يسمح لك.

(صحيح) ( حم طب هب ) عن ابن عباس . (الصحيحة ١٤٥٦)

**٢٥٢١- گونجاوبە و چاوپۆشی بکە با چاوپۆشیت لێ بکرێت.**

٢٥٢٢- إن الله تعالى يحب سمح البيع سمح الشراء سمح القضاء.

(صحيح) ( ت ك ) عن أبي هريرة . (الصحيحة ٨٩٦)

**٢٥٢٢- خوای گەورە کەسێکی خۆشدەوێت چاوپۆی بکات و نەرم و نیان بێت لە فرۆشتن و لە کڕین و دادوەریدا.**

٢٥٢٣- إن المتبايعين بالخيار في بيعهما ما لم يتفرقا أو يكون البيع خيارا.

(صحيح) ( خ ) عن ابن عمر . (صحيح النسائي ٤٤٧٣)

**٢٥٢٣- کڕیار و فرۆشیار سەرپشکن بۆ ئەنجامدانی مامەڵەکەیان تا ئەو کاتەی جیا دەبنەوە یان مامەڵەکە بە پێی مەرجی دیاریکراو دەبێ.**

٢٥٢٤- إنما البيع عن تراض.

(صحيح) ( هـ ) عن أبي سعيد . (الإرواء ١٢٧٠)

**٢٥٢٤- کڕین و فرۆشتن بە ڕازی بوونی هەردوو لا دەبێت.**

٢٥٢٥- البيعان إذا اختلفا في البيع ترادا البيع.

(صحيح) ( طب ) عن ابن مسعود . (الإرواء ٥\١٧٠)

**٢٥٢٥- کڕیارو فرۆشیار ئەگەر پێك نەهاتن لە مامەڵەدا دەتوانن دەستی لێ بکێشنەوە .**

٢٥٢٦- البيعان بالخيار ما لم يتفرقا.

(صحيح) ( حم د هـ) عن أبي برزة ( هـك ) عن سمرة . (صحيح ابن ماجه ٢١٨١)

**٢٥٢٦- کڕیار و فرۆشیار سەرپشکن تا لە یەکتر جیا نەبنەوە .**

٢٥٢٧- البيعان بالخيار ما لم يتفرقا إلا أن تكون صفقة خيار و لا يحل له أن يفارق صاحبة خشية أن يستقيله.

(حسن) ( حم ن ) عن ابن عمرو . (الإرواء ١٣٠٠)

**٢٥٢٧- كڕیار و فرۆشیار سەرپشكن تا ئەو كاتەی لە یەكتر جیادەبنەوە مەگەر مامەڵەیەكی سەرپشككردن[٢] بێت ڕەوایش نی یە یەكێكیان ئەوی تریان جێبێڵێ لە مەترسی ئەوەی پەشیمان بێتەوە.**

٢٥٢٨- البيعان بالخيار ما لم يتفرقا أو يقول أحدهما لصاحبه اختر.

(صحيح) ( حم خ ٣ ) عن ابن عمر . (الإرواء ١٢٩٩)

**٢٥٢٨- كڕیار و فرۆشیار سەرپشكن تا جیا نەبنەوە ، یان یەكێكیان بە هاوڕێكەی بڵێت : هەڵبژێرە[٣] .**

٢٥٢٩- البيعان بالخيار ما لم يتفرقا فإن صدقا و بينا بورك لهما في بيعهما و إن كتما و كذبا محقت بركة بيعهما.

(صحيح) ( حم ق ٣ ) عن حكيم بن حزام . (الإرواء ١٢٦٨)

**٢٥٢٩ – كڕیار و فرۆشیار سەرپشكن لە مامەڵەكەیاندا پێش جیابوونەوەیە نالەیكتر ، جا ئەگەر ڕاستیان كرد لەگەڵ یەكتر و بۆیەكتریان ڕوون كردەوە ، خوای گەورە بەرەكەت دەخاتە مامەڵەكەیانەوە ، ئەگەرشتیشیان شاردەوە و درۆیان كرد ، خوای گەورە مامەڵەكەیان بێ پیز دەكات.**

٢٥٣٠- رحم الله عبدا سمحا إذا باع سمحا إذا اشترى سمحا إذا قضى سمحا إذا اقتضى.

(صحيح) ( خ هـ) عن جابر. (الصحيحة ٨٩٩)

**٢٥٣٠- ڕەحمەتی خوا لە كەسێك لێ بووردەبێت ، ئەگەر فرۆشتی ئەگەر كڕی داوابكات ئەگەر دادوەری كرد یان داوابكات.**

٢٥٣١- غفر الله لرجل ممن كان قبلكم كان سهلا إذا باع سهلا إذا اشترى سهلا إذا اقتضى.

(صحيح) ( حم ت هق ) عن جابر. (الصحيحة ١١٨١)

---

[٢] وەكو یەكێكیان بەوی تریانك بڵێت تۆ سەر پشك بەپێك هاتن یان هەڵوەشاندنەوە.

**[٣] واتە: یەكێكیان لە كڕیار و فرۆشیار بەوی تریان بڵێت بەدەست تۆیە هەڵبژێرە پێكی دێنی یان هەڵیدەوشێنیتەوە بەكەیفی خۆتە.**

**٢٥٣١- خوای گەورە لە یەکێك لەوانەی پێش ئێوە خۆش بوو ، نەرم ونیان بوو لە فرۆشتن و کڕین و داواکردندا .**

٢٥٣٢- كل بيعين لا بيع بينهما حتى يتفرقا إلا بيع الخيار.

(صحيح) ( حم ق ن ) عن ابن عمر. (الإرواء ١٣١٠)

**٢٥٣٢- هەموو کڕیار و فرۆشیارێك مامەڵەکەیان سەر ناگرێت تاکو جیا نەبنەوە ، تەنها مامەڵەی سەرپشك کردن نەبێت .**

٢٥٣٣- لا يتفرقن عن بيع إلا عن تراض.

(حسن) ( ت ) عن أبي هريرة. (المشكاة ٢٨٠٥)

**٢٥٣٣- با کڕیار و فرۆشیار جیا نەبنەوە تاکو لە یەکتر ڕازی دەبن.**

٢٥٣٤- لا يفترقن اثنان إلا عن تراض.

(صحيح) ( د ) عن أبي هريرة. (الإرواء ١٢٧٠)

**٢٥٣٤- با دوو کەس لە یەکتر جیا نەبنەوە تا لە یەکتر ڕازی نەبن .**

٢٥٣٥- لألقين الله من قبل أن أعطي أحدا من مال أحد شيئا بغير طيب نفس إنما البيع عن تراض.

(صحيح) ( هق ) عن أبي سعيد. (الإرواء ١٢٨٣)

**٢٥٣٥- دەبێت بگەمە خوای گەورە پێش ئەوەی ماڵی کەسێك بدەم بە کەسێکی تر بە ڕەزامەندی خۆی نەبێت بێگومان کڕین و فرۆشتن بە ڕەزامەندی دەبێت.**

٢٥٣٦- من ابتاع محفلة أو مصراة فهو بالخيار ثلاثة أيام إن شاء أن يمسكها أمسكها و إن شاء أن يردها ردها و صاعا من تمر لا سمراء.

(صحيح) ( ن هـ ) عن أبي هريرة. (المشكاة ٢٨٤٧)

**٢٥٣٦- کەسێك (محفلة)[٤] یان (مصراة)[٥] بکڕێت ، سەرپشکە تاکو سێ ڕۆژ ئەگەر ویستی بیهێڵێتەوە ، یان بیگێڕێتەوە لەگەڵ چوار مشت خورما ، بۆر نەبێت .**

٢٥٣٧- من اشترى شاة مصراة فهو بالخيار ثلاثة أيام فإن ردها رد معها صاعا من طعام لا سمراء.

(صحيح) ( حم م د ت ) عن أبي هريرة. (صحيح الترمذي ١٢٥٢)

---

[٤] ئەو ئاژەڵەیە خاوەنەکەی چەند ڕۆژێك نایدۆشێت، کڕیاریش نرخی زیادی پێ ئەدات وا دەزانی هەر خۆی شیری زۆر بەڵام دوای دۆشین بۆی دەردەکەوێت دوای چەند ڕۆژێك.

[٥] ئەویش ئەو ئاژەڵەیە چەند ڕۆژێك نایدۆشێ وشتر لەگوانەکانیدا قەتیس دەمێنێ.

**٢٥٣٧- هەر کەسێك مەڕێك بکرێت کەشیر لەگوانەکانیدا قەتیس مابێ ، سەر پشکە تا سێ ڕۆژ ، ئەگەر گێڕایەوە با لەگەڵ ئەندازەیەك خۆراك بیگێڕێتەوە بۆر نەبێت .**

٢٥٣٨- من اشترى شاة مصراة فهو بخير النظرين إن شاء أمسكها و إن شاء ردها و صاعا من تمر لا سمراء.

(صحيح) ( م ) عن أبي هريرة. (صحيح الترمذي ١٢٥٢)

**٢٥٣٨- هەرکەسێك مەڕێك بکڕێت شیر لە گوانیدا کۆبووبێتەوە ، سەرپشکە لەوەی بیهێڵێتەوە یان ئەگەر ویستی بیگێڕێتەوە لەگەڵ ئەندازەیەك لە خورما بۆر نەبێت .**

٢٥٣٩- من اشترى شاة مصراة فهو فيها بالخيار ثلاثة أيام إن شاء أمسكها و إن شاء ردها ورد معها صاعا من تمر.

(صحيح) ( حم م ت ) عن أبي هريرة. (صحيح الترمذي ١٢٥٢)

**٢٥٣٩- هەرکەسێك مەڕێك بکڕێت شیر لە گوانی کۆببێتەوە ، سەرپشکە لەماوەی سێ ڕۆژدا ئەگەر بیەوێت بیهێڵێتەوە ، یان بیگێڕێتەوە لەگەڵ چوار مشت خورما .**

٢٥٤٠- من أقال مسلما أقال الله تعالى عثرته.

(صحيح) ( د هـ ك ) عن أبي هريرة. (الإرواء ١٣٢٣)

**٢٥٤٠- هەر کەسێك ڕازی بێت بە پەشیمان بوونەوەی موسوڵمانێك لە مامەڵەکەی خوای گەورە فریای دەکەوێت لە هەڵنگوتنیدا .**

٢٥٤١- المتبايعان بالخيار ما لم يتفرقا إلا أن تكون صفقة خيار و لا يحل له أن يفارق صاحبه خشية أن يستقيله.

(صحيح) ( د ن ) عن ابن عمرو. (صحيح الترمذي ٤٤٦٥)

**٢٥٤١- کڕیار و فرۆشیار سەرپشکن تا لە یەکتر جیا دەبنەوە ، مەگەر مامەڵەیەکی مەرجدار بێت ، ڕەوایش نییە هاوڕێکەی بەجێبهێڵێ لەبەر مەترسی پەشیمان بوونەوەی .**

٢٥٤٢- المتبايعان بالخيار ما لم يتفرقا إلا أن يكون البيع كان عن خيار فإن كان البيع عن خيار فقد وجب البيع.

(صحيح) ( ن ) عن ابن عمر. (صحيح الترمذي ٤٤٦٥)

**٢٥٤٢- کڕیار و فرۆشیار سەرپشکن لە ئە نجامدان و ئنجام نەدانی مامەڵەکە تا ئەو کاتەی لەیەکتر جیا دەبنەوە ، مەگەر خۆیان پێك هاتبێتن ، ئەگەر مامەڵەکە بە هەڵبژاردن بووبێت ئەوە پێکهاتووە.**

٢٥٤٣- المتبايعان كل واحد منهما بالخيار على صاحبه ما لم يتفرقا إلا بيع الخيار.

(صحيح) ( ق د ن ) عن ابن عمر. (صحيح الترمذي ٤٤٦٥)

**٢٥٤٣- هەردوو کڕیار و فرۆشیار سەرپشکن لەبەرامبەر هاوڕێکەیا تا لە یەکتر جیا دەبنەوە ، فرۆشتنی سەر پشك کردن نەبێت .**

٢٥٤٤- لا تصروا الإبل و الغنم فمن ابتاعها بعد فإنه بخير النظرين بعد أن يحلبها إن شاء أمسك و إن شاء ردها و صاع[٦] تمر.

(صحيح) ( خ ) عن أبي هريرة. (الإرواء ١٣٠٨)

**٢٥٤٤- شیر کۆمەکەنەوە لە گوانی وشتر و مەڕ ، هەرکەسێکیش کڕی سەرپشکە لە چاکترینی دوو ڕێگە چارە لە پاش دۆشینی ، ئەگەر ویستی گلی دەداتەوە یان دەیگێڕێتەوە ، لەگەڵ چوار مشت خورما.**

٢٥٤٥- إذا أنت بايعت فقل: لا خلابة ثم أنت في كل سلعة ابتعتها بالخيار ثلاث ليال فإن رضيت فأمسك و إن سخطت فارددها على صاحبها.

(حسن) ( هـ هق ) عن محمد بن يحيى بن حبان مرسلا. (الصحيحة ٢٨٧٥)

**٢٥٤٥- ئەگەر شتێکت فرۆشت بڵێ : بە بێ خەم بە لەفرۆفێڵ ، دوای ئەوەش تۆ لە هەموو کەل و پەلێکدا سەرپشکی تاکو سێ شەو ئەگەر قایل بووی گلی بدەرەوە ئەگەریش قایل نەبووی بیگێڕەوە بۆ خاوەنەکەی.**

## بابەتی قازانجی سوود (( ربا ))

٢٥٤٦- إذا تبايعتم بالعينة و أخذتم أذناب البقر و رضيتم بالزرع و تركتم الجهاد سلط الله عليكم ذلا لا ينزعه حتى ترجعوا إلى دينكم.

(صحيح) ( د ) عن ابن عمر . (الصحيحة ١١)

**٢٥٤٦- ئەگەر کڕین و فرۆشتنتان کرد بە (عینة)[٧] و کلکی مانگاتان[٨] گرت و ، ڕازی بوون بە کشتووکاڵ و، وازتان لە جیهاد هێنا ، خوای گەورە داماویتان بەسەردا زاڵ دەکات و هەرگیز لەسەرتانی لانابات تا ئەگەڕێنەوە لای ئاینەکەتان .**

---

**[٦] جیاوازی زۆر هەیە لەسەر سەنگی ((مُد)) لە ٦٠٠ گرامەوە بۆ ٨٥٠ گرام صاع جۆرێك پێوانە بووە لەسەر دەمی پێشیند بەکارهاتووە کە پێوانەی چوار ((مُد)) چوار مشتە : مُد- ٦,٥٠ گرام لای پێشەوا شافعی وە ٨,٥٠ گرامە لای پێشەوا أبو حنيفه کەواتە ٤×٦٥٠=٢٦٠٠ گرام سەنگی یەك ((صاعە)) لای پێشەوا شافعی.**

٢٥٤٧- إذا ظهر الزنا و الربا في قرية فقد أحلوا بأنفسهم عذاب الله.

(صحيح) ( طب ك ) عن ابن عباس . (الترغيب ١٨٥٩)

**٢٥٤٧- ئەگەر داوێنپیسی و ،سوو لەهەر لادێیەكدا دەركەوت ، بەڕاستی ئەوانە سزای خوایان بۆ خۆیان مسۆگەر كردووە.**

٢٥٤٨- إن أبواب الربا اثنان و سبعون حوبا أدناه كالذي يأتي أمه في الإسلام.

(صحيح) ( طب ) عبدالله بن سلام . (الترغيب ١٨٥٩)

**٢٥٤٨- دەرگاكانی سوود ( ربا ) حەفتاو دوو تاوانن كەمترينيان وەكو ئەوەيە دوای موسڵمان بوونی بچێتە وێزەی دايكی بۆ كاری خراپ.**

٢٥٤٩- إنما الربا في النسيئة.

(صحيح) ( حم م ن هـ ) عن أسامة بن زيد . (الإرواء ١٣٣٨)

**٢٥٤٩- ( ربا ) لە سووی قەرزی دواخراو دايە.**

٢٥٥٠- أهون الربا كالذي ينكح أمه و إن أربى الربا استطالة المرء في عرض أخيه.

(حسن) ( أبو الشيخ في التوبيخ ) عن أبي هريرة . (الصحيحة ١٤٣٣)

**٢٥٥٠- سادترين جۆرەكانی سوود ، وەكو ئە نجامدانی زينايە لەگەڵ دايليدا ، خراپترين سووديش دەم و درێژی و دەستدرێژی كەسێكە بەسەر ئابڕوی براكەيدا.**

٢٥٥١- الآخذ و المعطي سواء في الربا.

(صحيح) ( قط ك ) عن أبي سعيد . (الإرواء ١٣٣٩)

**٢٥٥١- وەرگر و بدەری سوود وەكو يەكن.**

٢٥٥٢- التمر بالتمر و الحنطة بالحنطة و الشعير بالشعير و الملح بالملح مثلا بمثل يدا بيد فمن زاد و استزاد فقد أربى إلا ما اختلفت ألوانه.

(صحيح) ( حم م ن ) عن أبي هريرة . (المشكاة ٢٨١٩)

**٢٥٥٢- خورما بە خورما ، گەنم بە گەنم ، جۆ بە جۆ ، خوێ بە خوێ ، وەك يەك ، دەست بە دەست ، هەر كەسێك لەوە زياتری وەرگرت يان داوای زياتری كرد ، ئەوە سوود خۆرە ، مەگەر جۆرەكانيان جياوازبن.**

---

**٧ (( عينه )) فرۆشتنی شتێكە بەنرخێكی دياركراو بەنيازی ئەوەی دواتر بەهەرزان تر لێ بكرێتەوە. السراج و الوهاج ج١ ص ٤٢٤.**

**٨ دوای ڕەشە وڵاخ و ماڵات كەوتن و هەر خەريكی بەخێوكردنيان بون.**

٢٥٥٣- درهم ربا يأكله الرجل و هو يعلم أشد عند الله من ستة و ثلاثين زنية.

(صحيح) ( حم طب ) عن عبدالله بن حنظلة . (الصحيحة ١٠٣٣)

**٢٥٥٣- درهەمێكی سوود كەسێك بیخوات و بزانێت ، لە لای خوا لە سی و شەش زیناكردن خراپترە .**

٢٥٥٤- الدينار بالدينار لا فضل بينهما و الدرهم بالدرهم لا فضل بينهما .

(صحيح) ( م ن ) عن أبي هريرة. (الإرواء ١٣٢٦)

**٢٥٥٤- دینار بە دینار بە بێ زیادە درهەم بە درهەم[9] بە بێ زیادە.**

٢٥٥٥- الدينار بالدينار و الدرهم بالدرهم و صاع حنطة بصاع حنطة و صاع شعير بصاع شعير و صاع ملح بصاع ملح لا فضل بين شيء من ذلك .

(صحيح) ( طب ك ) عن أبي أسيد الساعدي. (الإرواء ١٣٣٨)

**٢٥٥٥- دینار بە دینار درهەم بە درهەم ، یەك (( ساع ))[10] چوارمشت گەنم بە یەك ئەندزە گەنم ، ئەندازەیەك جۆ بە ئەندازەیەك جۆ ، ئەندازەیەك خوێ بە ئەندازەیەك خوێ ، بە بێ ئەوەی هیچ جیاوازیەك هەبێت لە نێوانیاندا.**

٢٥٥٦- الدينار بالدينار لا فضل بينهما والدرهم بالدرهم لا فضل بينهما فمن كانت له حاجة بورق فليصطرفهما بذهب ومن كان له حاجة بذهب فليصطرفها بالورق والصرف و هاء وهاء.

(صحيح) ( هـ ك ) عن علي. (الإرواء ١٣٣٧)

**٢٥٥٦- دینار بە دینار بێ زیاد و كەم ، درهەم بە درهەم بێ زیاد و كەم ، ئەگەر كەسێك پێویستی بە زیوو هەبوو با بە ئاڵتون بیگۆڕێتەوە ، هەركەسیش پێویستی بە ئاڵتون هەبوو با بە زیوو بیگۆڕێتەوە ، مامەڵەكەشی بەوە دەبێت : ها بگرە ها بێنە.**

٢٥٥٧- الذهب بالذهب تبره و عينه و الفضة بالفضة تبرها و عينها و البر بالبر مدين بمدين و الشعير بالشعير مدين بمدين و التمر بالتمر مدين بمدين و الملح بالملح مدين بمدين فمن زاد أو ازداد فقد أربى و لا بأس ببيع الذهب بالفضة و الفضة أكثرهما يدا بيد و أما نسيئة فلا و لا بأس ببيع البر بالشعير و الشعير أكثرهما يدا بيد و أما نسيئة فلا.

(صحيح) ( د ن ) عن عبادة بن الصامت. (الإرواء ١٣٣٥)

---

[9] دینار واتە یەك مسقاڵ ئاڵتون، دیرهەم واتە یەك سكەی زیوو.

[10] لەسەر ڕێڕەوی پێشەوا شافعی ساعێك ٢٦٠٠ گرامە، چونكە هەر مودێك ٦٥٠ گرامە و ساعێك چوار مودە.

**٢٥٥٧- ئـاڵتون بـه ئـاڵتون خۆڵەکـەی و خـۆی ، زیـو بـەزیو خۆڵەکـەی و خـۆی ، گـەنم بەگەنم دوو ( مُد ) مشت به دوو مشت ، جۆ به جۆ دوو ( مد ) مشت به دوو خورمـا بـه خورمـا دوو مشت به دوو مشت خوێ بو خوێ دوو مشت به دوو مشت ، هەرکەسێك لـەوه زیـادی کـرد یا داوای زیاتری کرد ئەوه سوو خـۆره ، قـەیناکا ئـاڵتونیش بـه زیـوو بفرۆشـێت زیوەکـه زۆرتـر بێت ، دەست به دەست ، بەڵام دواخراو نەبێت ، قەیناکا گەنم به جۆ بفرۆشـرێت و جۆ که زیاتـر بێت ، دەست به دەست ، بەڵام دواخراو نەبێت.**

٢٥٥٨- الذهب بالذهب مثلا بمثل و الفضة بالفضة مثلا بمثل و التمر بالتمر مثلا بمثل و البر بالبر مثلا بمثل و الملح بالملح مثلا بمثل و الشعير بالشعير مثلا بمثل فمن زاد أو ازداد فقد أربى بيعوا الذهب بالفضة كيف شئتم يدا بيد و بيعوا الشعير بالتمر كيف شئتم يدا بيد.

(صحيح) ( ت ) عن عبادة بن الصامت. (الإرواء ١٣٣٥)

**٢٥٥٨- ئاڵتون به ئاڵتون وەکو یەك، زیو به زیو وەکو یەك ، گەنم به گەنم وەکـو یـەك، خوێ به خوێ وەکو یەك جۆ به جۆ یەك به یەك ، هەرکەسێ لەوه زیاتری کـرد یـان داوای لەوه زیاتری کرد ئەو کەسه سوود خۆره ، ئاڵتوون بـه زیـوو بفرۆشـن چـۆن حـەز دەکـەن، دەست به دەست ، جۆیش به خورما بفرۆشن چۆن حەز دەکەن دەست به دەست.**

٢٥٥٩- الذهب بالذهب و الفضة بالفضة و البر بالبر و الشعير بالشعير و التمر بالتمر و الملح بالملح مثلا بمثل سواء بسواء يدا بيد فإذا اختلفت هذه الأصناف فبيعوا كيف شئتم إذا كان يدا بيد.

(صحيح) ( حم م د هـ ) عن عبادة بن الصامت. (الإرواء ١٣٣٥)

**٢٥٥٩- ئاڵتون به ئاڵتون ، زیو به زیو ، گەنم به گەنم ، جۆ به جۆ ، خورما به خورمـا ، خوێ به خوێ ، وەکو یەك ، بەیەکسانی ، دەست به دەست ، ئەگـەر جیـاوازی دروست بـوو له نێو جۆرەکاندا بفرۆشن بەو شێوەیەی حەز دەکەن بەڵام دەست به دەست.**

٢٥٦٠- الذهب بالذهب و الفضة بالفضة و البر بالبر و الشعير بالشعير و التمر بالتمر و الملح بالملح مثلا بمثل يدا بيد فمن زاد أو استزاد فقد أربى و الآخذ و المعطي سواء.

(صحيح) ( حم م ن ) عن أبي سعيد. (الإرواء ١٣٢٨)

**٢٥٦٠- ئاڵتون به ئاڵتون ، زیو به زیو ، گەنم به گەنم ، جۆ به جۆ ، خورما به خورما ، خوێ به خوێ ، وەکـو یـەك ، دەسـت بـه دەسـت ، هەرکەسـێ لـەوەی زیـاد کـرد یـان داوای زیاتری کرد ، ئەو کەسه سوو خۆره سوو وەرگر و سوودەر بدەر وەکو یەکن .**

٢٥٦١- الذهب بالذهب وزنا بوزن مثلا بمثل و الفضة بالفضة وزنا بوزن مثلا بمثل فمن زاد أو استزاد فهو ربا.

(صحيح) ( حم ن ) عن أبي هريرة. (الإرواء ١٣٢٨)

**٢٥٦١- ئاڵتون بە ئاڵتون کێشانە بە کێشانە ، وەکو یەك ، زیو بە زیو ، کێشانە بە کێشانە، وەکو یەك ، هەرکەسێك زیادی کرد ، یان داوای زیاتری کرد ئەوە سووە .**

٢٥٦٢- الذهب بالورق ربا إلا هاء و هاء و البر بالبر ربا إلا هاء و هاء و التمر بالتمر ربا إلا هاء و هاء و الشعير بالشعير ربا إلا هاء و هاء.

(صحيح) ( مالك ق ) عن عمر. (الإرواء ١٣٣٦)

**٢٥٦٢- ئاڵتون بە زیوو سوودە ، گەنم بە گەنم سوودە ، خورما بە خورما سوودە ، تەنها لەو حاڵەتە نەبێت بڵێیت ها بگرە و ، ها بێنە دەست بە دەست.**

٢٥٦٣- الربا اثنان و سبعون بابا أدناها مثل إتيان الرجل أمه و إن أربى الربا استطالة الرجل في عرض أخيه.

(صحيح) ( طس ) عن البراء. (الصحيحة ١٨٧١)

**٢٥٦٣- سوود حەفتاو دوو دەرگایە ، سووکترینیان وەکو کەسێکە لەگەڵ دایکی خۆی زینا بکات ، خراپترین سوودش دەستدرێژی کەسێکە لەسەر ئابڕوی براکەی.**

٢٥٦٤- الربا ثلاثة و سبعون بابا.

(صحيح) ( هـ ) عن ابن مسعود. (صحيح ابن ماجه ٢٢٧٥)

**٢٥٦٤- سوو ( ربا ) حەفتاو سێ دەرگایە.**

٢٥٦٥- الربا ثلاثة و سبعون بابا أيسرها مثل أن ينكح الرجل أمه و إن أربى الربا عرض الرجل المسلم.

(صحيح) ( ك ) عن ابن مسعود. (الصحيحة ١٨٧١)

**٢٥٦٥- ( سوو ) حەفتاو سێ پلەیە ، سووکترینیان وەکو زیناکردنی کەسێکە لەگەڵ دایکی خۆیدا ، خراپترین سوویش ناموسی پیاوی موسوڵمانە .**

٢٥٦٦- الربا سبعون بابا و الشرك مثل ذلك.

(صحيح) ( البزار ) عن ابن مسعود. (الصحيحة ١٨٧١)

**٢٥٦٦- سوو حەفتاو سێ دەرگایە ، هاوبەش بڕیاردانیش بەهەمان شێوەیە .**

٢٥٦٧- الربا سبعون حوبا أيسرها أن ينكح الرجل أمه.

(صحيح) ( هـ ) عن أبي هريرة. (المشكاة ٢٨٢٦)

**٢٥٦٧- سوود حەفتا تاوانە ، سووكترينيان ئەوەيە كەسێك لەگەڵ دايكی خۆيدا بكات .**

٢٥٦٨- الربا و إن كثر فإن عاقبته تصير إلى قل.

(صحيح) ( ك ) عن ابن مسعود. (المشكاة ٢٨٢٦)

**٢٥٦٨- سوو با هەر چەند زۆريش بێت سەر ئە نجامی هەر بەرەو كەمی يە .**

٢٥٦٩- السلف في حبل الحبلة ربا.

(صحيح) ( حم ن ) عن ابن عباس. (صحيح النسائي ٤٦٢٢)

**٢٥٦٩- قەرز لە بەچكەی وشترا سووە.**

٢٥٧٠- الطعام بالطعام مثلا بمثل .

(صحيح) ( حم م ) عن معمر بن عبدالله. (الإرواء ١٣٤١)

**٢٥٧٠- خۆراك بە خۆراك وەكو يەك .**

٢٥٧١- لعن الله آكل الربا و موكله و شاهده و كاتبه.

(صحيح) ( حم د ت هـ ) عن ابن مسعود. (غاية المرام ٣٤٢)

**٢٥٧١- نەفرينی خوا لە ئەو كەسەی سوو دەخوات و ئەو كەسەی دەيدات و شايەتەكەی و ئەو كەسەيش كە پە يمانەكە دەنوسێت.**

٢٥٧٢- لعن الله آكل الربا و موكله و شاهديه و كاتبه هم فيه سواء.

(صحيح) ( حم م ) عن جابر. (الإرواء ١٣٣٦)

**٢٥٧٢- خوا نەفرينی كردوە لە بخۆری سوو و بدەر و هەردوو شايەتەكەی و، نووسەرەكەی هەمووشيان وەكو يەكن.**

٢٥٧٣- لعن الله الربا و آكله و موكله و كاتبه و شاهده و هم يعلمون و الواصلة و المستوصلة و الواشمة و المستوشمة و النامصة و المتنمصة.

(صحيح) ( طب ) عن ابن مسعود. (الترغيب ٧٥٧)

**٢٥٧٣- خوا نەفرينی كردووە لە سوو و بخۆری و بدەری و نووسەری و شايەتی ، كە پێی بزانن ، هەروەها لەو ئافرەتەيش كە قژی تر دەخاتە سەر قژی خۆی و ، ئەو**

**ئافرەتەیش كە داوای دەكات و ، خاڵكوت و ئەوەی داوا دەكات خاڵی بۆ بكوتن ، ئەو ئافرەتەی برۆی هەڵدەگریٚ و ئەوەش فەرمان بەو كارە دەكات.**

٢٥٧٤- ليأتين على الناس زمان لا يبالي المرء بما أخذ المال ؟ أمن حلال أم من حرام ؟.

(صحيح) ( حم خ ) عن أبي هريرة. (الترغيب ١٧٢٢)

**٢٥٧٤- سەردەمانێك دێت بەسەر خەڵكی دا ، كەس گوێ ناداتیٚ چۆن ماڵ بەدەست بێنێت ؟ بە شێوەیەكی ڕەوا یان ناڕەوا؟**

٢٥٧٥- ما أحد أكثر من الربا إلا كان عاقبة أمره إلى قلة.

(صحيح) ( هـ ) عن ابن مسعود. (الترغيب ١٨٦٣)

**٢٥٧٥- هەركەسێك ببێتە ماڵدار لە ڕێگەی سوومەوە سەر ئەنجامی هەر بۆ نەبوونیە.**

٢٥٧٦- ما ظهر في قوم الربا و الزنا إلا أحلوا بأنفسهم عقاب الله.

(حسن) ( حم ) عن ابن مسعود. (الترغيب ١٨٦٠)

**٢٥٧٦- سوود و داوێنپیسی لەناو هەر كەسانێكدا بڵاوبێتەوە ، حەتمەن خۆیان دەكەنە شایستەی سزای خوا.**

٢٥٧٧- من باع بيعتين في بيعة فله أوكسهما أو الربا.

(حسن) ( د ك ) عن أبي هريرة. (الصحيحة ٢٣٢٦)

**٢٥٧٧- هەركەسێك دوو مامەڵەی لە فرۆشتنێكدا كرد ، كەمەكەیان بۆ خۆیەتی یان دەبێتە سوود .**

٢٥٧٨- نهى عن بيع الحيوان بالحيوان نسيئة.

(صحيح) ( حم ٤ الضياء ) عن سمرة. (المشكاة ٢٨٢٢)

**٢٥٧٨- پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی كردووە فرۆشتنی ئاژەڵ بە ئاژەڵ بە سووی دواخراو .**

٢٥٧٩- نهى عن بيع الذهب بالورق دينا.

(صحيح) ( حم ق ن ) عن البراء وزيد بن أرقم. (الإرواء ١٣٤٧)

**٢٥٧٩- پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی كردووە فرۆشتنی ئاڵتون بە زیو بە قەرز.**

٢٥٨٠- نهى عن بيع الشاة باللحم.

(حسن) ( ك هق ) عن سمرة. (الإرواء ١٣٣٩)

**٢٥٨٠- پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی کردووە فرۆشتنی مەڕ بە گۆشت.**

٢٥٨١- نهى عن بيع الصبرة من التمر لا يعلم مكيلها بالكيل المسمى من التمر.

(صحيح) ( حم م ن ) عن جابر. (المشكاة ٢٨١٦)

**٢٥٨١- پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی کردووە فرۆشتنی بڕێك خورما کەسەنگی زانراو نەبێت بە خورمای کیشانەکراو.**

٢٥٨٢- نهى عن بيع اللحم بالحيوان.

(حسن) ( مالك الشافعي ك ) عن سعيد بن المسيب مرسلا ( البزار ) عن ابن عمر. (الإرواء ١٣٤٠)

**٢٥٨٢- پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی کردووە فرۆشتنی گۆشت بە ئاژەڵ .**

٢٥٨٣- تبايعوا الذهب بالفضة كيف شئتم و الفضة بالذهب كيف شئتم.

(صحيح) ( ن ) عن أبي بكرة . (صحيح النسائي ٤٥٧٩)

**٢٥٨٣- مامەڵەی ئاڵتوون بە زیو بکەن چۆن حەز دەکەن ، هەروەها زیو بە ئاڵتون چۆن پێتان خۆشە.**

٢٥٨٤- الفضة بالفضة و الذهب بالذهب و الشعير بالشعير و الحنطة بالحنطة مثلا بمثل.

(صحيح) ( هـ ) عن أبي هريرة. (صحيح النسائي ٤٥٧٨)

**٢٥٨٤- زیو بە زیو ، ئاڵتون بە ئاڵتون ، جۆ بە جۆ ، گەنم بە گەنم ، وەکو یەك.**

٢٥٨٥- لا تبتاعوا الذهب بالذهب إلا مثلا بمثل و لا زيادة بينهما و لا نظرة.

(صحيح) ( هـ ) عن عبادة بن الصامت. (صحيح ابن ماجه ١٨)

**٢٥٨٥- ئاڵتون بە ئاڵتون مەکڕن وەکو یەك نەبێت ، نە زیادە و نە چاوەڕوانی و دواخستن لە نێواندا نەبێت.**

٢٥٨٦- لا تبيعوا الذهب بالذهب إلا سواء بسواء و الفضة بالفضة إلا سواء بسواء و بيعوا الذهب بالفضة و الفضة بالذهب كيف شئتم.

(صحيح) ( خ ) عن أبي بكرة. (الإرواء ١٣٤٦)

**٢٥٨٦- ئاڵتون بە ئاڵتون مەفرۆشن وەکو یەك نەبن ، زیویش بە زیو ئەگەر وەك یەك نەبن ، بەڵام ئاڵتون بفرۆشن بە زیوو ، زیویش بە ئاڵتون چۆن حەز دەکەن.**

٢٥٨٧- لا تبيعوا الذهب بالذهب إلا مثلا بمثل و لا تشفوا بعضها على بعض و لا تبيعوا الورق بالورق إلا مثلا بمثل و لا تشفوا بعضها على بعض و لا تبيعوا منها غائبا بناجز.

(صحيح) ( حم ق ت ن ) عن أبي سعيد. (الإرواء ١٣٢٨)

**٢٥٨٧- ئاڵتون بە ئاڵتون مەفرۆشن وەكو یەك نەبن، هیچیان با هەندێكیان زیاد نەبێت لەوی تر، زیوو بە زیوو مەفرۆشن ئەگەر وەك یەك نەبن ، با هیچیان لوی تر زیاد نەبێت، شتێكی ئامادە نەبوو مەفرۆشن بە شتێكی ئامادە.**

٢٥٨٨- لا تبيعوا الذهب بالذهب إلا وزنا بوزن.

(صحيح) ( م د ) عن فضالة بن عبيد. (الإرواء ١٣٣٩)

**٢٥٨٨- ئاڵتون بە ئاڵتون مەفرۆشن كێش بە كێش نەبێت .**

٢٥٨٩- لا تبيعوا الذهب بالذهب و لا الورق بالورق إلا وزنا بوزن مثلا بمثل سواء بسواء.

(صحيح) ( حم م ) عن أبي سعيد. (الإرواء ١٣٢٨)

**٢٥٨٩- ئاڵتون بە ئاڵتون مەفرۆشن و ، زیو بە زیو مەفرۆشن ، تاكو كێش بە كێش نەبێت و ، وەكو یەك نەبێت.**

٢٥٩٠- من كان يؤمن بالله و اليوم الآخر فلا يأخذن إلا مثلا بمثل - يعني الذهب بالذهب -.

(صحيح) ( م ) عن فضالة بن عبيد.

**٢٥٩٠- هەركەسێك باوەڕی هەبێت بەخوا و ڕۆژی دوایی با وەری نەگرێت ئەگەر وەكو یەك نەبن واتە : ئاڵتوون.**

٢٥٩١- لا بأس بالحيوان واحد باثنين يدا بيد.

(صحيح) ( حم هـ ) عن جابر. (الصحيحة ٢٤١٦)

**٢٥٩١- قەیناكا فرۆشتنی ئاژەڵێك بە دووان ، دەست بە دەست .**

٢٥٩٢- لا بأس بالقمح بالشعير اثنين بواحد يدا بيد.

(صحيح) ( طب ) عن عبادة.

**٢٥٩٢- خراپ نیە فرۆشتنی گەنم بە جۆ ، یەك بە دوو ، دەست بە دەست.**

٢٥٩٣- لا تباع الصبرة من الطعام بالصبرة من الطعام و لا الصبرة من الطعام بالكيل المسمى من الطعام.

(صحيح) ( ن ) عن جابر. (المشكاة ٢٨١٦)

**٢٥٩٣- ڕەوا نی یە ڕێك خۆراك بفرۆشرێت بە بڕێك خۆراكی تر بە بڕ ، بە هەمان شێوە بڕێك خۆراك بە خۆراكی كێشانەكراو .**

٢٥٩٤- لا تبيعوا الدينار بالدينارين و لا الدرهم بالدرهمين.

(صحيح) ( م ) عن عثمان.

**٢٥٩٤- دینارێك به دوو دینار مەفرۆشن ، یان درهەمێك دوو درهەم.**

٢٥٩٥- لا تفعل بع الجميع بالدراهم ثم ابتع بالدراهم جنيبا.

(صحيح) ( ق ن ) عن أبي سعيد وأبي هريرة. (الإرواء ١٣٢٩)

**٢٥٩٥- ئەو کارە مەکە ، هەمووی به زیو بفرۆشە و دوایی بەدرهەمە زیوەکان خورما بکڕە.**

٢٥٩٦- لا ربا فيما كان يدا بيد.

(صحيح) ( حم ق ن هـ ) عن أسامة بن زيد. (الإرواء ١٣٢٧)

**٢٥٩٦- سوو نیە لە مامەڵەیەکدا دەست بە دەست بێت.**

٢٥٩٧- لا صاعي تمر بصاع و لا صاعي حنطة بصاع و لا درهمين بدرهم.

(صحيح) (ن حب) عن أبي سعيد. (الصحيحة ٣٥٧٤)

**٢٥٩٧- نابێت دوو ( ساع )[11] خورما بدرێت بە ئەندازەیەك ، یان دوو ئەندازە گەنم بە ئەندازەیەك ، یان دوو درهەم بە درهەمێك.**

٢٥٩٨- لا صاعين بصاع و لا درهمين بدرهم.

(صحيح) ( ق ن ) عن أبي سعيد. (الصحيحة ٣٥٧٤)

**٢٥٩٨- نە دوو ساع بە ساعێك ، نە دوو درهەمیش بە درهەمێك.**

٢٥٩٩- لا يصلح صاع من تمر بصاعين و لا درهم بدرهمين و الدرهم بالدرهم و الدينار بالدينار لا فضل بينهما إلا وزنا

(صحيح) ( هـ ) عن أبي سعيد. (الصحيحة ٣٥٧٤)

**٢٥٩٩- ناگونجێ ئەندازەیەك ( ساعێك ) خورما بە دوو ئەندازە( ساع ) ، یان درهەمێك زیو و بە دوو درهەم زیو و، درهەم بە درهەم و ، دینار بە دینار ، هیچ زیادەیەك نەبێت لە نێوانیاندا کێشانە نەبێت .**

---

[11] **هەر ساعێك چوار مشتە ، هەر مشتێکیش ٦٥٠ گرامە.**

# بابەتی سەلەم و قەرز و بارمتە

٢٦٠٠- الرهن مركوب و محلوب.

(صحيح) ( ك هب ) عن أبي هريرة. (الإرواء ١٣٩٨)

**٢٦٠٠- بارمتە كراو دەكرێت سوار بن و بیدۆشن بە ئەندازەی خزمەتكردن بدۆشرێت .**

٢٦٠١- الرهن يركب بنفقته و يشرب لبن الدر إذا كان مرهونا.

(صحيح) ( خ ) عن أبي هريرة. (الإرواء ١٣٩٨)

**٢٦٠١- ئەو ئاژەڵەی بارمتەكراوە دەكرێت سواری بن بەئەندازەی خزمەتكردی ببڕێت و دەكرێ شیری بخورێت ئەگەر بارمتەكرابێت.**

٢٦٠٢- الظهر يركب بنفقته إذا كان مرهونا و لبن الدر يشرب بنفقته إذا كان مرهونا و على الذي يركب و يشرب النفقة .

(صحيح) ( خ ت هـ ) عن أبي هريرة. (الإرواء ١٣٩٨)

**٢٦٠٢- پشتی وڵاخی بارمتە بەئەندازەی بەخێو كردنی سواری دەبن ، شیریشی دەخورێت ئەگەر بەخێو بكرێت و بارمتە كراو بێت ، ئەو كەسەی سواری دەبێت و شیری دەخوات پێویستە خەرجیشی لەسەر بكات.**

٢٦٠٣- لبن الدر يحلب بنفقته إذا كان مرهونا و الظهر يركب بنفقته إذا كان مرهونا و على الذي يركب و يحلب النفقة.

(صحيح) ( د ) عن أبي هريرة. (الإرواء ١٣٩٨)

**٢٦٠٣- شیر دەدۆشرێت لەو وڵاخەی بارمتە كراوە ئەگەر بۆی خەرج بكرێت ، سواربوونیشی هەر ڕەوایە بە پێی ئەو خەرجییەی بۆی دەكرێت ئەگەر بارمتە كراو بێت ، ئەو كەسەی سواری دەبێت و شیرەكەی دەخوات پێویستە بەخێویشی بكات.**

٢٦٠٤- كل قرض صدقة.

(حسن) ( طس حل ) عن ابن مسعود. (الترغيب ٨٩٩)

**٢٦٠٤- هەموو قەرزێك خێرە .**

٢٦٠٥- من أسلف في شيء فليسلف في كيل معلوم و وزن معلوم إلى أجل معلوم.

(صحيح) ( حم ق ٤ ) عن ابن عباس. (الإرواء ١٣٦٥)

**٢٦٠٥- ئەگەر كەسێك قەرزى دا با بيدات بە پێوانە و كێشانەى دياريكراو، تا كاتێكى دياريكراو.**

٢٦٠٦- أتدرون ما المفلس ؟ إن المفلس من أمتي من يأتي يوم القيامة بصلاة و صيام و زكاة و يأتي قد شتم هذا و قذف هذا و أكل مال هذا و سفك دم هذا و ضرب هذا فيعطى هذا من حسناته و هذا من حسناته فإن فنيت حسناته قبل أن يقضى ما عليه أخذ من خطاياهم فطرحت عليه ثم طرح في النار.

(صحيح) ( حم ت ) عن أبي هريرة . (الصحيحة ٨٤٧)

**٢٦٠٦- ئايا دەزانن كێ مايە پوچە ؟ مايە پوچ لەئومەتى من ئەو كەسەيە لە ڕۆژى قيامەت دا دێت نوێژى كردووە و ڕۆژووى كردووە و زەكاتى داوە، بەڵام جنێوى بە ئەو داوە و ، بوختانى بۆ ئەو كردووە و ، ماڵى ئەوى خواردووە وە خوێنى ئەوى ڕژاندووە و ، لە ئەوى داوە . ئيتر لە چاكەكانى بەشى ئەوانە دەدرێت ، و بەشى ئەو بدرێت، ئەگەر چاكەكانيشى تەواو بوو پێش ئەوەى مافى خەڵكى بيداتەوە ، لە گوناهەكانيان وەردەگيردرێت و دەخرێتە سەرى ، دواى ئەوەش دەخرێتە دۆزەخەوە.**

٢٦٠٧- أتى الله عز و جل بعبد من عباده آتاه الله مالا فقال له: ماذا عملت في الدنيا ؟ فقال: ما عملت من شيء يا رب إلا أنك آتيتني مالا فكنت أبايع الناس و كان من خلقي أن أيسر على الموسر و أنظر المعسر قال الله تعالى: أنا أحق بذلك منك تجاوزا عن عبدي.

(صحيح) ( ك ) عن حذيفة وعقبة بن عامر وأبي مسعود الأنصاري . (المشكاة ٢٧٩١)

**٢٦٠٧- خوا بەندەيەك لە بەندە دەوڵەمەندەكانى خۆى هێناو پێى فەرموو : لە دونيا چيت كردووە ؟ وتى : هيچم نەكردووە خوايە ، بەڵام تۆ تۆ ماڵت دابومێ و منيش شتم بە خەڵكى دەفرۆشت و يەكێ لە ڕەوشتەكانيشم ئەوە بوو ئاسانكاريم دەكرد بۆ دەوڵەمەند و مۆڵەتم دەدايە هەژار ، خواى گەورە فەرمووى لەو خاتر گرتنەدا لە تۆ شايستە ترم چاوپۆشى لە بەندەكەم بكەن.**

٢٦٠٨- إن أخاك محبوس بدينه فاقض عنه.

(صحيح) ( حم هـ هق ) عن سعد بن الأطول . (المشكاة ٢٩٢٨)

**٢٦٠٨- براكەت دەستى بەسراوە بەهۆى قەرزەكانى يەوە ، قەرزەكانى بۆ بدەرەوە.**

٢٦٠٩- إن السلف يجري مجرى شطر الصدقة.

(صحيح) ( حم ) عن ابن مسعود . (الصحيحة ١٥٥٣)

**٢٦٠٩- قەرزدان بە نیوەی خێر دەچێت.**

٢٦١٠- إن الله تعالى مع الدائن حتى يقضي دينه ما لم يكن دينه فيما يكره الله.

(صحيح) ( تخ هـ ك ) عن عبدالله بن جعفر . (الصحيحة ١٠٠٠)

**٢٦١٠- خوای گەورە لەگەڵ خاوەن قەرزدایە تا قەرزەكەی دەدرێتەوە ، ئەگەر قەرزەكەی لە شتێكدا نەبێت خوا پێی ناخۆش بێت.**

٢٦١١- إن خيار عباد الله الموفون المطيبون.

(صحيح) ( طب حل ) عن أبي حميد الساعدي ( حم ) عن عائشة . (الروض ٩٣٧)

**٢٦١١- چاكترین بەندەكانی خوا ئەوانەن بە ئەمەكن ئەوەی كە پەیمانیان لەسەری داوە بە خواو ، بۆنخۆشەكان[١٢].**

٢٦١٢- إن خياركم أحسنكم قضاء.

(صحيح) ( حم خ ن هـ ) عن أبي هريرة . (صحيح النسائي ٤٦١٨)

**٢٦١٢- چاكترینتان ئەوانەن قەرزەكانیان بەباشی دەدەنەوە**

٢٦١٣- إن رجلا لم يعمل خيرا قط و كان يداين الناس فيقول لرسوله: خذ ما تيسر و اترك ما عسر و تجاوز لعل الله أن يتجاوز عنا فلما هلك قال الله: هل عملت خيرا قط ؟ قال: لا إلا أنه كان لي غلام و كنت أداين الناس فإذا بعثته يتقاضى قلت له: خذ ما تيسر و اترك ما عسر و تجاوز لعل الله أن يتجاوز عنا قال الله: قد تجاوزت عنك.

(صحيح) ( ن حب ك ) عن أبي هريرة . (الترغيب ٩٠٥)

**٢٦١٣- پیاوێك كە هەرگیز چاكەی نەكرد بوو ، قەرزی بە خەڵكی دەدا و بە نێردراوەكەی دەوت: ئەوەی توانای هەبوو لێ ی وەرگرەوە ، ئەوەش توانای نەبوو وازی لێبهێنە و چاو پۆشی لێ بكە بەڵكو خوا چاو پۆشیمان لێ بكات ، بەڵكو خوا لێمان خۆش بێت ، كاتێك مرد خوای گەورە پێی فەرموو : هیچ چاكەت كردووە ، وتی: نەخێر ! بەڵام خولامێكم هەبووە منیش كەسێك بووم قەرزم دەدایە خەڵكی جا كە دەمنارد داوای قەرزەكان بكاتەوە ، پێم دەوت : ئەوەی لە توانایاندا بوو وەریگرەوە و، ئەوانەش نیانە چاوپۆشیمان لێ بكات ، بەڵكو خوای گەورە چاوپۆشیمان لێ بكات ، خوای پەروەردگار فەرمووی: ئەوا وازم لێ هێنای .**

[١٢] پەیماننامەكەی بۆنخۆشەكان (( حلف المطيبين )) لەسەردەمی نەفامیدا بەستراو پێغەمبەریش بەشدار بوو بۆ یارمەتی و پشتگیری لێقەوماو.

٢٦١٤- إن رجلا ممن كان قبلكم أتاه ملك الموت ليقبض نفسه فقال له: هل عملت من خير ؟ قال: ما أعلم قال له: انظر قال: ما أعلم شيئا غير أني كنت أبايع الناس و أحارفهم فأنظر المعسر و أتجاوز عن الموسر فأدخله الله الجنة.

(صحيح) ( حم ق هـ ) عن حذيفة وأبي مسعود . (الترغيب ٩٠٤)

**٢٦١٤- پیاوێك لەوانەی کە پێش ئێوە بوون ، فریشتەی مردن هاتە لای بۆ گیان کێشانی و پێی وت : هیچ چاکەیەکت کردووە ؟ وتی : وا نازانم . پێی وت : بڕوانە . وتی : هیچم نەکردووە ئەوە نەبێت شتم بە خەڵکی دەفرۆشت و مامەڵەم لەگەڵ دەکردن بە جوانی و مۆڵەتی کەم دەستتم دەداو ، وازم لە چاوپۆشیم ساماندارم دەکرد ، ئیتر خوای گەورە خستیە بەهەشتەوە.**

٢٦١٥- إن رجلا من بني إسرائيل سأل بعض بني إسرائيل أن يسلفه ألف دينار فقال: ائتني بالشهداء أشهدهم فقال: كفى بالله شهيدا قال: فأتني بالكفيل قال: كفى بالله و كيلا قال: صدقت فدفعها إليه إلى أجل مسمى فخرج في البحر فقضى حاجته ثم التمس مركبا يركبها يقدم عليه للأجل الذي أجله فلم يجد مركبا فأخذ خشبة فنقرها فأدخل فيها ألف دينار و صحيفة منه إلى صاحبه ثم زج موضعها ثم أتى بها إلى البحر فقال: اللهم إنك تعلم أني تسلفت فلانا ألف دينار فسألني كفيلا فقلت: كفى بالله و كيلا فرضي بك و سألني شهيدا فقلت: كفى بالله شهيدا فرضي بك و إني جهدت أن أجد مركبا أبعث إليه الذي له فلم أجد و إني أستودعكها فرمى بها إلى البحر حتى ولجت فيه ثم انصرف و هو في ذلك يلتمس مركبا يخرج إلى بلده فخرج الرجل الذي كان أسلفه ينظر لعل مركبا قد جاء بماله فإذا بالخشبة التي فيها المال فأخذها لأهله حطبا فلما نشرها وجد المال و الصحيفة ثم قدم الذي كان أسلفه فأتى بالألف دينار و قال: و الله ما زلت جاهدا في طلب مركب لآتيك بمالك فما وجدت مركبا قبل الذي أتيت فيه قال: هل كنت بعثت إلي شيئا ؟ قال: أخبرك أني لم أجد مركبا قبل الذي جئت فيه قال: فإن الله قد أدى عنك الذي بعثت في الخشبة فانصرف بالألف دينار راشدا.

(صحيح) ( حم خ ) عن أبي هريرة . (الصحيحة ٢٨٤٥)

**٢٦١٥- پیاوێك لە بەنی ئیسرائیل داوای کرد لە بەنی ئیسرائیلیەك هەزار دیناری بەقەرز بداتێ ، ئەویش وتی : شایەتم بۆ بێنە ، شایەتی ئەم قەرزە بن ، وتی : خوای گەورە بەسە بۆ شایەتی ، وتی : کەواتە دەستەبەرم بۆ بهێنە ، وتی : خوای گەورە**

**باشترین بریکاره ، وتی : ڕاست دەکەیت ، ئیتر پارەکەی پێدا بۆ کاتێکی دیاری کراو ، ئەویش دەرچوو بۆ دەریاو کاری خۆی بە ئەنجام گەیاند ، ئینجا بە دوای بەلەمێکدا گەڕا بۆ ئەوەی سواری بێت بۆ لای خاوەن قەرز و قەرزەکەی بداتەوە ، بەلەمی دەست نەکەوت و ، پارچە دارێکی هێنا و کونی کرد و هەزار دینارەکەی تێ کرد و نامەیەکیشی تێکرد بۆ ئەو خاوەن قەرزەکە ، قایمی کرد و هاتە لای دەریاو ، وتی : خوایە تۆ ئاگاداری هەزار دینارم لە فلانە کەس قەرز کرد و ئەویش داوای دەستەبەری لێکردم و ، وتم: خوای گەورە چاکترین بریکارە و ئەویش ڕازی بوو ، داوای شایەتی لێکردم و ، وتم: خوای گەورە بەسە بۆ شایەتی ئەویش بە تۆ ڕازی بوو، منیش هەوڵم دا بەلەمێك پەیدا بکەم پارەکەی بۆ بنێرم و دەستم نەکەوت ، ئێستاش بەتۆ دەسپێرم و فڕەی دایە نێو دەریاکە و نگرۆ بوو تیایدا، دوای ئەوە ڕۆیشت بگەڕێت بە دوای بەلەمێکدا بیگێڕێتەوە بۆ شارەکەی خۆی ، خاوەن قەرزەکەیش دەرچوو بۆ لای دەریا بەڵکو کەشتیەك بێت و پارەکەی پێ بێت ، ئیتر دارەکەی بینی کە پارەکەی تیا بوو ، ئەویش وەکو سووتەمەنی بردییەوە بۆ ماڵی خۆی ، کاتێك تەماشای کرد پارەکە و نامەیەکی تیادایە ، لە پاش ئەوە قەرزارەکە هاتە لای و هەزار دینارەکەی بۆ هێناو ، وتی : سوێند بەخوا بەردەوام هەوڵم دەدا بۆ کەشتیەك قەرزەکەت بۆ بگێڕمەوە بەڵام پێش ئەم کەشتیەی کە پێی هاتم هیچ دەستنەکەوت ، پێی وت : ئایا تۆ هیچت بۆ من ناردبوو ؟ وتی: پێت دەڵێم کەشتیم دەست نەدەکەوت پێش ئەم کەشتەی پێی هاتم ، وتی : کەواتە خوای گەورە لە جیاتی تۆ قەرزەکەی دایەوە لەناو ئەو دارەدا ، ئەویش بە هەزار دینارەکەی گەڕایەوە بە ڕاستگۆیی.**

٢٦١٦- إن لصاحب الحق مقالا.

(صحيح) ( حم ) عن عائشة ( حل ) عن أبي حميد الساعدي . (الروض النضير ٩٣٧)

**٢٦١٦- خاوەن ماف قسەی سوارە.**

٢٦١٧- إنما جزاء السلف الحمد و الوفاء.

(صحيح) ( حم ن هـ ) عن عبدالله بن أبي ربيعة . (المشكاة ٢٩٢٦)

**٢٦١٧- پاداشتی قەرز سوپاس و ئەمەکە .**

٢٦١٨- أيما رجل تدين دينا و هو مجمع أن لا يوفيه إياه لقي الله سارقا.

(حسن) ( هـ ) عن صهيب . (الترغيب ١٨٠٢)

**٢٦١٨- هەرکەسێك قەرزێك بکات و بڕیاری دابێت نەیداتەوە ، وەکو دز دەچێتە لای خوای گەورە .**

٢٦١٩- الآن حين بردت عليه جلده.

(حسن) ( حم قط ك ) عن جابر . (الجنائز ١٦)

**٢٦١٩- ئێستا كه پێستەكەی سارد بۆتەوە .**

٢٦٢٠- حرمة مال المسلم كحرمة دمه.

(حسن) ( حل ) عن ابن مسعود . (غاية المرام ٣٤١)

**٢٦٢٠- ڕەوا نەبوونی ماڵی موسوڵمان ، وەكو ڕەوا نەبوونی خوێنێتی .**

٢٦٢١- حوسب رجل ممن كان قبلكم فلم يوجد له من الخير شيء إلا أنه كان رجلا موسرا و كان يخالط الناس و كان يأمر غلمانه أن يتجاوزوا عن المعسر فقال الله عز و جل لملائكته: نحن أحق بذلك منه تجاوزوا عنه.

(صحيح) ( خد ت ك هب ) عن أبي مسعود . (الترغيب ٩٠٦)

**٢٦٢١- پیاوێك لەوانەی پێش ئێوە بوون لێپرسینەوەی لەگەڵ كرا ، هیچ چاكەیەكی نەبوو ، ئەوە نەبێت پیاوێكی ساماندار بوو ، مامەڵەی لەگەڵ خەڵكی دەكرد و تێكەڵاویان دەبوو ، فەرمانیشی دەكرد بە غولامەكانی چاوپۆشی بكەن لە نەدارەكان ، خوای گەورەیش بە فریشتەكانی فەرموو : ئێمە شایستە ترین لەو بەو كارە ، چاوپۆشی لێ بكەن.**

٢٦٢٢- الدين دينان فمن مات و هو ينوي قضاءه فأنا وليه و من مات و لا ينوي قضاءه فذاك الذي يؤخذ من حسناته ليس يومئذ دينار و لا درهم.

(صحيح) ( طب ) عن ابن عمر . (الجنائز ٥)

**٢٦٢٢- قەرز دوو قەرزە ، هەركەسێ مرد و نیازی دانەوەی قەرزەكەی هەبوو ، من بەرپرسیارم لەقەرزەكەی، هەركەسیش مرد و نیازی نەبوو بیداتەوە. ئەوە ئەو كەسەیە كە لە چاكەكانی وەردەگیردرێت و لەو ڕۆژەدا نە دینار هەیە و نە درهەم .**

٢٦٢٣- سبحان الله ماذا أنزل من التشديد في الدين و الذي نفسي بيده لو أن رجلا قتل في سبيل الله ثم أحيي ثم قتل ثم أحيي ثم قتل و عليه دين ما دخل الجنة حتى يقضى عنه دينه.

(حسن) ( حم ن ك ) عن محمد بن جحش. (الجنائز ١٠٧)

**٢٦٢٣- پاكی و بێگەردی بۆ خوای گەورە ! ئای چی دابەزاندووە دەربارەی سەختی قەرز ، سوێند بەو كەسەی گیانی منی بەدەستە ، ئەگەر كەسێك لە پێناوی خوادا بكوژرایە و ، زیندوو كرایەوە و بكوژرایەوە و زیندوو بكرایەوە و ، جارێكی تر بكوژرایەوە و ، قەرزدار بووایە ، نەدەچووە بەهەشتەوە تاكو قەرزەكانی بۆ نەدرێتەوە .**

٢٦٢٤- كان رجل يداين الناس فكان يقول لفتاه: إذا أتيت معسرا فتجاوز عنه لعل الله أن يتجاوز عنا فلقي الله فتجاوز عنه.

(صحيح) ( حم ق ن ) عن أبي هريرة. (الترغيب ٩٠٥)

**٢٦٢٤- پياوێك هەبوو قەرزی دەدايە خەڵكی و بە غوڵامەكەی دەوت : ئەگەر چويتە لای نەدارێك چاوپۆشی لێبكە ، بەڵكو خوای گەورە لێمان خۆش بێت ، ئيتر كاتێك گەيشتە لای خوای گەورە چاوپۆشی لیٚ كرد.**

٢٦٢٥- ما من أحد يدان دينا يعلم الله منه أنه يريد قضاءه إلا أداه الله عنه في الدنيا.

(صحيح) ( حم ن حب ) عن ميمونة. (الترغيب ١٧٩٩)

**٢٦٢٥- هيچ كەسێك نيە قەرزدار بێت و خوای گەورەش دەوانێت ئەو كەسە بە تەمايە قەرزەكەی بداتەوە ، خوای گەورە خۆی قەرزەكەی بۆ ئەداتەوە .**

٢٦٢٦- ما من عبد كانت له نية في أداء دينه إلا كان له من الله عون.

(صحيح) ( حم ك ) عن عائشة. (الترغيب ١٨٠١)

**٢٦٢٦- هەر بەندەيەك نيازی هەبوو قەرزەكەی بداتەوە ، حەتمەن لەلای خواوە پشتيوانی دەكرێت.**

٢٦٢٧- ما من مسلم يقرض مسلما قرضا مرتين إلا كان كصدقتها مرة.

(صحيح) ( هـ ) عن ابن مسعود. (الصحيحة ١٥٥٣)

**٢٦٢٧- هەر موسوڵمانێك قەرز بداتە موسوڵمانێك دوو جار ، وەكو جارێك فێری پیٚ كردبێت وايە.**

٢٦٢٨- مطل الغني ظلم فإذا أتبع أحدكم على مليء فليتبع.

(صحيح) ( ق ) عن أبي هريرة. (الإرواء ١٤٠٧)

**٢٦٢٨- دەستی پیٚ كردنی دەوڵەمەند لە دانەوەی قەرز ستەمە ، ئەگەر كەسێك لە ئێوە حەواڵەی لای دەوڵەمەندێك كرا بۆ وەرگرتنی قەرزەكەی با شوێنی بكەوێت .**

٢٦٢٩- مطل الغني ظلم و إذا أحلت على مليء فاتبعه.

(صحيح) ( هـ ) عن ابن عمر. (المشكاة ٢٩٠٧)

**٢٦٢٩- دەستی پیٚ كردنی قەرز نەدانەوەی دەوڵەمەند ستەمە ، ئەگەريش ڕەوانە كرای بۆ لای دەوڵەمەندێك با بڕوا.**

٢٦٣٠- لي الواجد يحل عرضه و عقوبته.

(حسن) ( حم د ن هـ ك ) عن الشريد بن سويد. (الإرواء ١٤٢٤)

**٢٦٣٠- قەرز كوێری دەوڵەمەند ، ئابڕو چوون و سزای بۆ ڕەوا دەبینێت.**

٢٦٣١- من أخذ أموال الناس يريد أداءها أدى الله عنه و من أخذها يريد إتلافها أتلفه الله.

(صحيح) ( حم خ هـ ) عن أبي هريرة. (المشكاة ٢٩١٠)

**٢٦٣١- هەركەسێ ماڵی خەڵكی وەربگرێت و، بیەوێت بیگێڕێتەوە ، خوای گەورە لە جیاتی دەیداتەوە ، هەركەسیش بیبات بیەوێت لەناوی بەرێت ، خوای گەورە لەناوی دەبات.**

٢٦٣٢- من أخذ دينا و هو يريد أن يؤديه أعانه الله.

(صحيح) ( ن ) عن ميمونة. (الصحيحة ١٠٢٩)

**٢٦٣٢-هەركەسێك عەرزێك وەربگرێت و بیەوێت بیداتەوە ، خوای گەورە كۆمەكی دەكات.**

٢٦٣٣- من ادان دينا ينوي قضاءه أداه الله عنه ( يوم القيامة ) .

(صحيح) ( طب ) عن ميمونة. (الترغيب ١٧٩٩)

**٢٦٣٣- هەركەسێك قەرزێكی كرد نیازی دانەوەی هەبێت خوای گەورە لە جیاتی ئەو دەیداتەوە.**

٢٦٣٤- من أقرض ورقا مرتين كان كعدل صدقة مرة.

(صحيح) ( هق ) عن ابن مسعود. (الصحيحة ١٥٥٢)

**٢٦٣٤- هەركەسێك دووجار زیوی بەقەرز دا ، بەرانبەر ئەوەیە یەكجاریان بە فێر دابێتیە.**

٢٦٣٥- من أنظر معسرا أو وضع عنه أظله الله في ظله يوم لا ظل إلا ظله.

(صحيح) ( حم م ) عن أبي اليسر. (الروض ٨٤٤)

**٢٦٣٥- هەركەسێك چاوەڕوانی كرد لە هەژارێك ، یان هەر قەرزەكەی لەسەر لابرد ، خوای گەورە دەیخاتە ژێر سێبەری خۆیەوە ، لە ڕۆژێكدا كە جگە لەو سێبەرەی خوای گەورە هیچ سێبەرێكی تر نی یە .**

٢٦٣٦- من أنظر معسرا أو وضع له أظله الله يوم القيامة تحت ظل عرشه يوم لا ظل إلا ظله.

(صحيح) ( حم ت ) عن أبي هريرة. (الترغيب ٩٠٩)

**٢٦٣٦- هەركێ مۆڵەتی قەرزارێكی نەدار بدات ، یان قەرزەكەی لەسەر لابات ، خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەت دا ، دەیخاتە ژێر سێبەری عەرشی خۆی لە ڕۆژێكدا سایە و سێبەر نیە لە سایەو سێبەری خۆی زیاتر .**

٢٦٣٧- من أنظر معسرا فله بكل يوم مثله صدقة قبل أن يحل الدين فإذا حل الدين فأنظره فله بكل يوم مثلاه صدقة.

(صحيح) ( حم هـ ك ) عن بريدة. (الصحيحة ٨٦)

**٢٦٣٧- هەرکەسێك مۆڵەتی قەرزارێکی دەست کورت بدات ، هەموو ڕۆژێك بەئەندازەی ڕۆژەکەی خێری بۆ دەژمێردرێت ، پێش ئەوەی کاتی دانەوەی قەرزەکە بێت ، پاش هاتنی کاتەکە ئەگەر مۆڵەتی بدات ، هەموو ڕۆژێك بە دوو بەرانبەر خێری بۆ دەژمێردرێت .**

٢٦٣٨- من طلب حقا فليطلبه في عفاف واف أو غير واف.

(صحيح) ( هـ حب ك ) عن ابن عمر وعائشة. (الترغيب ١٧٥٦)

**٢٦٣٨- کەسێك داوای مافی خۆی بکات با لە پاکی دا داوای بکات ، ئیتر بۆی بچێتە سەر یان نا.**

٢٦٣٩- من مات و عليه دينار أو درهم قضي من حسناته ليس ثم دينار و لا درهم.

(صحيح) ( هـ ) عن ابن عمر. (الجنائز ٥)

**٢٦٣٩- هەرکەسێك بمرێت و دینارێك قەرزی لەسەر بێت یان درهەمێك ، لە چاکەکانی دەدرێتەوە ، لەوێیش نە دینار هەیە و نە درهەم.**

٢٦٤٠- من نفس عن غريمه أو محا عنه كان في ظل العرش يوم القيامة.

(صحيح) ( حم م ) عن أبي قتادة. (الترغيب ٩١١)

**٢٦٤٠- هەرکەسێ دووری خێر لە قەرزارەکەی بکاتەوە ، یان لەسەری لابەرێت ، لە سایەو سێبەری عەرشی خوای پەروەردگار دەبێت .**

٢٦٤١- من يسر على معسر يسر الله عليه في الدنيا و الآخرة.

(صحيح) ( هـ ) عن أبي هريرة. (الترغيب ٩٠٢)

**٢٦٤١- هەرکەسێك کار ئاسانی بۆ نەدارێك بکات ، خوای گەورە لە دونیا و دواڕۆژدا کار ئاسانی بۆ دەکات.**

٢٦٤٢- خياركم أحسنكم قضاء للدين.

(صحيح) ( ت ن ) عن أبي هريرة . . (المشكاة ٢٩٠٦)

**٢٦٤٢- چاکترینیان ئەو کەسەیە قەرزەکەی بە چاکی دەداتەوە.**

٢٦٤٣- خير الناس خيرهم قضاء.

(صحيح) ( هـ ) عن عرباض بن سارية . (صحيح ابن ماجه ٢٢٨٦)

**٢٦٤٣- چاکترین خەڵك ئەوان بە جوانی قەرزەکانیان دەدەنەوە .**

٢٦٤٤- خيركم خيركم قضاء.

(صحيح) ( ن ) عن عرباض . (الإرواء ١٣٨٨)

**٢٦٤٤- چاكترينتان ئەوەتانە كە قەرز بەباشى دەداتەوە.**

٢٦٤٥- هاهنا أحد من بني فلان ؟ إن صاحبكم مأسور بدينه.

(صحيح) ( حم د ) عن سمرة. (الجنائز ١٥)

**٢٦٤٥- ئايا لێرە كەسێك هەيە لە نەوەى فلانە كەس ؟ بەڕاستى ئەو ديلى قەرزەكانيەتى[13] ديلە ، بە قەرزەكەيەوە.**

٢٦٤٦- لا تخيفوا أنفسكم بالدين.

(حسن) ( هق ) عن عقبة بن عامر. (الصحيحة ٢٤٢٠)

**٢٦٤٦- خۆتان مەترسێنن لە قەرز.**

٢٦٤٧- دعوه فإن لصاحب الحق مقالا.

(صحيح) ( خ ت ) عن أبي هريرة .

**٢٦٤٧- لێى گەڕێن ، چونكە خاوەن هەق قسەى سوارە .**

## بابەتى نابوت بونى و ڕێليگرتن

٢٦٤٨- أيما امرئ مات و عنده مال امرئ بعينه اقتضى منه شيئا أو لم يقتض فهو أسوة الغرماء.

(صحيح) ( هـ ) عن أبي هريرة . (الإرواء ١٤٣٢)

**٢٦٤٨- هەركەسێك بمرێت و ماڵى كەسێكى لابێت ، داواى بكات ، يان داواى نەكات ، وەكو يەكێكە لە قەرزارەكان[14].**

٢٦٤٩- أيما رجل أفلس و وجد رجل سلعته عنده بعينها فهو أولى بها من غيره.

(صحيح) ( ت ن ) عن أبي هريرة . (الإرواء ١٤٣٢)

**٢٦٤٩- هەر پياوێك موفليس بێت و كەسێك كەل و پەلەكەى خۆى لە لاى دۆزييەوە خۆى لە پێشترە بەو كەل و پەلە لە كەسێكى تر .**

[13] واتە : ئەو پياوە شەهيد بووە و قەرزدار بووە لەدەرگاى بەهەشتدا ڕاگيراوە ناهێلن بچێتە ژوورەوە بەهۆى قەرزەكانيەوە. السراج المنير ج١ ص ٤٣٨

[14] لە حساب لەگەڵ كردندا لە دوارۆژدا وەكو قەرزدارەكان وايەجێ وەرگرن و لەجێ بێ بەش بكرێت.

٢٦٥٠- أيما رجل باع سلعة فأدرك سلعته بعينها عند رجل و قد أفلس و لم يكن قبض من ثمنها شيئا فهي له و إن كان قبض من ثمنها شيئا فهي أسوة الغرماء.

(صحيح) ( هـ ) عن أبي هريرة . (الإرواء ١٤٣٢)

**٢٦٥٠- هەركەسێك كەل و پەلێكی فرۆشت و خودی ئەو كەل و پەلەی خۆی لە لای كەسێكی موفليس دۆزييەوە نرخەكەشی وەرنەگرتبوو ، بۆ خۆی دەگەڕێتەوە ، ئەگەر هەندێكی لە نرخەكەی وەرگرتبوو شتەكانيشی وەرگرتەوە، وەكو يەكێكە لە قەرزارەكان.**

٢٦٥١- أيما رجل باع متاعا فأفلس الذي ابتاعه و لم يقبض الذي باعه من ثمنه شيئا فوجد متاعه بعينه فهو أحق به و إن مات المشتري فصاحب المتاع أسوة الغرماء.

(صحيح) ( مالك د ) عن أبي بكر بن عبدالرحمن بن الحارث بن هشام مرسلا . (الإرواء ١٤٣٢)

**٢٦٥١- هەركەسێك كەل و پەلێك بفرۆشێت و كڕەوەكە نابوت بكات و فرۆشەرەكە نرخەكەی وەرنەگرێت و دوايی خودی شتەكەی بدۆزێتەوە لای ، خۆی لە پێشتر دەبێت پێی، ئەگەر بكڕەكەيش مرد ، خاوەن شتەكە وەكو يەكێكە لە قەرزارەكان .**

٢٦٥٢- من أدرك ماله بعينه عند رجل قد أفلس فهو أحق به من غيره.

(صحيح) ( ق د ) عن أبي هريرة. (الإرواء ١٤٣٢)

**٢٦٥٢- هەركەسێك خودی ماڵەكەی خۆی بدۆزێتەوە لە لای پياوێك كە موفليس بوو بێت، خۆی لە پێشترە پێی لە كەسێكی تر.**

## بابەتی دەستەبەركردن

٢٦٥٣- إناء كإناء و طعام كطعام[١٥].

(صحيح) ( ن ) عن عائشة . (الروض النضير ٩٣حم)

**٢٦٥٣- قاپێك بە قاپێك خۆراكێكيش بە خۆراكێك.**

٢٦٥٤- طعام بطعام و إناء بإناء .

(صحيح) ( ت ) عن أنس. (الإرواء ١٥٢٦)

**[١٥] كاتێك پێغەمبەر سەلام و ڕەحمەتی خوای لێ بێت لەم فەرمودەی فەرمووە كە يەكێك لە هاوسەرەكانی لەقاپێكدا خواردنی بۆ نارد بوو كە عائيشە هاتەوە بەقاپەكەی كێشا و شكاندی و ئەوەی تێيدا بوو ڕشتی، وتی ئەی پێغەمبەری خوا پارتەقاكەی ((كە قەفارەتەكەی)) چيە؟ ئەو فەرمووی. السراج المنير ج ١ ص ٤٣٨.**

**٢٦٥٤- خواردنێك بە خواردنێك و قاپێك بە قاپێك.**

٢٦٥٥- طعام كطعامها و إناء كإنائها .

(صحيح) ( حم ) عن عائشة. (الإرواء ١٥٢٦)

**٢٦٥٥- خواردنێك وەكو خواردنەكەی ئەو ، قاپێكیش وەكو قاپەكەی ئەو .**

٢٦٥٦- الغلة بالضمان.

(حسن) ( حم هق ) عن عائشة. (الإرواء ١٣١٥)

**٢٦٥٦- دەسكەوتی زەوی مسۆگەرە.**

٢٦٥٧- من استودع وديعة فلا ضمان عليه.

(حسن) ( هـ هق ) عن ابن عمرو. (الصحيحة ٢٣١٥)

**٢٦٥٧- هەركەسێك بارمتەیەك بسپێرێت و خەوتا پێ ی نا ، نا بژێردرێت .**

٢٦٥٨- لا ضمان على مؤتمن.

(حسن) ( هق ) عن ابن عمرو. (الإرواء ١٥٤٥)

**٢٦٥٧- بژاردن لەسەر ئەمیندار نیە.**

## بابەتی قەرزی بێ سوود و سەلەم

٢٦٥٩- أداالأمانة ألى من ائتمنك ولا تخن من خانك.

(صحيح) ( تخ د ت ك ) عن أبي هريرة ( قط الضياء ) عن أنس ( طب ) عن أبي أمامة ( د ) عن رجل من الصحابة ( قط ) عن أبي بن كعب . (الصحيحة ٤٢٣)

**٢٦٥٩- سپاردە بگێڕەوە بۆ ئەو كەسەی تۆی بە جێگای متمانە زانی ، ناپاكی مەكە لەگەڵ كەسێكدا ناپاكی لەگەڵت كرد .**

٢٦٦٠- أربع إذا كن فيك فلا عليك ما فاتك من الدنيا صدق الحديث و حفظ الأمانة و حسن الخلق و عفة مطعم.

(صحيح) ( حم طب ك هب ) عن ابن عمر ( طب ) عن ابن عمرو ( عد ابن عساكر ) عن ابن عباس . (الصحيحة ٧٣٢)

**٢٦٦٠- ئەگەر چوار شتت تیادا بێت ئیتر گوێ مەدەرە دونیا، ئەگەر لە دەستت بچێت : ڕاستگۆیی ، پاراستنی ڕاسپاردە ، ڕەوشت جوانی ، حەڵاڵ خۆری.**

٢٦٦١- اضمنوا لي ستا من أنفسكم أضمن لكم الجنة اصدقوا إذا حدثتم و أوفوا إذا وعدتم و أدوا إذا ائتمنتم و احفظوا فروجكم و غضوا أبصاركم و كفوا أيديكم.

(حسن) ( حم حب ك هب ) عن عبادة بن الصامت . (الصحيحة ١٤٧٠)

**٢٦٦١- شەش شتم بۆ دەستەبەر بكەن لە خۆتاندا ، بەهەشتتان بۆ دەستەبەر دەكەم : ڕاستگۆبن كە قسەتان كرد ، بە ئەمەك بن ئەگەر بەڵێنتان دا ، ئەگەر بە جێگای متمانە زانران ، ڕاسپاردە بگێڕنەوە ، داوێن پاكيتان بپارێزن ، چاوتان بگرن لە حەرام و ، دەستدرێژی مەكەن .**

٢٦٦٢- عارية مؤداة .

(صحيح) ( ك ) عن ابن عباس. (الصحيحة ٦١٢)

**٢٦٦٢- قەرزێكی گەیەنراو.**

٢٦٦٣- العارية مؤداة و المنحة مردودة .

(صحيح) ( هـ ) عن أنس. (الصحيحة ٦٨٢)

**٢٦٦٣- سپاردە دەبێت بگەڕێنرێتەوە بەخشش وەرنەگرێت.**

٢٦٦٤- العارية مؤداة و المنحة مردودة والدين مقضي و الزعيم غارم .

(صحيح) ( حم د ت هـ الضياء ) عن أبي أمامة. (الصحيحة ٦١٣)

**٢٦٦٤- سپاردە دەبێت بگێڕدرێتەوە ، بەخشش بدرێتەوە و ، قەرزیش بۆ خاوەن قەرز بگەڕێتەوە ، دەستەبەریش دەبێ بیبژێرێت.**

٢٦٦٥- المنحة مردودة و الناس على شروطهم ما وافق الحق.

(صحيح) ( البزار ) عن أنس. (الصحيحة ٦١٠)

**٢٦٦٥- بەخشش دەگەڕێتەوە ، خەڵكیش دەبێ لەسەر مەرجەكانیان سووربن ئەوەی كە ڕەوا بێت.**

٢٦٦٦- لا إيمان لمن لا أمانة له و لا دين لمن لا عهد له.

(صحيح) ( حم حب ) عن أنس. (المشكاة ٣٥)

**٢٦٦٦- باوەڕە نیە ئەوەی دەست پاك نەبێت و، دینی نیە ئەوەی بێپەیمان بێت ، كەسێكیش پەیمانی نەبێت ئاینیشی نییە.**

# بابەتی ئاودێری و کشتوکاڵی

٢٦٦٧- إن قامت الساعة و في يد أحدكم فسيلة فإن استطاع أن لا تقوم حتى يغرسها فليغرسها.

(صحيح) ( حم خد عبد بن حميد ) عن أنس . (الصحيحة ٩)

**٢٦٦٧- ئەگەر قیامەت هەڵسا و شەتڵێکی دار خورما بەدەست کەسێکتانەوە بوو ، توانی بیڕوێنێ ، پێش ئەوەی قیامەت هەڵسێ با بیڕوێنێ .**

٢٦٦٨- إن يمنح أحدكم أخاه خير له من أن يأخذ عليه خرجا معلوما

(صحيح) ( خ ) عن ابن عباس . (المشكاة ٢٩٧٦)

**٢٦٦٨- ئەگەر کەسێك لە ئێوە شتێك ببەخشێت بە براکەی لەوە چاکترە لەوەی بەکرێ یان لەسەر داهاتێکی دیاریکراو بیداتێ.**

٢٦٦٩- إنما يزرع ثلاثة: رجل له أرض فهو يزرعها و رجل منح أرضا فهو يزرع ما منح و رجل استكرى أرضا بذهب أو فضة.

(حسن) ( د ن هـ ) عن رافع بن خديج . (الصحيحة ١٧١٥)

**٢٦٦٩- سێ کەس کشتوکاڵ دەکەن : کەسێك خۆی زەوییەکی هەبێت و بیکات بە کشتوکاڵ ، کەسێکیش زەوییەکی پێ بەخشراوە دەیکات بە کشتوکاڵ ، کەسێکیش زەوییەکی بە کرێ گرتووە بە ئاڵتوون یان بە زیو.**

٢٦٧٠- لأن يمنح الرجل أخاه أرضه خير له من أن يأخذ عليها خراجا معلوما.

(صحيح) ( حم م د ن هـ ) عن ابن عباس. (المشكاة ٢٩٧٦)

**٢٦٧٠- ئەگەر کەسێك لە ئێوە زەوییەکی ببەخشێتە براکەی چاکترە لەوەی داهاتێکی دیاریکراوی لەسەر وەربگرێت.**

٢٦٧١- من زرع زرعا فأكل منه طير أو عافية كان له صدقة.

(صحيح) ( حم ابن خزيمة ) عن خلاد بن السائب. (الترغيب ٢٥٩٩)

**٢٦٧١- هەرکەسێك کشتوکاڵێکی کرد مەل و بڕێوی پەیداکەر لێیان خوارد دەبێتە خێر بۆی .**

٢٦٧٢- من غرس غرسا لم يأكل منه آدمي و لا خلق من خلق الله إلا كان له صدقة.

(صحيح) ( حم ) عن أبي الدرداء. (الترغيب ٢٦٠٠)

**٢٦٧٢- هەرکێك نەمامێك بڕوێنێ و ، ئادەمیزاد یان هەر دروستکراوێك لە دروستکراوەکانی خوا لێ ی بخوات، دەبێتە خێر بۆی .**

٢٦٧٣- من كانت له أرض فليزرعها أو ليزرعها أخاه و لا يكرها بثلث و لا ربع و لا بطعام مسمى.

(صحيح) ( حم د هـ ) عن رافع بن خديج. (صحيح النسائي ٣٨٨١)

**٢٦٧٣- هەركەسێك زەوییەكی هەبێت با خۆی یان براكەی بیكەن بە كشتوكاڵ و ، با نەیدات بەكرێ بە سێ یەك و چوار یەك ، یان بە خۆراكێكی دیاریكراو .**

٢٦٧٤- من كانت له أرض فليزرعها فإن لم يستطع أن يزرعها و عجز عنها فليمنحها أخاه المسلم و لا يؤاجرها فإن لم يفعل فليمسك أرضه.

(صحيح) ( حم ق ن هـ ) عن جابر ( ق ن ) عن أبي هريرة ( حم ت ن ) عن رافع بن خديج ( حم د ) عن رافع بن رفاعة. (غاية المرام ٣٦١)

**٢٦٧٤- هەركەسێك زەوییەكی هەبوو با بیكات بە كشتوكاڵ ، ئەگەر خۆی توانای ئەوەی نەبوو با بیدا بە براكەی بە بێ كرێ ، ئەگەر ئەوەشی نەكرد ، با زەوییەكەی بهێڵێتەوە.**

٢٦٧٥- نهى عن المزارعة.

(صحيح) ( حم م ) عن ثابت بن الضحاك. (غاية المرام ٣٥٢)

**٢٦٧٥- پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی كردووە لە زەوی داچاندن بەنیە تۆو**[16] .

٢٦٧٦- نهى عن الجداد بالليل و الحصاد بالليل.

(صحيح) ( هق ) عن الحسين. (الصحيحة ٢٣٩٣)

**٢٦٧٦- پێغەمبەر ﷺ خورما چنین و دروێنەی قەدەغە كردووە بە شەو.**

٢٦٧٧- لا تكروا الأرض ( بشيء ) .

(صحيح) ( ن ) عن رافع بن خديج. (الإرواء ١٤٧٨)

**٢٦٧٧- زەوی مەدەن بە كرێ**[17] .

---

[16] واتەخاوەن زەوی یەكە بڵێ تۆوەكە لەسەر من و لەجیاتی كرێش هەندێك لەبەرو بوومی كشتوكاڵەكەت دەدەمێ، چونكە لەوانەیە زەویەكە هیچ نەهێنێ و كابراش ڕەنجەڕۆ بێت.

١٧ زانایان ڕای جیاوازیان هەیە لەم بارەوە بۆ دروستی و نادروستی بەكرێ دانی زەوی.

## بابەتی داگیركردن

٢٦٧٨- لعن الله من لعن والديه و لعن الله من ذبح لغير الله و لعن الله من آوى محدثا و لعن الله من غير منار الأرض.

(صحيح) ( حم م ن ) عن علي. (نقد الكتاني ٤٢)

**٢٦٧٨- نەفرینی خوا لەو كەسەی نەفرین لە دایك و باوكی خۆی دەكات . نەفرینی خوا لەو كەسەی بۆ جگە لە خوا سەردەبڕێت ، نەفرینی خوا لەو كەسەی داڵدەی تاوانبارێك دەدات ، نەفرینی خوا لەو كەسەی نیشانە و سنورەكانی زەوی دەگۆڕێت .**

٢٦٧٩- من زرع أرضا بغير إذن أهلها فله نفقته و ليس له في الزرع شيء.

(صحيح) ( حم د ت هـ ) عن رافع بن خديج. (الإرواء ١٥١٧)

**٢٦٧٩- هەركێك زەویەك بكاتە كشتوكاڵ بە بێ مۆڵەتی خاوەنەكەی ، خەرجییەكەی دەكەوێتە سەری و هیچیشی بەرناكەوێت لە كشتوكاڵەكە.**

٢٦٨٠- من أخذ من الأرض شيئا بغير حقه خسف به يوم القيامة إلى سبع أرضين.

(صحيح) ( خ ) عن ابن عمر. (المشكاة ٢٩٥٨)

**٢٦٨٠- هەركێ زەوییەك داگیربكات بە ناهەق، خوای گەورە لەڕۆژی قیامەت دا بەحەوت قاتی زەویدا نغرۆی دەكات.**

٢٦٨١- من أخذ من الأرض شيئا ظلما جاء يوم القيامة يحمل ترابها إلى المحشر.

(صحيح) ( حم طب ) عن يعلى بن مرة. (الصحيحة ٢٤٢)

**٢٦٨١- هەركێك بە ناهەق زەوییەك داگیربكات ، لە ڕۆژی قیامەت دا خۆڵەكەی بەكۆڵ هەڵدەگرێت بۆ گۆڕەپانی حەشر.**

٢٦٨٢- من اقتطع أرضا ظالما لقي الله و هو عليه غضبان.

(صحيح) ( حم م ) عن وائل. (الإرواء ٢٦٩٩)

**٢٦٨٢- هەكەسێك پارچە زەوییەك بە ستەم دابڕێت بۆ خۆی ، كاتێك بەخوا دەگات خوا لێ ی تۆڕەیە.**

٢٦٨٣- من ظلم قيد شبر من الأرض طوقه من سبع أرضين.

(صحيح) ( حم ق ) عن عائشة وسعيد بن زيد. (الترغيب ١٨٦٥)

**٢٦٨٣- كەسێك بستە زەوییەك بە ستەم داگیر بكات خوای گەورە دەورەی دەدات لە حەوت زەمینەوە.**

٢٦٨٤- أيما رجل ظلم شبرا من الأرض كلفه الله تعالى أن يحفره حتى يبلغ آخر سبع أرضين ثم يطوقه يوم القيامة حتى يقضى بين الناس.

(صحيح) ( طب ) عن يعلى بن مرة . (الصحيحة ٢٤٠)

**٢٦٨٤- هەركەسێك بە ناهەق بستێك زەوی داگیر بكات ، خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەت دا داوای لێ دەكات هەڵیكەنێت تا حەوت چینی زەوی ، دەورەشی دەدا تاكو دادوەری نێوان خەڵكی تەواو دەبێت .**

٢٦٨٥- لا غصب و لا نهبة.

(صحيح) ( طب ) عن عمرو بن عوف.

**٢٦٨٥- نە داگیركردن و نە تالانی ڕەوا نی یە.**

٢٦٨٦- لا يأخذ أحد شبرا من الأرض بغير حقه إلا طوقه الله إلى سبع أرضين يوم القيامة.

(صحيح) ( م ) عن أبي هريرة. (الترغيب ١٨٦٦)

**٢٦٨٦- هەركەسێك بستێك زەوی بە ناهەق داگیر بكات خوای گەورە لەڕۆژی قیامەتدا دەورەی دەدات تا حەوت چینی زەوی.**

٢٦٨٧- لا يحل مال امرئ مسلم إلا بطيب نفس منه.

(صحيح) ( د ) عن حنيفة الرقاشي. (الإرواء ١٤٥٠)

**٢٦٨٧-ماڵی هیچ موسوڵمانێك ڕەوا نی یە بە بێ خۆشحاڵی خۆی.**

## بابەتی هەڵگرتنەوە ( الشفعة )[١٨]

٢٦٨٨- إذا قسمت الأرض و حدت فلا شفعة فيها.

(صحيح) ( د ) عن أبي هريرة . (الصحيحة ١٣٧٥)

**٢٦٨٨- ئەگەر زەوی دابەشكراو سنوری بۆ دەستنیشان كرا ، ئیتر هاوبەش مافی هەڵگرتنەوەی نامێنێ.**

٢٦٨٩- إذا وقعت الحدود و صرفت الطرق فلا شفعة.

(صحيح) ( ت ) عن جابر . (الإرواء ١٥٣٢)

**[١٨] ( الشفعه ): ئەوەیە : ئەگەر دوو كەس هاوبەش بون لە ماڵێكدا كە دابەش ناكرێت یان بەگران دابەش بكرێت ئەگەر یەكێكیان بەشی خۆی فرۆشت هاوبەشەكەی مافی خۆیەتی بڵێ ئەوا من بەو نرخە هەڵمگرتەوە.**

**٢٦٨٩- كه سنورەكان دياريكران و ڕێگەكان دانران ئيتر هاوبەش مافی هەڵگرتنەوەی نامێنێ .**

٢٦٩٠- أيكم كانت له أرض أو نخل فلا يبعها حتى يعرضها على شريكه.

(صحيح) ( ن ) عن جابر . (الصحيحة ١٤٠١)

**٢٦٩٠- هەركامتان زەوی يان دارخورمای هەبێت با نەيفرۆشێت تاكو پێشنياری دەكات بۆ هاوبەشەكەی .**

٢٦٩١- جار الدار أحق بالدار من غيره.

(صحيح) ( ابن سعد ) عن الشريد بن سويد . (الإرواء ١٥٣٧)

**٢٦٩١- دراوسێ ماڵ ل پێش ترە بە خانووەكە لە كەسێكی تر.**

٢٨٩٢- جار الدار أحق بالشفعة.

(صحيح) ( طب ) عن سمرة . (الإرواء ١٥٣٧)

**٢٦٩٢- دراوسێ ماڵ شايستە ترە بە هەڵگرتنەوە.**

٢٦٩٣- جار الدار أحق بدار الجار.

(صحيح) ( ن ع حب ) عن أنس ( حم د ت ) عن سمرة . (الإرواء ١٥٣٧)

**٢٦٩٣- دراوسێ ماڵ شايستە ترە لە كەسی تر بە ماڵی دراوسێكەی .**

٢٦٩٤- الجار أحق بشفعة جاره ينتظر بها و إن كان غائبا إذا كان طريقهما واحد.

(صحيح) ( حم ٤ ) عن جابر . (الإرواء ١٥٣٨)

**٢٦٩٤- دراوسێ لە پێشترە ، بە هەڵگرتنەوەی خانووی دراوسێكەی ، چاوەڕوانی دەكرێت كە ئامادە نەبێت، ئەگەر ڕێگەشيان يەك بێت .**

٢٦٩٥- الجار أحق بصقبه.

(صحيح) ( خ د ن هـ ) عن أبي رافع ( ن هـ ) عن الشريد بن سويد . (الإرواء ١٥٣٦)

**٢٦٩٥- دراوسێ مافدارترە بە هۆی نزيكيەوە .**

٢٦٩٦- الشريك أحق بصقبه ما كان.

(صحيح) ( هـ ) عن أبي رافع. (الإرواء ١٥٣٨)

**٢٦٩٦- دراوسێ مافدارترە بە هۆی نزيكيەوە هەر چۆنێك بێت .**

٢٦٩٧- الشفعة في كل شرك في الأرض أو ربع أو حائط لا يصلح له أن يبيع حتى يعرض على شريكه فيأخذ أو يدع فإن أبي فشريكه أحق به حتى يؤذنه.

(صحيح) ( م د ن ) عن جابر. (الإرواء ١٥٣٠)

**٢٦٩٧- هەڵگرتنەوە لە هەموو هاوبەشییەکدا هەیە لە زەوی یان خانوو ، یان باخ، دروست نیە بیفرۆشێ تا پێشنیاری نەکات بۆ هاوبەشەکەی ئەویش هەڵیبگرێت یان وازی لێ بێنێت ، ئەگەر ڕازی نەبوو ، هاوبەشەکەی مافدارترە هەتا مۆڵەتی دەدا .**

٢٦٩٨- الشفعة فيما لم تقع فيه الحدود فإذا وقعت الحدود فلا شفعة.

(صحيح) ( طب ) عن ابن عمر. (الإرواء ١٥٣٠)

**٢٦٩٨- هەڵگرتنەوە لەوەدا دەبێت کە سنوری تیا دیاری نەکرا بێت ، ئەگەر نا هەڵگرتنەوە نامێنێ.**

٢٦٩٩- من كان له شريك في ربع أو نخل فليس له أن يبيع حتى يؤذن شريكه فإن رضي أخذ و إن كره ترك.

(صحيح) ( م ) عن جابر. (الإرواء ١٥٣٠)

**٢٦٩٩- هەرکەسێك هاوبەشێکی هەبێت لەخانویەکدا یان لە باخێکدا ، بۆی نیە بەشەکەی خۆی بفرۆشێت تاکو مۆڵەت وەرنەگرێت لە هاوبەشەکەی، ئەگەر ڕازی بوو هەڵیدەگرێتەوە ئەگەر پێشی خۆش نەبوو وازی لێ بێنێت .**

٢٧٠٠- من كان له شريك في حائط فلا يبع نصيبه من ذلك حتى يعرضه على شريكه.

(صحيح) ( حم ت ك ) عن جابر. (المشكاة ٢٩٦٢)

**٢٧٠٠- هەرکەسێك هاوبەشێکی هەبێت لە باخێکی دارخورمادا ، بۆی نییە بەشەکەی خۆی بفرۆشێت تاکو پێشنیاری هاوبەشەکەی نەکات .**

٢٧٠١- من كان له نخل أو أرض فلا يبعها حتى يعرضها على شريكه.

(صحيح) ( هـ ) عن جابر. (الإرواء ١٥٣٠)

**٢٧٠١- هەرکەسێك دارخورمای هەبێت یان زەوی ، با نەیفرۆشێت تاکو پێشنیاری دەکات بۆ هاوبەشەکەی.**

٢٧٠٢- من كانت له أرض فأراد بيعها فليعرضها على جاره.

(صحيح) ( هـ ) عن ابن عباس. (الصحيحة ٢٣٥٨)

**٢٧٠٢- هەرکەسێك زەوییەکی هەبێت و بیەوێت بیفرۆشێت با پێشنیاری بکات بۆ هاوبەشەکەی .**

٢٧٠٣- إذا اختلفتم في الطريق فاجعلوه سبعة أذرع.

(صحيح) ( حم م د ت هـ ) عن أبي هريرة ( حم هـ هق ) عن ابن عباس . (الصحيحة ٣٩٦٠)

**٢٧٠٣- ئەگەر ناکۆکیکتان کەوتە نێوان لەسەر ڕێگاو بان ، بیکەن بە حەوت باڵ .**

٢٧٠٤- حد الطريق سبعة أذرع.

(صحيح) ( طس ) عن جابر . (الصحيحة ٣٩٦٠)

**٢٧٠٤- سنوری ڕێگا ، حەوت باڵە.**

## بابەتی بەكرێدان (الإجارة)

٢٧٠٥- أطيب الكسب عمل الرجل بيده و كل بيع مبرور.

(صحيح) ( حم طب ك ) عن رافع بن خديج ( طب ) عن ابن عمر . (الترغيب ١٦٩١)

**٢٧٠٥- چاكترین دەستكەوی پیاو ڕەنجی شانیەتی، هەروەها هەموو مامەڵەیەكی دروست.**

٢٧٠٦- أعطوا الأجير أجره قبل أن يجف عرقه.

(حسن) ( هـ ) عن ابن عمر ( ع ) عن أبي هريرة ( طس ) عن جابر ( الحكيم ) عن أنس . (الإرواء ١٤٩٣)

**٢٧٠٦- كرێی كرێكار بدەن پێش ئەوەی ئارەقی وشكبێتەوە .**

٢٧٠٧- أفضل الكسب بيع مبرور و عمل الرجل بيده.

(صحيح) ( حم طب ) عن أبي بردة بن نيار . (الصحيحة ٦٠٩)

**٢٧٠٧- چاكترین دەسكەوت مامەلەی دروستە و ئیش و كاری پیاوە بە دەستی خۆی.**

٢٧٠٨- خير الرزق الكفاف.

(حسن) ( حم في الزهد ) عن زياد بن جبير مرسلا . (الصحيحة ١٨٣٤)

**٢٧٠٨- چاكترین ڕۆزی ئەوەیە ڕۆژانە بەشت بكات.**

٢٧٠٩- إن الله تعالى يحب من العامل إذا عمل أن يحسن.

(حسن) ( هب ) عن كليب . (الصحيحة ١١١٣)

**٢٧٠٩- خوای گەورە پێی خۆشە ئەگەر كرێكار كارێكی كرد بە جوانی ئەنجامی بدات .**

٢٧١٠- إن الله يحب إذا عمل أحدكم عملا أن يتقنه.

(حسن) ( هب ) عن عائشة . (الصحيحة ١١١٣)

**٢٧١٠- خوای گەورە پێی خۆشە ئەگەر كەسێك لە ئێوە كارێكی كرد بەچاكی بیكات.**

٢٧١١- إن من أطيب ما أكل الرجل من كسبه و ولده من كسبه.

(صحيح) ( د ك ) عن عائشة . (صحيح النسائي ٤٤٥١)

**٢٧١١- چاكترين خۆراكى كەسێك ڕەنجى خۆيەتى، كوڕەكەشى لە دەسكەوتى خۆيەتى .**

٢٧١٢- ولد الرجل من كسبه من أطيب كسبه فكلوا من أموالهم.

(صحيح) ( د ك ) عن عائشة. (الصحيحة ٢٤١٤)

**٢٧١٢- كوڕ لە چاكترين ڕەنج و بەرهەمى باوكێتى ، دەى لەماڵى كوڕەكانتان بخۆن.**

٢٧١٣- الولد من كسب الوالد.

(صحيح) ( طس ) عن ابن عمر. (الصحيحة ٢٤١٤)

**٢٧١٣- منالْ دەسكەوتى باوكێتى.**

٢٧١٤- ثمن الخمر حرام و مهر البغي حرام و ثمن الكلب حرام و الكوبة حرام و إن أتاك صاحب الكلب يلتمس ثمنه فاملأ يديه ترابا و الخمر و الميسر حرام و كل مسكر حرام.

(صحيح) ( حم ) عن ابن عباس . (الصحيحة ١٨٠٦)

**٢٧١٤- نرخى مەى حەرامە ، دەسكەوتى ئافرەتى داوێن پيس حەرامە ، نرخى سەگ حەرامە، تەپڵ حەرامە، ئەگەر خاوەن سەگيش هاتە لات ، داواى نرخەكەى كرد ، هەردوو دەستى پڕ بكە لە خۆڵ ، مەى و قومار حەرامە ، هەموو سەرخۆشكەرێكيش حەرامە.**

٢٧١٥- ثمن الكلب خبيث و مهر البغي خبيث و كسب الحجام خبيث.

(صحيح) ( حم م د ت ) عن رافع بن خديج . (الصحيحة ٣٦٢٢)

**٢٧١٥- نرخى سەگ پيسە ، دەستكەوتى ئافرەتى داوێن پيسيش هەر پيسە ، دەسكەوتى كەڵەشاخگريش پيسە.**

٢٧١٦- خير الكسب كسب يد العامل إذا نصح.

(حسن) ( حم ) عن أبي هريرة . (الترغيب ٧٧٦)

**٢٧١٦- باشترين دەستكەوت دەرستكەوتى كاسپى كرێكارە ئەگەر لەبەر خوا ئامۆژگارى خەڵكە بكات.**

٢٧١٧- شر الكسب مهر البغي و ثمن الكلب و كسب الحجام.

(صحيح) ( حم م ن ) عن رافع بن خديج. (الصحيحة ٣٦٢٢)

**٢٧١٨- خراپترين دەست كەوت دەستكەوتى ئافرەتى داوێن پيس و نرخى سەگ و دەست كەوتى كەڵەشاخ گرتنەوەيە.**

٢٧١٨- كل جسد نبت من سحت فالنار أولى به.

(صحيح) ( طب حل ) عن أبي بكر. (المشكاة ٢٧٧٢)

**٢٧١٨- هەر جەستەیەك بە حەرام گۆش بوبێت، ئاگر بۆ ئەو چاكترە.**

٢٧١٩- ما كسب الرجل كسبا أطيب من عمل يده و ما أنفق الرجل على نفسه و أهله و ولده و خادمه فهو صدقة

(صحيح) ( هـ ) عن المقدام . (الترغيب ١٦٨٥)

**٢٧١٩- هیچ كەس دەسكەوتێكی دەستنەكەوتووە لە بەرهەمی دەستی خۆی پاكتر بێت ، هەركەسێكیش خەرجی بكات بۆ خۆی و ماڵ و منالْ و خزمەتكارەكەی هەمووی خێرە.**

٢٧٢٠- من كان لنا عاملا فلم يكن له زوجة فليكتسب له زوجة فإن لم يكن له خادم فليكتسب له خادما فإن لم يكن له مسكن فليكتسب مسكنا من اتخذ غير ذلك فهو غال أو سارق.

(صحيح) ( د ك ) عن المستورد بن شداد. (المشكاة ٣٧٥١)

**٢٧٢٠- هەركەسێك كار بكات بۆ ئێمە و خێزانی نەبێت ، با ژن بهێنێت ، ئەگەر خزمەتكاریشی نییە ، با خزمەتكارێك بگرێت ، ئەگەر خانوویشی نییە ، با خانوو بۆ خۆی بكات ، هەركەسێك لەوانە زیاتر بكات ، ئەوە دەستدرێژی كردووەتە سەر ماڵی موسوڵمانان ، یان دزە.**

٢٧٢١- نهى عن كسب الإماء.

(صحيح) ( خ د ) عن أبي هريرة. (الصحيحة ٣٢٧٥)

**٢٧٢١- پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی كردووە دەسكەوتی كەنیزەك .**

٢٧٢٢- نهى عن كسب الأمة حتى يعلم من أين هو.

(حسن) ( د ك ) عن رافع بن خديج. (الصحيحة ٣٢٧٥)

**٢٧٢٢- پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی كردووە دەسكەوتی كەنیزەك تاكو نەزانرێت ئەو دەستكەوتەی لەكوێ بووە.**

٢٧٢٣- نهى عن كسب الحجام.

(صحيح) ( هـ ) عن أبي مسعود. (الصحيحة ٢٩٩٠)

**٢٧٢٣- پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی كردووە دەسكەوتی كەڵەشاخگر .**

٢٧٢٤- ما أصاب الحجام فاعلفوه الناضح.

(صحيح) ( حم ) عن رافع بن خديج. (الصحيحة ١٤٠٠)

**٢٧٢٤- دەسكەوتی كەڵەشاخگر بكەن بە ئالیكی ئەو ئاژەڵانەی ئاوی پێ هەڵدەگۆزن.**

٢٧٢٥- يحب الله العامل إذا عمل أن يحسن.

(حسن) ( طب ) عن كليب بن شهاب. (الصحيحة ١١١٣)

**٢٧٢٥- خوای گەورە ئەو كرێكارەی خۆش دەوێت كە كارەكەی بە جوانی بكات.**

٢٧٢٦- بينما ثلاثة نفر يمشون أخذهم المطر فآووا إلى غار في جبل فانحطت على فم غارهم صخرة من الجبل فانطبقت عليهم فقال بعضهم لبعض: انظروا أعمالا عملتموها صالحة لله فادعوا بها لعله يفرجها عنكم " فقال أحدهم: اللهم إنه كان لي والدان شيخان كبيران و امرأتي و لي صبية صغار أرعى عليهم فإذا أرحت عليهم حلبت فبدأت بوالدي فسقيتهما قبل بني و إني نأى بي ذات يوم الشجر فلم آت حتى أمسيت فوجدتهما قد ناما فحلبت كما كنت أحلب فجئت بالحلاب فقمت عند رءوسهما أكره أن أوقظهما من نومهما و أكره أن أسقى الصبية قبلهما و الصبية يتضاغون عند قدمي فلم يزل ذلك دأبي و دأبهم حتى طلع الفجر فإن كنت تعلم أني فعلت ذلك ابتغاء وجهك فافرج لنا فرجة نرى منها السماء ففرج الله منها فرجة فرأوا منها السماء " و قال الآخر: اللهم إنه كانت لي ابنة عم أحببتها كأشد ما يحب الرجال النساء و طلبت إليها نفسها فأبت حتى آتيها بمائة دينار فتعبت حتى جمعت مائة دينار فجئتها بها فلما وقعت بين رجليها قالت: يا عبد الله اتق الله و لا تفتح الخاتم إلا بحقه فقمت عنها فإن كنت تعلم أني فعلت ذلك ابتغاء وجهك فافرج لنا منها فرجة ففرج لهم فرجة " و قال الآخر: اللهم إني كنت استأجرت أجيرا بفرق أرز فلما قضى عمله قال لي: أعطني حقي فعرضت عليه فرقه فرغب عنه فلم أزل أزرعه حتى جمعت منه بقرا و رعاءها فجاءني فقال: اتق الله و لا تظلمني حقي قلت: اذهب إلى تلك البقر و رعائها فخذها فقال: اتق الله و لا تستهزئ بي فقلت: إني لا أستهزئ بك خذ ذلك البقر و رعاءها فأخذه و ذهب به فإن كنت تعلم أني فعلت ذلك ابتغاء وجهك فافرج ما بقي ففرج الله ما بقي.

(صحيح) ( ق ) عن ابن عمر . (الضعيفة ٦٥٠٥)

**٢٧٢٦- لە كاتێكدا سێ كەس دەڕۆیشتن، باران دای گرتن و ، پەنایان بردە ئەشكەوتێك لە شاخێكدا و ، تاوێرێك بەبۆوە و دەمی ئەشكەوتەكەی داخست ، ئەوانیش بە یەكتریان وت : بڕوانن چی كردەوەیەكی چاكتان كردووە ، داوابكەن بەخوا بەڵكو بە هۆی ئەو كردەوەیە ڕزگارتان بكات ، یەكێكیان وتی : خوایە من دایك و باوكێكی پیرم هەبوو ،**

لەگەڵ خێزانم و چەند منداڵێکی وورد بەخێوم دەکردان ، کە دەگەڕامەوە لایان شیرم بۆ دەدۆشین و ، و بە دایك و باوکم دەستم پێ دەکرد و دەرخواردم دەدان پێش منداڵەکان ، بەڵام ڕۆژێکیان بەبۆنەی دارەوە دوور کەوتمەوە و ، ئێوارەم بەسەردا هات ، ئەو کاتە گەڕامەوە و بینیم خەویان لێ کەوتووە ، منیش شیرەکەم دۆشی و وەکو جاران قاپە شیرەکەم بردە لای سەریان و حەزم نەدەکرد لەخەو هەڵیانسێنم ، یان شیر بە منداڵەکانم بدەم پێش ئەوان ، منداڵەکانیش لە لای قاچمدا هەر هاواریان دەکرد ، حاڵی من و حاڵی ئەوانیش بەو شێوە بوو تا سپێدەی بەیانی هەڵهات ، خوایە جا ئەگەر دەزانیت ئەوەم لە پێناو تۆدا کردووە جێگایەکی سەیرکرد نمان بۆ بکەرەوە ئاسمان ببینین ، خوای گەورە کەمێکی لە دەرگای ئەشکەوتەکە کردەوە و ئاسمانیان بینی ، یەکێکی تریان وتی: خوایە من کچێکی ئامۆزام هەبوو زۆرم خۆش دەویست تا ئەو پەڕ خۆشەویستی پیاو بۆ ئافرەت ، خوازبێنیشم کرد بەڵام ڕازی نەبوو تاکو دیناری بۆ نەبەم پاش ماندوبونێکی زۆر سەد دینارم کۆکردەوەو بۆم برد، کاتێك لەنێوان قاچەکانیدا دانیشتم ووتی : ئەی بەندەی خوا لەخوا بترسە و ئاڵقەی داخراو مە کەرەوە بە مافی خۆی نەبێت ، ئیتر منیش لێی دوور کەوتمەوە و ، خوایە ئەگەر دەزانی ئەوەم لەبەر تۆ کردووە کەمێکی تر تاوێرەکەمان بۆ لابدە، خوای گەورە کەمێکی تر لای برد ، ئەوەکەی تریان وتی : کرێکارێکم هەبوو . منیش هەر بۆم دەچاند پاش ئەوە هاتە لام و ، وتی : لە خوا بترسە و مافم مەخۆ ، وتم بچۆ ئەو هەموو مانگا و شوانەکانیشی هی تۆیە ببیە ، وتی : لە خوا بترسە و گاڵتەم پێ مەکە . وتم : من گاڵتەت پێ ناکەم ، هەموو ئەوانە مافی خۆتە بیانبە ، ئەویش بردنی و ڕۆیشت ، خوایە ئەگەر دەزانی ئەوەم ( لە پێناو تۆدا کردووە ئەوەی کە ماوەتەوە لێمان بکەرەوە ) خوای گەورەش بە تەواوی دەرگای ئەشکەوتەکەی لێ کردنەوە.

## بـابەتی زیندوو كردنەوەی زەوی مردوو

٢٧٢٧- الأرض أرض الله و العباد عباد الله من أحيا مواتا فهي له.

(حسن) ( طب ) عن فضالة بن عبيد . (الإرواء ١٥١٨)

**٢٧٢٧- زەوی زەوی خوایە ، بەندەكانیش بەندەی خـوان ، هەركەسێك زەوییـەكی مـردوی زیندوو كردەوە دەبێتە زەوی خۆی.**

٢٧٢٨- العباد عباد الله و البلاد بلاد الله فمن أحيا من مـوات الأرض شـيئا فهـو لـه و لـيس لعرق ظالم حق .

(حسن) ( هق ) عن عائشة. (الإرواء ١٥١٩)

**٢٧٢٨- بەندەكان بەندەی خوای گـەورەن ، وڵاتـیش وڵاتـی خوایـە ، جـا هەركەسێكیش زەوی مردوی زیندوو كردەوە بۆ خۆی دەبێت ، بەڵام كـەس مـافی نـی یـە ، لـە زەوی كەسـی تردا نەمام بنێژێت بە بێ مۆڵەتی خاوەنەكەی.**

٢٧٢٩- من أعمر أرضا ليست لأحد فهو أحق بها.

(صحيح) ( حم خ ) عن عائشة . (الإرواء ١٥٤٨)

**٢٨٢٩- هەركەسیك زەوییەكی ئاوەدان كردەوە هی كەس نەبوو بێت ، خۆی شایستەترە پێی .**

٢٧٣٠- من حفر بئرا فله أربعون ذراعا عطنا لماشيته.

(حسن) ( هـ ) عن عبدالله بن مغفل. (الصحيحة ٢٥١)

**٢٧٣٠- هەركەسێك بیرێك هەڵكەنێت دەگەز بەچواردەوریدا بۆ مەڕ و ماڵاتی خۆی دەبێت .**

٢٧٣١- موتان الأرض لله و لرسوله فمن أحيا منها شيئا فهو له.

(حسن) ( هق ) عن ابن عباس. (الإرواء ١٥١٩)

**٢٧٣١- زەوی مردوی بێ خاوەن بۆ خـوا و پێغەمبەرەكەیـەتی ، جـا هەركەسێك زینـدووی چاك بكاتەوە بۆ خۆی دەبێت .**

٢٧٣٢- لا حمى إلا لله و لرسوله.

(صحيح) (حس) ( حم خ د ) عن الصعب بن جثامة. (المشكاة ٢٩٩٢)

**٢٧٣٢- پاوەن كردنی لەوەڕگە بۆ كەس نییە بۆ خوا و پێغەمبەرەكەی نەبێت.**

٢٧٣٣- حريم النخلة مد جريدها.

(صحيح) ( هـ ) عن ابن عمر وعبادة بن الصامت . (الضعيفة ٣٤٨٥)

**٢٧٣٣- قەدەغە كراوی دارخورما درێژی گەڵاكانیەتی.**

٢٧٣٤- من أحاط حائطا على أرض فهي له.

(صحيح) ( حم د الضياء ) عن سمرة(الإرواء ١٥٥٢)

**٢٧٣٤- كەسێك دیوارێكی دروست كرد بە دەوری زەوییەكی بێ خاوەندا دەبێتە زەوی خۆی .**

٢٧٣٥- من أحيا أرضا ميتة فله فيها أجر و ما أكلت العافية منها فهو له صدقة.

(صحيح) ( حم ن حب الضياء ) عن جابر. (الصحيحة ٥٦٨)

**٢٧٣٥- هەركەسێك زەوییەكی مردووی زیندوو كردەوە پاداشتی تیایدا هەیە ، هەركەسێكیش لێی بخوات دەبێتە خێر بۆی .**

٢٧٣٦- من أحيا أرضا ميتة فهي له.

(صحيح) ( ت ) عن جابر. (الإرواء ١٥٤٨)

**٢٧٣٦- هەركێك زەوییەكی مردو ئاوەدان بكاتەوە و بیچێنێ بۆ خۆی دەبێت.**

٢٧٣٧- من أحيا أرضا ميتة فهي له و ليس لعرق ظالم حق.

(صحيح) ( حم د ت الضياء ) عن سعيد بن زيد. (الإرواء ١٥١٨)

**٢٧٣٧- هەركەسێك زەوییەكی مردو زیندوو بكاتەوە بۆ خۆیەتی ، كەسیش بەبێ مۆڵەت مافی نییە لە زەوی كەسدا .**

## بابەتی ڕاگرتن (الوقف)

٢٧٣٨- احبس أصلها و سبل ثمرتها.

(صحيح) ( ن هـ ) عن ابن عمر . (الإرواء ١٥٨٣)

**٢٧٣٨- بنەچەكەی بهێڵەوە و بەرهەمەكەی ببەخشە لە پێناو خوادا .**

٢٧٣٩- أرى أن تجعلها في الأقربين.

(صحيح) ( ق ) عن أنس . (الصحيحة ٣٩٨٢)

**٢٧٣٩- پێم باشه بۆ خزمەكانتى دابنێیت.**

٢٧٤٠- أربعة تجري عليهم أجورهم بعد الموت: من مات مرابطا في سبيل الله و من علم علما أجري له عمله ما عمل به و من تصدق بصدقة فأجرها يجري له ما وجدت و رجل ترك ولدا صالحا فهو يدعو له.

(حسن) ( حم طب ) عن أبي أمامة . (الترغيب ١١٤)

**٢٧٤٠- چوار كەس هەن پاداشتەكانیان بەردەوامە لەدوای مردنیان: كەسێك لەجیهادا بێت (مرابط) بێت لە پێناو خوادا ، هەركەسێكیش زانستێك فێری خەڵك بكات پاداشتی كردەوەكەی پێ دەگات هەرچەندە كاری پێ بكرێت ، كەسێكیش خێرێك بكات پاداشتەكەی پێی دەگات ، تاكو ئەو خێرە بوونی هەبێت ، پیاوێكیش منداڵێكی كردەوە چاك بەجێبهێڵێ بۆی لەخوا بپاڕێتەوە.**

٢٧٤١- إن شئت حبست أصلها و تصدقت بها.

(صحيح) ( حم خ ت ن ه ) عن ابن عمر . (الإرواء ١٥٨٢)

**٢٧٤١- ئەگەر حەز دەكەیت بنەچەكەی ڕاگرە و ئەوی تری بكە بە خێر.**

٢٧٤٢- ما من مسلم يزرع زرعا أو يغرس غرسا فيأكل منه طير أو إنسان أو بهيمة إلا كانت له به صدقة.

(صحيح) ( حم ق ت ) عن أنس. (الصحيحة ٧)

**٢٧٤٢- هەركەسێك كشتوكاڵێك بكات ، یان نەمامێك بنێژێت باڵندەیەك یان مرۆڤێك یان ئاژەڵێك لێی بخوات بۆی دەبێتە خێر .**

## بابەتی قۆرخ كردن (الاحتكار)

٢٧٤٣- لا يحتكر إلا خاطئ.

(صحيح) ( حم م د ن هـ ) عن معمر بن عبدالله. (غاية المرام ٣٢١)

**٢٧٤٣- قۆرخ ناكات كەسێكی هەڵەكار نەبێت .**

# بابەتی دیارییەکان

٢٧٤٤- أجيبوا الداعي و لا تردوا الهدية و لا تضربوا المسلمين.

(صحيح) ( حم خد طب هب ) عن ابن مسعود . (الإرواء ١٦١٥)

**٢٧٤٤- وەڵامی بانگخواز بدەنەوە ، دیاریش ڕەتمەکەنەوە و ، لە موسوڵمانانیش مەدەن.**

٢٧٤٥- إذا آتاك الله تعالى مالا لم تسأله و لم تشره إليه نفسك فاقبله فإنما هو رزق ساقه الله إليك.

(صحيح) ( هق ) عن عمر . (الصحيحة ١١٨٧)

**٢٧٤٥- ئەگەر خوای گەورە شتێکی پێت بەخشی کە داوات نەکردبوو ، یان دەرونت پەرۆشی نەبوو وەری گرە چونکە ئەوە ڕۆزیەکە خوا بۆی ناردوی .**

٢٧٤٦- إذا أعطيت شيئا من غير أن تسأل فكل و تصدق.

(صحيح) ( م د ن ) عن عمر . (الإرواء ٨٥٤)

**٢٧٤٦- ئەگەر شتێکت پێ بەخشرا بێ ئەوەی داوای بکەی لێی بخۆو خێری لێ بکە.**

٢٧٤٧- إذا جاءك من هذا المال شيء و أنت غير مستشرف و لا سائل فخذه و ما لا فلا تتبعه نفسك.

(صحيح) ( خ ) عن عمر . (المشكاة ١٧٤٥)

**٢٧٤٧- ئەگەرماڵێکت بۆ هات و تۆش چاوت تێ نەبڕیبو یان داوات نەکردبوو وەریبگرە و ئەگەر نا چاوت لەدوی نەبێت.**

٢٧٤٨- إذا ساق الله إليك رزقا من غير مسألة و لا إشراف نفس فخذه فإن الله أعطاكه.

(صحيح) ( حب ) عن عمر . (الصحيحة ١٣٢٤)

**٢٧٤٨- ئەگەر خوای گەورە ڕۆزیەکی بۆ ناردی بەبێ داواکردن یان پەرۆشبوون خۆت وەریگرە ئەوە بێگومان خوا پێ ی بەخشیوی.**

٢٧٤٩- أربعون خصلة أعلاهن منحة العنز لا يعمل عبد بخصلة منها رجاء ثوابها و تصديق موعودها إلا أدخله الله تعالى بها الجنة.

(صحيح) ( خ د ) عن ابن عمرو . (صحيح أبي داود ١٤٧٧)

**٢٧٤٩- چل خەسڵەت هەیە بەرزترین پاداشتیان بەخشینی بزنێکە هەر بەندەیەك بە یەکێکیان کاربکات بەهیوای پاداشتی و باوەڕهێنان بەبەڵێنی خوای گەورە بەوە دەیکاتە بەهەشتەوە.**

٢٧٥٠- أما بعد فما بال العامل نستعمله فيأتينا فيقول: هذا من عملكم و هذا أهدي إلي أفلا قعد في بيت أبيه و أمه فينظر هل يهدى له أم لا ؟ فوالذي نفس محمد بيده لا يغل أحدكم منها شيئا إلا جاء به يوم القيامة يحمله على عنقه إن كان بعيرا جاء به له رغاء و إن كانت بقرة جاء بها لها خوار و إن كانت شاة جاء بها تيعر فقد بلغت.

(صحيح) ( حم ق د ) عن أبي حميد الساعدي . (الترغيب ٧٨٢)

**٢٧٥٠- پاشان ئەوە ئەو کریکارە چیەتی کە بەکاری دەهێنین دەگەڕێتەوە لامان و دەڵێت ئەوە داهاتی کارەکەتانەو ئەوەش دیاریە بەخۆم بەخشراوە ئەری بۆلە ماڵی دایك و باوکی دانە نیشت بزانێ دیاری بۆ دەهێنرا یان نا، سوێند بەو کەسەی گیانی موحەممەدی بە دەستە هەر کەسێك شتێك لەماڵی موسوڵمانان هەلگرێت بەبێ پرس لە ڕۆژی قیامەت دێت ولە سەر شا نی هەڵی گرتووە ئەگەر وشترێك بێت دێت دەنكی دێت ئەگەر مانگایەکیش بێت دێت وبۆڕەی دێت، ئەگەر مەڕێکیش بێت دێت و دەباڕێنێ ، بەڕاستی پێم ڕاگەیاندن.**

٢٧٥١- أمسكوا عليكم أموالكم و لا تفسدوها فإنه من أعمر عمرى فهي للذي أعمرها حيا و ميتا و لعقبه.

(صحيح) ( حم م ) عن جابر . (الإرواء ١٦٠٦)

**٢٧٥١- دەست بە ماڵەکانتانەوە بگرن و ، لە ناوی مەدەن چونکە هەرکەسێك شتێکی بە کە سێك دا بۆ درێژای تەمەنی بۆ ئەو کەسە دە بێت بە زیندوویی و بە مردوویی و بۆ نە وە کەشی دەبێت دوای خۆی.**

٢٧٥٢- إن مثل الذي يعود في عطيته كمثل الكلب أكل حتى إذا شبع قاء ثم عاد في قيئه فأكله.

(صحيح) ( هـ ) عن أبي هريرة . (الصحيحة ١٦٩٩)

**٢٧٥٢- نمونەی ئەو کەسەی پاشگەز دەبێتەوە لە دیاریەکەی نمونەی سەگێکە خەریکی خوا ردن بێت تا تێر دەبێت ئینجا دەڕشێتەوە دوای ئەوە دەگەڕێتەوە ڕشا نەوەکەی خۆی دەخواتەوە.**

٢٧٥٣- إني نهيت عن زبد المشركين.

(صحيح) ( د ت ) عن عياض بن حمار . (الروض النضير ٧٤١)

**٢٧٥٣- لێم قەدەغە کراوە پەنیری (( دیاری )) بتپەرستان وەربگرم.**

٢٧٥٤- إني لا أقبل هدية مشرك.

(صحيح) ( طب ) عن كعب بن مالك . (الصحيحة ١٧٢٧)

**٢٧٥٤ – من ديا رى بتپەرست وەرناگرم.**

٢٧٥٥- إنا لا نقبل شيئا من المشركين.

(صحيح) ( حم ك ) عن حكيم بن حزام . (الصحيحة ١٧٠٧)

**٢٧٥٥- ئێمە هيچ شتێك لە بتپەرستا ن وەرناگرين.**

٢٧٥٦- ألا رجل يمنح أهل بيت ناقة تغدو بغداء و تروح بعشاء ؟ إن أجرها لعظيم.

(صحيح) ( م ) عن أبي هريرة . (الصحيحة ٣٦٠١)

**٢٧٥٦- ئايا پياوێك هەيە وشترێك ببەخشێت بەماڵێك بەيانيان وئێواران شيرى لێ بخۆن، ئەوە پاداشتى مەزنى هەيە.**

٢٧٥٧- أيما رجل أعمر رجلا عمرى له و لعقبه فهي له و لمن يرثه من عقبه موروثة.

(صحيح) ( ن ) عن ابن الزبير . (الإرواء ١٦٠٦)

**٢٧٥٧- هەر كەسێك بە ( عمرى ) بۆ ماوەى ژيان شتێك بە كەسێك بدات بۆ ئەو كەسە دەبێت و دواى خۆشى بۆ ميراتگرەكەيەتى.**

٢٧٥٨- أيما رجل أعمر عمرى لرجل له و لعقبه فإنها للذي أعطيها لا ترجع إلى الذي أعطاها.

(صحيح) ( م ٣ ) عن جابر . (الإرواء ١٦٠٦)

**٢٧٥٨- هەر كەسێك ماڵێكى بە ( عمرى ) بۆ ماوەى ژياندا بە كەسێكى تر بۆ ئە و كەسە و ئەوەكەى دەبێت و جارێكى تر ناگەڕێتەوە بۆ بەخشەرى.**

٢٧٥٩- تبسمك في وجه أخيك لك صدقة و أمرك بالمعرف و نهيك عن المنكر صدقة و إرشادك الرجل في أرض الضلال لك صدقة و إماطتك الحجر و الشوك و العظم عن الطريق لك صدقة و إفراغك من دلوك في دلو أخيك لك صدقة.

(صحيح) ( خد ت حب ) عن أبي ذر . (الصحيحة ٥٧٢)

**٢٧٥٩- زەردەخەنەت بەڕوى براكەتدا خێرە ، فەرمان كردنت بە چاكە و ڕێگريت كردنت لە خراپە خێرە چاوساخى كردنى كەسێك لە شوێنێكدا ڕێگاى ون كردبێت خێرە، دورخستنەوەى بەردێك و دڕكێك و ئێسقانێك لەسەر ڕێگا خێرە بەتاڵ كردنى سەتڵەكەت لەسەتڵى براكەتدا خێرە.**

٢٧٦٠- تهادوا تحابوا.

(حسن) ( ع ) عن أبي هريرة . (الإرواء ١٦٠٠)

**٢٧٦٠- دیاری بەیەكتر بدەن باخۆشەویست بن لەلای یەكتر.**

٢٧٦١- الرقبى جائزة.

(صحيح) ( ن ) عن زيد بن ثابت. (الإرواء ١٦٠٨)

**٢٧٦١- ڕوقبا[١٩] ڕەوایە.**

٢٧٦٢- العائد في هبته كالعائد في قيئه .

(صحيح) ( حم ق د ن هـ ) عن ابن عباس. (صحيح النسائي ٣٦٩٦)

**٢٧٦٢-ئەو كەسەی لەبەخششەكەی پەشیمان بێتەوە وەكو ئەو كەسەیە ڕشانەوەی خۆیەی بخواتەوە.**

٢٧٦٣- العمرى جائزة لأهلها .

(صحيح) (حم ق ن) عن جابر ( حم ق د ن ) عن أبي هريرة ( حم د ت ) عن سمرة ( ن ) عن زيد بن ثابت وابن عباس. (الإرواء ١٦٠٧)

**٢٧٦٣- عومرا[٢٠] ڕەوایە بۆكەسانی خۆی**

٢٧٦٤- العمرى جائزة لأهلها و الرقبى جائزة لأهلها .

(حسن) (حم ن ) عن جابر. (الإرواء ١٦٠٩)

**٢٧٦٤- (( عومرا )) بەخشین بۆماوەی تەمەن ڕەوایە بۆكەسانی شایستە ، (( ڕوقبا )) لەئەستۆگرتن ڕەوایە بۆكەسانی خۆی.**

٢٧٦٥- العمرى جائزة لمن أعمرها و الرقبى جائزة لمن أرقبها و العائد في هبته كالعائد في قيئه.

(صحيح) (حم ن) عن ابن عباس. (الإرواء ١٦٠٩)

**٢٧٦٥- (( عومرا )) بەخشین بۆ ماوەی تەمەن ڕەوایە بۆ ئەو كەسەی پێی دەدرێت و، (( ڕوقبا )) خستنە گەردن ڕەوایە بۆ ئەو كەسەی پێی دەدرێت و ، ئەو كەسە كە بەخشینی خۆی دەگەڕێتەوە وەكو ئەوەیە ڕشانەوەی خۆی بخواتەوە.**

---

[١٩] (( ڕوقبا )) ئەوەیە كەسێك بەكەسێكی تر بڵێت ئەم خانووەم بەخشی بەتۆ ئەگەر لەپێش مندا مردی خانوەكە بگەڕێتەوە بۆ خۆم ئەگەر منیش لە پێش تۆدا مردم خانوەكە بۆ خۆت.

[٢٠] (( العُمری )) ئەوەیە بەشێك ببەخشی بەكەسێك بۆ ماوەی تەمەنی بڵێ ئەم شتە بۆ هەتا ماوی و دوای مردنیش بگەڕێتەوە بۆ خۆم.

٢٧٦٦- العمرى لمن وهبت له.

(صحيح) (م د ن) عن جابر. (الإرواء ١٦٠٧)

**٢٧٦٦- عومرا بەخشین بۆماوەی تەمەن بۆئەوکەسەیە پێی دەبەخشرێت .**

٢٧٦٧- العمرى ميراث لأهلها .

(صحيح) (م) عن جابر وأبي هريرة. (الإرواء ١٦٠٧)

**٢٧٦٧- عومرا میراتیە بۆ کەسوکاری ئەوکەسانەی پێیاندەدرێت.**

٢٧٦٨- ليس لنا مثل السوء العائد في هبته كالكلب يعود في قيئه.

(صحيح) ( حم خ ت ن ) عن ابن عباس ( عد قط ) عن أبي بكر. (الإرواء ١٦٢١)

**٢٧٦٨- نموونەی ناشیرین بۆئێمە نیە، پاشگەزبوو لەدیاریەکەی وەکو سەگێکە ڕشانەوەی خۆی بخواتەوە.**

٢٧٦٩- ما آتاك الله من أموال السلطان من غير مسألة و لا إشراف فكله و تموله.

(صحيح) ( حم ) عن أبي الدرداء. (الصحيحة ٢٢٠٩)

**٢٧٦٩- ئەوەی خوا پێیدایت لەماڵی فەرمانڕەوای بەبێ داواکردن وبۆپەرۆشبوون، بخۆو کەڵکی لێ وەرگرە.**

٢٧٧٠- ما آتاك الله من هذا المال من غير مسألة و لا إشراف فخذه فتموله أو تصدق به و ما لا فلا تتبعه نفسك.

(صحيح) ( ن ) عن عمر. (الصحيحة ٢٢٠٩)

**٢٧٧٠- ئەوەی خوا پێتدا لەئەم ماڵەبەبێ داواکردن و حەزلێکردن وە ریگرە و خەرجی بکە یان بیکە بە خێر. ئە گەرنا خۆت بەهیلاك مەدە بۆداوا کردنی .**

٢٧٧١- مثل الذي يتصدق ثم يرجع في صدقته كمثل الكلب يقيء ثم يعود في قيئه فيأكله.

(صحيح) ( م ن هـ ) عن ابن عباس. (الإرواء ١٦٤١)

**٢٧٧١- نمونەی ئەوکەسەی خێردەکات ولێی پاشگەزدەبێتەوە، نمونەی ئەو سەگەیە دەڕشێتەوە و ڕشانەوەکەی خۆی دەخواتەوە.**

٢٧٧٢- مثل الذي يسترد ما وهب كمثل الكلب يقيء فيأكل قيئه فإذا استرد الواهب فليوقف فليعرف بما استرد ثم ليدفع إليه ما وهب.

(حسن)( د ) عن ابن عمرو. (الصحيحة ٢٢٨٢)

**٢٧٧٢- نمونەى ئەو كەسەى لەديارى خۆى پەشيمان دەبێتەوە وەكو سەگێكە بڕشێتەوە ، ڕشانەوەى خۆى بخواتەوە، جا ئەگەر بەخشەرلەبەخشينى خۆى پاشگەزبويەوە ، ڕابگيرێت و لێى بپرسرێت بۆچى پاشگەز بوەتەوە ئينجا ديارىيەكەى بۆبگێڕدرێتەوە.**

٢٧٧٣- من آتاه الله من هذا المال شيئا من غير أن يسأله فليقبله فإنما هو رزق ساقه الله إليه.

(صحيح) ( حم ) عن أبي هريرة. (الترغيب ٨٤٩)

**٢٧٧٣- هەركەسێك خواى گەورە لەم ماڵەى پێ بەخشى بێ ئەوەى داواى بكات باوەڕيگرێت، چونكە ئەوە ڕۆزيەكە خواى گەورە بۆى ناردووە.**

٢٧٧٤- من استعملناه على عمل فرزقناه رزقا فما أخذ بعد ذلك فهو غلول.

(صحيح) ( د ك ) عن بريدة. (غاية المرام ٤٥٥)

**٢٧٧٤- هەركەسيكمان بەكارهێنا لەسەر كارێك وڕۆزيەكمان پێدا، جگەلەوە هەرچيەك وەربگرێت ناپاكى و دزيە.**

٢٧٧٥- من استعملناه منكم على عمل فكتمنا مخيطا فما فوقه كان ذلك غلولا يأتي به يوم القيامة.

(صحيح) ( م د ) عن عدي بن عميرة. (الترغيب ٧٨١)

**٢٧٧٥- هەركەسيكمان لەئێوەبەكارهێنالەسەركارێك و دەرزييەك يان زياترى لێ شاردينەوە ئەو ناپاكيە و، لەگەڵ خۆى دەيهێنێ لەڕۆژى قيامەتدا.**

٢٧٧٦- من استعملناه منكم على عمل فليجئ بقليله و كثيره فما أوتي منه أخذ و ما نهي عنه انتهى.

(صحيح) ( م د ) عن عدي بن عميرة. (الترغيب ٧٨١)

**٢٧٧٦- هەركەسمان، لە ئێوە خستەسەر كارێك باكەم وزۆريمان بۆبهێنێ، هەرچى پێدرا وەربيگرێت و، هەرچى لێ قەدەغەكراوازى لێبهێنێ.**

٢٧٧٧- من أعمر رجلا عمرى فهي له و لعقبه يرثها من يرثه من عقبه.

(صحيح) ( م د ن هـ ) عن جابر. (الإرواء ١٦٠٨)

**٢٧٧٧- هەركەسێك شتێك بە (( عومرا )) بۆ ماوەى تەمەن بداتە پياوێك، بۆ ئەو كەسە و نەوەكەى دەبێت ميراتگرانى بەميرات دەيگرن.**

٢٧٧٨- من أعمر شيئا فهو لمعمره محياه و مماته و لا ترقبوا فمن أرقب شيئا فهو سبيل الميراث.

(صحيح) ( د ن ) عن زيد بن ثابت. (الإرواء ١٦٠٩ )

**٢٧٧٨- کەسێك شتێکی کرد بە((عومرا)) بۆ ماوەی تەمەن بۆ ئەو کەسە دەبێت لەژیانی و پاش مردنی، (روقبا)یش مەکەن، چونکە ئەوە ڕێگای میراتییە.**

٢٧٧٩- من أعمر شيئا فهو له حياته و بعد موته.

(صحيح) ( ن حب ) عن جابر. (الإرواء ١٦٠٩)

**٢٧٧٩- کەسێك شتێکی کرد بە((عومرا)) بۆ ماوەی تەمەن بۆ ئەو کەسە دەبێت لەژیانی و لە پاش مردنی.**

٢٧٨٠- من شفع لأخيه شفاعة فأهدى له هدية عليها فقبلها منه فقد أتى بابا عظيما من أبواب الربا.

(حسن) ( حم د ) عن أبي أمامة. (المشكاة ٣٧٥٧)

**٢٧٨٠- هەر کەسێك تکایەك بکات بۆ براکەی، ئەویش لەسەر ئەوە دیارییەکی پێی بدات و وەریبگرێت، ئەوە چووەتە دەرگایەکی گەورە لەدەرگاکانی سوو (الربا).**

٢٧٨١- من منح منحة غدت بصدقة و راحت بصدقة صبوحها و غبوقها.

(صحيح) ( م ) عن أبي هريرة.

**٢٧٨١- هەر کەسێك بەخششێك ببەخشێت لەڕۆیشتن و هاتنیدا بۆی دەبێتە خێر، لەبەیانی و دەمە و ئێوارەدا.**

٢٧٨٢- من منح منحة ورق أو منحة لبن أو أهدى زقاقا فهو كعتق نسمة.

(صحيح) ( حم ت حب ) عن البراء. (المشكاة ١٩١٧)

**٢٧٨٢- هەر کەسێك پارەیەکی دا بەقەرز، یان شیری بەخشی ، یان ڕێگای بەونبوویەك یان نابینایەك پیشاندا، وەکو ئەوەیە کەسێکی ئازاد کردبێت.**

٢٧٨٣- نعم الصدقة اللقحة الصفي منحة و الشاة الصفية منحة يغدو بإناء و يروح بإناء.

(صحيح) ( مالك خ ) عن أبي هريرة. (الصحيحة ٢٥٨٧)

**٢٧٨٣- باشترین زەکات وشترێکی باشی شیردار ، یان مەڕێکی دابەستەی شیردار ، بەیانی و ئێوارە ، قاپی شیری هەبێت.**

٢٧٨٤- هدايا العمال غلول.

(صحيح) ( حم هق ) عن أبي حميد الساعدي. (الإرواء ٢٦٨٩)

**٢٧٨٤- دیاری کار مەندان ((غلول)) ناپاکیە.**

٢٧٨٥- الهدية إلى الإمام غلول.

(صحيح) ( طب ) عن ابن عباس. (الإرواء ٢٦٨٩)

**٢٧٨٥- دیاری بۆ پێشەوا ناپاكی یە.**

٢٧٨٦- لا ترقبوا أموالكم فمن أرقب شيئا فهو لمن أرقبه.

(صحيح) ( ن ) عن ابن عباس. (الإرواء ١٦٠٨)

**٢٧٨٦- ماڵەكانتان بە( ڕوقبا ) مەدەن، هەر كەسێكیش وا بكات ماڵەكە دەبێتە ماڵی ئەو كەسەی پێیدەدا.**

٢٧٨٧- لا ترقبوا و لا تعمروا فمن أعمر شيئا أو أرقبه فهو للوارث إذا مات.

(صحيح) ( د ن حب ) عن جابر. (الإرواء ١٦٠٧)

**٢٧٨٧- نە( ڕوقبا ) بكەن و نە( عومرا ) بكەن، هەر كەسێكیش وایكرد ماڵەكە دەگەڕێتەوە بۆ میراتگرەكەی ئەگەر ئەو كەسە مرد[٢١].**

٢٧٨٨- لا عمرى فمن أعمر شيئا فهو له.

(صحيح) ( حم ن هـ ) عن أبي هريرة. (الإرواء ١٦٠٩)

**٢٧٨٨- ( عومرا ) نییە، هەر كەسێكیش بیكات بۆ ئەو كەسە دەبێت كە پێ ی بەخشراوە.**

٢٧٨٩- لا عمرى و لا رقبى فمن أعمر شيئا أو أرقبه فهو له في حياته و مماته.

(صحيح) ( حم ن هـ ) عن ابن عمر.

**٢٧٨٩- ( عومرا ) بەخشین بۆ ماوەی تەمەن نییەو، ( ڕوقبا ) لەگەردن پێچان نییە، ئەگەر كەسێكیش بەوانە هەڵسا، ماڵەكەی بۆ ئەو كەسە دەبێت لەژیانی و لە پاش مردنی.**

٢٧٩٠- لا يحل لرجل أن يعطي عطية أو يهب هبة فيرجع فيها إلا الوالد فيما يعطي ولده و مثل الذي يعطي العطية ثم يرجع فيها كمثل الكلب يأكل فإذا شبع قاء ثم عاد في قيئه.

(صحيح) ( حم ٤ ك ) عن ابن عمر وابن عباس. (الإرواء ١٦٢١)

**٢٧٩٠- ڕەوا نییە بۆ كەسێك خەڵاتێك یان دیارییەك ببەخشێت و لێی پاشگەز بێتەوە، تەنها باوك نەبێت لەو شتەی كەبەكوڕەكەی دەبەخشێت، نموونەی ئەو كەسەیش كەدیارییەك دەبەخشێت و لێی پاشگەز دەبێتەوە، وەكو سەگێكە كەتێر دەبێت دەڕشێتەوە دوایی دەگەڕێتەوە ڕشانەوەكەی خۆی دەخواتەوە.**

٢٧٩١- لا يرجع أحد في هبته إلا الوالد من ولده و العائد في هبته كالعائد في قيئه.

(صحيح) ( حم ن هـ ) عن ابن عمرو. (المشكاة ٣٠٢٠)

---

[٢١] ماڵەكە دەبێتە میراتی بۆ كەس و كاری ئەو كەسەی شتەكەی پێبەخشراوە.

**٢٧٩١- كەس بۆی نییە لەدیاری خۆی پاشگەز ببێتەوە، تەنها باوك نەبێت بەرامبەر كوڕەكەی، پاشگەز بوویش لەدیاری خۆی وەكو بخۆری ڕشانەوەی خۆیەتی.**

٢٧٩٢- يا معشر الأنصار ! أمسكوا عليكم أموالكم لا تعمروها فإنه من أعمر شيئا حياته فهو له حياته و موته.

(صحيح) ( ن ) عن جابر. (الإرواء ١٦٠٨)

**٢٧٩٢- ئەی كۆمەڵی (( ئەنسارەكان )) یاردەدەرەكان! ماڵەكانتان بپارێزن و مەیدەن بە( عومرا ) مەی بەخشن بۆ ماوەی تەمەن، چونكە كەسێك ئەوە بكات، بۆ ئەو كەسە دەبێت كە پێی دەبەخشێت لەژیانی و لە پاش مردنی.**

٢٧٩٣- لا تجوز لامرأة هبة في مالها إلا بإذن زوجها إذا ملك زوجها عصمتها.

(صحيح) ( حم ن هـ ) عن ابن عمرو ( هـ ) عن كعب بن مالك. (الترغيب ٩٤٠)

**٢٧٩٣- هیچ ئافرەتێك بۆی نییە لەماڵەكەی خۆی ببەخشێت بەبێ مۆڵەتی هاوسەرەكەی، ئەگەر پیاوەكەی خاوەنی پەیوەندی ژن و مێردایەتی بێت.**

## بابەتی الفرائض

٢٧٩٤- الله و رسوله مولى من لا مولى له و الخال وارث من لا وارث له.

(حسن) ( ت هـ ) عن عمر . (الإرواء ١٦٩٦)

**٢٧٩٤- خوا و پێغەمبەرەكەی ، پشگیری هەر كەسێكن سەرپەرشتیاری نەبێت ، خاڵۆیش میراتگری ئەو كەسەیە میراتگری نی یە .**

٢٧٩٥- أما بعد فإن أصدق الحديث كتاب الله و إن أفضل الهدي هدي محمد و شر الأمور محدثاتها و كل محدثة بدعة و كل بدعة ضلالة و كل ضلالة في النار أتتكم الساعة بغتة بعثت أنا و الساعة هكذا صبحتكم الساعة و مستكم أنا أولى بكل مؤمن من نفسه من ترك مالا فلأهله و من ترك دينا أو ضياعا فإلي و علي و أنا ولي المؤمنين.

(صحيح) ( حم م ن هـ ) عن جابر . (الترغيب ٥٠)

**٢٧٩٥- پاشان : ڕاسترین قسە كیتابی خوای گەورەیە ، چاكترین ڕێنومایش ڕێنومایی موحەممەدە ، خراپترین كرداریش داهێنراوەكانە و ، هەموو داهێنراوێكیش بیدعەیە و ، هەموو بیدعەیەكیش گومراییە و ، هەموو گومراییەكیش لە ئاگردایە ، لەناكاو**

**قیامەتتان بۆ دێت ، من لەگەڵ قیامەتتدا ئاوها ڕەوانە کراوم[٢٢] ، لەوانەیە سەر لەبەیانیەك یان ئێوارانێك قیامەت هەڵسێت ، من لە پێشترم بۆ هەموو موسوڵمانێك لە خۆی ، کەسێك ماڵێك بەجێبهێڵێ بۆ کەس و کارەکەیەتی ، هەر کەسێکیش قەرزێك یان خاوو خێزان بەجێبهێڵێ ئەوە بۆ منە و لەسەر منە ، من سەرپەرشتیاری باوەڕدارانم.**

٢٧٩٦- أنا أولى بالمؤمنين في كتاب الله فأيكم ما ترك دينا أو ضيعة فادعوني فأنا وليه و أيكم ما ترك مالا فليؤثر بماله عصبته من كان.

(صحيح) ( م ) عن أبي هريرة . (الإرواء ١٤٠٥)

**٢٧٩٦- من لە پێش ترم بە باوەڕداران لە کیتابی خوادا ، هەرکامتان لە پاش خۆی قەرز یان منالی بەجێهێشت ئاادارم بکەن من سەرپەرشتیاریم ، هەر کەسیشتان ماڵێکی بەجێهێشت با تەرخانی بکات بۆ کەس و کارەکەی هەر کەس هەن .**

٢٧٩٧- أنا أولى بالمؤمنين من أنفسهم فمن توفي من المؤمنين فترك دينا فعلي قضاؤه و من ترك مالا فهو لورثته.

(صحيح) ( حم ق ن هـ ) عن أبي هريرة . (الإرواء ١٤٠٥)

**٢٧٩٧- من لە پێشترم بۆ ئیمانداران لە خوددی خۆیان ، هەر کەسێك لە باوەڕداران مرد و قەرزار بوو ، قەرزەکەی لەسەر منە بیدەمەوە ، هەرکەسیش ماڵی بەجێهێشت بۆ میراتگرەکانیەتی .**

٢٧٩٨- أنا أولى بكل مؤمن من نفسه فمن ترك دينا أو ضيعة فإلي و من ترك مالا فلورثته و أنا مولى من لا مولى له أرث ماله و أفك عانيه و الخال مولى من لا مولى له يرث ماله و يعقل عنه[٢٣].

(حسن) ( د ) عن المقدام . (الإرواء ١٦٩٩)

**٢٧٩٨- من لە پێشترم بو هەموو بڕوادارێك لە خوددی خۆی ، جا هەرکەسێك قەرز یان منالی لە پاش بە جێما ، من لێ ی بەرپرسم ، هەرکەسێکیش ماڵی بەجێهێشت ئەوە بۆ میراتگرەکانیەتی ، من سەرپەرشتیاری ئەو کەسەم کە کەس و کاری نەبێت ، ماڵەکەی بە**

---

[٢٢] لەکاتی ئەو فەرمایشتەدا پێغەمبەر سەلامەت و سەلامی خوای لێ بێت هەردوو پەنجەی شایە تمان و پەنجە گەورەی بەیەکەو بەرزکردەوە.

[٢٣] ((يعقل عنه)) واتە ئەگەر خوێنبایی لەسەر بوو خاڵ و خزم و کەس و کار بۆ دەدەنەوە چونکە ((العاقلە)) بە کەس و کاردەوترێت.

**ميراتى دەگرم و ديلەكەى ئازاد دەكەم ، خالۆيش خاوەنى كەسێكە كەس و كارى نەبێت ، ماڵەكەى بە ميراتى دەگرێت و خوێنبايى بۆ دەدات .**

٢٧٩٩- أنا أولى بكل مؤمن من نفسه فمن ترك دينا فعلي و من ترك مالا فلورثته.

(صحيح) ( حم د ن ) عن جابر . (الإرواء ١٤٠٤)

**٢٧٩٩- من لە پێشترم بۆ هەموو برواداريك لە خۆى ، هەر كەسێك قەرزێكى لە پاش خۆى بەجێهێشت من لێى بەرپرسم ، هەركەسێكيش ماڵى بەجێهێشت بۆ ميراتگرەكانيەتى .**

٢٨٠٠- أنا وارث من لا وارث له أفك عانيه و أرث ماله و الخال وارث من لا وارث له يفك عانيه و يرث ماله.

(صحيح) ( د ك ) عن المقدام . (الإرواء ١٦٩٩)

**٢٨٠٠- من ميراتگرى ئەو كەسەم ميراتگرى نييە ، لەديلى ئازادى دەكەم ، ماڵەكەشى بە ميراتى دەگرم ، خالۆيش ميراتگرى ئەو كەسەيە ميراتگرى نەبێت ، لەديلى ئازادى دەكات و ماڵەكەى بە ميراتى دەگرێت .**

٢٨٠١- إن الله إذا أطعم نبيا طعمة فهي للذي يقوم من بعده.

(صحيح) ( هـ ) عن أبي بكر . (الإرواء ١٢٢٨)

**٢٨٠١- خواى گەورە ئەگەر داهات و دەسكەوتێكى دايە پێغەمبەرێك دەمێنێتەوە بۆ ئەوەى هەڵدەسێت بەسەرپەرشتيارى كارو بارى موسوڵمانان لە دواى خۆى.**

٢٨٠٢- الخال وارث.

(صحيح) ( ابن النجار ) عن أبي هريرة . (الصحيحة ١٨٤٨)

**٢٨٠٢- خاڵۆ ميراتگرە.**

٢٨٠٣- الخال وارث من لا وارث له.

(صحيح) ( ت ) عن عائشة ( عق ) عن أبي الدرداء . (الإرواء ١٦٩٦)

**٢٨٠٣- خاڵۆ ميراتگرى ئەو كەسەيە ميراتگرى نييە.**

٢٨٠٤- كل مال النبي صدقة إلا ما أطعمه أهله و كساهم إنا لا نورث.

(صحيح) ( د ) عن الزبير. (الصحيحة ٢٠٣٨)

**٢٨٠٤- هەموو ماڵى پێغەمبەر ﷺ خێرە ، خواردن و پۆشاكى خاوو خێزانەكەى نەبێت ، ئێمە هيچ بە ميراتى بەجێ ناهێڵين.**

٢٨٠٥- ما من مؤمن إلا أنا أولى به في الدنيا و الآخرة اقرءوا إن شئتم: ( النبي أولى بالمؤمنين من أنفسهم) فأيما مؤمن مات و ترك مالا فليرثه عصبته من كانوا و من ترك دينا أو ضياعا فليأتني فأنا مولاه .

(صحيح) ( خ ) عن أبي هريرة. (المشكاة ٣٠٤١)

**٢٨٠٥- من لە هەموو ئیمانداڕێك لە پێشترم لەخوددی خۆی ، لە دونیا و دواڕۆژدا ، ئەگەریش حەز دەكەن فەرموودەی خوای گەورە بخوێننەوە. ﴿النبي أولى بالمؤمنين من أنفسهم﴾ هەر ئیمانداڕێك مردوو ماڵێكی بەجێهێشت با كەس و كارەكەی بە میراتی ببەن، هەركەسێكیش قەرزی بەجێهێشت یان مناڵی لە دوا بەجێما من خاوەنی ئەوم .**

٢٨٠٦- من ترك مالا فلورثته و من ترك كلا فإلى الله و رسوله و أنا وارث من لا وارث له أعقل عنه و أرثه و الخال وارث من لا وارث له يعقل عنه و يرثه.

(حسن) ( حم هـ ) عن أبي كريمة. (الإرواء ١٦٩٦)

**٢٨٠٦- هەركەسێك ماڵ بەجێ بهێڵێ بۆ میراتگرانی دەبێت ، هەركەسێكیش پەككەوتوو بەجێ بهێڵێ بۆ خوا و پێغەمبەرە ، من میراتگری كەسێكم میراتگری نەبێت ، خوێنبایی بۆ دەدەم و میراتی لێ دەكرم خاڵۆ میراتگری كەسێكە میراتگری نەبێت خوێنبایی بۆ دەدات و میراتی لێ دەگرێت.**

٢٨٠٧- النبي لا يورث.

(صحيح) ( ع ) عن حذيفة. (الضعيفة ٣١٥٩)

**٢٨٠٧- پێغەمبەر میراتی لێ ناگیرێ.**

٢٨٠٨- و الذي نفس محمد بيده إن على الأرض من مؤمن إلا و أنا أولى الناس به فأيكم ما ترك دينا أو ضياعا فأنا مولاه و أيكم ما ترك مالا فإلى العصبة من كان.

(صحيح) ( م ) عن أبي هريرة. (الجنائز ٨٦)

**٢٨٠٨- سوێند بەوەی گیانی موحەممەدی بەدەستە ، هیچ كەسێك نی یە لەسەر زەویدا كە من لە پێشتر نەبم بۆی لە هەموو كەسێك، جا هەركەسێكتان قەرزی بەجێهێشت یان مناڵی لە پاش بەجێما، من لێی بەرپرسم، هەركەسێكیش ماڵێكی بەجێهێشت بۆ كەس و كارەكەیەتی هەر چۆن بن .**

٢٨٠٩- لا نورث ما تركنا صدقة.

(صحيح) ( حم ق ٣ ) عن عمر وعثمان وسعد وطلحة والزبير وعبدالرحمن بن عوف ( حم ق ) عن عائشة ( م ت ) عن أبي هريرة. (الصحيحة ٢٠٣٨)

**٢٨٠٩- میراتی بەجێناهێڵین ماڵەکانمان خێرە لە پاش خۆمان.**

٢٨١٠- لا نورث ما تركنا صدقة و إنما يأكل آل محمد في هذا المال.

(صحيح) ( حم ق د ن ) عن أبي بكر. (الصحيحة ٢٠٣٨)

**٢٨١٠- میراتیمان لێ ناگیرێت ، ئەوەی بەجێی دەهێڵین خێرە، خانەوادەی موحەممەدیش لە ئەم ماڵە دەخۆن.**

٢٨١١- لا نورث ما تركنا فهو صدقة و إنما هذا المال لآل محمد لنائبتهم و لضيفهم فإذا مت فهو إلى ولي الأمر من بعدي.

(صحيح) ( د ) عن عائشة. (الصحيحة ٢٠٣٨)

**٢٨١١- میراتیمان لێ ناگیرێت ، ئەوەی بە جێیدەهێڵن خێرە ، بەڵکو ئەم ماڵە تەنها بۆ خاوو خێزانی موحەممەدە بۆ سەغڵەتی میوانداریان ، هەر کاتێك منیش لە دونیا دەرچووم بۆ سەرپەرشتیاری موسوڵمانانە پاش خۆم.**

٢٨١٢- إذا استهل المولود ورث.

(صحيح) ( د هق ) عن أبي هريرة . (الصحيحة ١٥٣)

**٢٨١٢- ئەگەر دەنگی لێوەهات لە کاتی لەدایکبووندا میراتی دەگرێت.**

٢٨١٣- إذا أصاب المكاتب حدا أو ورث ميراثا فإنه يورث على قدر ما عتق و يقام عليه بقدر ما عتق منه.

(صحيح) ( د ت ك ) عن ابن عباس . (الإرواء ١٧٢٣)

**٢٨١٣- ئەگەر ئەو کۆیلەی نوسراوی ئازاد بوونی هەیە تاوانێکی کرد کە سزای لەسەر بوو، یان میراتییەکی بۆ جێ ما ، ئەوەندەی ئازاد کراوە میراتی بەشدەدرێت و ، ئەوەندەش سزا دەدرێت کە ئازاد کراوە.**

٢٨١٤- اقسموا المال بين أهل الفرائض على كتاب الله فما تركت الفرائض فلأولى رجل ذكر.

(صحيح) ( م د هـ ) عن ابن عباس . (الإرواء ١٦٨٧)

**٢٨١٤- ماڵ دابەش بکەن لە نێوان خاوەن مافەکاندا بە پێی پەڕاوی خوا ، هەرچیش مایەوە بۆ لە پێشترین کەسی نێر دەبێت.**

٢٨١٥- ألحقوا الفرائض بأهلها فما بقي فلأولى رجل ذكر.

(صحيح) ( حم ق ت ) عن ابن عباس . (الإرواء ١٦٨٧)

**٢٨١٥- بەشە دیاری کراوەکان بدەن بە خاوەنەکانیان ، هەرچیش مایەوە بۆ نزیکترین کەسی نێر نیە .**

٢٨١٦- اعلموا أنه ليس منكم من أحد إلا مال وارثه أحب إليه من ماله مالك ما قدمت و مال وارثك ما أخرت.

(صحيح) ( ن ) عن ابن مسعود . (الصحيحة ١٤٨٦)

**٢٨١٦- ئەوە بزانن هیچ کەسێك لە ئێوە نە ماڵی میراتگرەکەی خۆشەویستر نەبێت بە لایەوە لە ماڵی خۆی ، ماڵی خۆت ئەوەیە کە پێش خۆتی دەخەیت ، ماڵی میراتگرەکەیش ئەوەیە کە بۆی بەجێدەهێڵێت.**

٢٨١٧- أيكم مال وارثه أحب إليه من ماله ؟ فإن ماله ما قدم و مال وارثه ما أخر.

(صحيح) ( خ ن ) عن ابن مسعود . (الصحيحة ١٤٨٦)

**٢٨١٧- کامتان ماڵی میراتگرەکەی لا خۆشەویسترە لە ماڵی خۆی بەڕاستی ماڵی خۆی ئەوەیە کە پێش خۆی ، دەخات و ماڵی میراتگرەکەشی ئەوەیە کە دەیخاتە پاش خۆی.**

٢٨١٨- أيما رجل عاهر بحرة أو أمة فالولد ولد زنا لا يرث و لا يورث.

(صحيح) ( ت ) عن ابن عمرو . (المشكاة ٣٠٥٤)

**٢٨١٨- هەر پیاوێك سکی ئافرەتێك پڕ بکات بەزینا ئافرەتەکە ئازاد بێت یان کۆیلە منداڵەکە منداڵی زینایە ، نە میراتی دەگرێت و نە میراتیشی لێ دەگیرێت.**

٢٨١٩- قد آجرك الله و رد عليك في الميراث.

(صحيح) ( حم م ٤ ) عن بريدة. (صحيح ابن ماجه ٢٣٩٤)

**٢٨١٩- خوای گەورە پاداشتی کارەکەتی دایەوە ، لە میراتیشدا بۆت گەڕایەوە[٢٤].**

٢٨٢٠- القاتل لا يرث.

(صحيح) ( ت هـ ) عن أبي هريرة. (الإرواء ١٦٦٩)

**٢٨٢٠- بکوژ میراتی ناگرێت .**

٢٨٢١- كل قسم قسم في الجاهلية فهو على ما قسم و كل قسم أدركه الإسلام فإنه على قسم الإسلام.

(صحيح) ( د هـ ) عن ابن عباس. (الإرواء ١٧١٤)

---

**[٢٤] پێغەمبەر سەلات و سەلامی خوای لێ بێت بەکەسێکی فەرمووکە کەنیزەکێکی بەخشیبو بەدایکی مردو کەنیزەکەکەی بەمیراتی بۆ گەڕایەوە.**

٢٨٢١- هەموو دابەشكردنێك لە سەردەمی نەفامیدا دابەشكرابێت كراوە هەروەكو خۆی دەمێنێتەوە هەر دابەشكردنیش ئیسلام فریای كەوتبێت لەسەر دابەشكردنی ئیسلام دابەش دەكرێت.

٢٨٢٢- كل مستلحق بعد أبيه الذي يدعى له ادعاه ورثته من بعده من كان من أمة يملكها يوم أصابها فقد لحق بمن استلحقه و ليس له فيما قسم قبله من الميراث شيء و ما أدرك من ميراث لم يقسم فله نصيبه و لا يلحق إذا كان أبوه الذي يدعى له أنكره و إن كان من أمة لا يملكها أو من حرة عاهر بها فإنه لا يلحق و لا يورث و إن كان الذي يدعى له هو ادعاه فهو ولد زنا لأهل أمه من كانوا حرة أو أمة.

(حسن) ( هـ ) عن ابن عمرو. (المشكاة ٣٣١٨)

١٨٢٢-هەموو منداڵێك كەباوكی داوای بكات وە بڵێ منداڵی منە لەدوای خۆی میراتی لێ دەبات هەر منداڵێكیش لە كەنیزەك بوو بێت كەموڵكی خۆی بوو بێت لەو ڕۆژەدا كە لەگەڵی جووت بووە دەدرێت بەباوكی منداڵەكە كەداوای دەكات لەهەر میراتێكیش پێش ئەم داوایە دابەش كرابێت بەشی نیە، لەهەر میراتێكیش ئەم فریای بكەوێت دابەش نەكرا بێت بەری دەكەوێت، منداڵ نادرێت بەباوكێك كە بڵێن منداڵی ئەومو ئێستا ئینكاری لێ دەكات، ئەگەر منداڵەكەی لە نیزەكێك كەماڵی خۆی نەبوو یان لەئافرەتێكی ئازادی داوێن پیس بوو بوی ئەو منداڵە نادرێت بەو باوكە و میراتیشی لێ نابات، هەر چەند ئەو پیاوە داواشی بكات و بڵێ منداڵی منە، ئەوە منداڵی زینایە ((زۆڵە و)) دەدرێتەوە بە كەس و كاری دایكی جا كەنیزەك بێت یان ئافرەتی ئازاد بێت.

٢٨٢٣- للابنة النصف و لابنة الابن السدس و ما بقي فللأخت.

(صحيح) ( خ ) عن ابن مسعود. (الإرواء ١٦٨١)

١٨٢٣- كچ نیوەی[٢٥] هەیە كچی كوڕیش شەش یەكی هەیە ، هەرچیش دەمێنێتەوە بۆ خوشكە.

٢٨٢٤- ليس للقاتل شيء و إن لم يكن له وارث فوارثه أقرب الناس إليه و لا يرث القاتل شيئا.

(حسن) ( د ) عن ابن عمرو. (الإرواء ١٦٦٩)

٢٨٢٤-بكوژ هیچی نادرێتێ ، ئەگەر میراتگریشی نەبێت نزیكترین كەسی میراتگربەتی و، بكوژیش هیچ لە میراتی ناگرێت.

---

[٢٥] نیوەی میراتی هەیە لەمیراتی باوكی

٢٨٢٥- ليس للقاتل من الميراث شيء.

(صحيح) ( هق ) عن ابن عمرو. (الإرواء ١٦٦٩)

**٢٨٢٥- بكوژ هيچى لە ميراتى بەرناكەوێت .**

٢٨٢٦- ما كان من ميراث قسم في الجاهلية فهو على قسمة الجاهلية و ما كان من ميراث أدركه الإسلام فهو على قسمة الإسلام.

(صحيح) ( هـ ) عن ابن عمر. (الإرواء ١٧١٤)

**٢٨٢٦- هەرچى ميراتييەك لە نەفاميدا دابەشكرا بێت هەر لەسەر ئەو دابەشكردنە دەمێنێتەوە ، هەرچيش ئيسلام فرياى كەوتبێت لەسەر دابەشكرنى ئيسلامە .**

٢٨٢٧- لا يتوارث أهل ملتين.

(صحيح) ( ت ) عن جابر ( ن ك ) عن أسامة. (الإرواء ١٦٧٣)

**٢٨٢٧- خاوەنى دوو ئايينى جياواز ميراتى لە يەكتر ناگرن .**

٢٨٢٨- لا يتوارث أهل ملتين شتى.

(حسن) ( حم د هـ ) عن ابن عمرو. (الإرواء ١٦٧٣)

**٢٨٢٨- خاوەنى دوو ئايينى جياواز ميراتى لەيەك ناگرن.**

٢٨٢٩- لا يرث الكافر المسلم و لا المسلم الكافر.

(صحيح) ( حم ق ٤ ) عن أسامة. (الإرواء ١٧١٤)

**٢٨٢٩- نە بێباوەڕ ميراتى لە موسوڵمان ناگرێت ، نە موسوڵمانيش ميراتى لە بێباوەڕ دەگرێت.**

٢٨٣٠- و هل ترك لنا عقيل من رباع.

(صحيح) ( حم ق د ن هـ ) عن أسامة بن زيد. (صحيح ابن ماجه ٢٧٣٠)

**٢٨٣٠- ئايا عەقيل هيچ خانوويەكى بۆ بەجێ هێشتوين.**

٢٨٣١- ليس لقاتل ميراث.

(صحيح) ( هـ ) عن رجل. (الإرواء ١٦٦٩)

**٢٨٣١- بكوژ هيچ ميراتيەكى بەرناكەوێت.**

٢٨٣٢- ما أحرز الولد أو الوالد فهو لعصبة من كان.

(حسن) ( حم د هـ ) عن عمر. (الصحيحة ٢٢١٣)

**٢٨٣٢- ئەوەى كوڕ يان باوك بە دەستى دەهێنن بۆ كەس و كارێتى هەركێ بن .**

## بابەتی ڕاسپێرییەکان (الوصايا)

٢٨٣٣- إن الله أعطى كل ذي حق حقه فلا وصية لوارث و الولد للفراش و للعاهر الحجر.

(صحيح) ( ت ) عن عمرو بن خارجة . (المشكاة ٣٠٧٣)

**٢٨٣٣- خوای گەورە مافی هەموو مافدارێکی داوە ، ئیتر وەسیێت دروست نییە بۆ هیچ میراتگرێک منالیش بۆ پێخەفە و زیناکەری خاوەن هاوسەریش بەردە باران ((ڕجم)) کردنی بۆ هەیە**[٢٦] .

٢٨٣٤- إن الله أعطاكم ثلث أموالكم عند وفاتكم زيادة في أعمالكم.

(حسن) ( طب ) عن خالد بن عبيد السلمي . (الإرواء ١٦٤١)

**٢٨٣٤- خوای گەورە سێ یەکی ماڵەکانتانی لە کاتی مردنتاندا پێداون داوە ، وەکو زیادەیەك لە کردەوەکانتاندا**[٢٧].

٢٨٣٥- إن الله تعالى تصدق عليكم عند وفاتكم بثلث أموالكم و جعل ذلك زيادة لكم في أعمالكم.

(حسن) ( هـ ) عن أبي هريرة ( طب ) عن معاذ وأبي الدرداء . (الإرواء ١٦٤٠)

**٢٨٣٥- خوای گەورە خێری پێکردوون بە سێ یەکی ماڵەکانتاندا لە کاتی سەرە مەرگتاندا ، ئەوەشی کردووە بە زیادەیەك بۆ کردەوەکانتان.**

٢٨٣٦- إن الله تعالى قد أعطى كل ذي حق حقه فلا وصية لوارث.

(صحيح) ( هـ ) عن أنس . (المشكاة ٢٠٧٣)

**٢٨٣٦- خوای گەورە مافی هەموو مافدارێکی داوە ، بۆیە دروست نییە وەسیێت بکرێت بۆ میراتگر.**

٢٨٣٧- إن الله قد أعطى كل ذي حق حقه فلا وصية لوارث الولد للفراش و للعاهر الحجر و حسابهم على الله و من ادعى إلى غير أبيه أو انتمى إلى غير مواليه فعليه لعنة الله التابعة إلى يوم القيامة و لا تنفق امرأة شيئا من بيت زوجها إلا بإذن زوجها قيل: و لا الطعام ؟ قال: ذلك أفضل أموالنا.

(صحيح) ( حم ت ) عن أبي أمامة . (الإرواء ١٤١٣)

---

[٢٦] **واتە منالْ بۆ ئەو باوکەیە کە بەحەڵاڵی و لە پێخەفدا بە ڕێگەی شەرعی لەگەڵ دایکیدا جووت بۆ بێت بەهاوسەرهێری شەرعی ئەو منالەی بو بێت.**

[٢٧] **واتە زیاد لەو کردەوانەی کرددوتانن خوا مۆڵەتی داون لەو ماڵەی بەجێ ی دەهێڵن سێیەکی بکەن بەخێر لەسەرە مەرگ و کاتی نەخۆشی مردندا.**

**٢٨٣٧- خــوای گــەورە مــافی هــەموو مافــدارێکی داوە و، وەسـێت دروسـت نییـە بـۆ میراتگـر ، لێپرسینەوەشیان لای خوایە ، هەرکەسێکیش داخوازی ئەوە بکات کە کوڕی یـەکێکی تـرە جگـە لە باوکی ، یان خۆی خستە پاڵ سەرپەرشتیارێك جگە لە گەورەکـەی نـەفرینی خـوای لەسـەر بێت تـا ڕۆژی قیامەت بەبەردەوامی ، نـابێ ئافرەتێکیش هیچ لە مـاڵی مێردەکـەی هـیچ خـەرج بکات بەبێ مۆڵەتی ئەو، وتیان : خۆراکیش ؟ فەرمووی : ئەوە چاکترینی ماڵەکانمانە.**

٢٨٣٨- إن الله قسم لكل وارث نصيبه من الميراث و لا تجوز لوارث وصية الولد للفراش و للعاهر الحجر و من ادعى إلى غير أبيه أو تولى غير مواليه رغبة عنهم فعليه لعنة الله و الملائكة و الناس أجمعين و لا يقبل الله منه صرفا و لا عدلا.

(صحيح) ( حم هـ ) عن عمرو بن خارجة . (الإرواء ١٤١٣)

**٢٨٣٨- خوای گەورە بەشی هەموو میراتگرێکی دیاری کردووە لە میرات ، وەسێتیش دروست نییە بۆهیچ میراتگرێك منـاڵ بـۆ پێخەفـە و بـۆ زینـاکـەری هاوسـەردار بەردەبـانکردنـە ، هەرکەسێکیش وا نیشـان بـدات کە کوڕی کەسێکی تـرە جگە لـە بـاوکی ، یـان خـۆی بداتـە پاڵ سەرپەرشتیـارێك جگە لە لەسەر پەرشتیـاری خۆی[٢٨] ، نـەفرینی خـوا و فریـشتەکان و هەموو خەڵکی لەسەر بێت خوای گەورە نە فەرز و نە سوننەتـی لێ قبوڵ نـاکـات.**

٢٨٣٩- الثلث و الثلث كثير.

(صحيح) ( حم ق ن هـ ) عن ابن عباس . (الإرواء ١٦٤٧)

**٢٨٣٩- سێ یەك و ، سێ یەکیش زۆرە[٢٩].**

٢٨٤٠- الثلث و الثلث كثير إن صدقتك من مالك صدقة و إن نفقتك على عيالك صدقة و إن ما تأكل امرأتك من مالك صدقة و إنك أن تدع أهلك بخير خير من أن تدعهم يتكففون الناس.

(صحيح) ( م ) عن سعد . (المشكاة ٣٠٧١)

**٢٨٤٠- سێ یـەك و سـێ یـەکیش زۆرە، خێرکـردن لـە ماڵەکـەت خێـرە ، خـەرجکردنت بـۆ منداڵەکانت خێرە ، ئەوەشی هاوسـەرەکەت دەیخـوات لـە مـاڵی تـۆ خێـرە، تـۆیش ئەگـەر کەس و کارەکەت لە ماڵێکی چاکدا بەجێ بهێڵێ لەوە باشـترە بـەجێیان بهێڵـێ دەسـت لـە خەڵکی پان بکەنەوە.**

---

[٢٨] واتە خۆی لەسەر پەرشتیارەکەی بەرێ بکات و خۆی بکاتە کۆیلەی کەسێکی تر.

[٢٩] واتە بیکاتە خێرلەو ماڵەی بەجێ ی دێڵێت.

٢٨٤١- الدين قبل الوصية و ليس لوارث وصية.

(حسن) ( هق ) عن علي . (الإرواء ١٦٦٥)

**٢٨٤١- قەرز پێش وەسێت کردن ، دروستیش نی یه وەسیەت کردن بۆ میراتگر.**

٢٨٤٢- ما حق امرئ مسلم له شيء يريد أن يوصي فيه يبيت ليلتين إلا و وصيته مكتوبة عنده.

(صحيح) ( مالك حم ق ٤ ) عن ابن عمر. (الإرواء ١٦٥٢)

**٢٨٤٢- ئەگەر موسوڵمان شتێکی هەبێت بیەوێت ڕاسپێری بکات ، نابێت دوو شەوی بەسەردا تێپەڕێت و وەسێتەکەی به نوسراوی لای خۆی دانەنێت.**

٢٨٤٣- ما حق امرئ مسلم له شيء يوصي فيه يبيت ثلاث ليال إلا و وصيته عنده مكتوبة.

(صحيح) ( م ن ) عن ابن عمر. (الإرواء ١٦٥٢)

**٢٨٤٣- هەر موسوڵمانێك شتێکی هەبێت وەسێتی پێ بکات ، نابێ سێ شەوی بەسەردا تێپەڕ بێت تاکو وەسێتەکەی له لای خۆی نەنوسیبێت.**

٢٨٤٤- لا وصية لوارث.

(صحيح) ( قط ) عن جابر. (الإرواء ١٦٥٤)

**٢٨٤٤- دروست نی یه وەسێت کردن بۆ میراتگر.**

## بابەتی دۆزراوە (اللقطة)

٢٨٤٥- اعرف عددها و وعاءها و وكاءها ثم عرفها سنة فإن جاء صاحبها و إلا فهي كسبيل مالك.

(صحيح) ( مالك حم ق ٤ ) عن أبي بن كعب . (الإرواء ١٥٦٧)

**٢٨٤٥-ژمارەی بزانه و، ئەو شتەی کەتیایدایەو، پەتی بەستنەکەی و، یەك ساڵ پێناسەی بکه، ئەگەر خاوەنەکەی هات، ئەگەر نا وەکو ماڵی خۆتە.**

٢٨٤٦- ضالة المسلم حرق النار .

(صحيح) ( حم ت ن هـ حب ) عن الجارود بن المعلى ( حم هـ حب ) عن عبدالله بن الشخير ( طب ) عن عصمة بن مالك. (الصحيحة ٦٢١)

**٢٨٤٦- بزربووی موسوڵمان سوتاندنی ئاگره[٢٠].**

---

[٢٠] واته: ئەگەر کەسێك هەڵیگرتەوه بەنیازی دەست بەسەراگرتنی دبێتە هۆی چونه دۆزەخ بەئاگری دۆزەخ.
السراج المنير ج١ ص ٤٦٧

٢٨٤٧- ضوال المسلم حرق النار .

(صحيح) ( ابن سعد ) عن ابن الشخير. (الصحيحة ٦٢١)

**٢٨٤٧- شتە بزر بووەكانى موسوڵمان[٣١] بڵێسەى ئاگرە.**

٢٨٤٨- الضالة و اللقطة تجدها فانشدها و لا تكتم و لا تغيب فإن وجدت ربها فأدها و إلا فإنما هو مال الله يؤتيه من يشاء.

(صحيح) ( طب ) عن الجارود. (الصحيحة ٦٢١)

**٢٨٤٨- شتى بزر بوو و، دۆزراوە كە دەيدۆزيتەوە باسى بكەو مەيشارەوە پەنهانى مەكە، ئەگەر خاوەنەكەيت دۆزييەوە بيدەرەوە، ئەگەر نا ئەوە ماڵێكە خواى گەورە دەيداتە هەر كەسێك بيەوێت.**

٢٨٤٩- ما كان منها في طريق الميتاء و القرية الجامعة فعرفها سنة فإن جاء طالبها فادفعها إليه و إن لم يأت فهي لك و ما كان في الخراب ففيها و في الركاز الخمس.

(حسن) ( د ن ) عن ابن عمرو. (صحيح أبي داود ١٥٠٤)

**٢٨٤٩- ئەوانەى كە لەڕێگەى هاتوچۆى خەڵكى و لادێ ى ئاوەدانـدا دەيدۆزيتـەوە، يـەك سـاڵ بانگەوازى بۆ بكە، ئەگەر داواكارى (( خاوەنى )) هات پێى بدەرەوە، ئەگـەر نـەهات بـۆ خـۆت دەبێت، ئەوەشى لە وێرانەدا بدۆزێتەوە و گە نجينەدا پێنج يەك زەكاتى تيادايە.**

٢٨٥٠- من وجد دابة قد عجز عنها أهلها أن يعلفوها فسيبوها فأخذها فأحياها فهي له.

(حسن) ( د ) عن رجال من الصحابة. (الإرواء ١٥٦١)

**٢٨٥٠- هەر كەسێك وڵاخێكى دۆزييـەوە كـە خاوەنەكـەى نەيـدە تـوانى بـە خێوى بكـەن و بەرەڵايان كرد بوو، ئەگەر بيگێڕێتەوە و بەخێوى بكات دەبێتە ماڵى خۆى.**

٢٨٥١- من وجد لقطة فليشهد ذوي عدل و لا يكتم و لا يعبث فإن وجد صاحبها فليردها عليه و إلا فهو مال الله يؤتيه من يشاء.

(صحيح) ( حم د هـ ) عن عياض بن حمار. (المشكاة ٣٠٣٩)

**٢٨٥١- ئەگەر كەسێك شتێكى دۆزييەوە بادوو سەر ڕاست بكات بەشايەت و نەيـشارێتەوەو بەبێ هودەى دانەنێت ئەگەر خاوەنەكـەى دۆزييـەوە بـا بـۆى بگێڕێتـەوە ئەگـەر نـا ئـەوە ماڵێكە خواى گەورە دەيداتە هەر كەسێك بيەوێت.**

---

**[٣١] ضوال: كۆى (( ضالە )) واتە ون بو يان بزربو، هەڵگرتنەوەى بەنيازى دەست بەسەراگرتنى دەبێتە هۆى سوتانى ئەو كەسە بەئاگرى دۆزەخ.**

٢٨٥٢- نهى عن لقطة الحاج.

(صحيح) ( حم م د ) عن عبدالرحمن بن عثمان التيمي. (صحيح أبي داود ١٥١٢)

**٢٨٥٢- پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی کردووە لەهەڵگرتنی شتی ونبووی حاجیان.**

٢٨٥٣- من آوى ضالة فهو ضال ما لم يعرفها.

(صحيح) ( حم م ) عن زيد بن خالد. (المشكاة ٣٠٣٤)

**٢٨٥٣- هەر کەسێك ونبوویەکی گرتە خۆی بەنیازی دەست بەسەرگرتنی، کەسێکی گومڕایە ئەگەر پێناسەی نەکات.**

٢٨٥٤- لا يؤوي الضالة إلا الضال.

(حسن) ( حم د ن هـ ) عن جرير. (الإرواء ١٥٦٣)

**٢٨٥٤- کەسێك گومڕا نەبێت شتی ونبوو ناگرێتە خۆی بەنیازی دەست بەسەراگرتنی.**

# پەڕاوی هاوسەرگیری (النكاح)

## بابەتی هاندانی هاوسەرگیری

٢٨٥٥- يا معشر الشباب ! من استطاع منكم الباءة فليتزوج فإنه أغض للبصر و أحصن للفرج و من لم يستطع فعليه بالصوم فإنه له وجاء.

(صحيح) ( حم ق ٤ ) عن ابن مسعود. (الصحيحة ١٨٣٠)

**٢٨٥٥- ئەی کۆمەڵی لاوان هەر کەسێکتان توانای بوو با ژن بهێنێ، چونکە ئەوە پارێزەرترە بۆ چاوو، قایم ترە بۆ داوێن پاکی، هەر کەسێکیش توانای نەبوو، با ڕۆژوو بگرێت بێگومان ڕۆژوو بۆی دەبێتە قەڵغان.**

٢٨٥٦- إذا أتاكم من ترضون خلقه و دينه فزوجوه إن لا تفعلوا تكن فتنة في الأرض و فساد عريض.

( ت هـ ك ) عن أبي هريرة ( عد ) عن ابن عمر ( ت هق ) عن أبي حاتم المزني وماله غيره .

(حسن) (الصحيحة ١٠٢٢)

**٢٨٥٦- ئەگەر کەسێك هاتە لاتان و ڕازیبوون لەڕەوشت و دینی، ژنی لێ مارە بکەن، ئەگەر وانەکەن دەبێتە مایەی ئاژاوەو بەڵا لەسەر زەوی و خراپەیەکی بەرفراوان[1].**

٢٨٥٧- إذا تزوج العبد فقد استكمل نصف الدين فليتق الله في النصف الباقي.

(حسن) (هب) عن أنس. (الصحيحة ٦٢٦)

**٢٨٥٧- ئەگەر هەر بەندەیەك ژنی هێنا نیوەی دینەکەی تەواو کردووە، ئیتر با لەخوا بترسێت لەنیوەکەی تردا.**

---

[1] واتە ئەگەر ئافرەتەکانتان نەدان بەخاوەن دین و ڕەوشت و هەر چاوتان بڕیبوە ماڵ و سامان و پلەو پایە، لەئەنجامی دا ئافرەت و پیاوانی بێ هاوسەر زۆر دەبن ئەوەش سەر دەکێشێت بۆ زۆر بوونی زینا و بێ ئابڕویی.

٢٨٥٨- أربع من السعادة: المرأة الصالحة و المسكن الواسع و الجار الصالح و المركب الهنيء و أربع من الشقاء: المرأة السوء و الجار السوء و المركب السوء و المسكن الضيق.

(صحيح) ( ك حل هب ) عن سعد . (الصحيحة ٢٨٢)

**٢٨٥٨- چوار شت لەبەختەوەرییە: ئافرەتی باش، خانووی فراوان، دراوسێ ی چاك و، وولاخی سەرسوك، چوار شتیش بەدبەختیە: ئافرەتی خراپ و، دراوسێ ی خراپ و، وولاخی خراپ و، خانووی تەنگ.**

٢٨٥٩- انكحوا فإني مكاثر بكم.

(صحيح) ( هـ ) عن أبي هريرة . (الضعيفة ٢٩٦٠)

**٢٨٥٩- ژن و ژنخوازی بكەن بەڕاستی بەئێوەوە خۆم بەزۆرتر دەزانم.**

٢٨٦٠- إن المرأة تنكح لدينها و مالها و جمالها فعليك بذات الدين تربت يداك.

(صحيح) ( حم م ت ن ) عن جابر . (الصحيحة ٣٠٧)

**٢٨٦٠- ئافرەت خوازبێنی دەكرێت لەبەر دینداری و، دەوڵەمەندی و، جوانی، دیندارەكە لەدەست خۆت دەرمەكە دەستت خۆڵاوی، دەبێت[1].**

٢٨٦١- تزوج و لو بخاتم من حديد.

(صحيح) ( خ ) عن سهل بن سعد . (الإرواء ١٨٢٣)

**٢٨٦١- ژن بهێنە ئەگەر بەئەنگوستیلەیەكیش[2] بووە.**

٢٨٦٢- تزوجوا الأبكار فإنهن أعذب أفواها و أنتق أرحاما و أرضى باليسير.

(حسن) ( طب ) عن ابن مسعود . (الصحيحة ٦٢٣)

**٢٨٦٢- كچ بخوازن، چونكە دەمیان شیرین ترە منداڵیان زۆر تر دەبێت و، بەكەمیش ڕازی دەبێت.**

٢٨٦٣- تزوجوا الودود الولود فإني مكاثر بكم.

(صحيح) ( د ن ) عن معقل بن يسار . (الإرواء ١٨١١)

**٢٨٦٣- ئافرەتی هلوسەر پەرومر و بەشكوژا بخوازن ، چونكە بە ئێوە وە زۆرتر دەبم لەئۆمەتەكانی تر**

٢٨٦٤- تزوجوا فإني مكاثر بكم الأمم و لا تكونوا كرهبانية النصارى.

(صحيح) ( هق ) عن أبي أمامة . (الصحيحة ١٧٨٢)

---

[1] هەژاردەكەوی.

[2] ئەگەر هەر یەك موستیلەت هەبێت یان هەر یەك موستیلە بكەیتە مارەیی.

**٢٨٦٤- ژن بهێنن چونكە بە ئێوە خۆم لە ئوممەتەكانی تر بەزۆر تر دەزانم و، وەكو قەشە كۆشەنشینە گاورەكان مەبن.**

٢٨٦٥- تنكح المرأة لأربع: لمالها و لحسبها و لجمالها و لدينها فاظفر بذات الدين تربت يداك.

(صحيح) ( ق د ن هـ ) عن أبي هريرة . (الصحيحة ٣٠٧)

**٢٨٦٥- ئافرەت لەبەر چوار شت خواز بێنی دەكرێت: دەوڵەمەندی و، ڕەسەنی جوانی و، ئایین، جا خۆت بەختەوەركە بەدەست خستنی خاوەن ئایینەكە دەنا، دەستت خۆڵاوی دەبێت[1].**

٢٨٦٦- ثلاثة حق على الله تعالى عونهم: المجاهد في سبيل الله و المكاتب الذي يريد الأداء و الناكح الذي يريد العفاف.

(حسن) ( حم ت ن هـ ك ) عن أبي هريرة . (المشكاة ٣٠٨٩)

**٢٨٦٦- سێ كەس هەن مافی خۆیانە خوا كۆمەكیان بكات: ئەو كەسەی جیهاد دەكات لە پێناو خوادا، ئەو كۆیلەیش لەگەڵ سەر گەورەكەیدا نوسراوی ئازاد بوونی هەیە، ژنخوازێكیش مەبەستی داوێن پاكی بێت.**

٢٨٦٧- خير نسائكم الولود الودود المواسية المواتية إذا اتقين الله و شر نسائكم المتبرجات المتخيلات و هن المنافقات لا يدخل الجنة منهن إلا مثل الغراب الأعصم.

(صحيح) ( هق ) عن أبي أذينة الصدفي مرسلا وعن سلمان بن يسار مرسلا . (الصحيحة ١٨٤٩)

**٢٨٦٧- چاكترین ئافرەتانتان ئەوانەن منداڵیان زۆر دەبێت و ڕوویان گەشە و، هۆگری مێردەكانیانن، ئەگەر ترسی خوایان هەبێت، خراپترین ئافرەتەكانیشتان ئەوانەن جوانی خۆیان دەردەخەن و، لەخۆبازین[2]، ئەوانە ئافرەتی دوو ڕوون و لێیان ناچێتە بەهەشتەوە وەكو قەلەڕەشی باڵ سپی[3] نەبێت.**

٢٨٦٨- حق على الله عون من نكح التماس العفاف عما حرم الله.

(حسن) ( عد ) عن أبي هريرة . (المشكاة ٣٠٨٩)

**٢٨٦٨- خوای گەورە كۆمەكی كەسێك دەكات كەژن بهێنێ بەمەبەستی داوێن پاكی و دووركەوتنەوە لەقەدەغەكراوەكانی خوا.**

---

[1] واتە: ئەگەر وانەكەی هەژارو نەدار دەكەوی.

[2] لەخۆبازی كەشخە چیەكان.

[3] چونكە ئەو جۆرە قەلەڕەشە باڵ سپیانە زۆر كەم و ناوازەن لەناو قەلەڕەشەكاندا.

٢٨٦٩- الدنيا كلها متاع و خير متاع الدنيا المرأة الصالحة.

(صحيح) ( حم م ن ) عن ابن عمرو . (المشكاة ٣٠٨٣)

**٢٨٦٩- دونیا هەمووی بەهرەیە، چاکترین بەهرەی دونیاش ئافرەتێکی خواناسە.**

٢٨٧٠- سعادة لابن آدم ثلاث و شقاوة لابن آدم ثلاث فمن سعادة ابن آدم: الزوجة الصالحة و المركب الصالح و المسكن الواسع و شقوة لابن آدم ثلاث: المسكن السوء و المرأة السوء و المركب السوء.

(حسن) ( الطيالسي ) عن سعد. (الصحيحة ١٨٠٣)

**٢٨٧٠- سێ شت هەن لەبەختەوەری ئادەمیزادن و، سێ شتیش لە بەدبەختی ئادەمیزادن، ئەو سێ شتەی لەبەختەوەری ئەون: ژنی چاك و، وڵاخی سواری چاك و خانووی فراوان، بەدبەختیشی لەسێ شتدایە: خانووی تەنگ و ئافرەتی خراپ و، وڵاخی سواری چەموش.**

٢٨٧١- عليكم بالأبكار فإنهن أعذب أفواها و أنتق أرحاما و أسخن أقبالا و أرضى باليسير من العمل .

(حسن) ( ابن السني أبو نعيم في الطب ) عن ابن عمر. (الصحيحة ٦٢٤)

**٢٨٧١- کچە عازەب بخوازن، بەڕاستی دەمیان شیرین ترە و منداڵیان زۆر دەبێت و پێشوازیان گەرمترە و، بەکاری کەمیش ڕازی دەبن.**

٢٨٧٢- عليكم بالأبكار فإنهن أنتق أرحاما و أعذب أفواها و أقل خبا و أرضى باليسير .

(حسن) ( طس الضياء ) عن جابر. (الصحيحة ٦٢٣)

**٢٨٧٢- خوازبێنی کچان بکەن چونکە چاکتر منداڵیان دەبێت و بۆنی دەمیان خۆشترەو فڕو فێڵیان کەمترەو، بەکەمیش ڕازی دەبن.**

٢٨٧٣- عليكم بالباءة فمن لم يستطع فعليه بالصوم فإنه له وجاء .

(صحيح) ( طس الضياء ) عن أنس. (الروض ٩٢٣)

**٢٨٧٣- ژن بهێنن ئەگەر کەسێك توانای نەبوو باڕۆژوو بگرێت چونکە بۆی دەبێتە قەڵغان.**

٢٨٧٤- عليكم بشواب النساء فإنهن أطيب أفواها و أنتق أرحاما و أسخن أقبالا .

(صحيح) ( الشيرازي في الألقاب ) عن بشر بن عاصم عن أبيه عن جده. (الصحيحة ٦٢٤)

**٢٨٧٤- خوازبێنی کچە گەنجەکان بکەن چونکە بۆنی دەمیان خۆشترە و منداڵدانیان بە پیت ترەو پێشوازیان گەرمترە.**

٢٨٧٥- فهلا بكرا تلاعبها و تلاعبك و تضاحكها و تضاحكك ؟.

(صحيح) ( حم ق د ن ) عن جابر. (الإرواء ١٧٨٣)

**٢٨٧٥- كاشكێ كچێكت بخواستایە یاریت لەگەڵ بكردایەو یاری لەگەڵتا بكردایە لەگەڵیدا پێبەكەنیتایەو لەگەڵتا پێبەكەنیبا.**

٢٨٧٦- قلب شاكر و لسان ذاكر و زوجة صالحة تعينك على أمر دنياك و دينك خير ما اكتنز الناس.

(صحيح) ( هب ) عن أبي أمامة. (الروض ١٧٩)

**٢٨٧٦- دڵێكی سوپاسكوزار وزمانێكی یادكار و هاوسەرێكی چاكەخوازكە هاوكارت بێت لەسەر كارو باری دونیاو ئاینت، چاكترە ئەو گە نجینەی خەلكی پاشەكەوتی دەكەن.**

٢٨٧٧- لم ير للمتحابين مثل النكاح.

(صحيح) ( هـ ك ) عن ابن عباس. (الصحيحة ٦٢٥)

**٢٨٧٧- بۆ خۆشەویستان لەهاوسەرگیری چاكتر نیە.**

٢٨٧٨- ليتخذ أحدكم قلبا شاكرا و لسانا ذاكرا و زوجة مؤمنة تعينه على أمر الآخرة.

(صحيح) ( حم ت هـ ) عن ثوبان. (الصحيحة ٢١٧٦)

**٢٨٧٨- با هەر كەسێك لەئێوە دڵێكی سوپاس گوزار و زمانێكی یادكار و هاوسەرێكی برواداری هەبێت كە هاوكاری بێت لەسەر كارو باری دوا ڕۆژی.**

٢٨٧٩- من تزوج فقد استكمل نصف الإيمان فليتق الله في النصف الباقي.

(حسن) ( طس ) عن أنس. (الصحيحة ٦٢٦)

**٢٨٧٩- هەر كەسێك ژن بهێنێ نیوەی ئایینی تەواو كردووە، ئیتر با لەخوا بترسێت لەنیوەكەی تردا.**

٢٨٨٠- من كان منكم ذا طول فليتزوج فإنه أغض للبصر و أحصن للفرج و من لا فالصوم له وجاء.

(صحيح) ( ن ) عن عثمان. (الترغيب ١٩١١)

**٢٨٨٠- هەر كەسێ: لەئێوە دەست ڕۆیشتوو بوو، باژن بهێنێ چونكە دەبێتە مایەی چاو گرتن و پاراستنی داوێنی، هەر كەسێكیش نەیتوانی ڕۆژوو قەڵغانە بۆی.**

٢٨٨١- النكاح سنتي فمن لم يعمل بسنتي فليس مني و تزوجوا فإني مكاثر بكم الأمم يوم القيامة و من كان ذا طول فلينكح و من لم يجد فعليه بالصيام فإن الصوم له وجاء.

(صحيح) ( هـ ) عن عائشة. (الصحيحة ٢٣٨٣)

**٢٨٨١- ژن هێنان سوننەتی منە، جا هەر كەسێك پەیڕەوی سوونەتی من نەكات لەمن نییە، ژن بهێنن چونكە بەئێوە وە لە ئومەتەكانی زۆرترم لەڕۆژی قیامەتدا،**

**هەر کەسێکیش توانای هەیە باژن بهێنێ کەسێکیش هیچ شکی نەبرد با ڕۆژوو بگرێت چونکە ڕۆژوو قەڵغانە.**

٢٨٨٢- نهى عن التبتل.

(صحيح) ( حم ق د ) عن سعد ( حم ت ن هـ ) عن سمرة. (صحيح الترمذي ١٠٨٢)

**٢٨٨٢- پێغەمبەر ﷺ ژن نەهێنانی قەدەغەکردووە.**

## بابەتی قەدەغە کراوەکان

٢٨٨٣- لا يجمع بين المرأة و عمتها و لا بين المرأة و خالتها.

(صحيح) ( ق ن ) عن أبي هريرة. (صحيح أبي داود ١٨٠٣)

**٢٨٨٣- ڕەوا نییە کۆکردنەوە لەنێوان ئافرەتێك و پوری خۆشکی باوکی بێت یان خوشکی دایکی.**

٢٨٨٤- يحرم من الرضاعة ما يحرم من النسب.

(صحيح) ( حم ق د ن هـ ) عن عائشة ( حم م ن هـ ) عن ابن عباس. (الإرواء ١٩٣٤)

**٢٨٨٤- ئافرەت لە ڕێگەی شیرەوە حەرام دەبێت هەروەکو لەخزمایەتی نزیکەوە حەرام دەبێت.**

٢٨٨٥- لا تحرم الإملاجة و لا الإملاجتان.

(صحيح) ( حم م ن هـ ) عن أم الفضل. (الصحيحة ٣٢٥٩)

**٢٨٨٥- قوم و دووقوم شیر خواردن پێ ی حەرام نابێت.**

٢٨٨٦- لا تحرم المصة و لا المصتان.

(صحيح) ( حم م ٤ ) عن عائشة ( ن حب ) عن الزبير. (الإرواء ٢٢٠٧)

**٢٨٨٦- مژو دوو مژ شیر خواردن بیٚ ی حەرام نابێت.**

٢٨٨٧- لا يحرم من الرضاع إلا ما فتق الأمعاء في الثدي و كان قبل الفطام.

(صحيح) ( ت ) عن أم سلمة. (الإرواء ٢٢٠٩)

**٢٨٨٧- بەشیردان قەدەغە نابێت تاکو ڕیخۆڵەکان فراوان نەکات دەبێ پێش لەشیر بڕینەوەش بێت.**

٢٨٨٨- لا رضاع إلا ما فتق الأمعاء.

(صحيح) ( هـ ) عن الزبير. (الإرواء ٢٢٠٩)

**٢٨٨٨- بەشیردان دانانرێت تاکو ڕیخۆڵەکان نەژێنێتەوە.**

٢٨٨٩- اختر منهن أربعا و فارق سائرهن.

(صحيح) ( هـ ) عن الزبير. (الإرواء ١٩٤١)

**٢٨٨٩- چوار لەوانە هەڵبژێرەو ئەوانی تر تەڵاق بدە.**

٢٨٩٠- انظرن من إخوانكن ؟ فإنما الرضاعة من المجاعة.

(صحيح) ( حم ق د ن هـ ) عن عائشة . (الإرواء ٢٢١٠)

**٢٨٩٠- بڕواننە براکانتان؟ شیردان لەبرسێتی یەوەیە[1].**

٢٨٩١- إن الله حرم من الرضاعة ما حرم من الولادة.

(صحيح) ( ت ) عن عائشة . (الإرواء ١٩٣٤)

**٢٨٩١- خوای گەورە بەشیردان قەدەغە دەکات ئەوەی بە لەدایکبوون قەدەغەی کردووە.**

٢٨٩٢- إن الله تعالى حرم من الرضاع ما حرم من النسب.

(صحيح) ( ت ) عن علي . (الإرواء ١٩٣٤)

**٢٨٩٢- خوای گەورە ئەوەی بەشیردان یاساغی کردووە وەکو ئەوەیە کە بەڕەچەڵەك یاساغی کردووە.**

٢٨٩٣- الرضاع يحرم ما تحرم الولادة.

(صحيح) ( مالك ق ت ) عن عائشة. (الإرواء ١٧٩٤)

**٢٨٩٣- شیردان ئەوە یاساغ دەکات کە لەدایکبوون یاساغی دەکات.**

٢٨٩٤- كيف و قد قيل ؟.

(صحيح) ( خ ) عن عقبة بن الحارث. (الإرواء ٢٢١٢)

**٢٨٩٤- چۆن دەبێت پاش ئەوەی ئەو قسە وترا[2]؟**

٢٨٩٤- لا تنكح العمة على ابنة الأخ و لا ابنة الأخت على الخالة.

(صحيح) ( م ) عن أبي هريرة. (الإرواء ١٩٤٠)

---

[1] شیردانی حەرام ئەوە برسیەتی منداڵەکە نەهێڵێت و تێری بکات.

[2] پێغەمبەری خوا بەعوقبەی فەرموو کەژنی هێنا بوو، ئافرەتێك پێ ی ڕاگەیاند بوو کەشیری داوە بەهەر دووکیان بەعوقبەو هاوسەرەکەی عەقبە سواری ووڵاخەکەی بوو چوو بۆ خزمەت پێغەمبەر سەڵات و سەلامی خوای لەسەر بێت: ئەویش فەرمووی ئێ چۆن دەبێ، چۆن گواستویەتیەوە و چۆتە لای کەقسەی واکراوە؟ واتە وتراوە خوشکی شیریەتی ئەوە لە پیاوەتی کەسایەتیەوە دوورە بۆیە لێ ی جیا بۆوەو شوی کرد بەکەسێکی تر. السراج المنير ج١ ص ٤٧٥

**٢٨٩٥- نابێت پور بخوازرێتە (( خوشكی باوكی )) سەر برازاكەی، نەخوشكەزایش بخوازرێت بە سەر پوریدا (( خوشكی دایكی )).**

٢٨٩٦- لا تنكح المرأة على عمتها و لا العمة على ابنة أخيها و لا المرأة على خالتها و لا الخالة على بنت أختها لا الكبرى على الصغرى و لا الصغرى على الكبرى.

(صحيح) ( د ) عن أبي هريرة. (الإرواء ١٩٤٠)

**٢٨٩٦- نابێت ئافرەت بخوازرێت بە سەر پوریدا یان پور بخوازرێت بە سەر برازاكەیدا، یان ئافرەت بەسە پوری ( خوشكی دایكی ) یان پور ( خوشكی دایك ) بەسەر خوشكەزادا، نەگەورە بە سەر بچووك و، نەبچووك بە سەر گەورەدا.**

٢٨٩٧- لا تنكح المرأة على عمتها و لا على خالتها.

(صحيح) ( ن هـ ) عن أبي هريرة ( ن هـ ) عن جابر ( هـ ) عن أبي موسى وأبي سعيد. (الإرواء ١٩٤٠)

**٢٨٩٧- نابێت ئافرەتێك بخوازرێت بە سەر پوریدا ( نەخوشكی باوكی و نەخوشكی دایكی ).**

## بابەتی هاوتایی ( الكفاءة )

٢٨٩٨- تخيروا لنطفكم فانكحوا الأكفاء و انكحوا إليهم.

(صحيح) ( هـ ك هق ) عن عائشة . (الصحيحة ١٠٦٧)

**٢٨٩٨- شوێن هەڵبژێرن بۆ ئاوی پیاوەتیتان[1]، خوازبێنی هاوتای خۆتان بكەن و ژنیش لەهاوتا مارە بكەن.**

٢٨٩٩- لا ينكح الزاني المجلود إلا مثله.

(صحيح) ( د ك ) عن أبي هريرة. (الصحيحة ٢٤٤٤)

**٢٨٩٩- پیاوی داوێن پیسی شەلاق لیدراو ئافرەتانی هاوشێوەی خۆی نەبێت نابێ مارەیی بكات.**

٢٩٠٠- يا بني بياضة ! أنكحوا أبا هند و انكحوا إليه.

(حسن) ( د ك ) عن أبي هريرة. (الصحيحة ٢٤٤٦)

**٢٩٠٠- ئەی بەنی ( بياضة )! ژن بدەن بە ئەبو هیند و ژنی لێ داوا بكەن.**

[1] واتە: ئافرەتانی باش هەڵبژێرن و بگەڕێن بەدوای ئافرەتانی چاكدا بۆ هاوسەری خۆتان و دایكی منداڵەكانتان

## بابەتی سەرپەرشتیار لەهاوسەرگیری و وەرگرتنی ڕەزامەندی ئافرەت

٢٩٠١- آمروا النساء في أنفسهن فإن الثيب تعرب عن نفسها و إذن البكر صمتها.

(صحيح) ( طب هق ) عن أبي هريرة. (الإرواء ١٨٣٦)

**٢٩٠١- فەرمانی ئافرەتان بدە نەدەستی خۆیان، بێوەژن دەتوانێ ئەوەی لەدەرونیدا هەیە دەریبڕێت ڕێگە پێدانی کچیش بێدەنگی یەتی.**

٢٩٠٢- آمروا اليتيمة في نفسها و إذنها صماتها.

(صحيح) ( طب ) عن أبي موسى . (الصحيحة ٦٥٦)

**٢٩٠٢- فەرمانی کچی هەتیو لەدەروونی خۆیدایە، ڕازی بوونیشی بێدەنگی یەتی.**

٢٩٠٣- إذا أراد أحدكم أن يزوج ابنته فليستأمرها.

(صحيح) ( طب ) عن أبي موسى . (الصحيحة ١٢٠٢)

**٢٩٠٣- ئەگەر کەسێکتان ویستی کچەکەی بدات بەشوو با داوای مۆڵەتی لێ بکات.**

٢٩٠٤- إذا نكح العبد بغير أذن مولاه فنكاحه باطل.

(حسن) ( د ) عن ابن عمر . (الإرواء ١٩٣٣)

**٢٩٠٤- ئەگەر کۆیلەیەك ژن بهێنێ بەبێ مۆڵەتی گەورەکەی مارەکردنەکەی بەتاڵە.**

٢٩٠٥- استأمروا النساء في أبضاعهن.

(صحيح) ( حم ن حب ) عن عائشة . (الصحيحة ٣٩٧)

**٢٩٠٥- داوای فەرمانی ژنان بکەن لەشوکردنیاندا.**

٢٩٠٦- أيما امرأة نكحت بغير إذن وليها فنكاحها باطل فنكاحها باطل فنكاحها باطل فإن دخل بها فلها المهر بما استحل من فرجها فإن اشتجروا فالسلطان ولي من لا ولي له.

(صحيح) ( حم د ت هـ ك ) عن عائشة . (الإرواء ١٨٩٧)

**٢٩٠٦- هەر ئافرەتێك شوو بکات بەبێ ڕێگە دانی سەرپەرشتیارەکەی[1] شوکردنەکەی پوچەڵە، شوکردنەکەی پوچەڵە، شوکردنەکەی پوچەڵە، ئەگەر پیاوەکە گواستبوویەوە نیوەی مارەیی**

---

[1] وعته : گرێ بەندی مارەکردنەکەی

**دەکەوێتە سەر لەسەر ئەوەی ڕابواردنی ئەو ئافرەتەی بۆ حەڵاڵ بووە، ئەگەر خاوەنەکانیان ناکۆکیان کەوتە نێوان فەرمانڕەوا سەرپەرشتیاری هەر کەسێکە سەرپەرشتیاری نەبێت.**

٢٩٠٧- أيما عبد تزوج بغير إذن أهله فهو عاهر.

(صحيح) ( حم د ت ك ) عن جابر . (الإرواء ١٩٣٣)

**٢٩٠٧- هەر کۆیلەیەك بەبێ مۆڵەتی سەرپەرشتیارەکەی ژنی هێنا ئەو داوێن پیسە.**

٢٩٠٨- أيما عبد تزوج بغير إذن مواليه فهو زان.

(حسن) ( هـ ) عن ابن عمر . (الإرواء ١٧٣٣)

**٢٩٠٨- هەر کۆیلەیەك بەبێ ڕێگە پێدانی سەرپەرشتیارەکەی ژنی هێنا ئەو زیناکەرە.**

٢٩٠٩- الأيم أحق بنفسها من وليها و البكر تستأذن في نفسها و إذنها صماتها.

(صحيح) ( مالك حم م ٤ ) عن ابن عباس . (الصحيحة ١٢١٦)

**٢٩٠٩- بێوەژن بۆ خۆی زیاتر خاوەن مافە لەخاوەنەکەی، کچیش داوای ڕەزامەندی لێ دەکرێت، ڕەزامەندیشی بێ دەنگییەتی.**

٢٩١٠- تستأمر اليتيمة في نفسها فإن سكتت فهو إذنها و إن أبت فلا جواز عليها.

(صحيح) ( د ن ك ) عن أبي هريرة . (الإرواء ١٨٣٦)

**٢٩١٠- کچە هەتیو داوای فەرمانی لێ دەکرێت بۆ شوکردنی، ئەگەر بێ دەنگ بوو ئەوە ڕازیبونیەتی، ئەگەریش ملی نەدا قسە قسەی خۆیەتی.**

٢٩١١- الثيب أحق بنفسها من وليها و البكر يستأذنها أبوها في نفسها و إذنها صماتها.

(صحيح) ( م د ن ) عن ابن عباس . (الصحيحة ١٨٠٧)

**٢٩١١- بێوەژن لەخاوەنەکەی مافدار ترە بەخۆی، کچیش با باوکی داوای ڕەزامەندی لێ بکات[1]، بێ دەنگیشی ڕازیبوونیەتی.**

٢٩١٢- الثيب تعرب عن نفسها و البكر رضاها صمتها.

(صحيح) ( حم هـ ) عن عميرة الكندي . (الإرواء ١٨٩٣)

**٢٩١٢- بێوەژن ئەوە لەدەرونیدایە دەری دەبڕێت، ڕازیبوونی کچیش بێدەنگیەتی.**

٢٩١٣- رضاها صمتها - يعني البكر -.

(صحيح) ( ق ) عن عائشة. (الصحيحة ١٤٥٩)

---

[1] **بۆ شوکردنی.**

**٢٩١٣- ڕازی بوونی بێ دەنگیەتی -واتە: کچ-.**

٢٩١٤- سكاتها إقرارها - يعني البكر -.

(صحيح) ( د ) عن عائشة. (الصحيحة ٦٥٦)

**٢٩١٤- بێدەنگیەکەی دانپێدانانیەتی -واتە: کچ-.**

٢٩١٥- لا تزوج المرأة المرأة و لا تزوج المرأة نفسها ، فإن الزانية هي التي تزوج نفسها ...

(صحيح) ( هـ ) عن أبي هريرة. (الإرواء ٢٠٣٧)

**٢٩١٥- نابێت ئافرەت ئافرەت بەشوو بدات، و نابێ ئافرەتیش لەخۆی بەشوو بدات ((زیناکەر ئەوەیە خۆی بەشوودەدات)).**

٢٩١٦- لا تنكح الأيم حتى تستأمر و لا تنكح البكر حتى تستأذن قيل: و كيف إذنها ؟ قال: أن تسكت.

(صحيح) ( ق د ن ) عن أبي هريرة. (الإرواء ١٨٢٨)

**٢٩١٦- بێوەژن مارە ناکرێت تاکو داوای فەرمانی نەکرێت، کچیش مارە ناکرێت تاکو داوای ڕەزامەندی نەکرێت، وتیان ڕەزامەندی چۆنە؟ فەرمووی ئەگەر بێ دەنگ بێت.**

٢٩١٧- لا تنكح الثيب حتى تستأمر و لا تنكح البكر حتى تستأذن و إذنها الصموت.

(صحيح) ( ت هـ ) عن أبي هريرة. (الإرواء ١٨٢٨)

**٢٩١٧- بێوەژن مارە ناکرێت تاکو داوای فەرمانی نەکرێت، کچیش مارە ناکرێت تاکو داوای ڕازیبوونی نەکرێت، ڕازیبوونیشی بێ دەنگی یەتی.**

٢٩١٨- لا نكاح إلا بولي.

(صحيح) ( حم ٤ ك )عن أبي موسى ( هـ ) عن ابن عباس. (الإرواء ١٨٩٦)

**٢٩١٨- هاوسەرگیری نییە بەبێ ڕەزامەندی سەرپەرشتیار ((بەخێوکەر)).**

٢٩١٩- لا نكاح إلا بولي و السلطان ولي من لا ولي له.

(صحيح) ( حم هـ ) عن عائشة. (الإرواء ١٨٩٦)

**٢٩١٩- هاوسەرگیری دانامەزرێت بەبێ ڕەزامەندی بەخێوکەر، فەرمانڕەوایش سەرپەرشتیاری هەموو بێ سەرپەرشتیارێکە.**

٢٩٢٠- لا نكاح إلا بولي و شاهدي عدل.

(صحيح) ( هق ) عن عمران وعائشة. (الإرواء ١٨٩٦)

**٢٩٢٠ مارەكردن دروست نییه بەبیٚ ئامادە بوونی سەرپەرشتیارو، دوو شایەتی دادگەر.**

٢٩٢١- لا نكاح إلا بولي و شاهدين.

(صحيح) ( طب ) عن أبي موسى. (الإرواء ١٨٩٦)

**٢٩٢١-مارەكردن دروست نییه بەبیٚ سەرپەرشتیارو دوو شایەت.**

٢٩٢٢- اليتيمة تستأمر في نفسها فإن صمتت فهو إذنها و إن أبت فلا جواز عليها.

(حسن) ( ت ) عن أبي هريرة. (الإرواء ١٨٢٨)

**٢٩٢٢- كچی هەتیو داوایی فەرمانی دەكریٚت لەشووكردندا، ئەگەر قسەی نەكرد ئەوە ڕەزامەندییەتی، ئەگەر ملی نەدا دروست نیه بەزۆر بدریٚت بەشوو.**

## بابەتی سەیركردنی دەستگیران

٢٩٢٣- إذا ألقى الله في قلب امرئ خطبة امرأة فلا بأس أن ينظر إليها.

(صحيح) ( حم هـ ك هق ) عن محمد بن مسلمة . (الصحيحة ٩٨)

**٢٩٢٣- ئەگەر خوای گەورە خستیه دڵ كەسیٚكه وە خوازبیٚنی ئافرەتیٚك بكات، قەیناكا سەیری بكات.**

٢٩٢٤- إذا خطب أحدكم المرأة فإن استطاع أن ينظر منها إلى ما يدعوه إلى نكاحها فليفعل.

(حسن) (د ك هق) عن جابر . (الصحيحة ٩٩)

**٢٩٢٤- ئەگەر كەسیٚكتان خوازبیٚنی ئافرەتیٚكی كرد و توانی سەیری ئەوەندەی بكات كە ڕازی بكات بەمارە كردنی با وا بكات.**

٢٩٢٥- إذا خطب أحدكم المرأة فلا جناح عليه أن ينظر إليها إذا كان إنما ينظر إليها لخطبته و إن كانت لا تعلم.

(صحيح) ( حم طب ) عن أبي حميد الساعدي. (الصحيحة ٩٧)

**٢٩٢٥- ئەگەر كەسیٚكتان ئافرەتیٚكی خوازبیٚنی كرد گوناهبار نابیٚت تەماشای بكات، ئەگەر لەبەر خوازبیٚنی كردنی سەیری بكات با ئاگاداریش نەبیٚت.**

٢٩٢٦- اذهب فانظر إليها فإنه أحرى أن يؤدم بينكما.

(صحيح) ( حم قط ك هق ) عن أنس ( حم هـ قط طب هق ) عن المغيرة بن شعبة . (الصحيحة ٩٨)

**٢٩٢٦- بڕۆ تەماشای بكە، چونكە ئەوە شیاوترە بۆ بەردەوامی نیٚوانتان.**

## بابەتی مارەیی

٢٩٢٧- اذهب فقد ملكتكها بما معك من القرآن.

(حسن) ( ق ن ) عن سهل بن سعد . (صحيح النسائي ٣٣٣٩)

**٢٩٢٧- برۆ لەتۆم مارە كرد لەسەر ئەو قورئانەی لەبەرتە.**

٢٩٢٨- إن من يمن المرأة تيسير خطبتها و تيسير صداقها و تيسير رحمها.

(حسن) ( حم ك هق ) عن عائشة . (الإرواء ١٩٨٦)

**٢٩٢٨- لە پیرۆزی ئافرەتە خوازبێنی ئاسان و کەمی مارەیی و ئاسان منداڵبوونی بەئاسانی.**

٢٩٢٩- خير الصداق أيسره.

(صحيح) ( ك هـ ) عن عقبة بن عامر . (الإرواء ١٩٢٤)

**٢٩٢٩- چاکترین مارەیی کەمترینیانە.**

٢٩٣٠- خير النكاح أيسره.

(صحيح) ( د ) عن عقبة بن عامر . (الصحيحة ١٨٤٢)

**٢٩٣٠- چاکترین ژن هێنان ئاسانترینیانە.**

٢٩٣١- لو كنتم تغرفون من بطحان ما زدتم.

(صحيح) ( حم ك ) عن أبي حدرد. (الصحيحة ٢١٧٣)

**٢٩٣١- ئەگەر پڕ دۆڵی بوتحان ماڵ و سامانتان هەبوایە هیچ زیادتان نەدەکرد[1].**

٢٩٣٢- إن أعظم الذنوب عند الله رجل تزوج امرأة فلما قضى حاجته منها طلقها و ذهب بمهرها و رجل استعمل رجلا فذهب بأجرته و آخر يقتل دابة عبثا.

(حسن) ( ك هق ) عن ابن عمر . (الصحيحة ٩٩٩)

---

**[1] ئەبی حدرد ژنی خواست و مارەی کرد ئیتر چووە خزمەتی پێغەمبەر سەلات و سەلامی خوای لەسەر بێت لەمارەییەکەدا یارمەتی بدات ئەویش فەرمووی مارەییەکەی چەندەیە وتی دووسەد دیرهەمە پێغەمبەریش ئەو فەرمایشتەی فەموو چونکە ئەو دۆڵە نزیکترین دۆڵی مەدینە بوو بەنی ئەزیری جولەکەش لەوێ نیشتەجێ بوون. فيض القدير ج٥ ص ٤٢١.**

**٢٩٣٢- گوناهبارترین کەس لەلای خوا کەسێکە ئافرەتێك مارە بکات، کاتێك کاری خۆی لەگەڵدا تەواو کرد لێی جیا ببێتەوەو مارەییەکەی ببات، پیاوێکیش کەسێك کاری بۆ بکات و ڕۆژانەکەی پێ نەدات کەسێکیش ولاخێك بەبێ هودە بکوژێت.**

٢٩٣٣- التمس و لو خاتما من حديد.

(صحيح) ( حم ق د ) عن سهل بن سعد . (الإرواء ١٩٨٣)

**٢٩٣٣- شتێك پەیدا بکە ئەگەر ئەنگوستیلەیەکی ئاسنیش بێت.**

## بابەتی دەعوەتکردن ( الوليمة )

٢٩٣٤- إذا دعي أحدكم إلى الوليمة فليأتها.

(صحيح) ( مالك حم ق د ) عن ابن عمر . (المشكاة ٣٢١٦)

**٢٩٣٤- ئەگەر کەسێکتان بانگێشت کرا بۆ خواردنی شایی با بچێت.**

٢٩٣٥- إذا دعي أحدكم إلى طعام فليجب فإن شاء طعم و إن شاء لم يطعم.

(صحيح) ( م د ) عن جابر . (الصحيحة ٣٤٦)

**٢٩٣٥- ئەگەر کەسێك لەئێوە بانگێشت کرا بۆ خواردنێك با بچێت ئەگەر ویستی بخوات ئەگەر نەیویست نەخوات.**

٢٩٣٦- إذا دعي أحدكم إلى طعام فليجب فإن كان مفطرا فليأكل و إن كان صائما فليدع بالبركة.

(صحيح) ( طب ) عن ابن مسعود . (الإرواء ٢٠١٣)

**٢٩٣٦- ئەگەر کەسێك لەئێوە بانگێشت بۆ خواردنێك بابچێت، ئەگەر بەڕۆژوو نەبوو با بخوات، ئەگەریش بەڕۆژوو بوو با داوای پیرۆزیان بۆ بکات.**

٢٩٣٧- إذا دعي أحدكم إلى طعام فليجب فإن كان مفطرا فليأكل و إن كان صائما فليصل.

(صحيح) ( حم م د ت هـ ) عن أبي هريرة . (الصحيحة ١٣٤٣)

**٢٩٣٧- ئەگەر کەسێکتان بانگێشت کرا بۆ خواردنێك بابچێت، ئەگەر بەڕۆژوو نەبوو بخوات و، ئەگەر بەڕۆژووش با بۆیان بپاڕێتەوە.**

٢٩٣٨- إذا دعي أحدكم إلى طعام و هو صائم فليقل: إني صائم.

(صحيح) ( م د ت هـ ) عن أبي هريرة . (صحيح أبي داود ٢١٢٤)

**٢٩٣٨- ئەگەر کەسێکتان بانگێشت کرا بۆ خواردنێك و بەڕۆژوو بوو، بابڵێت: من بەڕۆژووم.**

٢٩٣٩- إذا دعي أحدكم إلى وليمة عرس فليجب.

(صحيح) ( م هـ ) عن ابن عمر . (الإرواء ١٩٤٨)

**٢٩٣٩- ئەگەر کەسێك لەئێوە بانگێشت کرا بۆ خواردنی شایی بابچێت.**

٢٩٤٠- إذا دعي أحدكم إلى وليمة فليجب و إن كان صائما.

(صحيح) ( ابن منيع ) عن أبي أيوب . (الإرواء ٢٠١٣)

**٢٩٤٠- ئەگەر کەسێکتان بانگێشت بۆ خواردنی شایی بابچێت ئەگەر ڕۆژوویش بێت.**

٢٩٤١- إذا دعي أحدكم فجاء مع الرسول: فإن ذلك له إذن.

(صحيح) ( خد د هب ) عن أبي هريرة . (الإرواء ١٩٥٥)

**٢٩٤١- ئەگەر کەسێك لەئێوە بانگێشت کراو ڕۆیشت لەگەڵ نێردراوەکەدا[1]: ئەوە ڕێگە پێدانە بۆی.**

٢٩٤٢- إذا دعيتم إلى كراع فأجيبوا.

(صحيح) ( م ) عن ابن عمر . (الترغيب ٢١٥٤)

**٢٩٤٢- ئەگەر دەعوەت کران بۆ سەرو پێ بچن.**

٢٩٤٣- شر الطعام طعام الوليمة يمنعها من يأتيها و يدعى إليها من يأباها و من لا يجب الدعوة فقد عصى الله و رسوله.

(صحيح) ( م ) عن أبي هريرة. (الصحيحة ١٠٨٥)

**٢٩٤٣- خراپترین خواردن خواردنی شاییەکە کە، قەدەغە دەکرێت لەو کەسەی حەزی لێ دەکات ، ئەو کەسەی پێی خۆش نییە ئامادەی بێت بانگ دەکرێت بۆی[2]، هەر کەسێکیش بانگکردنی ڕەتکاتەوە سەرپێچی قسەی خواو پێغەمبەری کردووە.**

٢٩٤٤- من دعي إلى عرس أو نحوه فليجب.

(صحيح) ( م ) عن ابن عمر. (الضعيفة ٥٥٥٧)

**٢٩٤٤- کەسێك دەعوەت کرا بۆ خوانی شایی یان بۆنەیەکی لەو جۆرە، بابچێت.**

٢٩٤٥- أولم و لو بشاة.

(صحيح) ( مالك حم ق ٤ ) عن أنس ( خ ) عن عبدالرحمن بن عوف . (الإرواء ١٩٢٣)

**٢٩٤٥- لەشاییەکەتدا دەعوەت بکە ئەگەر بەمەڕێکیش بێت.**

---

[1] واتە: ڕۆیشت لەگەڵ ئەو کەسەی هاتووە بەدوایدا.

[2] واتە: هەژاری بۆ بانگ ناکرێت و دەوڵەمەندی بۆ بانگ دەکرێت.

٢٩٤٦- إنه لا بد للعرس من وليمة.

(صحيح) ( حم ن ) عن بريدة . (آداب الزفاف ٧٢)

**٢٩٤٦- پێویسته لەشاییدا خواردن دروست بکرێت.**

٢٩٤٧- ائتوا الدعوة إذا دعيتم.

(صحيح) ( م ) عن ابن عمر . (الإرواء ١٩٤٨)

**٢٩٤٧- بچن بۆ دەعوەت ئەگەر بانگێشت کران.**

٢٩٤٨- أجيبوا هذه الدعوة إذا دعيتم لها.

(صحيح) ( ق ) عن ابن عمر . (الإرواء ١٩٤٨)

**٢٩٤٨- بۆ ئەو دەعوەتە بچن ئەگەر بانگێشت کران بۆی.**

٢٩٤٩- إذا دعا أحدكم أخاه فليجب عرسا كان أو نحوه.

(صحيح) ( حم د ) عن ابن عمر . (المشكاة ٣٢١٦)

**٢٩٤٩- ئەگەر کەسێکتان دەعوەتی براکەی کرد بابچێت بۆ شایی بێت یان هەر شتێکی لەو شێوە.**

٢٩٥٠- أكل طعامكم الأبرار و صلت عليكم الملائكة و أفطر عندكم الصائمون.

(صحيح) ( حم د ن ) عن أنس . (المشكاة ٤٢٤٩)

**٢٩٥٠- پیاو چاکان خواردنتان بخۆن و، فریشتەکان نزای چاکەتان بۆ بکەن، ڕۆژووەوان لاتان بەربانگ بکەنەوە.**

٢٩٥١- إنك دعوتنا خامس خمسة و هذا رجل قد تبعنا فإن شئت أذنت له و إن شئت رجع.

(صحيح) ( ق ) عن ابن مسعود . (الصحيحة ٣٥٥٢)

**٢٩٥١- تۆ دەعوەتت کردوین و پێنج کەسین، ئەوەش پیاوێکە دوامان کەوتووە، ئەگەر پێت باشە ڕێگەی بدە، ئەگەر نا دەگەڕێتەوە.**

٢٩٥٢- إنه اتبعنا رجل لم يكن معنا حين دعينا فإن أذنت له دخل.

(صحيح) ( ت ) عن أبي مسعود . (الصحيحة ٣٥٧٩)

**٢٩٥٢- کەسێك بەدوامان کەوتووە، لەگەڵماندا نەبوو کاتێك دەعوەت کراین جا ئەگەر ڕێگەی دەدەیت دێتە ژوورەوە.**

٢٩٥٣- حق المسلم على المسلم خمس: رد السلام و عيادة المريض و اتباع الجنائز و إجابة الدعوة و تشميت العاطس.

(صحيح) ( ق ) عن أبي هريرة . (المشكاة ١٥٢٤)

**٢٩٥٣- مافی موسوڵمان لەسەر موسوڵمان پێنج شتە: وەڵامدانەوەی سەلام و، سەردانی نەخۆش و، شوێنکەوتنی تەرم و، وەڵام دانەوەی بانگێشتی و، ڕەحمەت ناردن بۆ ئەو کەسەی دەپژمێت.**

٢٩٥٤- لو أهدي إلي كراع لقبلت و لو دعيت عليه لأجبت.

(صحيح) ( حم ت حب ) عن أنس. (الصحيحة ٢١٢٥)

**٢٩٥٤- ئەگەر سەر و پێم بەدیاری بۆ بهێنن وەری دەگەم ئەگەر بۆ شەڕو پێش بانگێشت بکرێم دەچم.**

٢٩٥٥- لو دعيت إلى ذراع أو كراع لأجبت و لو أهدي إلي ذراع أو كراع لقبلت.

(صحيح) ( خ ) عن أبي هريرة. (المشكاة ١٨٢٧)

**٢٩٥٥- ئەگەر دەعوەت بکرێم بۆ دەستێك یان سەرو پێیەك دەچم، ئەگەریش بەدیاری بۆم بهێنن وەری دەگرم.**

## بابەتی ڕاگەیاندنی هاوسەرگیری و خوازبێنی و مەرجەکان

٢٩٥٦- أشيدوا النكاح.

(حسن) ( طب ) عن السائب بن يزيد . (الصحيحة ١٤٦٣)

**٢٩٥٦- ژن هێنان و شووکردن ڕاگەیەنن و بڵاوییکەنەوە.**

٢٩٥٧- أشيدوا النكاح و أعلنوه.

(حسن) ( الحسن بن سفيان طب ) عن هبار بن الأسود. (الصحيحة ١٤٦٣)

**٢٩٥٧- هاوسەرگیری ڕاگەیەنن و ئاشکرای بکەن.**

٢٩٥٨- أعلنوا النكاح.

(حسن) ( حم حب طب حل ك ) عن ابن الزبير . (آداب الزفاف ٩٧)

**٢٩٥٨- ژن هێنان و شووکردن ئاشکرای بکەن.**

٢٩٥٩- فصل ما بين الحلال و الحرام ضرب الدف و الصوت في النكاح.

(حسن) ( حم ت ن هـ ك ) عن محمد بن حاطب. (الإرواء ٢٠٥٤)

**٢٩٥٩- جیاوازی نێوان ((حەڵاڵ و حەرام)): ڕەواو یاساغ دەف لێدان و ڕاگەیاندن و ئاشکرا کردنە لەژن و ژنخوازیدا.**

٢٩٦٠- يا عائشة أما كان معكم لهو ؟ فإن الأنصار يعجبهم اللهو.

(صحيح) ( خ ) عن عائشة. (المشكاة ٣١٤١)

**٢٩٦٠- ئەی عائیشە! ئەوە بۆ ڕابواردنێکتان پێ نەبوو، چونکە ئەنصارەکان حەز لەڕابواردن دەکەن.**

٢٩٦١- إياكم و الظن فإن الظن أكذب الحديث و لا تجسسوا و لا تحسسوا و لا تنافسوا و لا تحاسدوا و لا تباغضوا و لا تدابروا و كونوا عباد الله إخوانا و لا يخطب الرجل على خطبة أخيه حتى ينكح أو يترك.

(صحيح) ( مالك حم ق د ت ) عن أبي هريرة . (غاية المرام ٤١٢)

**٢٩٦١- نەکەن گومان خراپ ببەن، چونکە گومان بردن درۆترین قسەیە، سیخوڕیش مەکەن، بەدزیشەوە گوێ مەگرن و سەیر مەکەن، کێبڕکێیش مەکەن و چاو لەماڵی یەکتر مەبڕن و کینەتان نەبێت بەرانبەر یەکترو، پشت لەیەکتر هەڵمەکەن، بەڵکو ببنە بەندەی خواو برای یەکتر، کەسیش خوازبێنی نەکاتە سەر خوازبێنی براکەیدا تاکو مارەی دەبڕێت یان وازی لێ دەهێنێت.**

٢٩٦٢- لا يخطب أحدكم على خطبة أخيه.

(صحيح) ( ن هـ ) عن أبي هريرة وابن عمر. (الصحيحة ١٠٣٠)

**٢٩٦٢- کەسێك لەئێوە خواز بێنی نەکات بە سەر خواز بێنی براکەیدا.**

٢٩٦٣- لا يخطب أحدكم على خطبة أخيه حتى ينكح أو يترك.

(صحيح) ( ن ) عن أبي هريرة. (الصحيحة ١٠٣٠)

**٢٩٦٣- کەس خواز بێنی نەکات بەسەر خواز بێنی براکەیدا تاکو مارەی دەکات یان وازی لێدەهێنێت.**

٢٩٦٤- لا يخطب الرجل على خطبة أخيه و لا يسوم على سوم أخيه و لا تنكح المرأة على عمتها و لا على خالتها و لا تسأل المرأة طلاق أختها لتكفأ صحفتها و لتنكح فإنما لها ما كتب الله لها.

(صحيح) ( م ) عن أبي هريرة. (صحيح النسائي ٤٥٧٤)

**٢٩٦٤- هیچ پیاوێك خواز بێنی نەکات بە سەر خواز بێنی براکەیدا، مامەڵەش نەکات بە سەر مامەڵەی براکەیدا، ئافرەتیش ناخوازرێت بە سەر پورەکەیدا (خوشکی دایکی و باوکی)، دروستیش نییە ئافرەتێك داوای جیابوونەوەی خوشکەکەی بکات بۆ ئەوەی ئەو تەلاق بدرێت و خۆی مارە بکرێت ، چونکە ئەوەی خوا بۆی نووسیوە هەر ئەوەی دێتە پێش.**

٢٩٦٥- إذا تزوج أحدكم فليقل له: بارك الله لك و بارك عليك.

(صحيح) ( الحارث طب ) عن عقيل بن أبي طالب . (صحيح أبي داود ١٨٥٠)

**٢٩٦٥- ئەگەر کەسێکتان ژنی هێنا با پێی بڵێت: خوا پیرۆزی بکات لێت و فەڕو پیرۆزی بڕێژێت بەسەرتا.**

٢٩٦٦- إذا أفاد أحدكم امرأة أو خادما أو دابة فليأخذ بناصيتها و ليدع بالبركة و ليقل: اللهم إني أسألك من خيرها و خير ما جبلت عليه و أعوذ بك من شرها و شر ما جبلت عليه و إن كان بعيرا فليأخذ بذروة سنامه.

(حسن) (ك هق) عن ابن عمرو . (صحيح ابن ماجه ١٩١٨)

**٢٩٦٦- ئەگەر كەسێك لەئێوە ئافرەتێكی هێنا، یان خزمەتكارێك، یان وڵاخێكی دەست كەوت، با دەست بگرێت بەنەوچەوانی یەوە و دوعای پیرۆزی بكات و بڵێت: خوایە داوای چاكەی ئەمەت لێ دەكەم و چاكەی ئەوەش لەسەری ڕامكراوە، خوایە پەناشت پێدەگرم لەخراپەی و ئەو خراپەشی كەڕامكراوە لەسەری، ئەگەر وشتریش بوو بێت دەست بگرێت دونگەكەیەوە.**

٢٩٦٧- نهى عن المتعة.

(صحيح) ( حم ) عن جابر ( خ ) عن علي. (الصحيحة ٣٨)

**٢٩٦٧- پێغەمبەر ﷺ ژن هێنانی كاتی** (المتعة )**ی قەدەغە كردووە.**

٢٩٦٨- نهى عن الشغار.

(صحيح) ( حم ق ٤ ) عن ابن عمر. (الإرواء ١٨٩٥)

**٢٩٦٨- پێغەمبەر ﷺ ژن بەژنێكی قەدەغەكردوە كەئافرەتەكان مارەیی یەكتربن.**

٢٩٦٩- هدم المتعة النكاح و الطلاق و العدة و الميراث.

(حسن) ( حب ) عن أبي هريرة . (الصحيحة ٢٤٠٢)

**٢٩٦٩- هاوسەرگیری و، جیابوونەوەو، عیددەو، میراتی، ژن هێنانی كاتیان ڕوخاند.**

٢٩٧٠- لا إسعاد في الإسلام و لا عقر و لا شغار في الإسلام و لا جلب في الإسلام و لا جنب و من انتهب فليس منا.

(صحيح) ( حم ن حب ) عن أنس. (المشكاة ٢٩٤٧)

**٢٩٧٠- لەئیسلامدا كۆڕی شیوەنی ئافرەتان ڕەوا نییە.، هەروەها سەربڕینی وشتریش لەسەر گۆڕ و ژن بە ژن بەبێ مارەیی و جەلەب زەكات هێنان[1] و جەنەب ڕەوا نییە لەئیسلامدا، هەر كەسیش تاڵانی بكات لەئێمە نییە.**

---

[1] ((جلب)) واتە ((جابی)) ئەو كەسەی زەكات كۆدەكاتەوە لەشوێنێك دابنیشێت و خەڵكی زەكاتەكەی بۆ بهێنن بۆ ئەو شوێنە، ((جنب))یش واتە جابی لەشوێنێكی بەرزز دابنیشێت وبڵێ ماڵی زەكاتەكەم بۆ بێنن بۆ ئێرە

٢٩٧١- لا جلب و لا جنب و لا شغار في الإسلام.

(صحيح) ( ن الضياء ) عن أنس. (المشكاة ١٧٨٦)

**٢٩٧١- نه( جەلەب ) و نه( جەنەب )[1] و ژن بەژنی بێ مارەیی لەئیسلامدا نییە.**

٢٩٧٢- لا جلب و لا جنب و لا شغار في الإسلام و من انتهب نهبة فليس منا.

(صحيح) ( حم ت ن ) عن عمران بن حصين. (المشكاة ٢٩٤٧)

**٢٩٧٢- دانیشتنی لەشوێنێك یان لەبەرزاییەك بۆ زەكات وەرگرتن و ژن بەژنی بێ مارەیی لەئیسلامدا نیە، هەر كەسێكیش تالانییەك بكات لەئێمەنییە.**

٢٩٧٣- لا شغار في الإسلام.

(صحيح) ( حم هـ حب ) عن أنس ( م ) عن ابن عمر. (صحيح ابن ماجه ١٨٨٥)

**٢٩٧٣- ژن بەژنی بێ مارەیی لەئیسلامدا نییە.**

٢٩٧٤- يا أيها الناس ! إني قد كنت أذنت لكم في الاستمتاع من النساء و إن الله قد حرم ذلك إلى يوم القيامة فمن كان عنده منهن شيء فليخل سبيله و لا تأخذوا مما آتيتموهن شيئا.

(صحيح) ( م هـ ) عن سبرة. (الصحيحة ٣٨١)

**٢٩٧٤- هۆ خەڵكینە! من ڕێگام پێدابوون بەشێوەی كاتی ژن بهێنن بەڕاستی، خوای گەورە ئەوەی قەدەغە كردووە تا ڕۆژی قیامەت، ئەگەر هەر كەسێك بەو شێوە ژنی خوا ستووە با وازی لێ بهێنێت، هەرچیشتان پێداون پێیان داوە لێیان وەرمەگرنەوە.**

٢٩٧٥- كان إذا رفأ الإنسان إذا تزوج قال: بارك الله لك و بارك عليك و جمع بينكما في خير.

(صحيح) ( حم ٤ ك ) عن أبي هريرة. (الكلم ٢٠٦)

**٢٩٧٥- پێغەمبەر ﷺ ئەگەر پیرۆزبایی بكردایە لە كەسێك بەبۆنەی ژن هێنانی دەیفەرموو: خوای گەورە لێتی پیرۆز بكات و بۆتی پیرۆز بكات و لەسەر خێرو چاكە كۆتان بكاتەوە.**

---

[1] ووشەی ((الشغار)) واتە ژن بەژن بەبێ مارەیی، یان هەر ئافرەتە مارەیی ئەوی تر بێت و ئیتر مارەییان بۆ دانەنێن

# بابەتی دابەشكرنی نۆرەی شەو

٢٩٧٦- من كانت له امرأتان فمال إلى إحداهما جاء يوم القيامة و شقه مائل.

(صحيح) ( حم د ن هـ ) عن أبي هريرة. (الصحيحة ٢٠٧٧)

**٢٩٧٦- كەسێك دوو هاوسەری هەبووە مەیلی، بەلای یەكێكیاندا زۆر بوو، لەرۆژی قیامەت دێت و لایەكی لارە.**

٢٩٧٧- للبكر سبع و للثيب ثلاث.

(صحيح) ( م ) عن أم سلمة ( هـ ) عن أنس. (الصحيحة ١٢٧١)

**٢٩٧٧- حەوت شەو بۆ كچ و، سێ شەو بۆ بێوەژن[1].**

٢٩٧٨- ليس بك هوان على أهلك إن شئت سبعت عندك و سبعت لنسائي و إن شئت ثلثت ثم درت.

(صحيح) ( م د هـ ) عن أم سلمة. (الصحيحة ١٢٧١)

**٢٩٧٨- تۆ سووك نابیت لای كەس و كارت، ئەگەر حەز دەكەیت حەوت شەو لەلات دەمێنمەوەو، حەوت شەویش لای خێزانەكانی ترم، ئەگەریش حەز دەكەیت سێ شەو لات دەمێنمەوەو دوای دەگەڕێم.**

٢٩٧٩- إذا تزوج البكر على الثيب أقام عندها سبعا و إذا تزوج الثيب على البكر أقام عندها ثلاثا.

(صحيح) ( هق ) عن أنس . (الصحيحة ١٢٧١)

**٢٩٧٩- ئەگەر كچێكی هێنابە سەر بێوەژنێكدا حەوت شەو لەلای دەمێنێتەوە، ئەگەر بێوەژنی هێنا بەسەر كچدا سێ شەو لەلای دەمێنێتەوە.**

٢٩٨٠- كان إذا أراد سفرا أقرع بين نسائه فأيتهن خرج سهمها خرج بها معه.

(صحيح) ( ق د هـ ) عن عائشة. (غاية المرام ص١٦٠)

**٢٩٨٠- پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر بیویستایە سەفەر بكات تیرو پشكی دەكرد لەنێوان خێزانەكانیدا، كامیان تیرەكەی دەربچوایە لەگەڵ خۆی دەیبرد.**

[1] لەسەرەتای ژن گواستنەوەدا.

## بابەتى هەڵس و كەوتى پياو لەگەڵ هاوسەيدا

٢٩٨١- اثنان لا تجاوز صلاتهما رءوسهما: عبد آبق من مواليه حتى يرجع و امرأة عصت زوجها حتى ترجع.

(صحيح) ( ك ) عن ابن عمر . (الصحيحة ٢٨٨)

**٢٩٨١- دوو كەس نوێژيان لەسەر سەريان بەرز نابێتەوە: كۆيلەيەكى هەڵهاتوو لەخاوەنەكانى تاكو دەگەڕێتەوە، ئافرەتێكيش لەمێردەكەى ياخى بێت تاكو دەگەڕێتەوە.**

٢٩٨٢- إذا أتيت أهلك فاعمل عملا كيسا.

(صحيح) ( خط ) عن جابر . (الصحيحة ١١٩٠)

**٢٩٨٢- ئەگەر لەگەڵ خێزانت جووت بوويت، هەڵسە بەكردەوەيەكى جوان[1].**

٢٩٨٣- إذا باتت المرأة هاجرة فراش زوجها لعنتها الملائكة حتى تصبح.

(صحيح) ( حم ق ) عن أبي هريرة . (الإرواء ٢٠٠٢)

**٢٩٨٣- ئەگەر ئافرەتێك شەوێك جێگە لەهاوسەرەكەى جيا بكاتەوە فريشتە لەعنەتى لێ دەكەن تاكو ڕۆژ دەكاتەوە.**

٢٩٨٤- إذا دعا الرجل امرأته إلى فراشه فأبت فبات غضبان عليها لعنتها الملائكة حتى تصبح.

(صحيح) ( حم ق د ) عن أبي هريرة . (صحيح أبي داود ١٨٥٨)

**٢٩٨٤- ئەگەر پياوێك بانگى خێزانەكەى كرد بۆ سەر جێگاكەى و ئەويش نەهات و، پياوەكە لێى توڕە بوو، فريشتەكان نەفرينى لێ دەكەن تا ڕۆژ دەكاتەوە.**

٢٩٨٥- إذا دعا الرجل امرأته إلى فراشه فلتجب و إن كانت على ظهر قتب.

(صحيح) ( البزار ) عن زيد بن أرقم . (الصحيحة ١٢٠٣)

**٢٩٨٥- ئەگەر پياوێك بانگى هاوسەرەكەى كرد بۆ سەر جێگاى خۆى، با گوڕايەڵى بكات ئەگەر بەسوارى وشتريشەوە بووە.**

٢٩٨٦- إذا دعا الرجل زوجته لحاجته فلتأته و إن كانت على التنور.

(صحيح) ( ن ت ) عن طلق بن علي . (الصحيحة ١٢٠٢)

---

[1] **جوتبە لەگەڵى بەجوت بونێكى جوان، وتراوە مەبەست هەڵنان و هاندانە بۆ جوت بون بەئومێدى منداڵ.**

**٢٩٨٦- ئەگەر پیاوێك بانگی خێزانەكەی كرد بۆ پێویستی خۆی بابچێتە لای ئەگەر لەسەر تەنووریش بوو.**

٢٩٨٧- إذا صلت المرأة خمسها و صامت شهرها و حصنت فرجها و أطاعت زوجها قيل لها: ادخلي الجنة من أي أبواب الجنة شئت.

(صحيح) ( حب ) عن أبي هريرة . (آداب الزفاف ١٨٠)

**٢٩٨٧- ئەگەر ئافرەت پێنج فەرزەی خۆی بەجێ بهێنێ و، ڕۆژووی ڕەمەزان بگرێت و، داوێنی خۆی پاك ڕابگرێت و، گوێڕایەڵی مێردەكەی بكات، پێی دەوترێت: بڕۆ ناو بەهەشتەوە لە هەر دەرگایەكەوە حەز دەكەیت.**

٢٩٨٨- إذا صلت المرأة خمسها و صامت شهرها و حفظت فرجها و أطاعت زوجها دخلت الجنة.

(صحيح) ( البزار ) عن أنس ( حم ) عن عبدالرحمن الزهري ( طب ) عن عبدالرحمن ابن حسنة . (الترغيب ١٩٣٢)

**٢٩٨٨- ئەگەر ئافرەت پێنج فەرزە نوێژی كردو، ڕەمەزان ڕۆژووی گرت و، داوێنی خۆی پاك ڕاگرت و، گوێڕایەڵی مێردەكەی كرد، دەچێتە بەهەشتەوە.**

٢٩٨٩- إذا كانت عند الرجل امرأتان فلم يعدل بينهما جاء يوم القيامة و شقه ساقط.

(صحيح) ( ت ك ) عن أبي هريرة . (الصحيحة ٢٠٧٧)

**٢٩٨٩- ئەگەر پیاوێك دوو خێزانی هەبێت، دادگەری نەكات لەنێوانیاندا لەڕۆژی قیامەتدا دێت و لایەكی شۆڕ بووەتەوە.**

٢٩٩٠- استوصوا بالنساء خيرا فإن المرأة خلقت من ضلع و إن أعوج شيء في الضلع أعلاه فإن ذهبت تقيمه كسرته و إن تركته لم يزل أعوج فاستوصوا بالنساء خيرا.

(صحيح) ( ق ) عن أبي هريرة . (الإرواء ١٩٩٧)

**٢٩٩٠- ڕاسپێری چاكە بكەن بەژنان، چونكە ئافرەت لەپەراسوو دروستكراوە خوارترین جێگاش لەپەراسوودا لای سەرەوەیەتی، جا ئەگەر بتەوێت ڕاستی بكەیتەوە دەشكێت، ئەگەریش وازی لێ بهێنی هەر بەلاری دەمێنێتەوە، بۆیە ڕاسپێری چاكە بكەن لەگەڵ ئافرەتاندا.**

٢٩٩١- انظري أين أنت منه ؟ فإنما هو جنتك و نارك.

(صحيح) ( ابن سعد طب ) عن عمة حصين بن محصن . (الترغيب ١٩٣٣)

**٢٩٩١- بڕوانە تۆ لەچی ئاستێكی ڕەزامەند مێردەكەتدای؟ بێگومان ئەو بەهەشت و دۆزەخی تۆیە.**

٢٩٩٢- إن أحق الشروط أن توفوا به ما استحللتم به الفروج.

(صحيح) ( حم ق ٤ ) عن عقبة بن عامر . (صحيح أبي داود ١٨٥٦)

**٢٩٩٢- شایستەترین مەرجی جێ بەجێ کردن، ئەوەیە کە ئافرەتەکانتان پێی ڕەوا کردووە بۆ خۆتان.**

٢٩٩٣- إن المرأة خلقت من ضلع فإن ذهبت تقومها كسرتها و إن تدعها ففيها أود و بلغة.

(حسن) ( حم ن ) أبي ذر . (الترغيب ١٩٢٧)

**٢٩٩٣- ئافرەت لە پەراسوو دروستکراوە، ئەگەر بتەوێت ڕاستی بکەیتەوە دەیشکێنی، ئەگەریش لێی گەڕێیت دەتگەیەنێتە مەنزل[1].**

٢٩٩٤- إن المرأة خلقت من ضلع لن تستقيم لك على طريقة فإن استمتعت بها استمتعت بها و بها عوج و إن ذهبت تقيمها كسرتها و كسرها طلاقها.

(صحيح) ( م ت ) عن أبي هريرة . (الترغيب ١٩٢٧)

**٢٩٩٤- ئافرەت لە پەراسوو دروستکراوە، بۆ تۆ ڕێك نابێتەوە لەسەر شێوازێك، ئەگەر پێوەی ڕابوێریت پێوەی ڕادەبوێرێت و ئەو هەر لارە، ئەگەریش بچیت ڕاستی بکەیتەوە دەشکێت شکاندنیشی تەلاقدانێتی.**

٢٩٩٥- إن المرأة خلقت من ضلع و إنك إن ترد إقامة الضلع تكسرها فدارها تعش بها.

(صحيح) ( حم حب ك ) عن سمرة . (الترغيب ١٩٢٦)

**٢٩٩٥- ئافرەت لە پەراسوو دروست کراوە، تۆیش ئەگەر بتەوێت ئەو پەراسووە ڕاست بکەیتەوە دەیشکێنی، بۆیە ڕۆخۆش بەلەگەڵی و بەتەنگییەوە بە بەباشی لەگەڵیدا ژیان بەسەر دەبەی.**

٢٩٩٦- إن النساء شقائق الرجال.

(صحيح) ( حم ) عن عائشة . (صحيح أبي داود ٢٣٤)

**٢٩٩٦- ئافرەتان خوشکی پیاوانن.**

٢٩٩٧- إن الله تعالى يوصيكم بالنساء خيرا فإنهن أمهاتكم و بناتكم و خالاتكم إن الرجل من أهل الكتاب يتزوج المرأة و ما تعلق يداها الخيط فما يرغب واحد منهما عن صاحبه.

(صحيح) ( طب ) عن المقدام . (الصحيحة ٢٨٧١)

---

[1] واتە: دەتەیەنێتە ئەو پەڕی ئاسوودەی و لەزەت و چێژی ژیان. السراج المنير ج١ ص ٢٩٠

**٢٩٩٧- خوای گەورە ڕاسپێری چاکەتان پێ دەکات بەرانبەر ژنەکانتان ئەوان دایك و کچ و پوری ئێوەن، کەسی وا هەبوو لە ئەهلی کیتاب ژنێکی مارە دەکرد دەستی دەزووی نەدەگرت، کەسیشیان، وازی لەویتر نەدەهێنا.**

٢٩٩٨- إنما النساء شقائق الرجال.

(صحيح) ( حم د ت ) عن عائشة ( البزار ) عن أنس . (الصحيحة ٢٨٦٣)

**٢٩٩٨- بێگومان ئافرەتان خوشکی پیاوانن.**

٢٩٩٩- إني أحرج عليكم حق الضعيفين: اليتيم و المرأة.

(حسن) ( ك هب ) عن أبي هريرة . (الصحيحة ١٠١٥)

**٢٩٩٩- بەگوناهبارتان دەژمێرم ئەگەر مافی هەردوو لاوازەکە بەفیڕۆ بدەن: هەتیوو ئافرەت.**

٣٠٠٠- أيما امرأة توفي عنها زوجها فتزوجت بعده فهي لآخر أزواجها.

(صحيح) ( طب ) عن أبي الدرداء . (الصحيحة ١٢٨١)

**٣٠٠٠- هەر ئافرەتێك مێردەکەی مردو لە پاش ئەو شووی کرد، لەدوارۆژدا بۆ هاوسەری دووهەمی دەبێت.**

٣٠٠١- ثلاثة من السعادة و ثلاثة من الشقاء فمن السعادة: المرأة الصالحة تراها فتعجبك و تغيب عنها فتأمنها على نفسها و مالك و الدابة تكون و طيئة فتلحقك بأصحابك و الدار تكون واسعة كثيرة المرافق و من الشقاء: المرأة تراها فتسوؤك و تحمل لسانها عليك و إن غبت عنها لم تأمنها على نفسها و مالك و الدابة تكون قطوفا فإن ضربتها أتعبتك و إن تركتها لم تلحقك بأصحابك و الدار تكون ضيقة قليلة المرافق.

(حسن) ( ك ) عن سعد . (الصحيحة ١٨٠٣)

**٣٠٠١- سێ شت لەبەختەوەرییەوەن و سێ شتیش لەبەدبەختیە، ئەوانەی لە بەختەوەرین: ئافرەتی چاك، کە دەیبینیت کەمن کێشت دەکات کەجێ ی دەهێڵیت دڵنیای لەخۆی و لەماڵت، وولاخێکیش خێراو خۆش سوار و سەرنەرم بێت فریای هاوەڵانت دەخات، خانووی فراوان کە جێگا و ڕێگای زۆربێت، ئەوانی لە بەدبەختین، ئافرەتێك تەماشای بکەیت و پێی دڵتەنگ بیت، زمانی لەدژایەتیدا بەکاربێنێ، ئەگەر بەجێشت هێشت دڵنیانە بێت نە لەخۆی و نە لەماڵەکەت، وولاخیش خرس و تەمبەڵ بێت، ئەگەر لێی بدەیت ماندووت دەکات، ئەگەر وازیشی لێ بهێنێت بەهاوەڵەکانت ناگەیت، خانوویەکیش تەنگ بێت و جێگا و ڕێگای کەم بێت.**

٣٠٠٢- ثلاثة لا تسأل عنهم: رجل فارق الجماعة و عصى إمامه و مات عاصيا و أمة أو عبد أبق من سيده فمات و امرأة غاب عنها زوجها و قد كفاها مؤنة الدنيا فتبرجت بعده فلا تسأل عنهم.

(صحيح) ( خد ع طب ك هب ) عن فضالة بن عبيد . (الصحيحة ٥٤١)

**٣٠٠٢- سێ شت هەن پرسیاریان مەكە، پیاوێك دابڕابێت لە كۆمەڵی موسوڵمانان و، لە پێشەواكەی یاخی بوو بێت هەر بەو سەرپێچیەوەش لەدونیا دەرچێت، كەنیزەكێك یان كۆیلەیەكیش لە گەورەكەی یاخی بوو بێت و مردبێت، ئافرەتێكیش پیاوەكەی بەجێی هێشتبێت و لێی دوور كەوتبێتەوە بەڵام هەموو پێویستیەكی دونیایی بۆ مسۆگەر كرد بێت لەدوای هاوسەرەكە روت بكاتەوە لەشی دەرخات پرسیار لەوانە مەكە[1].**

٣٠٠٣- ثلاثة لا يدخلون الجنة أبدا: الديوث و الرجلة من النساء و مدمن الخمر.

(صحيح) ( طب ) عن عمار بن ياسر . (الصحيحة ١٣٩٧)

**٣٠٠٣- سێ كەس هەن هەرگیز ناچنە بەهەشتەوە: كەسی بێ ئابڕوو((گەوواد))، ئەو ئافرەتەش خۆی وەكو پیاو لێ دەكات و، هەروەها كەسی هەمیشە ئارەق خۆرو سەرخۆش**

٣٠٠٤- حق الزوج على زوجته أن لو كانت به قرحة فلحستها ما أدت حقه.

(صحيح) ( ك ) عن أبي سعيد . (الترغيب ١٩٣٤)

**٣٠٠٤- مافی مێرد بەسەر هاوسەرەكەی ئەوەیە ئەگەر برینداربێت و ئەو برینەكەی بەزمانی بلێسێتەوە، هێشتا مافی نەداوە.**

٣٠٠٥- حق المرأة على الزوج أن يطعمها إذا طعم و يكسوها إذا اكتسى و لا يضرب الوجه و لا يقبح و لا يهجر إلا في البيت

(صحيح) ( طب ك ) عن معاوية بن حيدة . (الإرواء ٢٠٩٣)

**٣٠٠٥- مافی ئافرەت لەسەر مێردەكەی ئەوەیە وەكو خواردنی خۆی خواردنی پێ بدات، وەكو خۆی جل و بەرگی بۆ بكات، لەدەم و چاویشی نەدات و، قسەی ناشرینی پێ نەڵێت و، جێ ی لێ جیانەكاتەوە لەماڵدا نەبێت.**

٣٠٠٦- خذي من ماله بالمعروف ما يكفيك و يكفي بنيك.

(صحيح) ( ق د ن هـ ) عن عائشة . (الإرواء ٢٧١٣)

---

[1] **واتە: پرسیار لەخراپی ماڵیان و گوناه و تاوانیان مەكە ئەوەند كارێكی خراپیان كردووە.**

**٣٠٠٦- لەماڵەكەی ببە بەچاكە ئەوەندەی بەشی خۆت و منداڵەكانت دەكات[1].**

٣٠٠٧- خياركم خياركم لنسائهم.

(صحيح) ( هـ ) عن ابن عمرو . (الصحيحة ٢٨٤)

**٣٠٠٧- چاكترینتان چاكترینتانن بۆ خێزانەكانیان.**

٣٠٠٨- خياركم خيركم لأهله.

(صحيح) ( طب ) عن أبي كبشة . (الترغيب ٢٦٦٠)

**٣٠٠٨- چاكترینتان چاكترینتانن بۆ كەس و كارتان.**

٣٠٠٩- خير النساء التي تسره إذا نظر و تطيعه إذا أمر و لا تخالفه في نفسها و لا مالها بما يكره.

(صحيح) ( حم ن ك ) عن أبي هريرة . (الصحيحة ١٨٣٨)

**٣٠٠٩- باشترین ئافرەت ئەوەیە كەمێردەكەی تەماشای بكات پێی دڵخۆش بێت، گوێڕایەڵیشی بكات ئەگەر فەرمان پێ كرد، سەرپێچیشی نەكات لەشتێكدا پێ ی ناخۆش بێت لەخۆی و لەماڵیدا.**

٣٠١٠- خير النساء من تسرك إذا أبصرت و تطيعك إذا أمرت و تحفظ غيبتك في نفسها و مالك.

(صحيح) ( طب ) عن عبدالله بن سلام . (الصحيحة ١٨٣٨)

**٣٠١٠- چاكترین ژن ئەوەیە كەبینیت شادمان و دڵخۆش بیت، كەفەرمانیشت پێ كرد گوێڕایەڵیت بكات، لەدیار نەبونتا خۆی و ماڵەكەت بپارێزیت.**

٣٠١١- خيركم خيركم لأهله و أنا خيركم لأهلي.

(صحيح) ( ت ) عن عائشة ( هـ ) عن ابن عباس ( طب ) عن معاوية . (الصحيحة ٢٨٥)

**٣٠١١- چاكترینتان چاكترینتانن بۆ خاوو خێزانتان، منیش چاكترینتانم بۆ خاوو خێزانەكەم.**

٤٠١٢- خيركم خيركم للنساء.

(صحيح) ( ك ) عن ابن عباس . (الصحيحة ٢٨٥)

**٣٠١٢- چاكترینتان چاكترینتانە بۆ ئافرەتان.**

٤٠١٣- دونك فانتصري.

(صحيح) ( هـ ) عن عائشة . (الصحيحة ١٨٦٢)

---

**[1] كاتێك هیندی هاوسەرەكەی ئەبو سوفیان دەردە دڵی لەئەبو سوفیان كرد لەخزمەت پێغەمبەردا و ووتی ئەبو سوفیان رۆژ دوو چرۆكە بەشی خەرجی خۆم و منداڵەكەم بەچاكی ناداتێ پێغەمبەریش سەلات و سەلامی خوای لەسەر بێت ئاوایی پێ فەرموو. السراج المنير ج١ ص ٤٩٢**

**٣٠١٣- مافى خۆت وەرگرەوە ئەى عائيشە[1].**

٣٠١٤- كفى بالمرء إثما أن يحبس عمن يملك قوته.

(صحيح) ( م ) عن ابن عمرو . (المشكاة ٣٣٤٦)

**٣٠١٤- بەسە بۆ گوناهبارى كەسێك خەرجى نەداتە ئەو كەسانەى دەسەڵاتى هەيە بەسەريدا.**

٣٠١٥- كفى بالمرء إثما أن يضيع من يقوت.

(حسن) ( حم د ك هق ) عن ابن عمرو. (الإرواء ٨٩٤)

**٣٠١٥- بەسە بۆ گوناهبارى كەسێك بەخێو كراوەكانى خۆى تيابچوێنێت.**

٣٠١٦- كل نفس من بني آدم سيد فالرجل سيد أهله و المرأة سيدة بيتها.

(صحيح) ( ابن السني في عمل اليوم والليلة ) عن أبي هريرة. (الصحيحة ٢٠٤١)

**٣٠١٦- هەموو كەسێك لەئادەميزادەكان گەورەيە، پياو گەورەى كەس و كارى خۆيەتى و، ئافرەت گەورەى ماڵى خۆيەتى.**

٣٠١٧- لقد طاف الليلة بآل محمد نساء كثير كلهن تشكو زوجها من الضرب و ايم الله لا تجدون أولئك خياركم.

(صحيح) ( د ن هـ حب ك ) عن إياس الدوسي. (المشكاة ٣٢٦١)

**٣٠١٧- ئەمشەو ئافرەتانێكى زۆر هاتنە لاى ئەوادەى موحەممەد و هەموويان سكاڵايان لە مێردەكانيان دەكرد كەلێيان دەدەن، سوێند بەخواى گەورە ئەوانە پياو چاكانى ناو، ئێوە نين.**

٣٠١٨- لو أمرت أحدا أن يسجد لأحد لأمرت المرأة أن تسجد لزوجها .. .

(صحيح) ( هـ ) عن عائشة. (الصحيحة ٣٤٩٠)

**٣٠١٨- ئەگەر فەرمانم بەكەسێك بكرد با سوژدە بۆ كەسێك ببات، فەرمانم دەكرد بە ژن سوژدە بۆ مێردەكەى ببات. ((ئەگەر پياوێك فەرمان بەژنەكەى بكات لەچيايێكى سورەوە بچێت بۆ چيايێكى ڕەش يان لەچيايەكى ڕەشەوە بچێت بۆ چيايێكى سور باشترە بۆى بەگوێ ى بكات)).**

٣٠١٩- لو أن أحدكم إذا أراد أن يأتي أهله قال: بسم الله اللهم جنبنا الشيطان و جنب الشيطان ما رزقتنا فإنه إن قضي بينهما ولد من ذلك لم يضره الشيطان أبدا.

(صحيح) ( حم ق ٤ ) عن ابن عباس. (الإرواء ٢٠١٢)

---

**[1] لە كاتێكدا پێغەمبەر سەڵات و سەلامى خواى لەسەر بێت ئەم فەرمايشتەى فەرموو كە زەينەب بەبێ پرس چۆتە ژوورى عائيشە ڕەزاى خوايان لێ بێت عائيشەش تورە بو ئينجا باسى كرد.**

**٣٠١٩- ئەگەر کەسێك لەئێوە بیەوێت بچێتە لای خێزانەکەی بڵێت: بەناوی خوا، خوایە شەیتانمان لێ دوور خەرەوە و لەو منداڵەشی دوورخەرەوە کە پێمان دەبەخشی، ئەگەر منداڵێك دروست بێت لەنێوانیاندا هەرگیز شەیتان زیانی پێ ناگەیەنێت.**

٣٠٢٠- لو تعلم المرأة حق الزوج لم تقعد ما حضر غداؤه و عشاؤه حتى يفرغ منه.

(صحيح) ( طب ) عن معاذ. (الصحيحة ٢١٦٦)

**٣٠٢٠- ئەگەر ئافرەت مافی مێردەکەی بزانیبا، هەرگیز دانە دەنیشت کە ئەو نیوەڕۆژەو شێوی بکرد با، تاکو لێی دەبوویەوە.**

٣٠٢١- لو كنت آمرا أحدا أن يسجد لأحد لأمرت المرأة أن تسجد لزوجها.

(صحيح) ( ت ) عن أبي هريرة ( حم ) عن معاذ ( ك ) عن بريدة. (الإرواء ٢٠٨٥)

**٣٠٢١- ئەگەر فەرمانم بەکەسێك بکردبا سوژدە بۆ کەسێکی تر ببات، فەرمانم دەکرد ئافرەت سوژدە ببات بۆ مێردەکەی.**

٣٠٢٢- لو كنت آمرا أحدا أن يسجد لغير الله لأمرت المرأة أن تسجد لزوجها و الذي نفس محمد بيده لا تؤدي المرأة حق ربها حتى تؤدي حق زوجها كله حتى لو سألها نفسها و هي على قتب لم تمنعه.

(حسن) ( حم هـ حب ) عن عبدالله بن أبي أوفى. (الإرواء ٢٠٨٥)

**٣٠٢٢- ئەگەر فەرمانم بەکەسێك بکردبا سوژدە بۆ کەسێکی تر ببات جگە لە خوا، فەرمانم دەکرد ئافرەت سوژدە بۆ مێردەکەی ببات، سوێند بەو کەسەی گیانی موحەممەدی بەدەستە، ئافرەت مافی خوا بەجێ ناهێنێ تاکو هەموو مافی مێردەکەی بەجێ نەهێنێ، تەنانەت ئەگەر داوای لێی بکاتە بێتە لای و لەسەر وشترێك بێت پێویستە ڕێگەی لێ نەگرێت.**

٣٠٢٣- ليس للمرأة أن تنتهك شيئا من مالها إلا بإذن زوجها.

(صحيح) ( طب ) عن واثلة. (الصحيحة ٧٧٥)

**٣٠٢٣- ئافرەت بۆی نییە ماڵی خۆی لەناوبدات بەبێ ڕێگە پێدانی مێردەکەی.**

٣٠٢٤- مرها فإن يك فيها خير فستفعل و لا تضرب ظعينتك كضرب أمتك.

(صحيح) ( د حب ) عن لقيط بن صبرة. (صحيح أبي داود ١٣٠)

**٣٠٢٤- فەرمانی پێبکە ئەگەر چاکەی تێدا بێت وا دەکات، لەخێزانیش مەدە بەو شێوەی لە کەنیزەکەکەت دەدەیت.**

٣٠٢٥- من كان يؤمن بالله و اليوم الآخر فإذا شهد أمرا فليتكلم بخير أو ليسكت و استوصوا بالنساء فإن المرأة خلقت من ضلع و إن أعوج شيء في الضلع أعلاه إن ذهبت تقيمه كسرته و إن تركته لم يزل أعوج استوصوا بالنساء.

(صحيح) ( م ) عن أبي هريرة. (الإرواء ١٩٩٧)

**٣٠٢٥- كەسێك باوەڕی هەبێت بەخواو ڕۆژی دوایی، ئەگەر ئامادەی كارێك بوو باقسەی باش بكات یان بێ دەنگ بێت، ڕاسپێری چاكەیش بكەن دەربارەی ئافرەتان چونكە ئافرەت لە پەراسوو دروست كراوە، خوارترین جێگایش لە پەراسوودا سەرومیەتی، ئەگەر بچیت ڕاستی بكەیتەوە دەیشكێنی، ئەگەر وازیشی لێ بهێنی هەر بە لاری دەمێنێتەوە، دەی ڕاسپاردەی چاك بكەن دەربارەی ئافرەتدا.**

٣٠٢٦- المرأة عورة فإذا خرجت استشرفها الشيطان.

(صحيح) ( ت ) عن ابن مسعود. (الإرواء ٢٧٣)

**٣٠٢٦- ئافرەت شەرمگەیە، ئەگەر لەماڵ دەرچوو شەیتان سەروەختی دەكات.**

٣٠٢٧- المرأة لآخر أزواجها.

(صحيح) ( طب ) عن أبي الدرداء ( خط ) عن عائشة. (الصحيحة ١٢٨١)

**٣٠٢٧- ئافرەت بۆ دوایین هاوسەی دەبێت.**

٣٠٢٨- و الذي نفسي بيده ما من رجل يدعو امرأته إلى فراشه فتأبى عليه إلا كان الذي في السماء ساخطا عليها حتى يرضى عنها.

(صحيح) ( م ) عن أبي هريرة. (المشكاة ٣٢٤٦)

**٣٠٢٨- سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە، هەر پیاوێك بانگی هاوسەرەكەی بكات بۆ سەر جێگای خۆی و ئەو ڕازی نەبێت، ئەوەی لە ئاسمانە لێ ی تورە دەبێت تا ئەو كاتەی مێردەكەی لێی ڕازی دەبێت.**

٣٠٢٩- لا تأذن امرأة في بيت زوجها إلا بإذنه ولا تقوم من فراشها فتصلي تطوعا إلا بإذنه.

(صحيح) ( طب ) عن ابن عباس. (الضعيفة ٤٧٧١)

**٣٠٢٩- دروست نییە ئافرەت ڕێگە بەكەس بدات بێتە ماڵی مێردەكەی بە ڕەزامەندی خۆی نەبێت وەنابێ لەناو جێگەكەی بێتە دەرەوە بۆ نوێژ كردن بەڕەزامەندی هاوسەرەكەی نەبێت.**

٣٠٣٠- لا تؤذي امرأة زوجها في الدنيا إلا قالت زوجته من الحور العين: لا تؤذيه قاتلك الله فإنما هو عندك دخيل يوشك أن يفارقك إلينا.

(صحيح) ( حم ت ) عن معاذ. (الصحيحة ١٧٣)

**٣٠٣٠- هەر ئافرەتێك ئازاری هاوسەرەكەی بدات لەدونیادا، هاوسەرە حۆریەكەی ئەو پیاوە دەڵێت: ئازاری مەدە خوا بتكوژێت، بەڕاستی ئەو لای تۆ غەریبە و نزیكە لێت جیا بێتەوە بەرەو لای ئێمە.**

٣٠٣١- لا تصومن امرأة إلا بإذن زوجها.

(صحيح) ( حم د حب ك ) عن أبي سعيد. (الصحيحة ٣٩٥)

**٣٠٣١- نا هیچ ئافرەتێك بەڕۆژوو نەبێت بەڕەزامەندی مێردەكەی نەبێت.**

٣٠٣٢- لا يجوز لامرأة أمر في مالها إذا ملك زوجها عصمتها.

(صحيح) ( د ك ) عن ابن عمرو. (الصحيحة ٨٢٥)

**٣٠٣٢- دروست نییە هیچ ئافرەتێك دەستكاری ماڵی خۆی بكات بەبێ پرسی هاوسەرەكەی لەو كاتەوە دەبێتە هاوسەری.**

٣٠٣٣- لا يجوز لامرأة عطية إلا أن يأذن زوجها.

(صحيح) ( د ) عن ابن عمرو. (الصحيحة ٨٢٥)

**٣٠٣٣- دروست نییە ئافرەتێك بەخشینێك ببەخشێت مەگەر هاوسەرەكەی ڕێگەی پێبدات.**

٣٠٣٤- لا يحل لامرأة أن تصوم و زوجها شاهد إلا بإذنه أو تأذن في بيته إلا بإذنه و ما أنفقت من نفقة من غير أمره فإنه يؤدي إليه شطره.

(صحيح) ( خ ) عن أبي هريرة. (الترغيب ٩٣٩)

**٣٠٣٤- دروست نییە هیچ ئافرەتێك بەڕۆژوو بێت و مێردەكەی ئامادە بێت بەبێ ڕەزامەندی ئەو، یان ڕێگە بداتە كەسێك بێتە ماڵەكەی بەبێ ڕەزامەندی ئەو، هەر خەرجییەكیش خەرج بكات بەبێ فەرمانی ئەو نیوەی خێرەكەی بۆ مێردەكەی دەچێت.**

٣٠٣٥- لا يصلح لبشر أن يسجد لبشر و لو صلح أن يسجد بشر لبشر لأمرت المرأة أن تسجد لزوجها من عظم حقه عليها و الذي نفسي بيده لو أن من قدمه إلى مفرق رأسه قرحة تنبجس بالقيح و الصديد ثم أقبلت تلحسه ما أدت حقه.

(صحيح) ( حم ن ) عن أنس. (الترغيب ١٩٣٦)

**٣٠٣٥- ڕەوا نییە ئادەمیزاد سوژدە بەرێت بۆ ئادەمیزاد، ئەگەر ئەو كارە ڕەوا بوایە، فەرمانم دەكرد ئافرەت سوژدە بەرێت بۆ مێردەكەی ئەوەندە مافی زۆرە بەسەریەوە، سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە ئەگەر لەسەری پێیەوە هەتا تەوقی سەری پیاوەكەی برینی هەڵتەقیو بێ بەكێم و زوخاو و دوایی بەزمانی بلێسێتەوە هێشتا مافی جێ بەجێ نەكردووە.**

٣٠٣٦- لا يفركن مؤمن مؤمنة إن كره منها خلقا رضي منها غيره.

(صحيح) ( حم م ) عن أبي هريرة. (المشكاة ٣٢٤٠)

**٣٠٣٦- با پیاوی ئیماندار ڕق هەڵنەگرێت لەئافرەتی ئیماندار، ئەگەر ڕەوشتێکی نارازی بێت، لەڕەوشتێکی تری ڕازی دەبێت.**

٣٠٣٧- يعمد أحدكم فيجلد امرأته جلد العبد و لعله يضاجعها في آخر يومه.

(صحيح) ( حم ق ت هـ ) عن عبدالله بن زمعة. (الصحيحة ٢٦٧٨)

**٣٠٣٧- کەسێك لەئێوە دەچێت بەقامچی لەخێزانەکەی دەدا وەکو کۆیلە و، لەوانەشە لەکۆتایی ڕۆژەکەیدا لەگەڵیدا ڕاکێشێت[1].**

٣٠٣٨- اصنعوا ما بدا لكم فما قضى الله تعالى فهو كائن و ليس من كل الماء يكون الولد.

(صحيح) ( حم ) عن أبي سعيد . (الصحيحة ١٤٦٢)

**٣٠٣٨- هەر چیتان پێ باشە ئەنجامی بدەن[2]، ئەوەی خوای گەورە بڕیاری دابێت هەر ئەوە دەبێت، منالێش لەهەموو ئاوە کەدروست نابێت[3].**

٣٠٣٩- اعزل عنها إن شئت فإنه سيأتيها ما قدر لها.

(صحيح) ( م ) عن جابر . (الصحيحة ١٣٣٣)

**٣٠٣٩- لێی جیا بەرەوە ئەگەر حەز دەکەیت، بێگومان ئەوەی بۆی بڕیاردراوە هەر دروست دەبێت.**

٣٠٤٠- إن قضى الله تعالى شيئا ليكونن و إن عزل.

(صحيح) ( الطيالسي ) عن أبي سعيد . (الصحيحة ١٤٦٢)

**٣٠٤٠- ئەگەر خوای گەورە بڕیاری شتێك بدات هەر دەبێت ئەگەر دوور خستنەوەش بکرێت[4].**

٣٠٤١- أوإنكم تفعلون ذلك ؟ لا عليكم أن لا تفعلوا ذلك فإنها ليست نسمة كتب الله أن تخرج إلا هي خارجة.

(صحيح) ( ق ) عن أبي سعيد . (صحيح أبي داود ٢١٧٢)

---

[1] واتە : لەگەڵیدا جوت بێت.

[2] واتە : لەقەدەغەو ڕێگرتن لەمناڵ بوون.

[3] لەهەموو ئەو تۆوەی دەڕژێتە منداڵدانەوە.

[4] عزل: واتە لەکاتی جوت بونداو لەکاتی هاتنەوەی تۆودا پیاو لەهاوسەرەکەی دور بکەوێتەوەو ئاوەکە بڕێژێتە دەرەوە.

**٣٠٤١- ئايا ئێوە ئەو كارە دەكەن[1]، هيچتان لەسەر نييە ئەگەر وا نەكەن، چونكە هەر كەسێك خواى گەورە بڕيارى دا بێت دروست ببێت هەر دروست دەبێت.**

٣٠٤٢- لقد هممت أن أنهى عن الغيلة حتى ذكرت أن الروم و فارس يصنعون ذلك فلا يضر أولادهم.

(صحيح) ( مالك حم م ٤ ) عن جدامة بنت وهب. (غاية المرام ٢٤٢)

**٣٠٤٢- خەريك بوو جوت بون قەدەغە بكەم لەكاتى شيرداندا، هەتا كەوتە بيرم ڕۆم و فارسەكان ئەو كارە دەكەن و زيانيشى نييە بۆ منداڵەكانيان.**

٣٠٤٣- لا تقتلوا أولادكم سرا فوالذي نفسي بيده إن الغيل ليدرك الفارس فيدعثره عن فرسه.

(حسن) ( حم د هـ ) عن أسماء بنت يزيد. (المشكاة ٣١٩٦)

**٣٠٤٣- منداڵەكانتان بە پەنهانى مەكوژن سوێند بەوەى گيانى منى بەدەستە جوت بون لەگەڵ هاوسەرى شيردەر لەسولرچاكدا هەبووە سەرسمەى پێداوە.**

٣٠٤٤- لو أن الماء الذي يكون منه الولد أهرقته على صخرة لأخرج الله تعالى منها ولدا و ليخلقن الله نفسا هو خالقها.

(حسن) ( حم الضياء ) عن أنس. (الصحيحة ٣٣٧)

**٣٠٤٤- ئەگەر ئەو ئاوەى منالى لىٚ دروست دەبێت بيرێژيتە سەر تاوێريكدا هەر خواى گەورە منالى لىٚ دروست دەكات، خواى گەورە كەسێك هەر دروست دەكات كە خۆى دروستكەريتى.**

٣٠٤٥- لو كان ذلك ضارا ضر فارس و الروم - يعني الغيل -.

(صحيح) ( م ) عن أسامة بن زيد. (المشكاة ٣١٨٨)

**٣٠٤٥- ئەگەر ئەوە شتێكى زيان بەخش بوايە بۆ فارس و ڕۆمەكان زيان بەخش دەبوو، واتە: ( غيل ) جووت بوون لەگەڵ ئافرەتانىشيردەردا.**

٣٠٤٦- ما عليكم أن لا تعزلوا فإن الله قدر ما هو خالق إلى يوم القيامة.

(صحيح) ( ن ) عن أبي سعيد وأبي هريرة. (الضعيفة ٧٠٢٢)

**٣٠٤٦- هيچتان لەسەر نييە (عزل) دورە پەرێزى نەكەن، چونكە ئەوەى خواى گەورە بڕيارى داوە هەر ئەوە دەبێت تا ڕۆژى قيامەت.**

٣٠٤٧- نهى عن الإخصاء.

(صحيح) ( ابن عساكر ) عن ابن عمر. (غاية المرام ٤٧٦)

---

[1] **واتە: (( عزل ))**

**٣٠٤٧- پێغەمبەر ﷺ خەساندنی قەدەغە کردووە[1].**

٣٠٤٨- و لم يفعل ذلك أحدكم ؟ فإنه ليست نفس مخلوقة إلا الله خالقها.

(صحيح) ( م د ) عن أبي سعيد. (صحيح أبي داود ١٨٨٦)

**٣٠٤٨- کەسێك لەئێوە بۆچی ئەو کارە دەکات[2]، بەڕاستی هیچ کەسێك دروست نابێت تاکو خوای گەورە دروستی نەکات.**

٣٠٤٩- لا إخصاء في الإسلام ( ولا بنيان كنيسة ) .

(صحيح) ( هق ) عن ابن عباس . (غاية المرام ٤٧٨)

**٣٠٤٩- خەساندن نییە لەئیسلام... (( دروست کردنی کێسەش دروست نیە )).**

٣٠٥٠- لا عليكم أن لا تفعلوا فإن الله تعالى كتب من هو خالق إلى يوم القيامة.

(صحيح) ( حم م ) عن أبي سعيد. (الصحيحة ١٠٣٢)

**٣٠٥٠- هیچتان لەسەر نییە ئەو کارە نەکەن ((عزل)) ، چونکە خوای گەورە هەموو شتێکی نووسیوە کە دروست دەبێت تا ڕۆژی قیامەت.**

٣٠٥١- لا عليكم أن لا تفعلوا ما كتب الله خلق نسمة هي كائنة إلى يوم القيامة إلا ستكون

(صحيح) ( م د ) عن أبي سعيد. (الصحيحة ١٠٣٢)

**٣٠٥١- هیچتان لەسەر نییە ئەو کارە ((عزل)) نەکەن، خوای گەورە بڕیاری دروست بوونی هەر کەسێکی دابێت تاڕۆژی قیامەت دروست دەبێت.**

٣٠٥٢- يا أبا هريرة ! جف القلم بما أنت لاق فاختص على ذلك أو ذر.

(صحيح) ( خ ن ) عن أبي هريرة. (السنة ١٠٩)

**٣٠٥٢- ئەی ئەبو هورەیرە! مەرەکەبی نوسراوی چارەنووست وشکبۆتەوە، ئیتر لەوبارەو خۆت بخەسێنە یان واز بێنە[3].**

٣٠٥٣- كان إذا ذبح الشاة يقول: أرسلوا بها إلى أصدقاء خديجة.

(صحيح) ( م ) عن عائشة. (الصحيحة ٢٨١٨)

---

[1] خەساندنی بۆ ئاژەمیزاد قەدەغە کردووە چونکە دەبێتە هۆی فەوتانی نەومو بەرەچەی ئادەمیزاد، بەڵام خەساندنی ئاژەڵ دروستە.

[2] واتە: ((عزل)) دورە پەرێزی واتە: لەکاتی جوت بوندا و لەکاتی ڕەحەت بوندا تومکە فرێیداتە دەرەوە.

[3] پێغەمبەر سەڵات و سەلامی خوای لەسەر بێت بەتوڕە بوونەوە بەئەبی هورەیرەی فەموو: کاتێك ئەبو هریرە فەرمووی من لەخۆم دەترسم دەربارەی ئارەزو ناشتوانم ژن بهێنم.

**٣٠٥٣- پێغەمبەر ﷺ كە مەرێك یان بزنێكی سەر دەبڕی دەیفەرموو: لێی بنێرن بۆ هاوڕێكانی خەدیجە.**

٣٠٥٤- كان له ملحفة مصبوغة بالورس و الزعفران يدور بها على نسائه فإذا كانت ليلة هذه رشتها بالماء و إذا كانت ليلة هذه رشتها بالماء و إذا كانت ليلة هذه رشتها بالماء.

(صحيح) ( خط ) عن أنس. (الصحيحة ٢١٠١)

**٣٠٥٤- پێغەمبەر ﷺ لێفەیەكی هەبوو ڕەنگ كرا بوو بەزافەران، بەسەر خێزانەكانیدا دەیگێڕا، كەنۆرە شەوی ئەمەیان دەهات ئاوی پیادە پرژان و، كە نۆرە شەوی ئەویان دەهات ئاوی پیادە پرژان، ئەگەر شەوی یەكێكی تریشیان بوایە ئاوی پیادە پرژان.**

٣٠٥٥- كان يدور على نسائه في الساعة الواحدة من الليل و النهار.

(صحيح) ( خ ن ) عن أنس. (صحيح أبي داود ٢١٤)

**٣٠٥٥- پێغەمبەر ﷺ بەسەر خێزانەكانیدا دەسوڕایەوە، لەیەك كاتدا لەشەو و ڕۆژێكدا.**

٣٠٥٦- ملعون من أتى امرأة في دبرها.

(صحيح) ( حم د ) عن أبي هريرة. (صحيح أبي داود ١٨٧٨)

**٣٠٥٦- نەفریت لێكراوە كەسێك بچێتە لای ئافرەتێك لە پاشەوە[١].**

٣٠٥٧- إن الذي يأتي امرأته في دبرها لا ينظر الله إليه يوم القيامة.

(صحيح) ( هب ) عن أبي هريرة . (المشكاة ٣١٩٤)

**٣٠٥٧- ئەو كەسەی بچێتە لای خێزانەكەی لە پاشەوە[٢] خوای گەورە لەڕۆژی قیامەتدا تەماشای ناكات.**

٣٠٥٨- ائت حرثك أنى شئت و أطعمها إذا طعمت و اكسها إذا اكتسيت و لا تقبح الوجه و لا تضرب.

(حسن) ( د ) عن بهز بن حكيم عن أبيه عن جده . (الصحيحة ٦٨٧)

**٣٠٥٨- بچۆرە كێڵگەكەت لەهەر كوێوە دەتەوێت خواردنیشی پێبدە ئەگەر خۆت خواردت، پۆشاكیشی بۆ بكە كە ئەگەر خۆت جل و بەرگت پۆشی، مەشڵێ خوا ڕووت ڕەش بكات و لێیشی مەدە.**

٣٠٥٩- إتيان النساء في أدبارهن حرام.

(صحيح) ( ن ) عن خزيمة بن ثابت . (الصحيحة ٨٧١)

---

[١] لەكۆمیەوە.

[٢] لەكۆمیەوە.

**٣٠٥٩- چوونه لای ژنان له پاشیانەوه[1] حەرامه.**

٣٠٦٠- إذا أراد أحدكم من امرأته حاجته فليأتها و إن كانت على تنور.

(صحيح) ( حم طب ) عن طلق بن علي . (الصحيحة ١٢٠٢)

**٣٠٦٠- ئەگەر کەسێك لەئێوه داوای پێویستی خۆی[2] کرد لەخێزانەکەی باگوێڕایەڵی بکات ئەگەر لەسەر تەنوریش بووه.**

٣٠٦١- إذا رأى أحدكم المرأة التي تعجبه فليرجع إلى أهله حتى يقع بهم فإن ذلك معهم.

(صحيح) ( حب ) عن جابر . (الصحيحة ٢٣٥)

**٣٠٦١- ئەگەر کەسێك لەئێوه ئافرەتێکی بینی ودڵی بۆی چوو، بابگەڕێتەوه بۆ لای خێزانەکەی و بچێته لای چونکه چیاوان لەوەیان لەگەڵدایه.**

٣٠٦٢- إذا سقى الرجل امرأته الماء أجر.

(حسن) ( تخ طب ) عن العرباض . (الصحيحة ٢٧٣٦)

**٣٠٦٢- ئەگەر پیاوێك ئاو بداته خێزانەکەی پاداشت دەدرێتەوه.**

٣٠٦٣- استحيوا فإن الله لا يستحيي من الحق لا تأتوا النساء في أدبارهن.

(حسن) ( هق ) عن خزيمة بن ثابت . (الإرواء ٢٠٠٥)

**٣٠٦٣- شەرم بکەن، خوای گەوره لەئاست ڕاستی شەرم ناکات، مەچنه لای ئافرەتان له پاشەوه(( لەکۆمیانەوه )).**

٣٠٦٤- استحيوا فإن الله لا يستحيي من الحق لا يحل مأتى النساء في حشوشهن.

(حسن) ( سمويه ) عن جابر . (الإرواء ٢٠٠٥)

**٣٠٦٤- شەرم بکەن، بەڕاستی لەئاست هەق خوای شەرم ناکات، دروست نییه چوونه لای ژنان لەکۆمیانەوه.**

٣٠٦٥- إن الله تعالى لا يستحي من الحق لا تأتوا النساء في أدبارهن.

(صحيح) ( ن هـ ) عن خزيمة بن ثابت . (الإرواء ٢٠٦٥)

**٣٠٦٥- خوای گەوره لەهەق شەرم ناکات، مەچنه لای ئافرەتان لەدواومیان.**

٣٠٦٦- إن الله ينهاكم أن تأتوا النساء في أدبارهن.

(صحيح) ( طب ) عن خزيمة بن ثابت . (الإرواء ٢٠٦٥)

---

[1] لەکۆمیەوه

[2] داوای جوت بون (( سەرجێ ی )) لێ کرد.

**٣٠٦٦- خوای گەورە قەدەغەی کردووە لەئێوە بچنە لای ژنان لە پاشەوە.**

٣٠٦٧- أوليس قد جعل الله لكم ما تصدقون به ؟ إن بكل تسبيحة صدقة و بكل تكبيرة صدقة و بكل تحميدة صدقة و بكل تهليلة صدقة و أمر بالمعروف صدقة و نهى عن المنكر صدقة و في بضع أحدكم صدقة قالوا: يا رسول الله أيأتي أحدنا شهوته و يكون له فيها أجر ؟ قال: أرأيتم لو وضعها في الحرام أليس كان يكون عليه وزر ؟ فكذلك إذا وضعها في الحلال يكون له أجر.

(صحيح) ( حم م ) عن أبي ذر . (الصحيحة ٤٥٤)

**٣٠٦٧- ئایا خوا ئەوەی بۆ دانەناون کەخێری پێ بکەن، هەموو (سبحان الله) یەك خێرێکە، هەموو (الله أكبر)ێك خێرێکە، هەموو (الحمدلله)ێك خێرێکە ، فەرمانکردن بەچاکەیش خێرێکە و، نەهی کردن لەخراپە خێرێکە،لەئارەزووی یەکێکیاندا خێر هەیە وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ئایا کەسێك لەئێمە ئارەزووی خۆی بنوێنێ پاداشتی دەگات؟ فەرمووی: چۆنە بەلاتانەوە ئەگەر لەجێگایەکی یاساغدا ئەو ئارەزووە بەجێ بهێنێ، ئایا گوناهبار نابێ؟ کەواتە ئەگەر لەجێگایەکی ڕەوا دای بێنێ پاداشت وەردەگرێت.**

٣٠٦٨- عسى رجل يحدث بما يكون بينه و بين أهله أو عسى امرأة تحدث بما يكون بينها و بين زوجها فلا تفعلوا فإن مثل ذلك مثل شيطان لقي شيطانة في ظهر الطريق فغشيها و الناس ينظرون .

(حسن) ( طب ) عن أسماء بنت يزيد. (آداب الزفاف ص٦٣)

**٣٠٦٨- لەوانەیە پیاوێك باسی ئەوە بکات کە ڕوو دەدات لەنێوان خۆی و خێزانیدا ، یان لەوانەیە ئافرەتێك باسی ئەوە بکات کەڕوو دەدات لەنێوان خۆی و مێردەکەیدا، بەڵام کاری وا مەکەن، چونکە نموونەی ئەوە وەکو دوو شەیتانی نێرو مێیە لەناوەڕاستی ڕێگادا بەیەکتر بگەن و شەیتانە نێرەکە سەر مێیەکە نیشت و، خەڵکیش تەماشایان بکات.**

٣٠٦٩- كل ما صنعت إلى أهلك فهو صدقة عليهم.

(حسن) ( طب ) عن عمرو بن أمية . (الصحيحة ١٠٢٤)

**٣٠٦٩- هەرچی بۆ خاو خێزانت کردوە ئەوە خێرەلەگەڵیان دەکەیت خێرە و بۆیانی دەکەیت.**

٣٠٧٠- هذه بتلك السبقة.

(صحيح) ( حم د ) عن عائشة. (آداب الزفاف ١٧١)

**٣٠٧٠- ئەمەیان بەئەو پێشدانەوە.**

٣٠٧١- هل منكم رجل إذ أتى أهله فأغلق عليه بابه و ألقى عليه ستره و استتر بستر الله ؟ قالوا: نعم قال: ثم يجلس بعد ذلك فيقول: فعلت كذا فعلت كذا فسكتوا ثم أقبل على النساء فقال: هل منكن من تحدث ؟ فسكتن فجثت فتاة كعاب على إحدى ركبتيها و تطاولت لرسول الله صلى الله عليه وسلم ليراها و يسمع كلامها فقالت: يا رسول الله ! إنهم ليحدثون و إنهن ليحدثن فقال: هل تدرون ما مثل ذلك ؟ إنما مثل ذلك مثل شيطانة لقيت شيطانا في السكة فقضى حاجته و الناس ينظرون إليه ! ألا إن طيب الرجال ما ظهر ريحه و لم يظهر لونه ألا إن طيب النساء ما ظهر لونه و لم يظهر ريحه ألا لا يفضين رجل إلى رجل و لا امرأة إلى امرأة إلا إلى ولد أو والد.

(صحيح) ( د ) عن أبي هريرة. (الإرواء ٢٠٧١)

**٣٠٧١- ئايا كەسێكتان بچێتە لای خێزانەكەی و دەرگاكە لەسەر خۆی دا بخات و پەردە بدات بەسەریداو بەپەردەی داپۆشێ؟ وتیان: بەڵێ. فەرمووی: لەدوای ئەوەش دادەنیشێت و دەڵێت: ئاوهام و ئاوهام كرد، بێدەنك ئینجا ڕوویكردە ئافرەتەكان و فەرمووی: كەس لەئێوە هەیە ئەو قسانە بكات؟ بۆ ئەوەی ئەوان بێ دەنگ بوون، ئینجا كچێكی گەنجی تازە پێگەیشتوو هاتە سەرچۆك و لەسەرئەژنۆیەكی دانیشت ملی درێژ كرد بۆ ئەوەی پێغەمبەر ﷺ ببینێ و قسەكەی ببیسێ و ، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوانیش و ئەمانیش ئەم قسانە دەكەن. فەرمووی: ئایا دەزانن نموونەی ئەو كارە چییە؟ نموونەی ئەوە وەكو شەیتانێكی مێینەیە شەیتانێكی نێرینەیبینیبێت لەسەرە ڕێگەدا و بەبەرچاوی خەڵكییەوە بچێتە لای، گوڵاوی پیاو ئەوەیە بۆنی دەركەوێت و ڕەنگی دیار نەبێت، گوڵاوی ئافرەتیش ئەوەیە ڕەنگی دیار بێت و بۆنی دەرنەكەوێت ئاگادارتان دەكەمەوە پیاو لەگەڵ پیاو، یان ژن لەگەڵ ژن، یان كوڕ لەگەڵ كوڕ، لەژێریەك پێخەفدا پێكەوە نەخەون.**

٣٠٧٢- لا تضربوا إماء الله.

(صحيح) ( د ن هـ ك ) عن إياس بن عبدالله بن أبي ذئاب. (المشكاة ٣٢٦١)

**٣٠٧٢- لەئافرەتان كۆیلەكانی مەدەن.**

٣٠٧٣- لا يستحي الله من الحق لا يستحي الله من الحق لا تأتوا النساء في أعجازهن.

(صحيح) ( حم ن حب هـ ) عن خزيمة بن ثابت. (الإرواء ٢٠٦٥)

**٣٠٧٣- خوای گەورە لەئاست ڕاستی شەرم ناكات، خوای گەورە لەئاست ڕاستی شەرم ناكات، مەچنە لای ئافرەتان (( لەكۆمیانەوە )).**

٣٠٧٤- لا ينظر الله إلى رجل أتى رجلا أو امرأة في الدبر.

(صحيح) ( ت ) عن ابن عباس. (المشكاة ٣١٩٥)

**٣٠٧٤- خوای گەورە تەماشای پیاوێك ناكات بچێتە لای پیاو یان بچێتە لای ئافرەت لەدواوە.**

٣٠٧٥- لا ينظر الله إلى رجل جامع امرأته في دبرها.

(صحيح) ( هـ ) عن أبي هريرة. (المشكاة ٣١٩٤)

**٣٠٧٥- خوای گەورە تەماشای پیاوێك ناكات لەدواوە چووبێتە لای ژنەكەی.**

## بابەتی داماڵین ( الخلع )

٣٠٧٦- اقبل الحديقة و طلقها تطليقة.

(صحيح) ( خ ن ) عن ابن عباس . (الإرواء ٢٠٩٦)

**٣٠٧٦- باخچەكەت وەرگرەوە و یەك تەڵاقی بدە.**

٣٠٧٧- المختلعات هن المنافقات.

(صحيح) ( ت ) عن ثوبان. (الصحيحة ٦٣٣)

**٣٠٧٧- ئەوئافرەتانەی داوای خولع[1] دەكەن دووڕوون.**

٣٠٧٨- إن المختلعات و المنتزعات هن المنافقات.

(صحيح) ( طب ) عقبة بن عامر . (الصحيحة ١٦٣٣)

**٣٠٧٨- ئەوانەی داوای خولع دەكەن و خۆیان لەمێردەكانیان دەكێشنەوە دووڕوون.**

## بابەتی جیابوونەوە ( الطلاق )

٣٠٧٩- أيما امرأة سألت زوجها الطلاق من غير ما بأس فحرام عليها رائحة الجنة.

(صحيح) ( حم د هـ ت حب ك ) عن ثوبان . (الإرواء ٢٠٣٥)

---

[1] **خلع: ئەوەیە پیاوێك بەژنەكەی بڵێت: (( واتۆم خولع كرد لەسەر ئەوەند یان لەسەر فلان شت )) ئەویش بڵێت قبوڵم كرد یان كەسێكی تر بڵێت وا بۆم قبوڵ كرد. ووشەی (( خلع ) واتە: داماڵین.**

**٣٠٧٩- هەر ئافرەتێك داوای تەڵاق لەمێردەكەی بكات بەبێ ناچار بوون، بۆنی بەهەشتی لێ یاساغە بێت.**

٣٠٨٠- ثلاث جدهن جد و هزلهن جد: النكاح و الطلاق و الرجعة.

(حسن) ( د ت هـ ) عن أبي هريرة . (الإرواء ١٨٨٣)

**٣٠٨٠- سێ شت هەن ڕاستیان ڕاستە و گاڵتەشیان هەر ڕاستە: ژن مارە بڕین، تەڵاق، گێڕانەوە[1].**

٣٠٨١- أيتلعب بكتاب الله و أنا بين أظهركم ؟.

(صحيح) ( ن ) عن محمود بن لبيد . (المشكاة ٢٣٩٢)

**٣٠٨١- ئایا یاری بەكیتابی خوا دەكرێت و من لەوناوتاندام[2].**

٣٠٨٢- ثلاث لا يجوز اللعب فيهن: الطلاق و النكاح و العتق.

(حسن) ( طب ) عن فضالة بن عبيد . (الإرواء ١٨٨٣)

**٣٠٨٢- سێ شت هەن دروست نییە یارییان پێبكرێت: تەڵاق و ژن مارە بڕین و ئازادكردن[3].**

٣٠٨٣- سبق الكتاب أجله اخطبها إلى نفسها.

(صحيح) ( هـ ) عن الزبير. (الإرواء ٢١٧٦)

**٣٠٨٣- تازە كار لەكار ترازا، خۆی خواز بێنی بكەرەوە.**

٣٠٨٤- الطلاق بيد من أخذ بالساق .

(حسن) ( طب ) عن ابن عباس. (الإرواء ٢٠٤١)

**٣٠٨٤- تەڵاق بەدەستی ئەوەیە نەرمایی قاچی ئافرەتەكە دەگرێت ((كە پیاوە)).**

٣٠٨٥- يا أيها الناس ! ما بال أحدكم يزوج عبده أمته ثم يريد أن يفرق بينهما ؟ إنما الطلاق لمن أخذ بالساق .

(حسن) ( هـ ) عن ابن عباس. (صحيح ابن ماجه ٢٠٨١)

**٣٠٨٥- خەڵكینە! بۆچی كەسی واتان هەیە كەنیزەكێكی لەكۆیلەیەكی مارە دەكات و دوایی دەیەوێ جیایان بكاتەوە لەیەكتر، تەڵاق بەدەستی مێردە.**

---

[1] الرجعه: واتە گێڕانەوەی ژن لەلایەن پیاوەكەیەوە یەكەم جار و دووهەم جار.

[2] پێغەمبەر سەڵات و سەلامی خوای لەسەر بێت بە پیاوێكی فەرموو كەژنەكەی سێ بەستی تەڵاق دا بوو.

[3] واتە كەسێك بۆ پێكەنین تەڵاق بخوات تەڵاقی دەكەوێت كەسێكیش بۆ پێكەنین و بەدەم سوعبەت و پێكەنینەوە بەكەسێك بڵێت واكچەكەم لێ مارەكردی ئەویش قەبوڵی بكات دەدمەزرێت- ئازادكردنی كۆیلەش بەهەمان شێوەیە.

٣٠٨٦- لعلك تريدين أن ترجعي إلى رفاعة ؟ لا حتى تذوقي عسيلته و يذوق عسيلتك.

(صحيح) ( ق ن ) عن عائشة. (الإرواء ١٨٨٧)

**٣٠٨٦- لەوانەیە حەز بکەیت بگەڕێیتەوە لای ڕیفاعە؟ نەخێر تاکو هەنگوینۆگەکەی بەچێژێت هەنگوینوکەکەت نەچێژێت[1].**

٣٠٨٧- العسيلة الجماع.

(حسن) (هق) عن عائشة. (الإرواء ٢١٤٣)

**٣٠٨٧- هەنگوینۆکە بەجوت بونی ژن و مێردە دەوترێت.**

٣٠٨٨- ليراجعها ثم يمسكها حتى تطهر ثم تحيض فتطهر فإن بدا له أن يطلقها فليطلقها طاهرا قبل أن يمسها فتلك العدة التي أمر الله أن يطلق لها النساء.

(صحيح) ( ق د ن هـ ) عن ابن عمر. (الإرواء ٢٠٥٩)

**٣٠٨٨- بابیگێڕێتەوەو ڕایبگرێت لەماڵ تاکو پاك دەبێتەوەو، جارێکی تر دەکەوێتە سوڕی مانگانەوەو پاك دەبێتەوە، ئەوسا ئەگەر ویستی لێی جیا بێتەوە با تەڵاقی بدات بەپاکی پێش ئەوەی بچێتە لای، ئەوە ئەو عیددەیە خوا فەرمانی پێکردووە کە ژنانی تیا تەڵاق بدرێن.**

٣٠٨٩- ليس على الرجل طلاق فيما لا يملك و لا عتاق فيما لا يملك و لا بيع فيما لا يملك.

(حسن) ( حم ن ) عن ابن عمرو. (الصحيحة ٢١٨٤)

**٣٠٨٩- دروست نیە پیاو تەلاقێك بدات کەبەدەستی نەبێت، یان کۆیلەیەك ئازاد بکات کەماڵی خۆی نەبێت، یان شتی کەسێکی تر بفرۆشێت.**

٣٠٩٠- المطلقة ثلاثا ليس لها سكنى و لا نفقة.

(صحيح) ( ن ) عن فاطمة بنت قيس. (الروض ٨٣٦)

**٣٠٩٠- ئەو ئافرەتەی سێ جار تەڵاق درا بێت نەنیشتەجێبوون و نەخەرجی ناکەوێت.**

٣٠٩١- لا تسأل المرأة طلاق أختها لتستفرغ صحفتها و لتنكح فإن لها ما قدر لها.

(صحيح) ( خ د ) عن أبي هريرة. (المشكاة ٣١٤٥)

**٣٠٩١- دروست نییە ئافرەتێك داوای تەڵاقی هەوێکەی بکات بۆ ئەوەی تەنیا خۆی بمێنێتەوە لای پیاوەکەی، چونکە ئەوەی خوا بۆی نووسیوە هەر ئەوەی دەست دەکەوێت.**

---

**[1] لە جیاتی لەزەتی جوت بون بەکاری هێناوە کەچواندویەتی بەلەزەت و چێژی هەنوین.**

٣٠٩٢- لا طلاق إلا فيما يملك و لا عتق إلا فيما يملك و لا بيع إلا فيما يملك و لا و فاء نذر إلا فيما يملك و لا نذر إلا فيما ابتغي به وجه الله و من حلف على معصية فلا يمين له و من حلف على قطيعة رحم فلا يمين له.

(حسن) ( د ك ) عن ابن عمرو. (الإرواء ١٨٧٨)

**٣٠٩٢- دروست نییە کەسێك تەڵاق بخات لەسەر خێزانی خۆی نەبێت، یان کۆیلەی کەسێکی تر ئازاد بکات، یان شتێك بفرۆشێت کەموڵکی خۆی نەبێت، یان نەزرێك بەجێ بهێنی لەشتێکدا کەماڵی خۆی نەبێت، نەزریش ڕەوا نییە بۆ شتێك نەبێت لەپێناوی خوادا ، هەر کەسێکیش سوێند بخوات لەسەر ئەنجامدانی تاوانێك، سوێندی لەسەر نیە، هەر کەسێکیش سوێند بخوات پەیوەندی لەگەڵ خزمێکی بپچڕێت با سوێنەکەی نەباتە سەر.**

٣٠٩٣- لا طلاق قبل النكاح.

(صحيح) ( هـ ) عن علي ( ك ) عن جابر. (الإرواء ٢١٣٠)

**٣٠٩٣- تەڵاق نییە لەپێش مارە بڕینەوە.**

٣٠٩٤- لا طلاق قبل النكاح و لا عتاق قبل ملك.

(صحيح) ( هـ ) عن المسور. (الإرواء ٢١٣٠)

**٣٠٩٤- تەڵاق نییە لەپێش مارەبڕینەوە، ئازاد کردنیش نییە پێش بەخاوەن بوون[1].**

٣٠٩٥- لا طلاق و لا عتاق في إغلاق.

(حسن) ( حم د هـ ك ) عن عائشة. (الإرواء ٢١٠٧)

**٣٠٩٥- نە تەڵاق دروستە و نە ئازاد کردن لەکاتی زۆرەملیدا[2].**

٣٠٩٦- ألا أخبركم بالتيس المستعار ؟ هو المحل فلعن الله المحل و المحلل له.

(حسن) ( هـ ك ) عن عقبة بن عامر . (الإرواء ١٩٥٥)

**٣٠٩٦- ئایا ئاگادارتان بکەم سابرێنی خوازراو کێیە؟ حەڵاڵکەرە، نەفرینی خوا لەو کەسەی حەڵاڵدەکاتەوە ئەو کەسەش بۆی حەڵاڵ دەکرێت[3].**

---

[1] واتە: پێش ئەوەی ببێتە خاوەنی کۆیلەکە.

[2] لەکاتی زۆرەملی یان توڕەیی زۆردا.

[3] المحلل: ئەو کەسەیە کەژنی تەڵاقدراوی یەکجاری لێ مارە دەکەن بەمەرجێ ئەوەی تەڵاقی بدات دوای جوت بون لەگەڵیدا و لە ((المحلل)) مێردەکەی خۆی حەڵاڵ بێتەوە.

٣٠٩٧- لعن الله المحلل و المحلل له.

(صحيح) ( حم ٣ ) عن علي ( ت ن ) عن ابن مسعود ( ت ) عن جابر . (الإرواء ١٩٥٥)

**٣٠٩٧- نەفرینی خوا لەوەی ئافرەت حەڵاڵ دەکاتەوە بۆ مێردەکەی و لەوەش ئافرەتی بۆ حەڵاڵدەکرێتەوە.**

٣٠٩٨- لا تحل للأول حتى يجامعها الآخر.

(صحيح) ( ن ) عن ابن عمر. (الإرواء ١٩٤٥)

**٣٠٩٨- حەڵاڵ نابێت بۆ یەکەم، تاکو دووەم نەچێتە لای[1].**

٣٠٩٩- إن الله تعالى وضع عن أمتي الخطأ و النسيان و ما استكرهوا عليه.

(صحيح) ( هـ ) عن ابن عباس. (الإرواء ٨١)

**٣٠٩٩- خوای گەورە گوناه نوسینی لەسەر لەئوممەتەکەم هەڵگرتووە سەبارەت بە هەڵە کردن و، لەبیرچوونەوە و، ئەوەی بەزۆر پێیان دەکرێت[2].**

٣١٠٠- وضع عن أمتي الخطأ و النسيان و ما استكرهوا عليه.

(صحيح) ( هق ) عن ابن عمر. (الإرواء ٨١)

**٣١٠٠- نوسینی تاوان لا براوە لەسەر ئوممەتم لە هەڵە و لەبیرچوونەوە و ئەو کارەی بەزۆرە ملێ پێیان دەکرێت.**

٣١٠١- ليس منا من خبب امرأة على زوجها أو عبدا على سيده.

(صحيح) ( د ك ) عن أبي هريرة. (الصحيحة ٣٢٤)

**٣١٠١- لە ئێمە نییە کەسێك ئافرەتێك هەڵگێڕێتەوە لە مێردەکەی، یان کۆیلەیەك لە گەورەکەی.**

٣١٠٢- متعها فإنه لا بد من المتاع و لو نصف صاع من تمر.

(حسن) ( هق ) عن جابر. (الصحيحة ٢٢٨١)

**٣١٠٢- کە هاوسەرەکەت تەڵاقدا هەر دەبێ کەل و پەلێکی بدەیتێ ئەگەر نیو ساع[1] خورماش بێت.**

---

[1] واتە بۆ مێردی یەکەمی حەڵاڵ نابێتەوە هەتا مێردی دووەمی لەگەڵیدا جووت نەبێت.

[2] بەڵام زۆر لێ کردن – زۆرە ملە ) مەرجی هەیە :

أ- دەبێ ئەو ککەسەی هەڕەشەکەی لێ دەکات یان زۆری لێ دەکات دەسەڵاتی هەبێت.

ب- دەبێ هەڕەشە گیان یان بڕینی ئەندام یان زەرەری زۆری لێ بکات کە لە توانادا نەبێت.

٣١٠٣- متعها و لو بصاع.

(حسن) ( خط ) عن جابر. (الصحيحة ٢٢٨١)

**٣١٠٣- كەل و پەل و دەست كەوتێكە بدەری باساعێكیش بێت.**[1]

٣١٠٤- من خبب زوجة امرئ أو مملوكه فليس منا.

(صحيح) ( د ) عن أبي هريرة. (الصحيحة ٣٢٤)

**٣١٠٤- هەر كەسێك خێزانی پیاوێك یان كۆیلەكەی لێ هەڵگێڕێتەوە لەئێمە نییە.**

## بابەتی نەفرین لەیەكتر كردن ( اللعان )

٣١٠٥- لولا ما مضى من كتاب الله لكان لي و لها شأن.

(صحيح) ( د ت هـ ) عن ابن عباس ( ن ) عن أنس. (المشكاة ٣٣٠٧)

**٣١٠٥- ئەگەر لەبەر ئەوە نەبوایە لەقورئاندا بڕایەوە من و ئەو شتێكمان دەكرد.**

## بابەتی عیددە و پرسە گرتن

٣١٠٦- إنما هي أربعة أشهر و عشر و قد كانت إحداكن في الجاهلية ترمي بالبعرة على رأس الحول.

(صحيح) ( مالك ق ت ن هـ ) عن أم سلمة . (المشكاة ٣٣٢٩)

**٣١٠٦- بێگومان پرسەگرتن چوار مانگ و دە ڕۆژە، ئێوە لەسەردەمی نەفامیدا یەك ساڵ پاش مردنی پیاوەكانتان دەمانەوە .**

٣١٠٧- استبرءوهن بحيضة - يعني السبايا -.

(صحيح) ( ابن عساكر ) عن أبي سعيد . (الإرواء ١٨٧)

**٣١٠٧- بەیەك حەیز پاكیان بكەنەوە -واتە : ئەو ئافرەتانەی لەجەنگ دەگیران.**

٣١٠٨- إنما النفقة و السكنى للمرأة إذا كان لزوجها عليها الرجعة.

(صحيح) ( ن ) عن فاطمة بنت قيس . (الصحيحة ١٧١١)

**٣١٠٨- خەرجی و نیشتە جێبوون دابین دەكرێت بۆ ژن ئەگەر مێردەكەی مافی هێنانەوەی مابێت لەسەری.**[2]

---

[1] ساع لەڕێڕەوی شافعیدا ٢٦٠٠ گرامە.

[2] واتە تەڵاقی ( رجعی ) دابێت و بتوانێت بیگێڕێتەوە.

٣١٠٩- قد حللت حين وضعت حملك.

(صحيح) ( عب ) عن سبيعة. (صحيح النسائي ٣٥٢٠)

**٣١٠٩- تۆ عيددەكەت كۆتايى دێت هەر كات منالّەكەت بوو.**

٣١١٠- من كان يؤمن بالله و اليوم الآخر فلا يسق ماءه زرع غيره و من كان يؤمن بالله و اليوم الآخر فلا يأت سبيا من السبي حتى يستبرئها و من كان يؤمن بالله و اليوم الآخر فلا يبيعن مغنما حتى يقسم و من كان يؤمن بالله و اليوم الآخر فلا يركبن دابة من فيء المسلمين حتى إذا أعجفها ردها فيه و من كان يؤمن بالله و اليوم الآخر فلا يلبسن ثوبا من فيء المسلمين حتى إذا أخلقه رده فيه.

(حسن) ( د ) عن رويفع بن ثابت. (الإرواء ٢١٩٦)

**٣١١٠- هەر كەسێ باوەڕی بەخواو ڕۆژی دوایی هەیە ئاوی نەخاتە كێڵگەی كەسی ترەوە، هەر كەسێكیش باوەڕی بەخواو ڕۆژی دوایی هەیە نەچێتە لای هیچ كەنیزەكێك تا دڵنیا نەبێت پاك بووەتەوە، هەر كەسێكیش باوەڕی بەخواو ڕۆژی دوایی هەیە هیچ شتێك لەدەستكەوتی موسوڵمانان نەفرۆشێت تاكو دابەش دەكرێت، هەر كەسێكیش باوەڕی بەخواو ڕۆژی دوایی هەیە سواری وولاّغی دەستكەوتی موسوڵمانان نەبێت و لاوازی بكات و دوایی بیگێڕێتەوە، هەر كەسێكیش باوەڕی بەخوا و ڕۆژی دوایی هەیە با پۆشاكێ لەبەر نەكات لەدەستكەوتی موسوڵمانان و ئینجا، شڕی بكات و بیگێڕێتەوە.**

٣١١١- من كان يؤمن بالله و اليوم الآخر فلا يسق ماءه ولد غيره.

(صحيح) ( ت ) عن رويفع. (الإرواء ٢٦٩٦)

**٣١١١- هەر كەسێك باوەڕی هەیە بەخواو ڕۆژی دوایی ئاوی خۆی نەداتە كوڕی خەڵكی تر[1].**

٣١١٢- لقد هممت أن ألعنه لعنا يدخل معه قبره كيف يورثه و هو لا يحل له ؟ كيف يستخدمه و هو لا يحل له؟ !.

(صحيح) ( حم م د ) عن أبي الدرداء. (صحيح أبي داود ١٨٧٢)

**٣١١٢- خەریك بوو نەفرینێكی لێ بكەم لەگەڵی بچێتە گۆڕەكەیەوە، چۆن میراتی پێدەدات كەبۆی ڕەوا نییە؟ چۆن دەچێتە لای بۆشی ڕەوا نیە؟**

٣١١٣- لا توطأ حامل حتى تضع و لا غير ذات حمل حتى تحيض.

(صحيح) ( حم د ك ) عن أبي سعيد. (الإرواء ١٨٧)

---

[1] واتە: ئەگەر كەنیزەكێك سك پڕ بێت جا دەست كەوتی جەنگ بێت یان كڕیبێتی نابێ لەگەڵیدا جوت بێت. السراج المنير.

**٣١١٣- هیچ ئافرەتێکی سك پڕ لەکەنیزەکەکان ڕەوا نییە کەس بچێتە لای، تاکو منالّی نەبێت، یان ئەگەر سك پڕیش نەبێت تا نەچێتە حەیزەوە.**

٣١١٤- لا نفقة لك إلا أن تكوني حاملا.

(صحيح) ( د ) عن فاطمة بنت قيس. (الإرواء ٢٢١٨)

**٣١١٤- مافی بژێوی نیە کەبەتەواوی تەلاّقدرا مەگەر سك پڕ بێت.**

٣١١٥- لا نفقة لك و لا سكنى.

(صحيح) ( م ) عن فاطمة بنت قيس. (الإرواء ٢٢١٨)

**٣١١٥- خەرجیت ناکەوێت، مەگەر سك پڕ بێت.**

٣١١٦- لا يحل لامرأة تؤمن بالله و اليوم الآخر أن تحد على ميت فوق ثلاث ليال إلا زوج فإنها تحد عليه أربعة أشهر و عشرا.

(صحيح) ( حم ق ٣ ) عن أم حبيبة وزينب بنت جحش ( حم م ت هـ ) عن حفصة وعائشة ( ن ) عن أم سلمة. (الجنائز ٢٤)

**٣١١٦- دروست نییە بۆ هیچ ئافرەتێك باوەڕی هەبێت بەخواو ڕۆژی دوایی زیاتر لەسێ ڕۆژ پرسە بگرێت لەسەر مردوویەك، ئافرەت بۆ مێردەکەی نەبێت پێویستە لەسەری چوار مانگ و دە ڕۆژ پرسە بگرێت.**

٣١١٧- لا يحل لامرأة تؤمن بالله و اليوم الآخر أن تحد فوق ثلاث إلا على زوج أربعة أشهر و عشرا فإنها لا تكتحل و لا تلبس ثوبا مصبوغا إلا ثوب عصب و لا تمس طيبا إلا إذا طهرت من محيضها نبذة من قسط أظفار.

(صحيح) ( حم ق د ن هـ ) عن أم عطية. (صحيح أبي داود ١٩٩٤)

**٣١١٧- دروست نییە بۆ ئافرەتێك باوەڕی هەبێت بەخواو ڕۆژی دوایی زیاتر لەسێ ڕۆژ پرسە بگرێت تەنها بۆ مێردی نەبێت چوار مانگ و دە ڕۆژ پرسە دەگرێت و چاو نارێژێت، دروستیش نییە جل و بەرگێك بپۆشێت ڕەنگکرا بێت جگە لە پۆشاکەکانی یەمەن نەبێت، نابێت خۆیشی بۆن خۆش بکات ئەو کاتە نەبێت کە لە بێ نوێژی پاك دەبێتەوە پارچەیەك لە بخورت بەکاربهێنێت[1].**

[1] پارچەیەك پەڕۆ – کە بوغوردی پێ کرا بێت.

٣١١٨- المتوفى عنها زوجها لا تلبس المعصفر من الثياب و لا الممشقة و لا الحلي و لا تختضب و لا تكتحل.

(صحيح) ( م ن ) عن أم سلمة. (الإرواء ٢١٨٨)

**٣١١٨- ئەو ئافرەتەی مێردەکەی مردبێت نابێت پۆشاکی ڕەنگکراو بە گیا گەزنە بپۆشێت، یان پۆشاکێك بەسوور ڕەنگ کرا بێت[١]، یان خشڵ، دروستیش نییە خەنە بکات و چاو بڕێژێت.**

## بابەتی بەخێوکردن ( الحضانة )

٣١١٩- ادفعوها إلى خالتها فإن الخالة أم.

(صحيح) ( ك ) عن علي . (الصحيحة ١١٨٢)

**٣١١٩- بیدەنە پووری، بەڕاستی پوور دایکە.**

٣١٢٠- الخالة بمنزلة الأم.

(صحيح) ( ت ق ) عن البراء ( د ) عن علي . (الإرواء ٢٢٥٢)

**٣١٢٠- پوور لە پلە و پایەی دایکدایە.**

٣١٢١- الخالة والدة.

(صحيح) ( ابن سعد ) عن محمد بن علي مرسلا . (الإرواء ٢٢٥٢)

**٣١٢١- پوور دایکە[٢].**

٣١٢٢- يا غلام ! هذا أبوك و هذه أمك فخذ بيد أيهما شئت.

(صحيح) ( ن هـ ك ) عن أبي هريرة. (الإرواء ٢١٩٣)

**٣١٢٢- ئەی لاو! ئەوە باوکتە، ئەوەش دایکتە، دەستی کامیان دەگریت ئارەزووی خۆتە.**

---

[١] بەقوڕی سور ڕەنگ کرا بێت.

[٢] (( الخالە )) واتە خوشکی دایك (( پور )) بۆ دایەنی بڕی دایك دەکەوێت و وەکو دایك وایە.

# پەڕاوی تاوانەکان (الجنايات)

٣١٢٣- أبى الله أن يجعل لقاتل المؤمن توبة.

(صحيح) ( طب الضياء في المختارة ) عن أنس . (الصحيحة ٦٨٩)

**٣١٢٣- خوای گەورە ڕازی نابێت لە تەوبە کردنی ئەو کەسەی ئیماندار بکوژێت[1].**

٣١٢٤- أبغض الناس إلى الله ثلاثة: ملحد في الحرم و مبتغ في الإسلام سنة الجاهلية و مطلب دم امرئ بغير حق ليهريق دمه

(صحيح) ( خ ) عن ابن عباس . (الصحيحة ٧٧٨)

**٣١٢٤- سێ کەس لە هەموو کەس زیاتر مایەی خەشم و قینی خوان: بێ باوەڕ لەحەڕەمدا، کەسێکیش زیندوکەرەوەی ڕێبازی نەفامی بێت لەئیسلامدا و، کەسێکیش بەدوای کوشتنی کەسێکدا بگەڕێت بەناهەق.**

٣١٢٥- إذا أشار الرجل على أخيه بالسلاح فهما على جرف جهنم فإذا قتله وقعا فيه جميعا.

(صحيح) ( الطيالسي ن ) عن أبي بكرة . (الصحيحة ١٢٣١)

**٣١٢٥- ئەگەر کەسێك چەکێك بەرەو ڕووی براکەی ئاڕاستە بکات[2]، هەر دووکیان لەلێواری دۆزەخدان، ئەگەر بیکوژێت هەردووکیان تێی دەکەون.**

٣١٢٦- إذا التقى المسلمان بسيفيهما فقتل أحدهما صاحبه فالقاتل و المقتول في النار قيل: يا رسول الله هذا القاتل فما بال المقتول ؟ قال: إنه كان حريصا على قتل صاحبه.

(صحيح) ( حم ق د ن ) عن أبي بكرة ( هـ ) عن أبي موسى . (نقد الكتاني ٣٩)

---

[1] خۆ ڕێگەی تەوبەی داوە بەڵام ئەمە لێ بورەبون و پیاهەڵشاخانە. السراج المنير ج١ ص ٥٠٨

[2] واتە: ئەگەر چەکیان لەیەك ڕاکێشا.

**٣١٢٦- ئەگەر دوو موسوڵمان بەرەنگاری یەك وەستان بەشمشێرەکانیان و، یەکێکیان ئەوی تر بکوژێت، بکوژ و کوژراو لەدۆزەخدان، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ئەوە بکوژ دەچێتە دۆزەخەوە ئەی کوژراو لەبەر چی؟ فەرمووی: ئەویش سوور بووە لەسەر کوشتنی براکەی.**

٣١٢٧- إذا التقى المسلمان و حمل أحدهما على أخيه السلاح فهما على جرف جهنم فإذا قتل أحدهما صاحبه دخلاها جميعا.

(صحيح) ( حم م هـ ) عن أبي بكرة . (الصحيحة ١٢٣١)

**٣١٢٧- ئەگەر دوو موسوڵمان ڕووبەڕووی یەك بوونەوەو یەکێکیان چەکی لەدژی براکەی بەرز کردەوە، هەردووکیان لەقەراغی دۆزەخن ئەگەر یەکێکیان ئەوی تر بکوژێت هەردووکیان دەچنە دۆزەخەوە.**

٣١٢٨- إذا سل أحدكم سيفا لينظر إليه فأراد أن يناوله أخاه فليغمده ثم يناوله إياه.

(حسن) ( حم طب ك ) عن أبي بكرة . (المشكاة ٣٥٢٧)

**٣١٢٨- ئەگەر کەسێك لەئێوە شمشێری هەڵکێشا تەماشای بکات ئەگەر ویستی بیداتە دەست براکەی بابیخاتەوە ناو کێلانەکەی خۆی و ئینجا بیداتە دەستی یەوە.**

٣١٢٩- إذا شهر المسلم على أخيه سلاحا فلا تزال ملائكة الله تلعنه حتى يشيمه عنه.

(حسن) ( البزار ) عن أبي بكرة . (الصحيحة ٣٩٧٣)

**٣١٢٩- ئەگەر موسوڵمانێك چەك هەڵکێشێت لەدژی براکەی فریشتەکانی خوا بەردەوام نەفرینی لێ دەکەن تاکو دەیخاتەوە کێڵانەکەی خۆی.**

٣١٣٠- إن الله أبى علي فيمن قتل مؤمنا ثلاثا.

(صحيح) ( حم ن ك ) عن عقبة بن مالك . (الصحيحة ٦٨٩)

**٣١٣٠- خوای گەورە بەهیچ شێوەیەك ڕازی نەبوو تەوبە لە کەسێك وەربگرێت ئیماندارێکی کوشتبێت[1].**

٣١٣١- إن الملائكة لتلعن أحدكم إذا أشار إلى أخيه بحديدة و إن كان أخاه لأبيه و أمه.

(صحيح) ( حم حل ) أبي هريرة . (غاية المرام ٤٤١)

**٣١٣١- بەڕاستی فریشتەکانی خوا نەفرین لەکەسێکتان دەکەن ئاسنێك ئاڕاستەی براکەی بکات، ئەگەر برای باوك و دایکیشی بێت.**

---

[1] واتە: بەستەم کوشتبێتی، داوام کرد تەوبەی لێ گیرا بکات ڕێگەی پێنەدا.

٣١٣٢- إن أول ما يحكم بين العباد في الدماء.

(صحيح) ( ت ) عن ابن مسعود . (الصحيح الترمذي ١٣٩٦)

**٣١٣٢- يەكەمين كێشە لەنێوان بەندەكاندا حوكمى تيا بدرێت كێشەى خوێنە لەرۆژى دواييدا.**

٣١٣٣- إن رجلا قتل تسعة و تسعين نفسا ثم عرضت له التوبة فسأل عن أعلم أهل الأرض ؟ فدل على راهب فأتاه فقال: إنه قتل تسعة و تسعين نفسا فهل له من توبة ؟ فقال: لا فقتله فكمل به مائة ثم سأل عن أعلم أهل الأرض ؟ فدل على رجل عالم فقال: إنه قتل مائة نفس فهل له من توبة ؟ قال: نعم و من يحول بينه و بين التوبة ؟ انطلق إلى أرض كذا و كذا فإن بها أناسا يعبدون الله فاعبد الله معهم و لا ترجع إلى أرضك فإنها أرض سوء فانطلق حتى إذا نصف الطريق أتاه الموت فاختصمت فيه ملائكة الرحمة و ملائكة العذاب فقالت ملائكة الرحمة: جاء تائبا مقبلا بقلبه إلى الله تعالى و قالت ملائكة العذاب: إنه لم يعمل خيرا قط فأتاهم ملك في صورة آدمي فجعلوه بينهم فقال: قيسوا بين الأرضين فإلى أيتهما كان أدنى فهو لها فقاسوا فوجدوه أدنى إلى الأرض التي أراد فقبضته ملائكة الرحمة.

(صحيح) ( حم م هـ ) عن أبي سعيد . (الصحيحة ٢٦٤٠)

**٣١٣٣- پياوێك نەوەدو نۆ كەسى كوشت، ئينجا تەوبەى بۆ پێشنياز كرا، ئەويش پرسيارى زاناترين كەسى كرد لەسەر زەويدا؟ ئيتر ڕێنمايى كرا بۆ لاى قەشەيەك، چووە لاى و، وتى: نەوەدو نۆ كەسى كوشتووە ئايا بۆى هەيە تەوبە بكات؟ وتى: نەخێر، ئەويش كوشت و سەد كەسەكەى پێ تەواو كرد، ئينجا پرسيارى كرد كێ زاناترين خەڵكى سەر زەوييە؟ ڕێنمايى كرا بۆ لاى پياوێكى زانا، وتى: سەد كەسى كوشتووە، ئايا بۆى هەيە تۆبە بكات؟ وتى: كێ دەتوانێ ببێتە ڕێگر لەنێوان ئەوو تەوبەكردندا؟ بڕۆ فڵانە جێگا، خەڵكێك هەن لەوێ خوا دەپەرسن، تۆيش لەگەڵيان خوا بپەرستەو، مەگەڕێرەوە خاكى خۆت، چونكە خاكێكى خراپە[1]، ئەويش كەوتە ڕێ و كە گەيشتە نيوەى ڕێگا مردن بەرى ڕێ پێ گرت، ئينجا فريشتەكانى ميهرەبانى و فريشتەكانى ئەشكەنجە بوو بەمشت و مڕيان، فريشتەكانى ميهرەبانى وتيان: ئەو هاتبوو تەوبە بكات بەدڵێكى بەپەرۆشەوە رووى كردبووە خوا، فريشتەكانى ئەشكەنجەش وتيان: ئەو هەرگيز هيچ**

---

[1] مەبەست ئەوەيە لەو خاكەدا خراپەى كردووەو خەڵكى هەوڵ دەدەن تۆڵەى لێ بكەنەوە ئەويش ناچار دەبێت دەست بوەشێنێت.

**چاكه‌یه‌كی نه‌كردووه،ئیتر فریشته‌یه‌ك له‌وێنه‌ی ئاده‌میزادێكدا هات و كه‌وته نێوانیان و، وتی: زه‌وییه‌كه بپێون بۆ لای هه‌ر لایه‌ك نزیكتر بوو سه‌ر به‌و جێگه‌یه‌یه، ئه‌وانیش پێوانه‌یان كرد و بینییان له‌و جێگه‌یه نزیك تره كه‌بۆی ده‌چێت، ئیتر فریشته‌كانی میهره‌بانی بردیان.**

٣١٣٤- إني نهيت عن قتل المصلين.

(صحيح) ( د ) عن أبي هريرة . (المشكاة ٤٤٨١)

**٣١٣٤- من لێم قه‌ده‌غه كراوه نوێژ خوێنان بكوژم[1].**

٣١٣٥- أول ما يقضى بين الناس يوم القيامة في الدماء.

(صحيح) ( حم ق ن هـ ) عن ابن مسعود . (الصحيحة ١٧٤٨)

**٣١٣٥- یه‌كه‌مین كێشه‌ی نێوان خه‌ڵكی خوای گه‌وره له‌رۆژی قیامه‌تدا حوكمی تیا بدات خوێنه[2].**

٣١٣٦- ألا إنما هي أربع: لا تشركوا بالله شيئا و لا تقتلوا النفس التي حرم الله إلا بالحق و لا تزنوا و لا تسرقوا.

(صحيح) ( حم ن ك ) عن سلمة بن قيس . (الصحيحة ١٧٥٩)

**٣١٣٦- له‌ڕاستیدا خۆی چوار شته: هاوتا بۆ خوای گه‌وره بڕیار مه‌ده‌ن و، كه‌سێك مه‌كوژن به‌ناهه‌ق كه‌خوا قه‌ده‌غه‌ی كردووه و زینا و دزی مه‌كه‌ن.**

٣١٣٧- سباب المسلم فسوق و قتاله كفر.

(صحيح) ( حم ق ت ن هـ ) عن ابن مسعود ( هـ ) عن أبي هريرة وسعد ( طب ) عن عبدالله بن مغفل وعمرو بن النعمان بن مقرن (الدارقطني في الأفراد ) عن جابر. (الصحيحة ٨٧)

**٣١٣٧- جنێودان و سوكایه‌تیكردن به‌موسوڵمان ده‌رچوونه له‌فه‌رمانی خوا و، جه‌نگ كردن له‌گه‌ڵیدا بێ باوه‌ڕییه.**

٣١٣٨- سباب المسلم فسوق و قتاله كفر و حرمة ماله كحرمة دمه.

(حسن) ( طب ) عن ابن مسعود. (غاية المرام ٣٤١)

**٣١٣٨- جنێودان به‌موسوڵمان ده‌رچوونه له‌فه‌رمانی خوا و، جه‌نگ كردن له‌گه‌ڵیدا بێ باوه‌ڕییه، قه‌ده‌غه بوونی ماڵیشی وه‌كو قه‌ده‌غه بوونی خوێنیه‌تی.**

---

[1] قازی قه‌یاز: فه‌رموویه‌تی: مه‌به‌ست به‌نوێژخوێنانی موسوڵمانه.

[2] واته: خوێن ڕشتن – كوشتن. السراج المنير ج١ ص ٥١١

٣١٣٩- قتل المؤمن أعظم عند الله من زوال الدنيا.

(صحيح) ( ن الضياء ) عن بريدة. (الروض ٥٩٥)

**٣١٣٩- كوشتنی موسوڵمان لەلای خوا گەورەترە لە لەناو بردنی دونیا.**

٣١٤٠- كان في بني إسرائيل رجل قتل تسعة و تسعين إنسانا ثم خرج يسأل فأتى راهبا فسأله فقال له: ألي توبة ؟ قال: لا فقتله فجعل يسأل فقال له رجل: ائت قرية كذا و كذا فأدركه الموت فنأى بصدره نحوها فاختصمت فيه ملائكة الرحمة و ملائكة العذاب فأوحى الله إلى هذه: أن تقربي و أوحى الله إلى هذه: أن تباعدي و قال: قيسوا ما بينهما فوجداه إلى هذه أقرب بشبر فغفر له.

(صحيح) ( ق ) عن أبي سعيد. (المشكاة ٢٣٢٧)

**٣١٤٠- پیاوێك لەبەنی ئیسرائیل نەوەدو نۆ كەسی كوشتبوو، دوای ڕۆیشت بۆ پرسیار كردن و هاتە لای قەشەیەك و لێی پرسی: ئایا من تەوبەم بۆ هەیە؟ وتی: نەخێر، ئەویشی كوشت، ئینجا دەستی كرد بەپرسیار كردن، پیاوێك پێی وت: بڕۆ فلانە ئاوایی ئیتر لەڕێگە مردن ڕێی پێ گرت لەكاتێكدا ڕووی لەو گوندە بوو كە بۆی دەچوو فریشتەكانی میهرەبانی و ئەشكەنجە بوو بەمشت و مڕیان لەسەری، خوای گەورەیش نیگای كرد بۆ ئەو دێیە نزیك بەوە بۆ ئەو گوندەش بەجێ هێشتووە دوركەوە، ئینجا فەرمووی: نێوان هەر دوو جێگایە بپێون، پێوانەیان كرد بینیان بستێك نزیكترە لەو گوندەی بۆ چوو خوای گەورە لێی خۆش بوو.**

٣١٤١- الكبائر: الإشراك بالله و عقوق الوالدين و قتل النفس و اليمين الغموس.

(صحيح) ( حم خ ت ن ) عن ابن عمرو. (المشكاة ٥٠)

**٣١٤١- گوناهە گەورەكان: هاوتا دانان بۆ خوا و، كوشتنی خەڵكی و، سوێندی بەدرۆ.**

٣١٤٢- الكبائر: الشرك بالله و قتل النفس و عقوق الوالدين ألا أنبئكم بأكبر الكبائر ؟ قول الزور.

(صحيح) ( حم ق ت ن ) عن أنس. (الترغيب ٢٣٠٠)

**٣١٤٢- گوناهە گەورەكان: هاوتا بڕیاردان بۆ خوا و، خراپە كردن لەگەڵ دایك و باوك، ئەرێ ئاگادارتان بكەم كامە گەورەترین تاوانە شایەتی درۆ.**

٣١٤٣- لزوال الدنيا أهون على الله من قتل رجل مسلم.

(صحيح) ( ت ن ) عن ابن عمر. (المشكاة ٣٤٦٢)

**٣١٤٣- لەناوبردنی دونیا لەلای خوا ئاسانترە لەكوشتنی پیاوێكی موسوڵمان.**

٣١٤٤- لزوال الدنيا أهون على الله من قتل مؤمن بغير حق.

(صحيح) ( هـ ) عن البراء. (الترغيب ٢٤٣٨)

**٣١٤٤- له‌ناوبردنی دونیا ئاسانتره لای خوا له‌كوشتنی كه‌سێكی باوەڕدار به‌ناهه‌ق.**

٣١٤٥- لو أن أهل السماء و الأرض اشتركوا في دم مؤمن لكبهم الله عز و جل في النار.

(صحيح) ( ت ) عن أبي سعيد وأبي هريرة معا. (الروض ٩٢٥)

**٣١٤٥- ئه‌گه‌ر خه‌ڵكی ئاسمان و زه‌وی به‌شداربن له‌ڕشتنی خوێنی كه‌سێكی باوەڕدار، خوای گه‌وره هه‌موویان به‌ڕودا ده‌خاته دۆزه‌خه‌وه.**

٣١٤٦- ما من مسلمين التقيا بأسيافهما إلا كان القاتل و المقتول في النار.

(صحيح) ( هـ ) عن أنس. (غاية المرام ٤٣٨)

**٣١٤٦- ئه‌گه‌ر دوو موسوڵمان به‌شمشێره‌وه به‌رامبه‌ر یه‌كتر ڕاوه‌ستن بكوژو كوژراو له‌ئاگردان.**

٣١٤٧- من أشار إلى أخيه بحديدة فإن الملائكة تلعنه و إن كان أخاه لأبيه و أمه.

(صحيح) ( م ت ) عن أبي هريرة. (غاية المرام ٤٤١)

**٣١٤٧- هه‌ر كه‌سێك ئاسنێك ئاراسته‌ی براكه‌ی بكات، فریشته‌كان نه‌فرینی لێ ده‌كه‌ن ئه‌گه‌ر برای دایكی و باوكیشی بێت.**

٣١٤٨- لا يشر أحدكم على أخيه بالسلاح فإنه لا يدري لعل الشيطان ينزع في يده فيقع في حفرة من النار.

(صحيح) ( حم ق ) عن أبي هريرة. (غاية المرام ٤٤٥)

**٣١٤٨- كه‌س له‌ئێوه با به‌چه‌ك ئاماژه نه‌كات بۆ براكه‌ی، چونكه نازانێت له‌وانه‌یه شه‌یتان له‌ده‌ستی وه‌رگرێت و بیخاته چاڵێكی ئاگرینه‌وه.**

٣١٤٩- من اطلع في بيت قوم بغير إذنهم فقد حل لهم أن يفقئوا عينه.

(صحيح) ( حم م ) عن أبي هريرة. (الإرواء ٢٢٨٩)

**٣١٤٩- هه‌ر كه‌سێك ته‌ماشای نێو ماڵی كه‌سێك بكات به‌بێ مۆڵه‌تیان. بۆیان هه‌یه چاوی كوێر بكه‌ن .**

٣١٥٠- من اطلع في دار قوم بغير إذنهم ففقئوا عينه فقد هدرت.

(صحيح) ( د ) عن أبي هريرة. (الإرواء ٢٢٨٩)

**٣١٥٠- هه‌ر كه‌سێك ته‌ماشای نێو ماڵی كه‌سانێك بكات به‌بێ مۆڵه‌تیان و چاویان ده‌رهێنا به فیڕۆ ده‌چێت.**

٣١٥١- من أمن رجلا على دمه فقتله فأنا بريء من القاتل و إن كان المقتول كافرا.

(صحيح) ( تخ ن ) عن عمرو بن الحمق. (الصحيحة ٤٤٠)

**٣١٥١- هەر کەسێك گیانی کەسێکی دڵنیا کرد لەسەر گیانی خۆی و لە پاش ئەوە کوشتی من بێبەریم لەو بکوژە با کوژراوەکەیش بێباوەڕ بێت.**

٣١٥٢- من سل علينا السيف فليس منا.

(صحيح) ( حم م ) عن سلمة بن الأكوع. (المشكاة ٣٥٢١)

**٣١٥٢- هەر کەسێ شمشێری لێمان هەڵکێشا لە ئێمە نییە.**

٣١٥٣- من شهر سيفه ثم وضعه فدمه هدر.

(صحيح) ( ن ك ) عن ابن الزبير. (الصحيحة ٢٣٤٥)

**٣١٥٣- هەر کەسێك شمشێرەکەی هەڵکێشێت و بیوەشێنێت خوێنی فیڕۆیە.**

٣١٥٤- من ضرب بسوط ظلما اقتص منه يوم القيامة.

(صحيح) ( خد هق ) عن أبي هريرة. (الصحيحة ٢٣٥٢)

**٣١٥٤- هەر کەسێك قامچییەکی هاویشت بەناهەق تۆڵەی لێ دەکرێتەوە لەڕۆژی دواییدا.**

٣١٥٥- من قتل رجلا من أهل الذمة لم يجد ريح الجنة و إن ريحها ليوجد من مسيرة سبعين عاما.

(صحيح) ( حم ن ) عن رجل. (الترغيب ٢٤٥٣)

**٣١٥٥- هەر کەسێك پیاوێکی لە** (اهل الذمة) **بەناهەق کوشت، بۆنی بەهەشت ناکات، کەبۆنی بەهەشت لەدووری حەفتا ساڵەوە دێت.**

٣١٥٦- من قتل مؤمنا فاغتبط بقتله لم يقبل الله منه صرفا و لا عدلا.

(صحيح) ( د الضياء ) عن عبادة بن الصامت. (الترغيب ٢٤٥٠)

**٣١٥٦- هەر کەسێك کەسێکی خاوەن باوەڕ بکوژێت بەناهەق[1]، خوای گەورە نەفەرزو نەسوننەتی لێ وەرناگرێت.**

٣١٥٧- من قتل معاهدا في غير كنهه حرم الله عليه الجنة.

(صحيح) ( حم د ن ك ) عن أبي بكرة. (الترغيب ٢٤٥٣)

**٣١٥٧- هەر کەسێك خاوەن پەیمانێکی کوشت لەکاتی ناشیاودا، خوای گەورە بەهەشتی لەسەر قەدەغە دەکات.**

---

[1] ((فاغتبط)) بەستەم یان دڵخۆش بێت بەکوشتنەکەی.

٣١٥٨- من قتل معاهدا لم يرح رائحة الجنة و إن ريحها ليوجد من مسيرة أربعين عاما.

(صحيح) ( حم خ ن هـ ) عن ابن عمرو. (غاية المرام ٤٤٩)

**٣١٥٨- هەر كەسێك خاوەن پەیمان بكوژێت بەناهەق خوای گەورە بەهەشتی لەسەر قەدەغە دەكات؛ هەرچەند بونی بەهەشت چل ساڵ دەڕوات.**

٣١٥٩- من قتل نفسا معاهدة بغير حلها حرم الله عليه الجنة: أن يشم ريحها.

(صحيح) ( حم ن ) عن أبي بكرة. (الترغيب ٣٠٠٨)

**٣١٥٩- هەر كەسێك خاوەن پەیمانێك بكوژێت بەناهەق و لەناوەختا خوا بەهەشتی لێ قەدەغە دەكات: كەبۆنی بكات.**

٣١٦٠- المؤمنون تكافأ دماؤهم و هم يد على من سواهم و يسعى بذمتهم أدناهم ألا لا يقتل مؤمن بكافر و لا ذو عهد في عهده من أحدث حدثا فعلى نفسه و من أحدث حدثا أو آوى محدثا فعليه لعنة الله و الملائكة و الناس أجمعين.

(صحيح) ( د ن ك ) عن علي. (الإرواء ١٠٤٢)

**٣١٦٠- خوێنی ئیمانداران وەكو یەكە، هەمووشیان كۆكن لەدژی ناحەزانیان ، كامەشیان پلە و پایەی كەمترە خاوەن پەیمانە ، ئاگاداربن ڕەوا نییە ئیماندارێك لەسەر كوشتنی كافرێك بكوژرێتەوە ، یان خاوەن پەیمانێك لە كاتی پەیمانەكەیدا بكوژرێت ، هەركەسێك كردەوەیەكی خراپ ئەنجام بدات لە دژی خۆی ئەنجامی دەدا ، یا هەر كەسێك كردوەیەكی خراپ بكات و ، تاوانبار داڵدە بدات ، نەفرینی خوا و فریشتەكان و هەموو خەڵكی لەسەر بێت.**

٣١٦١- الوائدة و الموءودة في النار.

(صحيح) ( د ) عن ابن مسعود. (المشكاة ١٢)

**٣١٦١- زیندە بەچاڵكەر[1] و دایكی مناڵەكە ئەگەر ڕەزامەندی بنوێنێ لەدۆزەخدان.**

٣١٦٢- الوائدة و الموءودة في النار إلا أن تدرك الوائدة الإسلام فتسلم.

(صحيح) ( حم ن ) عن سلمة بن يزيد الجعفي. (المشكاة ١٢)

---

[1] ئافرەت كەبەژانەوە بوایە چاڵێكیان بۆهەڵدەكەند (الوائدە) واتە مامانەكە لەبن چاڵەكەدا دادەنیشت ئەگەر مناڵەكە كچ بووایە مامانەكە زیندەبەچاڵی دەكرد ((المؤودة))ش دایكی مناڵەكەیە كەبەڕەزامەندی خۆی بوایە هەر دووكیان دەچنە دۆزەخ. السراج المنير ج١ ص ٥١٤

**٣١٦٢- ئەو مامانەی منداڵەكە زیندە بەچاڵ دەكات و دایكی كەڕەزامەندی لەسەر بێت لەدۆزەخدان، مەگەر مامانەكە فریای ئیسلام كەوتبێت موسوڵمان بێت.**

٣١٦٣- لا تقتل نفس ظلما إلا كان على ابن آدم الأول كفل من دمها لأنه أول من سن القتل.

(صحيح) ( حم ق ت ن هـ ) عن ابن مسعود. (المشكاة ١٢)

**٣١٦٣- هەر كەسێك بەناهەق بكوژرێت بەشێك لەخوێنەكەی دەكەوێتە سەر یەكەم كوڕی ئادەم، چونكە ئەو یەكەم كەس بوو كوشتنی داهێنا.**

٣١٦٤- لا يحل دم امرئ مسلم إلا بإحدى ثلاث: رجل زنى بعد إحصان أو ارتد بعد إسلام أو قتل نفسا بغير حق فيقتل به.

(صحيح) ( حم ت ن هـ ك ) عن عثمان ( حم ن ) عن عائشة. (الإرواء ٢٢٥٨)

**٣١٦٤- خوێنی هیچ موسوڵمانێك ڕەوا نییە بەم سێ شتە نەبێت: كەسێك زینا بكات پاش هاوسەرگیری، یان هەڵگەڕێتەوە پاش موسوڵمان بوون، یان كەسێك بەناهەق بكوژێت دەكوژرێتەوە.**

٣١٦٥- لا يحل دم امرئ مسلم يشهد أن لا إله إلا الله و أن محمدا رسول الله إلا بإحدى ثلاث: رجل زنى بعد إحصان فإنه يرجم و رجل خرج محاربا لله و رسوله فإنه يقتل أو يصلب أو ينفى من الأرض أو يقتل نفسا فيقتل بها.

(صحيح) ( د ن ) عن عائشة. (الإرواء ٢٢٥٨)

**٣١٦٥- كوشتنی موسوڵمانێك كەشایەتمان بهێنێت ڕەوا نییە، بەسێ شت نەبێت: پیاوێك زینا بكات پاش ژن هێنان بەردە باران دەكرێت، پیاوێك شەڕ بكات لەدژی خواو پێغەمبەرەكەی، دەكوژرێت یان لەخاچ دەدرێت یان دوور دەخرێتەوە، یان كەسێك كەسێكی تر بكوژێت لەسەری دەكوژرێتەوە.**

٣١٦٦- لا يحل دم امرئ مسلم يشهد أن لا إله إلا الله و أني رسول الله إلا بإحدى ثلاث: الثيب الزاني و النفس بالنفس و التارك لدينه المفارق للجماعة.

(صحيح) ( حم ق ٤ ) عن ابن مسعود. (الإرواء ٢٢٥٨)

**٣١٦٦- خوێنی موسوڵمانێك شایەتی بدات بەیەكتا پەرستی خوا و ئەوەی كەمن ڕەوانە كراوی خوام، ڕەوا نییە بەسێ شت نەبێت: خاوەن هاوسەری زیناكەر، كوشتنەوەی كەسێك بەكەسێكی تر، ئەو كەسەش كەوازی لەئایینی خۆی هێناوە و لەكۆمەڵ جیا بوبێتەوە.**

٣١٦٧- لا يزال العبد في فسحة من دينه ما لم يصب دما حراما.

(صحيح) ( حم خ ) عن ابن عمر. (المشكاة ٣٤٤٧)

**٣١٦٧- بەندە بوارێکی هەمیشە هەر بۆ دەمێنێتەوە لەئاييینەکەیدا تا ئەو کاتەی خوێنێکی ناهەقی نەڕشتبێت.**

٣١٦٨- لا يزال المؤمن معنقا صالحا ما لم يصب دما حراما فإذا أصاب دما حراما بلح.

(صحيح) ( د ) عن أبي الدرداء وعبادة بن الصامت. (المشكاة ٣٤٦٧)

**٣١٦٨- ئیماندار چاکە و بارسووك و گورج و گۆڵە بۆ ڕمزامەندی خوا، تاکو خوێنێکی ناهەق نەڕێژێت، ئەگەر ئەوەی کرد تووشی پچڕاندن و بارگرانی دەبێت.**

٣١٦٩- يجيء الرجل آخذا بيد الرجل فيقول: يا رب ! هذا قتلني فيقول الله له: لم قتلته ؟ فيقول: قتلته لتكون العزة لك فيقول: فإنها لي و يجيء الرجل آخذا بيد الرجل فيقول: أي رب ! إن هذا قتلني فيقول الله: لم قتلته ؟ فيقول: لتكون العزة لفلان ! فيقول: إنها ليست لفلان فيبوء بإثمه.

(صحيح) ( ن ) عن ابن مسعود. (المشكاة ٣٤٦٥)

**٣١٦٩- لەڕۆژی قیامەتدا پیاوێك دەستی کەسێکی تری گرتووەو دەڵێت: خوایە! ئەمە منی کوشت، خوای گەورەیش پێی دەفەرمووێت: بۆ کوشتت؟ ئەویش دەڵێت: کوشتم بۆ ئەوەی سەروەری بۆ تۆ بێت، ئینجا پێی دەفەرموێت: سەروەری بۆ منە، پیاوێکی تریش دەستی پیاوێکی تر گرتووەو دەڵێت: خوایە! ئەمە منی کوشت، خوای گەورە پێی دەفەرموێت: بۆچی کوشتت؟ دەڵێت: کوشتم بۆ ئەوەی سەروەری بۆ فڵانە کەس بێت! خوای گەورە دەفەرموێت: سەروەری بۆ ئەو نەبوو، ئیتر ئەو کەسە گەناهەکەی هەڵدەگرێت.**

٣١٧٠- يجيء المقتول بالقاتل يوم القيامة ناصيته و رأسه بيده و أوداجه تشخب دما فيقول: يا رب ! سل هذا فيم قتلني ؟ حتى يدنيه من العرش.

(صحيح) ( ت ن هـ) عن ابن عباس. (المشكاة ٣٤٦٥)

**٣١٧٠- کوژراو لەڕۆژی قیامەتدا قژی پێشە سەری بکوژەکەی دەگرێت و دەیهێنێت و، دەمارەکانی خوێنیان لێ دەتکێت و، دەڵێت: خوایە! پرسیار لەمە بکە بۆچی منی کوشت؟ تاکو نزیکی دەکاتەوە لەعەرش.**

٣١٧١- يجيء المقتول يوم القيامة متعلقا بقاتله فيقول الله: فيم قتلت هذا ؟ فيقول: في ملك فلان.

(صحيح) ( ن ) عن جندب. (المشكاة ٣٤٦٥)

**٣١٧١- كوژراو له‌ڕۆژى قیامه‌تدا دێت خۆى هه‌ڵواسیوه‌ به‌ بكوژه‌كه‌یه‌وه‌و خواى گه‌وره‌یش ده‌فه‌رموێت: بۆچى ئه‌وه‌ت كوشت؟ ئه‌ویش ده‌ڵێت: له‌به‌ر موڵكى فلانه‌ كه‌س.**

## بابه‌تى تۆڵه‌ (القصاص)

٣١٧٢- كتاب الله القصاص.

(صحيح) ( حم ق د ن هـ ) عن أنس. (الإرواء ٢٢٣٤)

**٣١٧٢- تۆڵه‌ له‌ په‌ڕاوى خوادایه‌[1].**

٣١٧٣- ليس في المأمومة قود.

(حسن) ( هق ) عن طلحة. (الصحيحة ٢١٩٠)

**٣١٧٣- له‌برینى (المأمومة)[2] دا هه‌ق لێ كردنه‌وه‌ نیه‌ به‌ڵكو خوێنبایى هه‌یه‌.**

٣١٧٤- ما تأمرني ؟ ! تأمرني أن آمره أن يدع يده في فيك تقضمها كما يقضم الفحل ؟ ! ادفع يدك حتى يعضها ثم انتزعها.

(صحيح) ( م ) عن عمران بن حصين. (صحيح النسائي ٤٧٥٨)

**٣١٧٤- فه‌رمانى چیم پێ ده‌كه‌یت؟! فه‌رمانم پێ ده‌كه‌یت پێى بڵێم ده‌ستى بخاته‌ ده‌مت و پیاینوسێت وه‌كو گه‌زتنى كه‌ڵه‌ وشتر؟! ده‌ستت بخه‌ره‌ ده‌مى تا ده‌یگه‌زێت ودوایى ده‌ریبهێنه‌.**

٣١٧٥- من اطلع في بيت قوم بغير إذن ففقئوا عينه فلا دية له و لا قصاص.

(صحيح) ( حم ن ) عن أبي هريرة. (الإرواء ٢٢٨٩)

**٣١٧٥- هه‌ر كه‌سێك ته‌ماشاى نێو ماڵى كه‌سێك بكات به‌بێ مۆڵه‌ت و چاوى كوێر بكه‌ن، نه‌خوێنبایى و نه‌تۆڵه‌ى له‌سه‌ر نییه‌.**

٣١٧٦- لا يقاد الوالد بالولد.

(صحيح) ( حم ت ) عن عمر. (الإرواء ٢٢٧)

**٣١٧٦- باوك به‌ كوشتنى كوڕى خۆى ناكوژرێته‌وه‌.**

---

[1] واته‌: حوكمى تۆڵه‌سه‌ندنه‌وه‌ له‌قورئاندایه‌، پێغه‌مبه‌ر ئه‌م فه‌رمایشته‌ى به‌و هۆیه‌ وه‌ فه‌رموو كه‌ ڕوبیع دانێكى یاریده‌ده‌رێكى ((موسوڵكانێكى مه‌دینه‌یى)) شكاند بوو.

[2] برینى قوڵ كه‌ له‌سه‌ردا بێت گه‌یشته‌ مێخى سه‌ر، ((قود)) واته‌ تۆڵه‌ جونكه‌ زه‌حمه‌ته‌ بۆیه‌ خوێنبایى لێ ده‌سه‌نرێت.

٣١٧٧- أما إن ابنك هذا لا يجني عليك و لا تجني عليه.

(صحيح) ( حم د ن ك ) عن أبي رمثة . (الإرواء ٢٣٦٢)

**٣١٧٧- تـاوانی تۆ كوڕه‌كه‌ت نـاگرێته‌وه‌و تـاوانی كوڕه‌كه‌شت تۆ نـاگرێته‌وه[١].**

٣١٧٨- لا تجني أم على ولد.

(صحيح) ( ن هـ ) عن طارق المحاربي. (الصحيحة ٩٨٩)

**٣١٧٨- تـاوانی دایك نـادرێت به‌سه‌ر كوڕه‌كه‌یدا.**

٣١٧٩- لا تجني نفس على أخرى.

(صحيح) ( ن هـ ) عن أسامة بن شريك. (الصحيحة ٩٨٨)

**٣١٧٩- تـاوانی هیچ كه‌سێك نـادرێت به‌سه‌ر كه‌سێكی تـردا.**

٣١٨٠- ما من رجل يجرح في جسده جراحة فيتصدق بها إلا كفر الله عنه مثل ما تصدق.

(صحيح) ( حم الضياء ) عن عبادة. (الصحيحة ٢٢٧٢)

**٣١٨٠- هه‌ر كه‌سێك له‌جێگه‌یه‌كی لاشه‌یدا بریندار بكرێت و له‌به‌ر خوا له‌و كه‌سه خۆش بێت، خوای گه‌وره هێنده‌ی ئه‌و لێخۆشبوونه گونـاهی ده‌سڕێته‌وه.**

٣١٨١- من تصدق بشيء من جسده أعطي بقدر ما تصدق.

(صحيح) ( طب ) عن عبادة. (الصحيحة ٢٢٧٣)

**٣١٨١- هه‌ركه‌سێك له‌برینێك خۆش بێت كه له‌لاشه‌یدا زامدار كردبێت خوای گه‌وره بـایی ئه‌وه‌نده‌ی پێ ده‌دات.**

٣١٨٢- لا قود في المأمومة و لا الجائفة و لا المنقلة.

(حسن)( هـ ) عن العباس. (الصحيحة ٢١٩٠)

**٣١٨٢- بریندار كردنه‌وه نییه له‌و برینی ده‌گاته نزیك ده‌ماغ و ئه‌و برینه‌ی ده‌گاته قولایی سه‌رو ئه‌و برینـانه‌ی ورده ئێسكی لێ ده‌ردێنێت.**

---

[١] له‌سه‌رده‌می نه‌فامیدا تـاوانی كه‌سێك كه‌سه نزیكه‌كانی ده‌گرته‌وه.

# بابه‌تی خوێنبایی (الديات)

٣١٨٣- أصابع اليدين و الرجلين سواء.

(صحيح) ( د ) عن ابن عباس . (الإرواء ٢٢٧١)

**٣١٨٣- په‌نجه‌كانی ده‌ست و پێ یه‌كسانن[١].**

٣١٨٤- ألا إن قتل الخطأ شبه العمد بالسوط و العصا فيه مائة من الإبل مغلظة منها أربعون خلفة في بطونها أولادها.

(صحيح) ( ن هق ) عن ابن عمر . (الإرواء ٢١٩٨)

**٣١٨٤- كوشتنی هه‌ڵه‌ی هاوشێوه‌ی ئه‌نقه‌ست به‌قامچی و دار، سه‌د وشتری قورسی له‌سه‌ره، چلیان ئاوس بن له‌و وشترانه بێت به‌چه‌كه‌كانیان له‌سكیاندایه.**

٣١٨٥- الأسنان سواء الثنية و الضرس سواء.

(صحيح) ( هـ ) عن ابن عباس . (الإرواء ٢٢٣٣)

**٣١٨٥- ددانه‌كان وه‌كو یه‌كن، خرێ و دانی بڕنده وه‌كو یه‌كن.**

٣١٨٦- الأسنان سواء خمسا خمسا.

(صحيح) ( ن ) عن ابن عمرو . (الإرواء ٢٢٣٨)

**٣١٨٦- ددانه‌كان وه‌كو یه‌كن پێنج پێنج[٢].**

٣١٨٧- الأصابع سواء عشر عشر من الإبل.

(صحيح) ( د ن هـ ) عن أبي موسى . (الإرواء ٢٢٣٣)

**٣١٨٧- په‌نجه‌كان هه‌موویان له‌هه‌ر یه‌كێكیاندا ده‌و ووشتر هه‌یه یه‌كسانن[٣].**

٣١٨٨- الأصابع سواء كلهن فيهن عشر من الإبل.

(صحيح) ( ن هـ ) عن ابن عمرو . (الإرواء ٢٢٣٤)

**٣١٨٨- په‌نجه‌كان هه‌موویان یه‌كسانن هه‌ر یه‌كه‌و ده وشتریان له‌سه‌ره.**

٣١٨٩- الأصابع سواء و الأسنان سواء الثنية و الضرس سواء هذه و هذه سواء - يعني الإبهام و الخنصر-.

(صحيح) ( د ) عن ابن عباس . (الإرواء ٢٢٣٩)

---

[١] واته: هه‌ر په‌نجه‌یه‌كی قرتاند یان له‌كاری خست هه‌مان په‌نجه‌ی ده‌قرتێرێته‌وه و یان له‌كار ده‌خرێته‌وه.

[٢] واته: بۆ هه‌ر دانێك پێنج وشتر خوێنبایی.

[٣] واته: له‌تۆڵه و خوێنبایی یه‌ك په‌نجه‌دا ده ووشتر ده‌درێت.

**٣١٨٩- په نجه‌كان يه‌كسانن، ددانه‌كانيش يه‌كسانن، خڕێ و دانى بڕنده وه‌كو يه‌كن، ئه‌مه و ئه‌وه‌ش يه‌كسانه-مه‌به‌ستى: په نجه كه‌ڵه‌و په نجه تووته‌يه-.**

٣١٩٠- دية أصابع اليدين و الرجلين سواء عشر من الإبل لكل إصبع.

(صحيح) ( ت ) عن ابن عباس . (الإرواء ٢٣٣٣)

**٣١٩٠- خوێنبايى په نجه‌كانى هه‌ر دوو ده‌ست و هه‌ردوو پێ وه‌كو يه‌كن، ده وشتر بۆ يه‌ك په نجه‌يه.**

٣١٩١- دية المعاهد نصف دية الحر.

(صحيح) ( د ) عن ابن عمرو . (الإرواء ٢٢٥٢)

**٣١٩١- خوێنبايى خاوه‌ن په يمان، نيوه‌ى خوێنبايى كه‌سى ئازاده.**

٣١٩٢- دية المكاتب بقدر ما عتق منه دية الحر و بقدر ما رق منه دية العبد

(صحيح) ( طب ) عن ابن عباس . (الإرواء ١٧٢٦)

**٣١٩٢- خوێنبايى كۆيله‌ى نوسراو پێدراو ئه‌وه‌نده‌ى ئازادكراوه ، وه‌كو خوێمبايى ئازاد وايه وه ئه‌وه‌شى به كۆيله‌يى ماوه‌ته‌وه وه‌كو خوێنبايى كۆيله وايه.**

٣١٩٣- دية عقل الكافر نصف عقل المؤمن.

(صحيح) ( ت ) عن ابن عمرو . (الإرواء ٢٢٥٢)

**٣١٩٣- خوێنبايى خاوه‌ن كتێبى ئه‌مين كراو نيوه‌ى خوێنبايى خاوه‌ن باوه‌ڕه.**

٣١٩٤- عقل أهل الذمة نصف عقل المسلمين .

(حسن) ( ن ) عن ابن عمرو. (الإرواء ٢٣١٣)

**٣١٩٤- خوێنبايى** ( أهل الذمة )[1] **نيوه‌ى خوێن بايى موسوڵمانانه.**

٣١٩٥- عقل شبه العمد مغلظ مثل عقل العمد و لا يقتل صاحبه .

(حسن) ( د ) عن ابن عمرو. (المشكاة ٣٥٠١)

**٣١٩٥- خوێنبايى هاوشێوه‌ى ئه‌نقه‌ست قورسه وه‌كو خوێنبايى كوشتنى ئه‌نقه‌سته، ئه نجامده‌ره‌كه‌شى ناكوژرێته‌وه.**

٣١٩٦- على كل بطن عقولة .

(صحيح) ( حم م ) عن جابر. (صحيح النسائي ٤٨٢٩)

**٣١٩٦- هه‌موو تيره‌يه‌ك به‌شى خۆى ده‌كه‌وێته سه‌رى له خوێنبايى[2].**

---

[1] ( أهل الذمة ) به‌و خاوه‌ن كتێبه ئاسمانيانه ده‌وترێت كه له‌ژێر سايه‌ى ده‌وڵه‌تى ئيسلامدا ئه‌مانيان پێدراوه و حه‌واونه‌ته‌وه.

[2] عاقله- يان (( عُقوله )) واته كه‌س و كارى بكوژه، ده‌بێ له‌هۆزمكه‌ياندا هه‌ر كه‌س خوێنبايى كه‌وته سه‌ر ده‌بێ به‌شدارى بژاردنى بكات به‌گوێره‌ى توانا.

٣١٩٧- العجماء جرحها جبار و البئر جبار و المعدن جبار و في الركاز الخمس .

(صحيح) ( مالك حم ق ٤ ) عن أبي هريرة ( طب ) عن عمرو بن عوف. (الإرواء ٨٠٤)

**٣١٩٧- هەر برینێك ئاژەڵ[1] دروستی بكات بەفیڕۆ دەڕوات، ئەو كەسەی دەكەوێتە بیری كەسێكەوە هیچ لەسەر خاوەن بیرەكە نییە، ئەوەشی دەكەوێتە كانەوە بەفیڕۆ دەڕوات كانزاش پێنج یەك زەكاتی تیایە.**

٣١٩٨- العجماء جرحها جبار و المعدن جبار .

(صحيح) ( هـ ) عن عمرو بن عوف. (الإرواء ٨٠٤)

**٣١٩٨- بێ زمان هەر برینێك دروست بكات بەفیڕۆ دەڕوات.**

٣١٩٩- العقل على العصبة و في السقط غرة عبد أو أمة.

(صحيح) ( طب ) عن حمل بن النابغة. (الصحيحة ١٩٨٣)

**٣١٩٩- خوێنبایی لەسەر خزم خوتیشە، كۆرپەلەیش خوێنباییەكەی كۆیلەیەك یان كەنیزەكێكە.**

٣٢٠٠- العمد قود و الخطأ دية .

(صحيح) (طب) عن أم حزم. (الصحيحة ١٩٨٦)

**٣٢٠٠- كوشتنی ئەنقەست دەبێتە مایەی كوشتنەوە، كوشتنی هەڵەیش خوێنبایی لەسەرە.**

٣٢٠١- في الأسنان خمس خمس من الإبل.

(صحيح) ( د ن ) عن ابن عمر. (الإرواء ٢٣٣٣)

**٣٢٠١- لەددان پێنج هەیە واتە پێنج وشتر هەیە.**

## بابەتی جەنگكردن لەگەڵ ستەمكاراندا

٣٢٠٢- في الأصابع عشر عشر.

(صحيح) ( حم د ن ) عن ابن عمرو. (الإرواء ٢٣٣٣)

**٣٢٠٢- خوێنبای پەنجەكان دە وشترە دە بۆ هەر پەنجەیەك.**

٣٢٠٣- في الأنف الدية إذا استوفى جدعه مائة من الإبل و في اليد خمسون و في الرجل خمسون و في العين خمسون و في الآمة ثلث النفس و في الجائفة ثلث النفس و في المنقلة خمس عشرة و في الموضحة خمس و في السن خمس و في كل إصبع من هنالك عشر.

(حسن) ( هق ) عن عمر. (الصحيحة ١٩٩٧)

---

[1] **العجماء: واتە: بۆ زمان – ئاژەڵ. ئەگەر لەلایەن خاوەنیەوە كەمتەرخەمی نەبو بێت.**

**٣٢٠٣- خوێنبایی تەواو لەشکانی لوتدا ئەگەر بەتەواو شکا بێت کەسەد ووشترە بۆ دەستییش پەنجا ووشتر و بۆ قاچیش پەنجا و بۆ چاو پەنجا و بۆ (الآمة) برینی قوڵ کە چوبێتە دیوی ناوەوەی سەر سێ یەکی خوێنبایی تەواو، بۆ زامی سەر ئەگەر بۆ دیوی ناوەوەی سەرکون بو بێت پێنج ووشتر و، بۆ زامی سەر کەئێسقانی دەرخستبێت پێنج ووشتر و، بۆ هەر دانێك پێنج ووشتر و بۆ هەر پەنجەیەکیش دە ووشتر.**

٣٢٠٤- في المواضح خمس خمس من الإبل.

(صحيح) ( حم ٤ ) عن أبي هريرة. (الإرواء ٢٣٤٥)

**٣٢٠٤- بۆ زامی سەر ئێسقانی لێ دەرکەوت بێت پێنج ووشترە.**

٣٢٠٥- من قتل خطأ فديته مائة من الإبل ثلاثون بنت مخاض و ثلاثون بنت لبون و ثلاثون حقة و عشرة بني لبون.

(حسن) ( حم ن ) عن ابن عمرو. (الإرواء ٢٢٦١)

**٣٢٠٥- هەر کەس کەسێك بکوژێت بەهەڵە خوێنباییەکەی سەد ووشترە سی بێچووی مێینەی یەك ساڵە و سی بێچووی مێینەی دوو ساڵە سی ووشتری سێ ساڵە و دە بێچووی نێرینەی دووساڵە.**

٣٢٠٦- من قتل في عميا أو رميا يكون بينهم بحجر أو سوط فعقله عقل خطأ و من قتل عمدا فقود يديه فمن حال بينه و بينه فعليه لعنة الله و الملائكة و الناس أجمعين.

(صحيح) ( د ن هـ ) عن ابن عباس. (المشكاة ٣٤٧٨)

**٣٢٠٦- هەر کەس لە قەرباڵغیدا کوژرا و نەزانرێت کێ کوشتویەتی، یان بەبەرد یان بەقەمچی کوژرا بێت خوێنباییەکەی خوێنبایی کوشتنی بەهەڵەیە، هەر کەسێش بەئەنقەست بکوژرێت کولەکەی کوشتنەوەی بکوژە و هەر کەسیش ڕێگر بێت نەفرینی خواو فریشتەکان وهەموو خەڵکی لێ بێت.**

٣٢٠٧- من قتل في عميا في رمى يكون بينهم بحجارة أو بالسياط أو ضرب بعصا فهو خطأ و عقله عقل الخطأ و من قتل عمدا فهو قود يد و من حال دونه فعليه لعنة الله و غضبه لا يقبل منه صرفا و لا عدلا.

(صحيح) ( د ن ) عن ابن عباس. (المشكاة ٣٤٧٨)

**٣٢٠٧- هەر کەس لە قەربالغیدا کوژرا و بەبەردە فڕکێ یان قەمچی یان تێلاوەکوشتنی هەلەیە و خوێنباییەکەی خوێنبایی هەلەیە، هەر کەسیش بە ئەنقەست کوژرا دەبێ بکوژ بکوژرێتەوە هەر کەسیش ببێتە لەمپەڕو نەهێلێ بکوژرێتەوە نەفرینی و خەشمی خوای لێ بێت، نەفەرزو نەسوننەتی لێ وەرناگیرێت.**

٣٢٠٨- من قتل له قتيل فهو بخير النظرين إما أن يقاد و إما أن يفدي.

(صحيح) ( ن هـ ) عن أبي هريرة. (الإرواء ١٠٤٢)

**٣٢٠٨- هەر کەس خزمێکی کوژرا کامیانی پێ چاکە لەو دوو بۆ چونە دەیکات یان وەرناگیرێت. تۆڵە دەستێنێتەوە یان خوێنبایی[1] دەدرێتێ.**

٣٢٠٩- من قتل متعمد دفع إلى أولياء المقتول فإن شاءوا قتلوا و إن شاءوا أخذوا الدية و هي ثلاثون حقة و ثلاثون جذعة و أربعون خلفة و ما صولحوا عليه فهو لهم.

(صحيح) ( حم ت هـ ) عن ابن عمرو. (الإرواء ٢٢٦١)

**٣٢٠٩- هەر کەس بەئەنقەست کەسێکی کوشت دەدرێتە دەست سەرپەرشتیاری کوژراوەکە جا ئەگەر ویستیان دەیکوژنەوە یان خوێنبایی لێ وەردەگرن ئەویش سی ووشتری سێ ساڵە[2] و سی ووشتری چوار ساڵەو چل ووشتری ئاوش و ئەوەش ئاشتەوایی لەسەر کرا بۆ ئەوانە ((واتە وەری دەگرن)).**

٣٢١٠- المسلمون تتكافأ دماؤهم يسعى بذمتهم أدناهم و يجير عليهم أقصاهم و هم يد على من سواهم يرد مشدهم على مضعفهم و مسرعهم على قاعدهم لا يقتل مؤمن بكافر و لا ذو عهد في عهده.

(حسن) ( د هـ ) عن ابن عمرو. (الإرواء ٢٢٧٠)

**٣٢١٠- موسوڵمانان خوێنیان یەکسانە سادەترینیان کۆشش دەکات بۆ ئەوەی لەئەستویاندا بالاترینیان هەقیان بۆ دەکاتەوە و هەمووشیان یەك دەستن لەدژی ناحەز یان بەهێزیان یارمەتی لاوازیان دەداتو ئەوەی بەرتەواز بووە یارمەتی بنکە و کەسانی تر یان ئەدات، بڕوادار بە لەسەر کافر ناکوژرێتەوە خاوەن پەیمانیش لەسەر کافر ناکوژرێتەوە.**

---

[1] واتە دەیکوژێنەوە لەتۆڵەدا ین قەرەبوو دەدرێتەوە بەوەرگرتنی خوێنبایی.

[2] واتە سێ ساڵی تەواو کرد بێت و چوبێتە چوار ساڵیەوە.

٣٢١١- النار جبار.

(صحيح) ( د هـ ) عن أبي هريرة. (الصحيحة ٢٣٨١)

**٣٢١١- ئاگر خستنه‌وه به سيرايه‌ت كردنى له موڵكى خۆيه‌وه بۆ موڵكى خه‌ڵكى بژاردنى نيه.**

٣٢١٢- هذه و هذه سواء - يعني الخنصر و الإبهام -.

(صحيح) ( حم خ ت ن هـ ) عن ابن عباس. (المشكاة ٣٤٨٦)

**٣٢١٢- ئه‌مه و ئه‌مه يه‌كسانن – واته: په نجه تووته و په نجه گه‌وره[1].**

٣٢١٣- لا يقتل الوالد بالولد.

(صحيح) ( د ) عن عمر وابن عباس. (الإرواء ٢٢٧٦)

**٣٢١٣- باوك له‌سه‌ر كورى خۆى ناكوژرێته‌وه.**

٣٢١٤- لا يقتل مؤمن بكافر و لا ذو عهد في عهده.

(حسن) ( هـ ) عن ابن عباس. (الإرواء ٢٢٧٠)

**٣٢١٤- بڕوادار له‌سه‌ر بێ باوەڕ و خاوه‌ن په يمان له‌ماوه‌ى په يمانه‌كه‌يدا ناكوژرێته‌وه.**

٣٢١٥- لا يقتل مسلم بكافر.

(صحيح) ( حم ت هـ ) عن ابن عمرو. (الإرواء ٢٢٠٩)

**٣٢١٥- موسوڵمان له‌سه‌ر بێ باوەڕ ناكوژرێته‌وه.**

٣٢١٦- يؤدي المكاتب بحصته ما أدى دية حر و ما بقي دية عبد.

(صحيح) ( حم ت ك ) عن ابن عباس. (الإرواء ١٧٢٣)

**٣٢١٦- كۆيله‌ى خاوه‌ن نوسراو[2] خوێنبايى كۆيله‌ى وێنه‌ى خۆى ئه‌داته ئه‌وه‌ى داويه‌ته‌وه[3] خوێنبايى ئازادەو ئه‌وه‌ى له‌سه‌رى ماوه خوێنبايى كۆيله‌يه.**

---

[1] واته: ئه‌و دوو په نجه‌يه له‌قه‌ره‌بوو خوێنبايدا وه‌كو يه‌كن.

[2] كۆيله‌ى خاوه‌ن نوسراو – ئه‌وه‌يه گه‌وره‌كه‌ى نوسراوێكى پێداوه بۆ نوسيوه‌ى هه‌ركات ئه‌وه‌نده‌ت ماڵ-يان پاره بۆ هێنام ئازاديه.

[3] واته: ئه‌گه‌ر كۆيله‌ى خاوه‌ن نوسراو كوژرا ئه‌وه‌نده‌ى داويه‌تيه‌وه به‌گه‌وره‌كه‌ى ئازاد حساب ده‌كرێ و ده‌بێ به‌و ئه‌ندازه‌يه خوێنبايى ئازاد بدرێت به‌كه‌س و كارى ئه‌وه‌نده‌شى ماوه بيداته‌وه به‌و ئه‌ندازه‌يه خوێنبايى كۆيله ده‌درێت به‌گه‌وره‌كه‌ى.

## بابەتی شەڕکردن لەگەڵ هەڵگەڕاوەکان

٣٢١٧- من حمل علينا السلاح فليس منا.

(صحيح) ( مالك حم ق ن هـ ) عن ابن عمر. (المشكاة ٣٥٢٠)

**٣٢١٧- هەر کەسێك چەکی لەدژمان هەڵگرت لەئێمە نییە.**

٣٢١٨- من حمل علينا السلاح فليس منا و من غشنا فليس منا.

(صحيح) ( م هـ ) عن أبي هريرة. (المشكاة ٣٥٢٠)

**٣٢١٨- هەرکەسێ چەکمان لەدژ هەڵگرێت لەئێمە نییە، هەرکێیش فێڵ و تەڵەکەمان لێ بکات لەئێمە نییە.**

٣٢١٩- تقتل عمارا الفئة الباغية.

(صحيح) ( حم ) عن خزيمة بن ثابت وعن عمرو بن العاص وعن ابنه وعن عمرو بن حزم ( م ) عن أم سلمة . (الصحيحة ٧١٠)

**٣٢١٩- دەستەی دەست درێژکار عەممار دەکوژێت.**

## بابەتی شەڕ کردن لەگەڵ تاوانبار و کوشتنی پاشگەز بوو لەئایینی خۆی

٣٢٢٠- من قتل دون ماله فهو شهيد و من قتل دون دمه فهو شهيد و من قتل دون دينه فهو شهيد و من قتل دون أهله فهو شهيد.

(صحيح) ( حم ٣ حب ) عن سعيد بن زيد. (المشكاة ٣٥٢٩)

**٣٢٢٠- هەر کەسێك لەپێناو ماڵی خۆی بکوژرێت شەهیدە، هەر کەسیش لەکاتی بەرگریکردن لەخۆی بکوژرێت شەهیدە، هەر کەسیش لە پێناو ئاینیدا بکوژرێت شەهیدە، هەر کەسیش لە پێناو کەس و کاریدا بکوژرێت شەهیدە[1].**

**٣٢٢١- هەر کەسێك لە پێناو ماڵی خۆی بکوژرێت شەهیدە.**

٣٢٢١- من قتل دون ماله فهو شهيد.

(صحيح) ( حم ق ت ن ) عن ابن عمرو ( ت حب ) عن سعيد بن زيد ( ن ) عن بريدة. (الجنائز ٤١)

---

[1] لە پێناو شەورەف یان خێزانیدا بکوژرێت شەهیدە.

**٣٢٢١- هه‌ركه‌س له‌ پێناو ماڵیدا بكوژرێت شه‌هیده[1].**

٣٢٢٢- من قتل دون ماله مظلوما فله الجنة.

(صحيح) ( ن ) عن ابن عمرو. (الجنائز ٤١)

**٣٢٢٢- هه‌ر كه‌سێ به‌سته‌م لێ كراوى له‌پێناو ماڵى[2] خۆیدا بكوژرێت ده‌چێته به‌هه‌شته‌وه.**

٣٢٢٣- من قتل دون مظلمته فهو شهيد.

(صحيح) ( ن الضياء ) عن سويد بن مقرن. (الجنائز ٤٢)

**٣٢٢٣- هه‌ر كه‌سێك له‌ پێناو سته‌ملێكراوى خۆى بكوژرێت شه‌هیده.**

٣٢٢٤- من أتي عند ماله فقوتل فقاتل فقتل فهو شهيد.

(صحيح) ( هـ ) عن ابن عمر. (الجنائز ٤١)

**٣٢٢٤- هه‌ر كه‌سێك بێنه‌ سه‌ر ماڵى و شه‌ڕى له‌گه‌ڵ بكه‌ن و ئه‌ویش شه‌ڕبكات و بكوژرێت شه‌هیده.**

٣٢٢٥- يَعَضُّ أحدكم أخاه كما يعض الفحل ؟ ! لا دية له.

(صحيح) ( حم ق ت ن هـ ) عن عمران بن حصين ( ن ) عن يعلى بن منية وأخيه مسلمة.

**٣٢٢٥- هه‌ر كه‌سێك له‌ئێوه قه‌پ به‌براكه‌یدا بكات وه‌كو كه‌ڵ؟! خوێنبایى نییه.**

٣٢٢٦- لو أن امرءا اطلع عليك بغير إذن فحذفته بحصاة ففقأت عينه لم يكن عليك جناح.

(صحيح) ( حم ق ) عن أبي هريرة. (الإرواء ٢٢٨٩)

**٣٢٢٦- ئه‌گه‌ر كه‌سێك ته‌ماشاى ماڵت یان ژنت بكات به‌بێ مۆڵه‌تى خۆت و به‌ردێكى تێگریت و چاوى ده‌رپه‌رێنى گوناهبار نابیت.**

٣٢٢٧- من بدل دينه فاقتلوه.

(صحيح) ( حم خ ٤ ) عن ابن عباس. (الإرواء ٢٥٣٧)

**٣٢٢٧- هه‌ر كه‌سێك ئایینى خۆى گۆڕى بیكوژن[3].**

٣٢٢٨- من ارتد عن دينه فاقتلوه.

(صحيح) ( طب ) عن عصمة بن مالك. (الصحيحة ٤٨٧)

**٣٢٢٨- هه‌ر كه‌سێك له‌ئایینى خۆى پاشگه‌ز بوویه‌وه بیكوژن.**

---

[1] واته پله‌یه‌ك له‌پله‌كانى شه‌هیدى وه‌رده‌گرێت چونكه شه‌هید چه‌ند پله‌یه‌كى هه‌یه گه‌وره‌ترین شه‌هید ئه‌وه‌یه له‌ پێناو دین و ئایینیدا و له‌جه‌نگدا شه‌هید بێت.

[2] واته له‌ پێناو هه‌ق سه‌ندنه‌وه یان ده‌ست خستنه‌وه‌ى شتى داگیر كراویدا بكوژرێت شه‌هیده.

[3] واته : پاشگه‌زبووه‌وه.

# پەڕاوی
# سزاکان (الحدود)

## بابەتی سزای داوێن پیسی ((زینا))

٣٢٢٩- إذا زنت أمة أحدكم فتبين زناها فليجلدها و لا يثرب ثم إن زنت فليجلدها و لا يثرب ثم إن زنت الثالثة فليبعها و لو بحبل من شعر.

(صحيح) ( حم ق ن د هـ ) عن أبي هريرة وزيد بن خالد . (الإرواء ٢٣٢٣)

**٣٢٢٩- ئەگەر کەنیزەکی کەسێکتان زینای کرد بابەشەلاق لێی بدات و سەرزەنشتی نەکات، ئەگەر جارێکی تریش داوێن پیسی کرد بابەشەلاق لێی بدات و سەرزەنشتی نەکات ئەگەر بۆ جاری سێیەمیش داوێن پیسی کرد بابیفرۆشێت ئەگەر بەگوریسێکی موش بووە.**

٣٢٣٠- الشيبان يجلدان و يرجمان و البكران يجلدان و ينفيان.

(صحيح) ( الحاكم في تاريخه ) عن أبي . (الصحيحة ١٨٠٨)

**٣٢٣٠- بێوە پیاو و بێوە ژن ئەگەر زینا بکەن جەڵدەیان لێدەدرێت و بەرد باران دەکرێت، کچ و کوڕی عازەبیش جەڵدەیان لێدەدرێت و دوور دەخرێنەوە.**

٣٢٣١- خذوا عني خذوا عني قد جعل الله لهن سبيلا البكر بالبكر جلد مائة و نفي سنة و الثيب بالثيب جلد مائة و الرجم.

(صحيح) ( حم م هـ ) عن عبادة بن الصامت . (الإرواء ٢٣٩٩)

**٣٢٣١- لێم وەربگرن، لێم وەربگرن[٢٧]، خوای گەورە ڕێگە چارەی بۆیان داناوە[٢٨]، کچ و کوڕی عازەب لێدانی سەد شەلاق و یەك ساڵ دوور خستنەوە، خاوەن هاوسەریش سەد شەلاق و بەردەباران کردن.**

---

[٢٧] **واتە: حوکم و بڕیاری شەرع دەربارەی زیناکەر.**

٣٢٣٢- من أتى بهيمة فاقتلوه و اقتلوها معه.

(صحيح) ( د ) عن ابن عباس. (الإرواء ٢٤٠٦)

**٣٢٣٢- هەر كەسێك لەگەڵ ئاژەڵێكدا جوت بێت، بیكوژن و ئاژەڵەكەش لەگەڵیدا بكوژن.**

٣٢٣٣- من وجدتموه وقع على بهيمة فاقتلوه و اقتلوا البهيمة.

(صحيح) ( ت ك ) عن ابن عباس. (٢٤٠٦)

**٣٢٣٣- هەر كەسێكتان بینی كەوتبووە سەر ئاژەڵێك بیكوژن[29] و ئاژەڵەكەشی لەگەڵ بكوژن.**

٣٢٣٤- من وجدتموه يعمل عمل قوم لوط فاقتلوا الفاعل و المفعول به.

(صحيح) ( حم ٤ قط ك الضياء ) عن ابن عباس. (الإرواء ٢٤٠٨)

**٣٢٣٤- هەر كەسێكتان بینی كاری گەلی ( لوط) ئە نجامدەدا بكەر[30] و كارلێكراو بكوژن.**

٣٢٣٥- و الذي نفسي بيده لأقضين بينكما بكتاب الله الوليدة و الغنم رد عليك و على ابنك جلد مائة و تغريب عام و على امرأة هذا الرجم و اغد يا أنيس على امرأة هذا فإن اعترفت فارجمها.

(صحيح) ( حم ق ٤ ) عن أبي هريرة وزيد بن خالد الجهني. (الإرواء ١٤٥٧)

**٣٢٣٥- سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە، دەبێت بە پەڕاوی خوای گەورە دادوەری بكەم لەنێوانتاندا، كەنیزەك و مەڕەكان[31] دەگەڕێنەوە بۆت، كوڕەكەش سەد جەڵدەو دوور خستنەوەی ساڵێكی لەسەرە، خێزانی ئەوەیش بەردە باران دەكرێت، تۆیش ئەی ئونەیس بڕۆ بۆ لای خێزانی ئەو پیاوە، ئەگەر دانی بەتاوانەكەیدانا بەردەبارانی بكە.**

٣٢٣٦- أخوف ما أخاف على أمتي كل منافق عليم اللسان.

(صحيح) ( عد ) عن عمر . (المشكاة ٣٥٧٧)

**٣٢٣٦- ترسناكترین كار ترسم لێی هەبێت بۆ ئوممەتەكەم كردەوەی گەلی ( لوط )ە.**

---

[28] ڕێگە چارە بۆ ڕزگار بونیان لەقەتیس دان و گێردانیان لەماڵەكاندا – چونكە پێشتر حوكمی ئافرەتی زیناكەر ئەوە بوو.

[29] واتە: لەگەڵی جووت بو بو.

[30] واتە: نێربازەكە و دودەكیەكە.

[31] كوڕی ی پیاوێك زینی لەگەڵ ژنی كەسێكی تر كرد بوو باوكی كوركەش لەبارتەقای ئەوەدا كەنیزەكێك و سەد مەڕو بزنی دایە مێردی ژنەكە كاتێك پێغەمبەر سەڵات و سەلامی خوای لێ بێت بیستی بەفەرموودەیە دادوەری كرد لەنێوانیاندا.

## بابەتی سزای بوختان (القذف)

٣٢٣٧- من قذف مملوكه بالزنا يقام عليه الحد يوم القيامة إلا أن يكون كما قال.

(صحيح) ( م ) عن أبي هريرة. (الترغيب ٢٨٠٢)

**٣٢٣٧- هەر کەسێك بوختانی داوێن پیسی بۆ کۆیلەیەکەی خۆی بکات ، سزای بوختانی لەسەر جێبەجێ دەکرێت لەقیامەتدا، مەگەر ئەو قسەی کردوویەتی ڕاست بێت.**

٣٢٣٨- من قذف مملوكه و هو بريء مما قال جلد يوم القيامة حدا إلا أن يكون كما قال.

(صحيح) ( حم ق د ت ) عن أبي هريرة. (الروض ١١٤٦)

**٣٢٣٨- هەر کێ بوختان بۆ کۆیلەکەی خۆی بکات و ئەویش تاوان بێت لەڕۆژی قیامەت شەلاقی لێ دەدرێت وەکو سزا مەگەر ئەو قسەی کردوویەتی وابێت.**

٣٢٣٩- البينة و إلا فحد في ظهرك.

(صحيح) ( د ن هـ ك ) عن ابن عباس . (الإرواء ٢١٥٨)

**٣٢٣٩- شاهد بهێنە ئەگەر نا سزا لەسەر پشتت جی بەجێ دەکرێت.**

## بابەتی سزای دزیکردن (السرقة)

٣٢٤٠- اقطعوا في ربع الدينار و لا تقطعوا فيما هو أدنى من ذلك.

(صحيح) ( حم هق ) عن عائشة . (الإرواء ٩٧٤)

**٣٢٤٠- دەستی دز ببڕن لەچواریەکی دینارێکدا، لەوە کەمتر بوو دەست مەبڕن.**

٣٢٤١- تقطع اليد في ثمن المجن.

(صحيح) ( حم هـ ) عن سعيد . (الصحيحة ٢١٩٧)

**٣٢٤١- دەست دەبڕدرێت لەنرخی قەڵغانێکدا.**

٣٢٤٢- تقطع يد السارق في ربع دينار فصاعدا.

(صحيح) ( خ د ن ) عن عائشة . (المشكاة ٣٥٩٠)

**٣٢٤٢- دەستی دز لەچواریەکی دنیارێك بەرەو ژوور دەبرێت.**

٣٢٤٣- ليس على المختلس قطع.

(صحيح) ( هـ ) عن عبدالرحمن بن عوف. (الإرواء ٢٤٧٠)

**٣٢٤٣- ڕفێنەر دەست بڕینی لەسەر نییە[٣٢].**

٣٢٤٤- ليس على المنتهب و لا على المختلس و لا على الخائن قطع.

(صحيح) ( حم ٤ حب ) عن جابر. (الإرواء ٢٤٧٠)

**٣٢٤٤- ئەئەو کەسەی بەزۆرداری شتێك دەبات و نەڕفێنەر و نەناپاك دەست بڕینیان لەسەر نییە.**

٣٢٤٥- من أصاب بفمه من ذي حاجة غير متخذ خبئة فلا شيء عليه و من خرج بشيء منه فعليه غرامة مثليه و العقوبة و من سرق منه شيئا بعد أن يؤويه الجرين فبلغ ثمن المجن فعليه القطع و من سرق دون ذلك فعليه غرامة مثليه و العقوبة.

(حسن) ( ٣ ) عن ابن عمر. (الإرواء ٢٤٨١)

**٣٢٤٥- هەر کەسێك بەدەمی لەبەرو بوومی هەژارێکی برد، خوارد و بەرۆك و گیرفانی لێ پڕ نەکرد، هیچی لەسەر نییە، هەرکەسێکیش هەندێکی لێ ببات دوو بەرامبەر پێی دەبژێردرێت و سزایش دەدرێت، هەر کەسێکیش شتێکی لێ بدزێت پاش ئەوەی دزەکە خستیەی جێگە و موشتاخ و، بایی هەشت یەکی قەڵغانێك بوو ، دەستی دەبڕدرێت هەر کەسیش لەو ئەندازە کەمتر بدزێت دوو بەرامبەر پێی دەبژدرێت و سزایش دەدرێت.**

٣٢٤٦- لا تقطع الأيدي في السفر.

(صحيح) ( حم ٣ الضياء ) عن بسر بن أبي أرطاة. (المشكاة ٣٦٠١)

**٣٢٤٦- دەستی دز لەکاتی گەشتدا سەفەری غەزادا نابڕدرێت[٣٣].**

٣٢٤٧- لا تقطع اليد في تمر معلق فإن ضمه الجرين قطعت في ثمن المجن و لا تقطع في حريسة الجبل فإذا آوى المراح قطعت في ثمن المجن.

(حسن) ( ن ) عن ابن عمرو. (الإرواء ٢٤٠٨)

**٣٢٤٧- دەست نابڕدرێت لەخورمای هەڵواسراودا، ئەگەر هەڵگیرا لەجێگای خۆی دەست بڕینی لەسەرە ئەگەر دزراوەکە بایی هەشت یەکی نرخی قەڵغانێك بێت، هەروەها دەست بڕین نییە لەسەر ئەو کەسەی مەڕێك لە نێو ڕاندا بدزێت لەشاخ، بەڵام کەگەڕانەوە جێگای مانەوەی خۆیان وبایی هەشت یەکی نرخی قەڵغانێك بدزرێت دەستی لەسەر دەبڕێتەوە.**

٣٢٤٨- لا تقطع يد السارق إلا في ربع دينار فصاعدا.

(صحيح) ( م ن هـ ) عن عائشة. (الإرواء ٢٣٩٧)

---

[٣٢] چونکە یەکێك لەمەرجەکانی دزی شوێن،ی هەڵگرتنی شتەکەیە.

[٣٣] مەناوی فەرموویەتی مەبەست بەسەفەری غەزاو جەنگی کافراتە. السراج المنير ج١ ص ٥٢٨.

**٣٢٤٨- دەستى دز نابڕدرێت لەچوار یەکی دیناریك بەرەو ژوورتر نەبێت.**

٣٢٤٩- لا قطع في ثمر و لا كثر.

(صحيح) ( حم ٤ حب ) عن رافع بن خديج. (الإرواء ٢٤٨٢)

**٣٢٤٩- دزینی خورما بەداروە و، ناو کرۆکەکەی[٣٤] دەست بڕینی لەسەر نییە.**

٣٢٥٠- لعن الله السارق يسرق البيضة فتقطع يده و يسرق الحبل فتقطع يده.

(صحيح) ( حم ق ن هـ ) عن أبي هريرة. (المشكاة ٣٥٩٢)

**٣٢٥٠- خوا نەفرینی کردوە لەدزێك کە هێلکەیەك دەدزێت و دەستیشی دەبڕدرێت، گوریسێك دەدزێت و دەستی دەبڕدرێت[٣٥].**

٣٢٥١- ما علمته إذ كان جاهلا و لا أطعمته إذ كان ساغبا.

(صحيح) ( حم د ن هـ ك ) عن عباد بن شرحبيل. (المشكاة ٢٢٢٩)

**٣٢٥١- فێرێت نەکرد کاتێك نەزان بوو، تێریشت نەکرد کاتێك برسی بوو[٣٦].**

٣٢٥٢- من دخل حائطا فليأكل و لا يتخذ خبيئة.

(حسن) ( ت ) عن ابن عمر. (المشكاة ٢٩٥٤)

**٣٢٥٢- هەر کەس چوە باخی حەشار بۆکراو بالێ ی بخوات بەڵام لێ ی نەبات.**

---

[٣٤] کە پێ ی دەوترێت (کثر) یان (جمار) واتە پیوی ناو بێخ و نێرکی دارخورماکە.

[٣٥] واتە: لەسەر هێلکەیەك و گوریسێك دەستی نابڕێت بەڵام مەبەستی فەرموودەکە ئەوەیە لەهێلکەیەك و گوریسێکە دەست بەدزی دەکات تا دەگاتە شتی گەورەی وا کە دەستی لەسەری دەبڕدرێت. السراج المنير ج١ ص ٥٢٨.

[٣٦] هۆی وتنی ئەم ئەوە بوو عُبادی کوڕی شرجیل فەرموویەتی: گرانی و نەبونی ڕووی تێکردم چومە حەشاری باخە خورمایەك و دارخورمایەکم ڕاوەشاند و هەندێکم خوارد و هەندێکیشم لە پۆشاکەکەمدا هەڵگرت لەو کاتەدا خاوەنەکەی هات و لێ ی دام و پۆشاکەکەشی بەخورماکەوە لێ سەندم، یەکسەر چومە خزمەت پێغەمبەر و بۆم گێڕایەوە (سەڵات و سەلامی خوای لێ بێت) ئەویش فەرمانی کرد کابرا جلەکەی پێدامەوە.

## بابەتی سزای ئارەق خۆر و ڕوونکردنەوەی بیٚ هۆشکەر

٣٢٥٣- أتاني جبريل فقال: يا محمد ! إن الله عز و جل لعن الخمر و عاصرها و معتصرها و شاربها و حاملها و المحمولة إليه و بائعها و مبتاعها و ساقيها و مسقيها.

(صحيح) ( طب ك هب الضياء ) عن ابن عباس . (الصحيحة ٨٣٧)

**٣٢٥٣- جیبریل هات بۆ لام و، فەرمووی: ئەی موحەممەد! خوای گەورە نەفرینی کردووە لەئارەق و، ئەو کەسەی دەیگوشیٚ ی و لەوەی بۆی دەگوشریٚ و، لە بخۆرەوەی و لە هەلگری و لەو کەسەی بۆی هەڵدەگیریٚت و لەفروشیاری و لەکڕیاری لەو کەسەی دەیگیٚریٚت و ئەوەی بۆی دەگیٚڕن.**

٣٢٥٤- اجتنبوا الخمر فإنها مفتاح كل شر.

(حسن) ( ك هب ) عن ابن عباس . (الصحيحة ٢٧٩٨)

**٣٢٥٤- دورکەونەوە لەئارەق، چونکە کلیلی هەموو خراپەیەکە.**

٣٢٥٥- اجتنبوا كل مسكر.

(صحيح) ( طب ) عن عبدالله بن مغفل . (الصحيحة ٨٨٤)

**٣٢٥٥- دورکەونەوە لەهەموو بیٚ هۆشکەریٚك.**

٣٢٥٦- اجتنبوا ما أسكر.

(صحيح) ( الحلواني ) عن علي . (الصحيحة ٨٨٦)

**٣٢٥٦- دورکەونەوە لە سەرخۆشکەرەکان.**

٣٢٥٧- إن الخمر من العصير و الزبيب و التمر و الحنطة و الشعير و الذرة و إني أنهاكم عن كل مسكر.

(حسن) ( د ) عن النعمان بن بشير . (الصحيحة ١٥٩٣)

**٣٢٥٧- ئارەق دروست دەکریٚت لەشەربەت و میٚوژ و خورما و گەنم و جۆ و گەنمەشامی، بەڕاستی منیش هەموو بیٚ هۆشکەریٚکتان لیٚ قەدەغە دەکەم.**

٣٢٥٨- إن الذي حرم شربها حرم بيعها - يعني الخمر -.

(صحيح) ( حم م ن ) عن ابن عباس . (غاية المرام ٦٣)

**٣٢٥٨- بەڕاستی ئەوەی خواردنەوەی قەدەغە کردووە فرۆشتنیشی قەدەغە کردووە- واتە: ئارەق-**

٣٢٥٩- إن الله حرم الخمر و حرم الميتة و ثمنها و حرم الخنزير و ثمنه.

(صحيح) ( د ) عن أبي هريرة . (الصحيحة ٣٢٤٨)

**٣٢٥٩- خوای گەورە ئارەقی یاساغ کردووە، ئاژەڵی تۆپی و نرخەکەشی یاساغ کردووە، بەرازو نرخەکەشی یاساغ کردووە.**

٣٢٦٠- إن الله حرم على أمتي الخمر و الميسر و المزر[٣٧] و الكوبة و الغبيراء و زادني صلاة الوتر.

(صحيح) ( طب هق ) عن ابن عمرو . (الصحيحة ١٧٠٨)

**٣٢٦٠- خوای گەورە ئارەق و قومار و بیرەو دەهۆڵ و دومبەڵەکی و شەرابی غوبەیرای[٣٨] لەئومەتم یاساغ کردووە، نوێژی ویتریشی بۆ زیاد کردم.**

٣٢٦١- إن الله حرم عليكم الخمر و الميسر و المزر و الكوبة و كل مسكر حرام.

(صحيح) ( هق ) عن ابن عباس . (المشكاة ٣٦٥٢)

**٣٢٦١- خوای گەورە ئارەق و قومار و دەهۆڵ و دومبەڵەکی و بالۆرە و هەموو بێ هۆشکەرێکی لەسەرتان قەدەغە کردووە.**

٣٢٦٢- إن الله لعن الخمر و عاصرها و معتصرها و شاربها و ساقيها و حاملها و الحمولة إليه و بائعها و مشتريها و آكل ثمنها.

(صحيح) ( ك هب ) عن ابن عمر . (الإرواء ١٥٢٥)

**٣٢٦٢- خوای گەورە نەفرینی کردووە لەئارەق و ئەو کەسەی دەیگوشێ و ئەوەی بۆی دەگوشرێ و لە بخورەوەی و ئەو دەیگێڕێت و ئەو کەسەی هەڵیدەگرێت و ئەوەی بۆی هەڵدەگیردرێت و فرۆشیار و کڕیار و بخۆری نرخەکەی.**

٣٢٦٣- إن من العنب خمرا و إن من التمر خمرا و إن من العسل خمرا و إن من البر خمرا و إن من الشعير خمرا.

(صحيح) ( د ) عن النعمان بن بشير . (المشكاة ٣٦٤٧)

**٣٢٦٣- بێگومان ئارەق دروست دەکرێت لەترێ و، خورماو، هەنگوین و، گەنم و، جۆ.**

---

[٣٧] (المزر) پێشی دەوترێت (نبیذ) جۆرێکە لە ئارەق.

[٣٨] جۆرە شەرابێکە لەچەند جۆرە شتێك دروست دەکرێت. السراج المنير ج١ ص ٥٣٠.

٣٢٦٤- أنهى عن كل مسكر أسكر عن الصلاة.

(صحيح) ( م ) عن أبي موسى . (الصحيحة ٤٢٢)

**٣٢٦٤- هەموو بێ هۆشکەرێکیان لێ قەدەغە دەکەم کە بێئاگاتان بکات لە نوێژ.**

٣٢٦٥- أنهاكم عن قليل ما أسكر كثيره.

(صحيح) ( ن ) عن سعد . (الإرواء ٢٣٧٢)

**٣٢٦٥- ئەوەی زۆری سەرخۆشکەوە، کەمیشی قەدەغە دەکەم لێتان.**

٣٢٦٦- ثلاثة قد حرم الله عليهم الجنة: مدمن الخمر و العاق و الديوث الذي يقر في أهله الخبث

(صحيح) ( حم ) عن ابن عمر . (حجاب المرأة المسلمة ص٦٧)

**٣٢٦٦- سێ کەس هەن خوای گەورە بەهەشتی لێ قەدەغە کردوون: هەمیشە ئارەق خۆری عەودالْ ئەو کەسەی لەگەڵ دایك و باوکی خراپە دەکات و، هەروەها کەسی بێ ئابڕوو کەڕازییە بە خراپەکاری ژن و منالی خۆی.**

٣٢٦٧- حرام قليل ما أسكر كثيره.

(صحيح) ( البغوي ) عن وافد أهل اليمن . (الإرواء ٣٨٤)

**٣٢٦٧- کەمی ئەو شتە حەرامە کەزۆرەکەی سەر خۆشکەر بێت.**

٣٢٦٨- حرم الله الخمر و كل مسكر حرام.

(صحيح) ( ن ) عن ابن عمر . (الصحيحة ١٨١٤)

**٣٢٦٨- خوای گەورە ئارەقی حەرام کردووە، هەموو سەر خۆشکەرێکیش حەرامە.**

٣٢٦٩- الخمر أم الخبائث فمن شربها لم تقبل صلاته أربعين يوما فإن مات و هي في بطنه مات ميتة جاهلية.

(حسن) ( طس ) عن ابن عمرو . (الصحيحة ١٨٥٤)

**٣٢٦٩- ئارەق ماکی هەموو خراپەکانە، هەر کەسێك بیخواتەوە چل ڕۆژ لێ وەرناگیرێت، ئەگەر بمرێت و ئارەق لەسکی دا بێت لەسەر ڕێبازی نەفامی دەمرێت.**

٣٢٧٠- الخمر أم الفواحش و أكبر الكبائر من شربها وقع على أمه و خالته و عمته.

(حسن) ( طب ) عن ابن عباس . (الصحيحة ١٨٥٣)

**٣٢٧٠- ئارەق سەرچاوەز ماکی خراپەکانەو، گەورەترینی تاوانەکانە، هەر کەسێك بیخواتەوە دەکەوێتە سەر دایك و پورو پلکی خۆی.**

٣٢٧١- الخمر من هاتين الشجرتين: النخلة و العنبة.

(صحيح) ( حم م ٤ ) عن أبي هريرة . (الصحيحة ٣١٥٩)

**٣٢٧١- ئارەق لەئەم دوو دارە دروست دەکرێت: دارخورما و دارمێو[٣٩].**

٣٢٧٢- شارب الخمر كعابد وثن و شارب الخمر كعابد اللات و العزى.

(صحيح) ( الحارث ) عن ابن عمرو. (الصحيحة ٦٧٧)

**٣٢٧٢- ئارەق خۆر وەکو بتپەرستە، ئارەق خۆر وەکو کەسێکە لات و عوززا بپەرستێت.**

٣٢٧٣- قليل ما أسكر كثيره حرام.

(صحيح) ( حب ) عن جابر. (الإرواء ٢٣٧٢)

**٣٢٧٣- کەمی ئەو شتە حەرامە کە زۆرەکەی سەرخۆشکەر بێت.**

٣٢٧٤- كل شراب أسكر فهو حرام.

(صحيح) ( حم ق ٤ ) عن عائشة. (المشكاة ٣٦٣٧)

**٣٢٧٤- هەموو خواردنەوەیەك سەرخۆشکەر بێت حەرامە.**

٣٢٧٥- كل ما أسكر عن الصلاة فهو حرام.

(صحيح) ( م ) عن أبي موسى. (الصحيحة ٤٢١)

**٣٢٧٥- هەموو سەخۆشکەرێك کە بێ ئاگای لەنوێژدا دروست بکات حەرامە.**

٣٢٧٦- كل مخمر خمر و كل مسكر حرام و من شرب مسكرا بخست صلاته أربعين صباحا فإن تاب تاب الله عليه فإن عاد الرابعة كان حقا على الله أن يسقيه من طينة الخبال صديد أهل النار و من سقاه صغيرا لا يعرف حلاله من حرامه كان حقا على الله أن يسقيه من طينة الخبال.

(صحيح) ( د ) عن ابن عباس. (الصحيحة ٢٠٣٩)

**٣٢٧٦- هەر شتێك ئەقڵ داپۆشێت ئارەقە، هەموو سەرخۆشکەرێکیش حەرامە، هەر کەسێکیش سەرخۆشکەرێك بخواتەوە چل بەیانی[٤٠] نوێژەکەی کەم دەکاتەوە، ئەگەر تەوبەی کرد خوای گەورە تەوبەکەی لێ وەردەگرێت، ئەگەر بۆ چوارەم جار گەڕایەوە سەر ئارەق خواردن، ئیتر خوای گەورە کێم و زوخاوی برینی دۆزەخیانی دەرخوارد بدات.**

٣٢٧٧- كل مسكر حرام.

(صحيح) ( حم ق د ن هـ ) عن أبي موسى ( حم ن ) عن أنس ( حم د ن هـ ) عن ابن عمر ( حم ن هـ ) عن أبي هريرة (هـ) عن ابن مسعود. (الإرواء ٢٤٣١)

---

[٣٩] عارق بەزۆری لەو دوو درەختە دروست دەکرێت ئەگەرنا لەشتی تریش و لەدرەختی تریش دروست دەکرێت.

[٤٠] واتە: چل ڕۆژ.

**٣٢٧٧- هەموو سەرخۆشکەرێك حەرامە.**

٣٢٧٨- كل مسكر حرام و إن على الله لعهدا لمن شرب المسكر أن يسقيه من طينة الخبال عرق أهل النار.

(صحيح) ( حم م ن ) عن جابر. (المشكاة ٣٦٣٩)

**٣٢٧٨- هەموو سەر خۆشکەرێك حەرامە، بەڕاستی خوای گەورەیش پە یمانی داوە هەر کەسێك سەرخۆشکەرێك بخوات لەقوڕی خەبالی دەرخوارد بدات کەئارەقی خەڵکی دۆزەخە.**

٣٢٧٩- كل مسكر حرام و ما أسكر منه الفرق فملء الكف منه حرام.

(صحيح) ( د ت ) عن عائشة . (الإرواء ٢٤٤٤)

**٣٢٨٩- هەموو سەرخۆشکەوێك حەرامە، ئەوەشی ئەندازەیەك لێی سەرخۆش بکات، کەم و زۆری هەر حەرامە.**

٣٢٨٠- كل مسكر خمر و كل مسكر حرام و من شرب الخمر في الدنيا فمات و هو يدمنها لم يتب لم يشربها في الآخرة.

(صحيح) ( حم م ٤ ) عن ابن عمر. (المشكاة ٣٦٣٨)

**٣٢٨٠- هەموو سەرخۆشکەرێك عارەقە و هەموو سەرخۆشکەرێکیش حەرامە، هەر کەسێکیش لەدونیادا ئارەق بخوات و بمرێت و هەر لەسەری بەردەوام بوو بێت بێ ئەوەی تەوبە بکات، لەڕۆژی قیامەتدا نا یخواتەوە.**

٣٢٨١- لعن الله الخمر و شاربها و ساقيها و بائعها و مبتاعها و عاصرها و معتصرها و حاملها و المحمولة إليه و آكل ثمنها.

(صحيح) ( د ك ) عن ابن عمر. (الإرواء ١٥٢٧)

**٣٢٨١- خوا نەفرینی لەئارەق کردوە، بخۆری و گێڕەری و، فرۆشەری و، کڕیاری و، گوشەری و، ئەوەی بۆی دەگوشرێت و، هەڵگری و، بۆ هەڵگیراوی و، بخۆری نرخەکەشی.**

٣٢٨٢- ما أسكر كثيره فقليله حرام.

(صحيح) ( حم د ت حب ) عن جابر ( حم ن هـ ) عن ابن عمرو. (الإرواء ٢٤٣٣)

**٣٢٨٢- ئەوەی زۆرەکەی سەرخۆش بکات، کەمەکەشی هەر حەرامە.**

٣٢٨٣- ما أسكر منه الفرق فملء الكف منه حرام.

(صحيح) ( حم ) عن عائشة. (غاية المرام ٥٩)

**٣٢٨٣- ئەوەی ئەندازەیەکی سەرخۆشکەر بێت لەوێچێکیش هەر حەرامە.**

٣٢٨٤- مدمن الخمر كعابد وثن.

(صحيح) ( تخ هب ) عن أبي هريرة. (الصحيحة ٢١٧٧)

**٣٢٨٤- ئەو عەودالّی ئارەق وەکو بتپەرستە.**

٣٢٨٥- من شرب الخمر في الدنيا ثم لم يتب منها حرمها في الآخرة.

(صحيح) ( حم ق ن هـ ) عن ابن عمر. (الروض ٥٦٢)

**٣٢٨٥- هەر کەسێك لەدونیادا ئارەق بخوات و تەوبە نەکات، خوای گەورە لەڕۆژی دواییدا لیٚ ی حەرامی دەکات.**

٣٢٨٦- من شرب الخمر في الدنيا لم يشربها في الآخرة.

(صحيح) ( هـ ) عن أبي هريرة. (الصحيحة ٣٨٤)

**٣٢٨٦- هەر کەسێك لەدونیادا ئارەق بخوات، لەڕۆژی دواییدا نایخوات.**

٣٢٨٧- من شرب الخمر لم تقبل له صلاة أربعين صباحا فإن تاب تاب الله عليه فإن عاد لم تقبل له صلاة أربعين صباحا فإن تاب تاب الله عليه فإن عاد لم تقبل له صلاة أربعين صباحا فإن تاب تاب الله عليه فإن عاد الرابعة لم تقبل له صلاة أربعين صباحا فإن تاب لم يتب الله عليه و سقاه من نهر الخبال.

(صحيح) ( حم ت ) عن ابن عمر ( حم ن ك ) عن ابن عمرو. (المشكاة ٣٦٤٣)

**٣٢٨٧- هەر کیٚ ئارەق بخوات چل ڕۆژ نوێژی لیٚ وەرناگیردرێت، ئەگەر دووبارەی کردەوە چل ڕۆژی تر نوێژی لیٚ وەرناگیرێت، ئەگەر تەوبە بکات خوای گەورە تەوبەکەی وەردەگرێت، ئەگەر دیسان دوبارەی کردەوەچل ڕۆژ خوا نوێژی لیٚ وەرناگرێت ئەگەر تەوبەی کرد خوای گەورە تەوبەی وەردەگرێت، ئەگەر دیسان گەڕایەوە، خوای گەورە چل بەیانی تر نوێژی لیٚ قبول ناکات، ئەگەر تەوبە بکات خوای گەورە تەوبەکەی وەردەگرێت، ئەگەر بۆ جاری چوارەم گەڕایەوە چل بەیانیانی تر نوێژی لیٚ وەرناگرێت، ئەگەر تەوبەی کرد خوای گەورە تەوبەی لیٚ وەرناگرێت و لەڕووباری خەبالی دەرخوارد دەدات.**

٣٢٨٨- من شرب الخمر و سكر لم تقبل له صلاة أربعين صباحا فإن مات دخل النار فإن تاب تاب الله عليه و إن عاد فشرب فسكر لم تقبل له صلاة أربعين صباحا فإن مات دخل النار و إن تاب تاب الله عليه و إن عاد فشرب فسكر لم تقبل له صلاة أربعين صباحا فإن مات دخل النار

و إن تاب تاب الله عليه فإن عاد كان حقا على الله أن يسقيه من ردغة الخبال يوم القيامة: عصارة أهل النار.

(صحيح) ( هـ ) عن ابن عمرو. (المشكاة ٣٦٤٤)

**٣٢٨٨- هەر كەسێك ئارەق بخوات و سەرخۆش بێت چل ڕۆژ نوێژی لێ وەرناگیرێت، ئەگەریش بمرێت دەچێتە دۆزەخەوە بەڵام ئەگەر تەوبە بكات خوا تەوبەكەی لێ وەردەگرێت، ئەگەر دووبارە عارەق بخواتەوەو سەرخۆش بێت، چل ڕۆژ نوێژی لێ وەرناگیرێت، ئەگەر بمرێت دەچێتە دۆزەخەوە، ئەگەر تەوبەیش بكات لێ وەردەگیرێت، ئەگەر بگەڕێتەوە سەر خواردنەوەی و سەرخۆش بێتەوە چل ڕۆژ نوێژی لێ وەردەگرێت، ئەگەریش بمرێت دەچێتە دۆزەخەوە، تەوبەیش بكات تەوبەی لێ وەرناگیرێت، ئەگەر بمرێت دەچێتە دۆزەخەوە، تەوبەش بكات تەوبەی لێ وەردەگیرێت، ئەگەریش جارێكی تر بگەڕێتەوە خوای گەورە لەقوڕی خەبالی دەرخوارد دەدات لەڕۆژی دواییدا: پاشەڕۆی برینی خەڵكی دۆزەخ.**

٣٢٨٩- من مات و هو مدمن خمر لقي الله و هو كعابد وثن.

(صحيح) ( طب حل ) عن ابن عباس. (الصحيحة ٦٧٧)

**٣٢٨٩- هەر كەسێك بمرێت و بەردەوام و ئالودەی لەئارەق خواردن بێت، وەكو بتپەرست بەخوا دەگات.**

٣٢٩٠- من وضع الخمر على كفه لم تقبل له دعوة و من أدمن على شربها سقي من الخبال.

(صحيح) ( طب ) عن ابن عمر. (الضعيفة ٦٩٥٨)

**٣٢٩٠- هەر كەسێك ئارەق دابنێ[41] لەسەر لە پی دەستی نزاو پاڕانەوەی لێ وەرناگیرێت، هەر كەسێكیش ئالودە بێت بەعارەق خواردنەوە، لەقوڕی خەبالی دەرخوارد دەدرێت.**

٣٢٩١- المزر كله حرام ( أبيضه و أحمره و أسوده و أخضره ) .

(صحيح) ( طب ) عن ابن عباس. (الضعيفة ٤٦٧٥)

**٣٢٩١- نەبیز[42] هەمووی باساغە ( سپی و سور و ڕەش و سەوزی )**

٣٢٩٢- لا تشرب مسكرا فإني حرمت كل مسكر.

(صحيح) ( ن ) عن أبي موسى. (الصحيحة ٢٤٢٤)

---

[41] واتە: لەسەر لە پی دەستی دا بینێت بۆ ئەوەی بیخواتەوە یان بگێڕێت بۆ كەسانی تر.

[42] نەبیز ( جۆرێكە لەشەراب ).

**٣٢٩٢- سەرخۆشكەر مەخۆرەوە؛ چونكە هەموو سەرخۆشكەرێكم قەدەغە كردووە.**

٣٢٩٣- لا تشربوا الخمر فإنها مفتاح كل شر.

(صحيح) ( هـ ) عن أبي الدرداء. (الصحيحة ٧٢٢)

**٣٢٩٣- ئارەق مەخۆنەوە، چونكە كليلى هەموو خراپەيەكە.**

٣٢٩٤- لا يدخل الجنة مدمن خمر.

(صحيح) ( هـ ) عن أبي الدرداء. (الصحيحة ٦٧٢)

**٣٢٩٤- كەسێك ئالودەى عارەق خواردنەوە بێت ناچێتە بەهەشتەوە.**

٣٢٩٥- لا يشرب الخمر رجل من أمتي فيقبل الله منه صلاة أربعين يوما.

(صحيح) ( ن ) عن ابن عمرو. (الصحيحة ٧٠٩)

**٣٢٩٥- هيچ كەسێك نيە لەئوممەتى من ئارەق بخواتەوەو، تا چل ڕۆژ نوێژى لىَ وەرگيرێت.**

٣٢٩٦- إذا سكر أحدكم فاجلدوه ثم إن سكر فاجلدوه ثم إن سكر فاجلدوه فإن عاد الرابعة فاقتلوه.

(صحيح) ( د هـ ) عن أبي هريرة . (الصحيحة ١٣٦٠)

**٣٢٩٦- ئەگەر كەسێكتان سەرخۆش بوو شەلاقى لىَ بدەن، ئەگەر ديسان سەرخۆش بوويەوە شەلاقى لىَ بدەنەوە ئەگەر جارێكى تر سەرخۆش بوويەوە، ديسان شەلاقى لێبدەنەوە، ئەگەر بۆ چوارەم جار دووبارەى كردەوە بيكوژن.**

٣٢٩٧- إذا شربوا الخمر فاجلدوهم ثم إن شربوها فاجلدوهم ثم إن شربوها فاجلدوهم ثم إن شربوا فاقتلوهم.

(صحيح) ( حم د هـ حب ) عن معاوية . (الصحيحة ١٣٦٠)

**٣٢٩٧- ئەگەر ئارەقيان خوارد شەلاقيان لىَ بدەن، ئەگەر ديسان خوارديانەوە شەلاقيان لى بدەنەوە، ئەگەر ديسان خوارديانەوە شەلاقيان لىَ بدەنەوە، ئەگەر ديسان خوارديانەوە بيانكوژن.**

٣٢٩٨- كان يضرب في الخمر بالنعال و الجريد.

(صحيح) ( هـ ) عن أنس. (المشكاة ٣٦١٥)

**٣٢٩٨- هەر كەسێك ئارەقى بخواردايە پێغەمبەر ﷺ بەنەعل و لاسكى گەڵاى خورما لێى دەدا.**

٣٢٩٩- من شرب الخمر فاجلدوه فإن عاد الثانية فاجلدوه فإن عاد الثالثة فاجلدوه فإن عاد الرابعة فاقتلوه.

(صحيح) ( حم د ن ك ) عن ابن عمر ( د ت ك ) عن معاوية ( د هق ) عن ذؤيب ( حم د ت ك) عن أبي هريرة ( طب ك الضياء ) عن شرحبيل بن أوس ( طب قط ك الضياء ) عن جرير ( حم ك ) عن ابن عمرو وابن خزيمة ( ك ) عن جابر ( طب ) عن غضيف ( ن ك الضياء ) عن الشريد بن سويد ( ك ) عن نفر من الصحابة. (الترغيب ٢٣٨١)

**٣٢٩٩- هەر کەسێك ئارەقی خواردەوە شەلاقی لێ بدەن، ئەگەر جارێکی تر دووبارەی کردەوە دیسان شەلاقی لێبدەنەوە، ئەگەر بۆ جاری سێ یەم دووبارەی کردەوە دیسان شەلاقی لێ بدەن، ئەگەر بۆ جاری چوارەم گەڕایەوە بیکوژن.**

## بابەتی جێبەجێکردنی سزاکان

٣٣٠٠- أقيموا حدود الله تعالى في البعيد و القريب و لا تأخذكم بالله لومة لائم.

(صحيح) ( ه ) عن عبادة بن الصامت . (الصحيحة ٦٣٨)

**٣٣٠٠- سنوورەکانی خوای گەورە بەجێ بهێنن لەسەر بەهێزو بێهێز، گوێ بەلۆمەی لۆمەکارانیش مەدەن لە پێناوی خوادا.**

٣٣٠١- إنما أهلك الذين من قبلكم أنهم كانوا إذا سرق فيهم الشريف تركوه و إذا سرق فيهم الضعيف أقاموا عليه الحد.

(صحيح) ( حم ق ٤ ) عن عائشة . (الإرواء ٢٣١٩)

**٣٣٠١- بێگومان ئەوانەی پێش خۆتان لەناوچوون، لەبەر ئەوەی ئەگەر کەسێکی پایەدار دزی بکردایە وازیان لێ دەهێنا، ئەگەر کەسێکی لاواز و بێ دەسەڵاتیش دزی بکردایە سزایان لەسەر جێبەجێ دەکرد.**

٣٣٠٢- إقامة حد من حدود الله خير من مطر أربعين ليلة في بلاد الله.

(حسن) ( هـ ) عن ابن عمر . (الصحيحة ٢٣١)

**٣٣٠٢- بەجێهێنانی سزایەك لەسزاکانی خوای گەورە، باشترە لەباران بارینی چل شەو لەشارو شوێنەکاندا.**

٣٣٠٣- حد يعمل في الأرض خير لأهل الأرض من أن يمطروا أربعين صباحا.

(حسن) ( ن ه ) عن أبي هريرة . (الصحيحة ٢٣١)

**٣٣٠٣- سزايەك كە جێ بەجێ بكرێت جێ بهێنرێت لەسەر زەويدا، باشترە بۆ خەڵكى سەر زەوى لەباران بارينى چل رۆژ لەسەر يەك.**

٣٣٠٤- لا تقام الحدود في المساجد و لا يقتل الوالد بالولد.

(حسن) ( حم ت ك ) عن ابن عباس. (الإرواء ٢١٧٦)

**٣٣٠٤- نابێ سزاكان لەمزگەتەكاندا جێبەجێ بكرێن، باوكيش لەسەر كوڕى كوشتنى كوڕى خۆى ناكوژرێتەوە.**

٣٣٠٥- اجتنبوا هذه القاذورات التي نهى الله تعالى عنها فمن ألم بشيء منها فليستتر بستر الله و ليتب إلى الله فإنه من يبد لنا صفحته نقم عليه كتاب الله.

(صحيح) ( ك هق ) عن ابن عمر . (الصحيحة ٦٦٣)

**٣٣٠٥- خۆتان بەدوور بگرن لەو پيسيانە، كەخواى گەورە قەدەغەى كردوون، ئەگەر هەر كەسێكيش تووشى شتێك بوو لەو بارەوە، بابيشارێتەوەو تەوبە بكات بۆ لاى خوا، چونكە هەر كەسێك خۆى ئاشكرا بكات ئەو سزايەى لەقورئاندا هاتووە جێ بەجێى دەكەين لەسەرى.**

## بابەتى تكا كردن لەسزاكاندا

٣٣٠٦- أعرضوا عن الناس ألم تر أنك إن ابتغيت الريبة في الناس أفسدتهم أو كدت تفسدهم.

(حسن) ( طب ) عن معاوية . (غاية المرام ٤٢٤)

**٣٣٠٦- ڕووتان وەرگێڕن لە هەڵپشكنينى كەم كوڕى خەڵكى ، ئايا نابينى ئەگەر بەدواى تۆمەتبار كردنى خەڵكدا بگەڕێ ى تێكيان دەدەيت، يان لەزانەيە خراپيان بكەيت.**

٣٣٠٧- اشفعوا تؤجروا.

(صحيح) ( ابن عساكر ) عن معاوية . (الصحيحة ١٤٦٤)

**٣٣٠٧- تكا بكەن پاداشت وەردەگرن[٤٣].**

---

**[٤٣] با تكاكەت جێگەش نەگرێت بەلاَم ديارە تكاكردن لەو شتانەدا كەخوا سزاى ديارى دنيايى بۆ دانەناون، چونكە ئەوانە قەدەغەيە تكايان تێربكرێت. السراج المنير ج١ ص ٥٣٦.**

٣٣٠٨- اشفعوا تؤجروا و يقضي الله على لسان نبيه ما شاء.

(صحيح) ( ق ٣ ) عن أبي موسى. (الصحيحة ١٤٤٦)

**٣٣٠٨- تكا بكەن پاداشت دەدرێنەوە، خوای گەورەش لەسەر زمانی پێغەمبەری هەر چی بیەوێت بڕیاری پێ دەدات و ئاشكرای دەكات.**

٣٣٠٩- أقيلوا ذوي الهيئات عثراتهم إلا الحدود.

(صحيح) ( حم خد د ) عن عائشة . (الصحيحة ٦٣٨)

**٣٣٠٩- چاو پۆشيتان هەبێت بەرامبەر هەڵە و گوناهی پياو چاكان، لە سزا خواييەكاندا نەبێت.**

٣٣١٠- تجافوا عن عقوبة ذوي المروءة.

(صحيح) ( أبو بكر بن المزربان في كتاب المروءة طب في مكارم الأخلاق ) عن ابن عمر . (الصحيحة ٦٣٨)

**٣٣١٠- دوره پەرێزی بكەن لەسزادانی خاوەن كەسايەتی و چاكەكاران.**

٣٣١١- تعافوا الحدود فيما بينكم فما بلغني من حد فقد وجب.

(حسن) ( د ن ك ) عن ابن عمرو . (الصحيحة ١٦٣٨)

**٣٣١١- لەنێوان خۆتاندا چاوپۆشی بكەن لەسزاكان، چونكە هەر سنورێكی شەرعی بگاتە من جێ بەجێ دەكرێت.**

٣٣١٢- من حالت شفاعته دون حد من حدود الله فقد ضاد الله في أمره و من مات و عليه دين فليس بالدينار و الدرهم و لكن بالحسنات و السيئات و من خاصم في باطل و هو يعلمه لم يزل في سخط الله حتى ينزع و من قال في مؤمن ما ليس فيه أسكنه الله ردغة الخبال حتى يخرج مما قال و ليس بخارج.

(صحيح) ( د طب ك هق ) عن ابن عمر. (الصحيحة ٤٣٨)

**٣٣١٢- هەر كەسێك تكا كردنی بووە مايەی جێبەجێ نە كردنی سزايەك لەسزا شەرعييەكان ئەوە دژايەتی فەرمانی خوای كردووە، هەر كەسێكيش بمرێت و قەرزار بێت ئەوە بەدينار و درهەم نابێت، بەڵكو بەچاكە و خراپە دەبێت، هەر كەسێكيش ململانێ بكات لەشتێكی ناهەقدا خۆيشی بزانێت ناهەقە، ئەو لەبەر خەشم و قينی خوا دايە هەتا واز دێنێت، هەر كەسيش قسەيەك بەناهەق بەئيماندارێك بڵێت**

**خوای گەورە لەقوڕی خەبالدا نیشتەجیّ دەكات تاكو واز دیّنیّت لەو قسەو تازە نایشتوانیّت وازی لیّ بیّنیّت.**

٣٣١٣- من ستر أخاه المسلم في الدنيا ستره الله يوم القيامة.

(صحيح) ( حم ) عن رجل. (الصحيحة ٢٣٤١)

**٣٣١٣- هەر كەسیّك كەموكوڕی برایەكی موسوڵمانی داپۆشیّ لەدونیادا، خوای گەورە لەقیامەتدا كەموكوڕی دایدەپۆشیّت.**

٣٣١٤- من ستر على مؤمن عورة فكأنما أحيا ميتا.

(صحيح) ( طب الضياء ) عن شهاب. (الترغيب ٢٣٣٧)

**٣٣١٤- هەر كەسیّك هەڵە و خراپەی بڕوادارێك داپۆشیّ وەكو مردوێكی زیندوو كردبیّتەوە وایە.**

٣٣١٥- من رأى عورة فسترها كان كمن أحيا موءودة من قبرها.

(حسن) ( خد د ك ) عن عقبة بن عامر. (الترغيب ٢٣٣٧)

**٣٣١٥- هەركەسیّك خراپەیەك ببینیّ و دایپۆشیّ وەكو ئەوەیە زیندە بەچاڵیّكی زیندوو كردبیّتەوە.**

٣٣١٦- من ستر عورة أخيه المسلم ستر الله عورته يوم القيامة و من كشف عورة أخيه المسلم كشف الله عورته حتى يفضحه بها في بيته .

(حسن) ( هـ ) عن ابن عباس. (الصحيحة ٢٣٤١)

**٣٣١٦- هەر كەسیّك عەیبەو هەڵەی براكەی داپۆشی خوای گەورە عەیبە و هەڵەی دادەپۆشیّ لەڕۆژی قیامەتدا، هەر كەسیّكیش عەیب و عاری برایەكی موسوڵمان ئاشكرا بكات خوای گەورە لەناو ماڵەكەی خۆیدا ئابڕووی دەبات.**

٣٣١٧- هلا تركتموه لعله أن يتوب فيتوب الله عليه ؟ - يعني ماعزا -.

(صحيح) ( د ك ) عن نعيم بن هذال. (المشكاة ٣٥٦٥)

**٣٣١٧- ئەریّ بۆ وازتان لیّ نەهیّنا بەڵكو تەوبەی بكردایەو خوای گەورەیش لیّی وەربگرتایە؟ - واتە: ماعیز[٤]- .**

٣٣١٨- لا تكونوا عون الشيطان على أخيكم.

(صحيح) ( خ ) عن أبي هريرة. (المشكاة ٣٦٢١)

**٣٣١٨- مەبنە پشتیوانی شەیتان لەدژی براكەتان.**

---

**[٤] كاتیّك ماعیز ڕەزای خوای لیّ بیّت دانی نا بەتاوانی زیناكەیدا.**

٣٣١٩- لا يستر عبد عبدا في الدنيا إلا ستره الله يوم القيامة.

(صحيح) ( م ) عن أبي هريرة. (الصحيحة ٢٣٤١)

**٣٣١٩- هیچ بەندەیەك نیە بەندەیەكدا پۆشێت لەدونیا، كە خوای گەورە لەرۆژی قیامەتدا دای نە پۆشێت.**

٣٣٢٠- يا أسامة ! أتشفع في حد من حدود الله ؟ !.

(صحيح) ( ق د ) عن عائشة. (الإرواء ٢٣١٩)

**٣٣٢٠- ئەی ئوسامە! ئایا تكا دەكەیت بۆ جێ بەجێ نەكردنی سنورێك لەسنورە شەرعییەكانی خوا؟!**

٣٣٢١- يا هذال ! لو سترته بثوبك كان خيرا لك.

(صحيح) ( حم د ك ) عن نعيم بن هذال. (الإرواء ٢٣٨٠)

**٣٣٢١- ئەی (هذال)[٤٥]! ئەگەر بە پۆشاكەكەت داتپۆشایە چاكتر بوو تۆ.**

## بابەتی سەرزەنشت و تەمێ كردن

٣٣٢٢- لا تعزروا فوق عشرة أسواط.

(صحيح) ( ه ) عن أبي هريرة. (صحيح أبن ماجه ٢٦٠٢)

**٣٣٢٢- بۆ تەمێ كردن دە قامچی زیاتر مەوەشێنن.**

٣٣٢٣- لا عقوبة فوق عشر ضربات إلا في حد من حدود الله.

(صحيح) ( خ ) عن رجل.

**٣٣٢٣- هیچ یەك سزا نییە لەسەرووی دە قامچی یەوە، مەگەر لەسا خواییەكاندا.**

٣٣٢٤- لا يجلد فوق عشرة أسواط إلا في حد من حدود الله.

(صحيح) ( حم ق ٤ ) عن أبي بردة بن نيار. (الإرواء ٢٤٦٤)

**٣٣٢٤- نابێت كەس لە دە قامچی زیاتر بوەشێنرێت مەگەر لەسزایەكی شەرعیەكاندا.**

---

[٤٥] (هذال) ئەو كەسە بوو كەماعیز وتی زینام كردوە (هذال) پێ ی ووت برۆ بۆ لای پێغەمبەر و دان بەتاوانەكەتدا بنێ.

# بابەتى: سزاكان گوناه دەسڕنەوە

٣٣٢٥- أيما عبد أصاب شيئا مما نهى الله عنه ثم أقيم عليه حده كفر الله ذلك الذنب.

(صحيح) ( ك ) عن خزيمة بن ثابت . (الصحيحة ١٧٥٥)

**٣٣٢٥- هەر بەندەيەك هەندێك لەقەدەغە كراوەكانى خواى بەزاندو سزاى شەرعى لەسەر جێبەجێكرا خواى گەورە ئەو تاوانەى لێ دەسڕێتەوە.**

٣٣٢٦- ما أدري أتبع أنبيا كان أم لا ؟ و ما أدري ذا القرنين أنبيا كان أم لا ؟ و ما أدري الحدود كفارات لأهلها أم لا ؟.

(صحيح) ( ك هق ) عن أبي هريرة. (الصحيحة ٢٢١٧)

**٣٣٢٦- نازانم توببەع پێغەمبەر بوو يان نا؟ نازانم** (ذو القرنين) **پێغەمبەر بوو يان نا؟ نازانم سزا خواييەكان دەبنە لابەرى تاوانەكان بۆ ئەوە كەسانە يان نا؟**

٣٣٢٧- من أصاب ذنبا فأقيم عليه حد ذلك الذنب فهو كفارته.

(صحيح) ( حم الضياء ) عن خزيمة بن ثابت. (الصحيحة ٢٣١٧)

**٣٣٢٧- هەركێ تووشى تاوانێك بوو، سزاكەى لەسەر جێ بەجێ كرا دەبێتە لابەرى ئەو تاوانە.**

٣٣٢٨- تعالوا بايعوني على أن لا تشركوا بالله شيئا و لا تسرقوا و لا تزنوا و لا تقتلوا أولادكم و لا تأتوا ببهتان تفترونه بين أيديكم و أرجلكم و لا تعصوني في معروف فمن وفى منكم فأجره على الله و من أصاب من ذلك شيئا فعوقب به في الدنيا فهو له كفارة و من أصاب من ذلك شيئا فستره الله فأمره إلى الله إن شاء عاقبه و أن شاء عفا عنه.

(صحيح) ( خ ) عن عبادة بن الصامت . (الصحيحة ٢٩٩٩)

**٣٣٢٨- وەرن بەيعەتم پێ بدەن لەسەر ئەوەى هاوبەش بۆ خوا دانەنێن و دزى نەكەن و، داوێن پيسى نەكەن و، منداڵەكانى خۆتان نەكوژن و بوختان نەكەن و، لەكارى چاكەدا لەقسەى دەرنەچن، هەر كەسێك بەئەمەك بوو بەرامبەر ئەم شتانە پاداشتى لەلاى خوايە، هەركەسێكيش تووشى شتێك بوو لەو تاوانانە لەدونيادا و سزاكەى وەرگرت، دەبێتە هۆى سڕينەوەى ئەو تاوانە، هەر كەسيش تووشى شتێك لەو تاوانانە بوو و خواى گەورەيش دايپۆشى، فەرمانى لەلاى خوايە، بيەوێت سزاى دەدات و بيەوێت لێى خۆش دەبێت.**

٣٣٢٩- مهلا يا خالد ! لا تسبها فوالذي نفسي بيده لقد تابت توبة لو تابها صاحب مكس لغفر له.

(حسن) ( حم م د ن ) عن بريدة. (الإرواء ٢٢٢٦)

**٣٣٢٩- لەسەرخۆبە ئەی خالید، جنێوی پێ مەدە، سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە، گەڕانەوەیەك گەڕاوەتەوە لای خوا، ئەگەر باج گرێكی ناڕەوا ئاوا بگەڕایەتەوە خوای گەورە لێی خۆش دەبوو.**

٣٣٣٠- الرجم كفارة ما صنعت.

(صحيح) ( ن الضياء ) عن الشريد بن سويد. (الصحيحة ١٧٥٥)

**٣٣٣٠- بەردە باران كردن سڕینەوەیە بۆ ئەو تاوانەیە كە كردت.**

# پەڕاوی جـیـهـاد

## بـابـەتـی فـەزڵـی جیهـاد

٣٣٣١- إن الشيطان قعد لابن آدم بأطرقه فقعد له بطريق الإسلام فقال: تسلم و تذر دينك و دين آبائك و آباء آبائك ؟ فعصاه فأسلم ثم قعد له بطريق الهجرة فقال: تهاجر و تدع أرضك و سماءك و إنما مثل المهاجر كمثل الفرس في الطول ! فعصاه فهاجر ثم قعد له بطريق الجهاد فقال: تجاهد فهو جهد النفس و المال فتقاتل فتقتل فتنكح المرأة و يقسم المال ؟ فعصاه فجاهد فمن فعل ذلك كان حقا على الله أن يدخله الجنة و من قتل كان حقا على الله أن يدخله الجنة و إن غرق كان حقا على الله أن يدخله الجنة و إن وقصته دابته كان حقا على الله أن يدخله الجنة.

(صحيح) ( حم ن حب ) عن سبرة بن أبي فاكه . (الترغيب ١٢٩٩)

**٣٣٣١- شەیتان لەسەر ڕێگەكانی ئادەمیزاد دانیشت، لەڕێگای ئیسلام بۆی دانیشت و ، وتی: موسوڵمان دەبیت و ئایینی باوو باپیرانت بەجێدەهێڵی؟ بەڵام بەقسەی نەكردو موسڵمان بوو، ئینجا لەسەر ڕێگای كوچكردن بۆی دانیشت و ووتی: كۆچ دەكەیت و زەوی و ئاسمانت بەجێ دەهێڵی، نموونەی كوچكاریش وەكو نموونەی ئەسپێكی بەستراوە، بەڵام بەگوێی نەكرد و كۆچی كرد، ئینجا لەڕێگای جیهاد بۆی دانیشت و، وتی: جیهاد دەكەیت و خۆت و ماڵت لەناو دەبەیت، شەڕ دەكەی و دەكوژرێیت، خێزانەكەت شودەكاتەوە و ماڵەكەت دابەشدەكرێت؟ بەڵام بەقسەی نەكردو جیهادی كرد، هەر كەسێك وایكرد بەدڵنیاییەوە خوا دەیخاتە بەهەشتەوە.**

٣٣٣٢- أفضل العمل الصلاة لوقتها و الجهاد في سبيل الله.

(صحيح) ( هب ) عن ابن مسعود . (الصحيحة ١٤٨٩)

**٣٣٣٢- چاكترين كردار نوێژ كردنه لەكاتی خۆیدا و، جیهاد كردنه لە پێناو خوا.**

٣٣٣٣- أفضل الناس مؤمن يجاهد في سبيل الله بنفسه و ماله ثم مؤمن في شعب من الشعاب يتقي الله و يدع الناس من شره.

(صحيح) ( حم ق ت ن ه ) عن أبي سعيد . (الصحيحة ١٥٣١)

**٣٣٣٣- چاكترين خەڵكی ئیمانداریكه جیهاد بكات لە پێناو خوادا بەخۆی و ماڵیەوە، دوای ئەویش ئیمانداریكه لەرێچكەیەكی نێو شاخەكاندا لەخوا بترسێت و خرا پەی خۆی لەخەڵكی دوور بخاتەوە.**

٣٣٣٤- انتدب الله لمن خرج في سبيله لا يخرجه إلا إيمان بي و تصديق برسلي أن أرجعه بما نال من أجر أو غنيمة أو أدخله الجنة و لو لا أن أشق على أمتي ما قعدت خلف سرية و لوددت أني أقتل في سبيل الله ثم أحيا ثم أقتل ثم أحيا ثم أقتل ثم أحيا.

(صحيح) ( حم ق ن ) عن أبي هريرة . (الصحيحة ٣٤٩٨)

**٣٣٣٤- خوای گەورە چاودێری كەسێك دەكات لە پێناویدا دەرچوبێت، تەنها پاڵنەری باوەڕ بەخواو بەڕاست دانانی پێغەمبەرەكانی بو بێت كە بەسەلامەتی و پاداشت و دەستكەوتەوە بگەڕێتەوە یان بیخاتە بەهەشتەوە، ئەگەر ترسی ئەوەشم نەبوایە دەردەسەری تووشی ئوممەتەكەم ببێت لەپشت پۆلێكی سەربازییەوە دانەدەنیشتم، ئاواتیش دەخوازم بكوژرێم لە پێناوی خوادا و، زیندوو بكرێمەوەو، بكوژرێم و، زیندوو بكرێمەوەو، بكوژرێم و زیندوو بكرێمەوە.**

٣٣٣٥- إن أبواب الجنة تحت ظلال السيوف.

(صحيح) ( حم م ت ) عن أبي موسى . (الإرواء ١١٧٠)

**٣٣٣٥- دەرگاكانی بەهەشت لەژێر سایەی شمشێردان.**

٣٣٣٦- إن سياحة أمتي الجهاد في سبيل الله.

(صحيح) ( د ك هب ) عن أبي أمامة . (المشكاة ٧٢٤)

**٣٣٣٦- گەشت و گوزاری ئوممەتی من جیهادە لە پێناوی خوادا.**

٣٣٣٧- إن قُتِلتَ في سبيل الله صابرا محتسبا مقبلا غير مدبر كفر الله عنك خطاياك إلا الدين كذلك قال لي جبريل آنفا.

(صحيح) ( حم م ت ن ) عن أبي قتادة ( ن ) عن أبي هريرة . (الإرواء ١١٩٧)

**٣٣٣٧- ئەگەر بکوژرێت لە پێناو خوادا و خۆگرو بیت و چاوەڕوانی پاداشت بیت، هەڵمەت ببەیت و پشت هەڵنەکەیت، خوای گەورە هەموو گوناهەکانت دەسڕێتەوە قەرزاری نەبێت، جیبریل کەمێك پێش ئێستا وای پێ وتم.**

٣٣٣٨- تعس عبد الدينار و عبد الدرهم و عبد الخميصة إن أعطي رضي و إن لم يعط سخط تعس و انتكس و إذا شيك فلا انتقش طوبى لعبد آخذ بعنان فرسه في سبيل الله أشعث رأسه مغبرة قدماه إن كان في الحراسة كان في الحراسة و إن كان في الساقة كان في الساقة إن استأذن لم يؤذن له و إن شفع لم يشفع.

(صحيح) ( خ ه ) عن أبي هريرة . (المشكاة ٥١٦١)

**٣٣٣٨- بەدبەخت بێت بەندەی ئاڵتون و بەندەی زیو و بەندەی جل و بەرگ، ئەگەر پێی ببەخشرێ ڕازیەو پێی نەبەخشرێت، دڕدۆنگە بەدبەخت بێت و جارێکی تر بگلێت، ئەگەریش دڕکێك بچەقێتە پێی کەس بۆی دەرناهێنێت، خۆشبەختی بۆ بەندەیەك هەوساری ئەسپەکەی بگرێت لە پێناو خوادا بەقژبژێ و پێ ی خۆڵاوی یان لە پاسەوانێتی ئەگەر پاسەوانی پێ بکەن یان لەکوتایی سەربازەکانەوەیە[1]، ئەگەر داوای مۆڵەت بکات مۆڵەتی پێنادرێت، ئەگەر تکاش بکات تکاکەی وەرناگیردێت.**

٣٣٣٩- أيما مسلم رمى بسهم في سبيل الله فبلغ مخطئا أو مصيبا فله من الأجر كرقبة أعتقها من ولد إسماعيل و أيما رجل شاب في سبيل الله فهو له نور و أيما رجل أعتق رجلا مسلما فكل عضو من المعتق بعضو من المعتق فداء له من النار و أيما رجل قام و هو يريد الصلاة فأفضى الوضوء إلى أماكنه سلم من كل ذنب و خطيئة هي له فإن قام إلى الصلاة رفعه الله تعالى بها درجة و إن رقد رقد سالما.

(صحيح) ( طب ) عن عمرو بن عبسة . (الصحيحة ١٧٥٦)

**٣٣٣٩- هەر موسوڵمانێك تیرێك لە پێناوی خوادا بهاوێژێ ئیتر بیپێکێ یان نەیپێکێ پاداشتی دەست دەکەوێت وەکو ئەوەی کۆیلەیەکی لەنەوەی ئیسماعیل ئازاد کرد بێت وە هەر کەسێك موو کرد بێت لە پێناوی خوادا دەبێتە ڕووناکی بۆی، هەر پیاوێکیش پیاوێکی موسوڵمان ئازاد بکات،هەموو ئەندامێکی کەسە ئازاد کراوەکە بۆی دەبنە**

---

[1] مەبەست ئەوەیە تەنها و تەنها لەبەر خوا و ڕەزامەندی خوا ئەو کارە دەکات ئیتر پاسەوانی و نیگایاتی پێ بکەن بەبێدەنگ و پرتەو بۆڵە دەیکات، لەڕۆیشتنیشدا لەدوای دواوەش بڕوا دڵگران نابێت و گلەیی ناکات.

**قوربانی لەئاگر، هەر کەسێکیش هەڵسێت بۆ شەو نوێژ و بەباشی دەست نوێژ بگرێت ڕزگاری دەبێت لەهەموو هەڵەو گوناهێك کردبێتی، ئەگەر دەستی کرد بەنوێژ کردن خوای گەورە پلەیەك بەرزی دەکاتەوە، ئەگەر بشخەوێت بەسەلامەتی دەخەوێت.**

٣٣٤٠- تكفل الله لمن جاهد في سبيله لا يخرجه من بيته إلا الجهاد في سبيله و تصديق كلماته بأن يدخله الجنة أو يرجعه إلى مسكنه الذي خرج منه مع ما نال من أجر أو غنيمة.

(صحيح) ( ق ن ) عن أبي هريرة . (الترغيب ١٢٦٦)

**٣٣٤٠- خوای گەورە مسۆگەرتی کردووە بۆ کەسێك جیهاد بکات لەپێناویدا تەنها لەپێناوەشدا و وتەکانی لە پێناو بەڕاست دانانی خوای گەورە دەرچوو بێت لەماڵی خۆی، کەبیکاتە بەهەشتەوە، یان بەسەلامەتی بیگێڕێتەوە بۆ ماڵی خۆی کە لێیەوە دەرچوو بە پاداشت و دەستکەوتەوە.**

٣٣٤١- ثلاثة يحبهم الله و ثلاثة يشنؤهم الله: الرجل يلقى العدو في فئة فينصب لهم نحره حتى يقتل أو يفتح لأصحابه و القوم يسافرون فيطول سراهم حتى يحبوا أن يمسوا الأرض فينزلون فيتنحى أحدهم فيصلي حتى يوقظهم لرحيلهم و الرجل يكون له الجار يؤذيه جاره فيصبر على أذاه حتى يفرق بينهما موت أو ظعن و الذين يشنؤهم الله: التاجر الحلاف و الفقير المختال " و البخيل المنان.

(صحيح) ( حم ) عن أبي ذر . (المشكاة ١٩٢٢)

**٣٣٤١- سێ کەس هەن خوا خۆشیانی دەوێت و سێ کەسیش هەن خوا ڕقی لێیانە. کەسێك ڕووبەڕووی دوژمن ببێتەوە لەناو کۆمەڵێکدا گەردەنی خۆی بخاتە مەترسیەوە تاکو دەکوژرێن یان هاوەڵەکانی ڕزگار دەکات، کەسانێکیش لەگەشتێکدا بن و شەوێکی درێژ بەڕێوەبن و حەز بکەن پشوویەك بدەن و دابەزن، جا یەکێکیان خۆی کەناربگرێت و بۆ نوێژ کردن هەتا هاوڕێکانی لەخەو هەڵدەستێنێ نەخەوێت، کەسێکیش دراوسێیەکی هەبێت ئازاری بدات، ئەویش ئارامی لەسەر بگرێت تاکو مردن یان دوورکەوتنەوە جیایان دەکاتەوە. ئەوانەش کەخوا ڕقی لێیانە: بازرگانی سوێند ئاژۆ، هەژاری لەخۆبایی و، ڕەزیلی منەتکار.**

٣٣٤٢- الجنة تحت ظلال السيوف.

(صحيح) ( ك ) عن أبي موسى . (الإرواء ١١٧٠)

**٣٣٤٢- بەهەشت لەژێر سایەی شمشێرەدایە .**

٣٣٤٣- حرم على عينين أن تنالهما النار: عين بكت من خشية الله و عين باتت تحرس الإسلام و أهله من أهل الكفر.

(حسن) ( ك هب ) عن أبي هريرة . (الترغيب ١٢٣٣)

**٣٣٤٣- قەدەغە کراوە لەسەر ئاگر دوو چاو بسوتێنێ. چاوێك لە پێناوی خوادا گریا بێت وە چاوێك پاسەوانێتی ئیسلام وموسوڵمانانی کرد بێت بۆ پاراشتنیان لە بێ باوەڕان.**

٣٣٤٤- خمس من فعل واحدة منهن كان ضامنا على الله: من عاد مريضا أو خرج غازيا أو دخل على إمامه يريد تعزيره و توقيره أو قعد في بيته فسلم الناس منه و سلم من الناس.

(صحيح) ( حم طب ) عن معاذ . (الترغيب ١٢٦٨)

**٣٣٤٤- پێنج شت هەن هەرکەسێك یەکێکیان ئەنجام بدات خوای گەورە پاراستی لەخۆدەگرێت: کەسێك سەردانی نەخۆشێك بکات،یان بچێت بۆ جیهاد، یان بچێتەلای پێشەواکەی بۆ ئەوەی مەزنی و سەروەری ڕاییگرێت و ڕێزی بگرێت،یان لەماڵی خۆی دانیشێ، خەڵکی لێی سەلامەت بن و ئەویش لەخەڵکی سەلامەت بێت.**

٣٣٤٥- رباط شهر خير من صيام دهر و من مات مرابطا في سبيل الله أمن من الفزع الأكبر و غدي عليه برزقه و ريح من الجنة و يجرى عليه أجر المرابط حتى يبعثه الله.

(صحيح) ( طب ) عن أبي الدرداء. (الترغيب ١٢١٩)

**٣٣٤٥- پاسەوانێتی مانگێك چاکترە لەڕۆژوو گرتنی ساڵێك، هەر کەسێکیش بمرێت لەکاتی پاسەوانێتی لە پێناو خوادا لە ترس و بیمی گەورە دڵنیا دەبێت، بەیانیانیش ڕۆزی خۆی و شنە بای بەهەشتی پێدەکات، بەردەم پاداشتی پاسەوانێتیشی بۆ دەژمێردرێت تاکو ڕۆژی قیامەت.**

٣٣٤٦- رباط يوم خير من صيام شهر و قيامه.

(صحيح) ( حم ) عن ابن عمرو. (الصحيحة ١٨٦٦)

**٣٣٤٦- پاسەوانێتی ڕۆژێك لە پێناوی خوادا چاکترە لەڕۆژوو شەونوێژی مانگێك.**

٣٣٤٧- رباط يوم في سبيل الله أفضل من صيام شهر و قيامه و من مات فيه وقي فتنة القبر و نما له عمله إلى يوم القيامة.

(صحيح) ( ت ) عن سلمان. (الإرواء ١١٨٦)

**٣٣٤٧- پاسەوانێتی ڕۆژێك لە پێناوی خوادا چاکترە لە ڕۆژوو شەونوێژی مانگێك، هەر کەسیش لەو حاڵەدا بمرێت لەسزای ناو گۆڕ پارێزراو دەبێت، کردەوەکانیشی هەر گەشە دەکەن تا ڕۆژی قیامەت.**

٣٣٤٨- رباط يوم في سبيل الله خير من الدنيا و ما عليها و موضع سوط أحدكم من الجنة خير من الدنيا و ما عليها و الروحة يروحها العبد في سبيل الله أو الغدوة خير من الدنيا و ما عليها.

(صحيح) ( حم خ ت ) عن سهل بن سعد. (الترغيب ١٢١٦)

**٣٣٤٨- پاسەوانێتی ڕۆژێك لە پێناوی خوادا چاکترە لەدونیا و ئەوەی لەدونیادایە جێگای قامچی کەسێکتان لەبەهەشتدا چاکترە لەهەموو دونیا، ڕۆشتنێك یان هاتنەوەیەك لە پێناو خوادا چاکترە لەدونیاو لەوەی لەدونیادایە.**

٣٣٤٩- رباط يوم في سبيل الله خير من ألف يوم فيما سواه من المنازل.

(حسن) ( ت ن ك ) عن عثمان. (الصحيحة ٢٨٥٧)

**٣٣٤٩- پاسەوانی و سەنگەر گرتنی ڕۆژێك لە پێناوی خوادا خێری زیاترە لە هەزار ڕۆژ لە پلەو پایەکانی تر.**

٣٣٥٠- رباط يوم و ليلة خير من صيام شهر و قيامه و إن مات مرابطا جرى عليه عمله الذي كان يعمله و أجري عليه رزقه و أمن من الفتان.

(صحيح) ( م ) عن سلمان. (الإرواء ١١٨٦)

**٣٣٥٠- پاسەوانێتی شەوو ڕۆژێك لە پێناوی خوادا چاکترە لە ڕۆژوو شەونوێژی مانگێك، ئەگەر لەحاڵی پاسەوانێتی بمرێت، کردەوەکانی هەر بەردەوام دەبێت و ڕۆزی خۆشی هەر پێ دەگات، لەگرفتاری گۆڕیش ڕزگاری دەبێت.**

٣٣٥١- من رابط يوما و ليلة في سبيل الله كان له كأجر صيام شهر و قيامه و من مات مرابطا جرى له مثل ذلك من الأجر و أجري عليه الرزق و أمن الفتان.

(صحيح) ( ن ك ) عن سلمان. (الترغيب ١٢٢٤)

**٣٣٥١- هەرکەس شەوو ڕۆژێك پاسەوانی لە پێناو خوادا بکات، وەکو پاداشتی ڕۆژوو شەونوێژی مانگێکە، هەر کەسیش لەکاتی پاسەوانێتیدا بمرێت، هەمان پاداشتی بۆ دەچێت و ڕۆزی خۆی پێ دەگات و دڵنیا دەبێت لەگرفتاری ناوگۆڕ.**

٣٣٥٢- الروحة و الغدوة في سبيل الله أفضل من الدنيا و ما فيها.

(صحيح) ( ق ن ) عن سهل بن سعد. (صحيح النسائي ٣١١٨)

**٣٣٥٢- ڕۆشتن و هاتن لە پێناو خوادا چاکترە لەدونیا و ئەوەی لەدنیادایە.**

٣٣٥٣- عجب ربنا من رجل غزا في سبيل الله فانهزم أصحابه فعلم ما عليه فرجع حتى أهريق دمه فيقول الله عز و جل لملائكته: انظروا إلى عبدي رجع رغبة فيما عندي و شفقة مما عندي حتى أهريق دمه .

(حسن) ( د ) عن ابن مسعود. (السنة ٥٦٩)

**٣٣٥٣- پەروەردگارمان سەیری دێت لە پیاوێك هاوەڵەکانی هەڵهاتوون و ئەویش ئەرکی خۆی زانیوە تاکو خۆی بەکوشت دەدات، خوای گەورەیش بەفریشتەکانی دەفەرمووێت: تەماشای بەندەکەم بکەن گەڕایەوە لەخۆشی ئەوەی کە لەلای منە و لەترسی ئەوەی کەلەلای منە تاکو خوێنی ڕژا.**

٣٣٥٤- عليكم بالجهاد في سبيل الله فإنه باب من أبواب الجنة يذهب الله به الهم و الغم .

(صحيح) ( طس ) عن أبي أمامة. (الصحيحة ١٩٤١)

**٣٣٥٤- لەسەرتانە جیهاد بکەن لەپێناو خوادا، چونکە دەرگایەکە لەدەرگاکانی بەهەشت خوای گەورە خەم و پەژارەی پێ دەڕەوێنێتەوە.**

٣٣٥٥- عمل هذا قليلا و أجر كثيرا .

(صحيح) ( ق ) عن البراء. (الصحيحة ٢٩٣٢)

**٣٣٥٥- ئەوە کردەوەیەکی کەمی کرد و، پاداشتێکی زۆری وەرگرت[1].**

٣٣٥٦- عينان لا تريان النار: عين بكت وجلا من خشية الله و عين باتت تكلأ في سبيل الله .

(صحيح) ( طس ) عن أنس. (المشكاة ٣٨٢٩)

**٣٣٥٦- دوو چاو دۆزەخ نابینن: چاوێك بەتەریقی گریابێت لە پێناو خوادا و، چاوێکیش پاسەوانی کرد بێت لە پێناو خوادا.**

---

[1] **لەجەنگی ئوحد: پیاوێکی بێ باوەڕ هاتە خزمەتی پێغەمبەر وتی ئەی پێغەمبەر وتی ئەی پێغەمبەری خوا بجەنگم یان موسڵمان بم؟ فەرمووی: مسوڵمان بە ئینجا بجەنگە، ئەویش بەگوێ ی کردو دەستی کرد بەجەنگ هەتا شەهید بوو ناوی ((أصيرم)) بوو.**

٣٣٥٧- عينان لا تصيبهما النار: عين بكت من خشية الله و عين باتت تحرس في سبيل الله .

(صحيح) ( ت ) عن ابن عباس. (المشكاة ٣٨٢٩)

**٣٣٥٧- دوو چاو ئاگریان بە ناکەوێت: چاوێك لەترسی خوای گەورە گریا بێت، چاوێكیش بەدرێژایی شەو پاسەوانێتی کرد بێت لە پێناو خوادا.**

٣٣٥٨- عينان لا تمسهما النار أبدا: عين بكت من خشية الله و عين باتت تحرس في سبيل الله.

(صحيح) ( ع الضياء ) عن أنس. (المشكاة ٣٨٢٩)

**٣٣٥٨- دوو چاو هەرگیز ئاگریان بەرناکەوێت: چاوێك لەترسی خوا گریا بێت و چاوێكیش بەدرێژایی شەو لە پێناوی خوادا پاسەوان بو بێت.**

٣٣٥٩- ثلاثة لا ترى أعينهم النار يوم القيامة: عين بكت من خشية الله و عين حرست في سبيل الله و عين غضت عن محارم الله.

(صحيح) ( طب ) عن معاوية بن حيدة. (الصحيحة ٢٦٧٣)

**٣٣٥٩- سێ کەس لەڕۆژی قیامەتدا چاویان ئاگر نابینێت: چاوێك لە پێناوی خوادا گریا بێت و چاوێك لەپێناو خوادا چاسەوانی کردبێت و چاوێك خۆی پاراست بێت لەقەدەغەکراوەکانی خوا.**

٣٣٦٠- غدوة في سبيل الله أو روحة خير مما طلعت عليه الشمس و غربت .

(صحيح) (حم م ن) عن أبي أيوب. (صحيح الترمذي ١٦٤٩)

**٣٣٦٠- ڕۆیشتن یان هاتنەوەیەك لە پێناوی خوادا باشترە لەوەی خۆری بەسەردا هەڵدێت و ئاوا بێت.**

٣٣٦١- غدوة في سبيل الله أو روحة خير من الدنيا و ما فيها .

(صحيح)عن أنس ( ق ت ن ) عن سهل بن سعد ( م ه ) عن أبي هريرة ( ت ) عن ابن عباس. (الترغيب ١٢٦٢)

**٣٣٦١- ڕۆیشتنێك یان هاتنەوەیەك لە پێناوی خوادا چاکترە لەدونیا و هەرچی تێیدایە.**

٣٣٦٢- غزوة في البحر خير من عشر غزوات في البر و من أجاز البحر فكأنما أجاز الأودية كلها و المائد فيه كالمتشحط في دمه.

(صحيح) (ك) عن ابن عمرو. (فقه السيرة ٢٢٦)

**٣٣٦٢- جەنگێك لەدەریادا خێری زیاترە لە دە غەزای وشکایی ئەوەی دەریا دەبڕێت وەکو ئەو کەسەیە کەتەواوتی شیو و دوڵەکان دەبڕێت، ئەو کەسەش بی دەریا سەر بادەدا وەکو ئەو کەسەیە خلتانی خوێنی خۆی بوبێت.**

٣٣٦٣- غشيتكم الفتن كقطع الليل المظلم أنجى الناس فيها رجل صاحب شاهقة يأكل من رسل غنمه أو رجل آخذ بعنان فرسه من وراء الدروب يأكل من سيفه .

(صحيح) (ك) عن أبي هريرة. (الصحيحة ١٩٨٨)

**٣٣٦٣- بەڵاو گرفتاری وەکو تاریکە شەو داتان دەگرێت خەڵکی ڕزگاریان دەبێت پیاوێك لەسەر چیایێکی بەرز لەمەڕو بزنە خرسەکانی دەخوات، یان پیاوێك لغاوی ئەسپەکەی دەگرێت کوچەو کۆڵان دەگەڕێت و لەبەرهەمی شمشێرەکەی دەخوات.**

٣٣٦٤- كل عمل منقطع عن صاحبه إذا مات إلا المرابط في سبيل الله فإنه ينمى له عمله و يجرى عليه رزقه إلى يوم القيامة.

(صحيح) ( طب حل ) عن العرباض. (الترغيب ١٢٢٠)

**٣٣٦٤- هەموو کردەوەیەك لەخاوەنەکەی دادەنرێت بێجگە لە پاسەوان لە پێناوی خوادا ئەو کردەوەکەی هەر گەشە دەکات و ڕۆزیەکەشی تا ڕۆژی قیامەت هەر بۆی دەچێت.**

٣٣٦٥- كل ميت يختم على عمله إلا الذي مات مرابطا في سبيل الله فإنه ينمو له عمله إلى يوم القيامة و يؤمن من فتان القبر.

(صحيح) ( د ت ك ) عن فضالة بن عبيد ( حم ) عن عقبة بن عامر. (المشكاة ٣٨٢٣)

**٣٣٦٥- هەموو مردوێك کردەوەکانی مۆر دەکرێت و کرتاییاتن پێ دێت جگە لە پاسەوانی ڕێگەی خوا نەبێت بەڕاستی ئەو کردەوەکانی هەتا ڕۆژی قیامەت هەر گەشە دەکەن و لەگلارفتاری گۆڕیش دڵنیا دەبێت.**

٣٣٦٦- لغدوة أو روحة في سبيل الله خير مما تطلع عليه الشمس و تغرب و لقاب قوس في الجنة خير مما تطلع عليه الشمس و تغرب.

(صحيح) ( خ ) عن أبي هريرة. (الترغيب ١٢٦١)

**٣٣٦٦- ڕۆیشت و هاتنەوەیەك لە پێناوی خوادا باشترە لەوەی خۆری بەسەردا هەڵدێت و ئاوا دەبێت، نێوانی دو لای کەوان لەبەهەشتا باشترە لەوەی خۆری بەسەردا هەڵدێت و ئاوا بێت.**

٣٣٦٧- لغدوة في سبيل الله أو روحة خير من الدنيا و ما فيها و لقاب قوس أحدكم أو موضع قده في الجنة خير من الدنيا و ما فيها و لو اطلعت امرأة من نساء أهل الجنة إلى الأرض لملأت ما بينهما ريحا و لأضاءت ما بينهما و لنصيفها على رأسها خير من الدنيا و ما فيها.

(صحيح) ( حم ق ت ه ) عن أنس. (الترغيب ٣٧٤٧)

**٣٣٦٧- ڕۆیشتن و هاتنەوە یەك لە پێناو خوادا باشترە لەدونیاو ئەوەی تێیدایە نێوانی دوو دەمی کەوانی یەکێکیان یان شوێنی قەمچیەکەی لەبەهەشتدا باشترە لەدونیا و هەرچی تێیدایە، خۆ ئەگەر ئافرەتێکی بەهەشتی ڕوبکاتە دونیا سەرانسەری دونیا پڕ دەکات لەبۆنی خۆشی و ڕۆشنی دەکاتەوەو سەرپۆشەکەی سەری لەدونیا هەرچی لەدونیادایە چاکترە.**

٣٣٦٨- لقيام رجل في الصف في سبيل الله عز و جل ساعة أفضل من عبادة ستين سنة.

(صحيح) ( هق خط ) عن عمران بن حصين. (الصحيحة ٨٩٩)

**٣٣٦٨- ڕاوەستانی پیاوێك لەڕیزی جەنگدا لەپێناوی خوای شکۆمەندا باشترە لەخوا پەرستی شەست ساڵە.**

٣٣٦٩- للغازي أجره و للجاعل أجره و أجر الغازي.

(صحيح) ( د ) عن ابن عمرو. (الصحيحة ٢١٥٣)

**٣٣٦٩- جەنگاوەر پاداشتی خۆی هەیە و ئەو کەسەش پڕ چەکی کردووە و ڕەوانەی کردوە پاداشتی خۆشی و جەنگاوەرکەشی هەیە.**

٣٣٧٠- ما اغبرت قدما عبد في سبيل الله إلا حرم الله عليه النار.

(صحيح) ( ٤ ) عن مالك بن عبدالله الخثعمي ( الشيرازي في الألقاب ) عن عثمان. (الصحيحة ٢٢١٩)

**٣٣٧٠- هیچ بەندیەك نیە قاچەکانی لەپێناوی خوادا خۆڵاوی بوبن ئاگری دۆزەخی لێ قەدەغە نەکرا بێت.**

٣٣٧١- ما خالط قلب امرئ مسلم رهج في سبيل الله إلا حرم الله عليه النار.

(صحيح) ( حم ) عن عائشة. (الصحيحة ٢٢٢٧)

**٣٣٧١- هیچ موسوڵمانێك نیە تەپوتۆزی لەپێناوی خوادا تێکەڵاوی دڵ و دەرونی بو بێت خوا ئاگری لێ قەدەغە نەکرد بێت.**

٣٣٧٢- مثل المجاهد في سبيل الله و الله أعلم بمن يجاهد في سبيله كمثل الصائم القائم الخاشع الراكع الساجد.

(صحيح) ( ن ) عن أبي هريرة. (الترغيب ١٣٢٠)

**٣٣٧٢- نموونەی خەباتگێر لە پێناوی خوادا خوا خۆشی دەزانێت لێ بەڕاستی لەپێناوی ئەودا جیهادی کردوە وەکو نموونەی ڕۆژووەوانێکی شەونوێژکەری ملکەچی کڕنوش بەری سوژدەبەر وایە.**

٣٣٧٣- مثل المجاهد في سبيل الله و الله أعلم بمن يجاهد في سبيله كمثل الصائم القائم الدائم الذي لا يفتر من صيام و لا صدقة حتى يرجع و توكل الله تعالى للمجاهد في سبيله إن توفاه أن يدخله الجنة أو يرجعه سالما مع أجر أو غنيمة.

(صحيح) ( ق ت ن ) عن أبي هريرة. (صحيح النسائي ٣١٢٤)

**٣٣٧٣- نموونەی موجاهید لەپێناوی خوادا خوا خۆشی چاکتر دەزانێت لێ بەڕاستی لەپێناوی ئەودا جیهادی کردوە وەکو ڕۆژوەوانێکە بەردەوام شەونوێژی کرد بێت ئەوە کە لەڕۆژوو و خێرکردن ماندوو نابێت، هەتا دەگەڕێتەوە ماڵەوە پشگیری خوا بۆ موجاهید لەپێناوی خوادا ئەوەیە کەمرد بیخاتە بەهەشتەوە یان ئەگەر نەمرد بەسەلامەتی و یاداشتەوەیان بە دەستکەوتە بیگێڕێتەوە.**

٣٣٧٤- مقام الرجل في الصف في سبيل الله أفضل من عبادة ستين سنة.

(صحيح) ( طب ك ) عن عمران. (الصحيحة ٨٩٩)

**٣٣٧٤- شوێنی هەر کەسێك لەپێناوی خوادا لەڕیزی جەنگاوەران باشترە لەخوا پەرستی شەست ساڵ.**

٣٣٧٥- من اغبرت قدماه في سبيل الله حرمه الله على النار.

(صحيح) ( حم خ ت ن ) عن أبي عبس. (الصحيحة ٢٢١٩)

**٣٣٧٥- هەرکەس قاچەکانی لەپێناوی خوادا تۆزاوی بوبن خوا ئاگری لەسەر قەدەغە دەکات.**

٣٣٧٦- من بلغ بسهم في سبيل الله فهو له درجة في الجنة.

(صحيح) ( د ن حب ك ) عن أبي نجيح. (المشكاة ٣٨٧٣)

**٣٣٧٦- هەرکەس تیرێك لەبێ باوەڕێك بدات لەبەر خوا ئەومیلەیەکی بەهەشتی هەیە.**

٣٣٧٧- من جهز غازيا في سبيل الله فقد غزا و من خلف غازيا في سبيل الله في أهله بخير فقد غزا.

(صحيح) ( حم ق ) عن زيد بن خالد. (صحيح أبي داود ٢٢٦٦)

**٣٣٧٧- هەر کەسێك تێکۆشەرێك لەپێناو خوادا پڕ چەك بکات وەکو ئەوەیە خۆیشی غەزای کردبێت، هەر کەسێکیش خەمخۆری کەس و کاری تێکۆشەرێك بکات لەپێناو خوادا پاش خۆی، وەکو ئەوەیە غەزای کرد بێت.**

٣٣٧٨- من جهز غازيا في سبيل الله كان له مثل أجره من غير أن ينقص من أجر الغازي شيئا.

(صحيح) ( ه ) عن زيد بن خالد. (الترغيب ١٢٣٧)

**٢٣٧٨- هەر كەسێ تێكۆشەرێك لەپێناو خوادا پڕچەك بكات پاداشتی وەكو ئەو وەردەگرێت بێ ئەوەی لە پاداشتی تێكۆشەرەكە كەم بكاتەوە.**

٢٣٧٩- من راح روحة في سبيل الله كان له بمثل ما أصابه من الغبار مسكا يوم القيامة.

(حسن) ( هـ الضياء ) عن أنس. (الصحيحة ٢٣٣٨)

**٢٣٧٩- هەر كەسێك لەپێناوی خوادا دەرچوبێت، ئەوەندەی تۆز دەچێت بە سەریدا میسكی دەدرێتێ لەڕۆژی قیامەتدا.**

٢٣٨٠- من رمى العدو بسهم في سبيل الله فبلغ سهمه العدو أصاب أو أخطأ يعدل رقبة.

(صحيح) ( حم ن هـ طب ك ) عن عمرو بن عبسة. (الترغيب ١٢٨٦)

**٢٣٨٠- هەر كەسێك تیرێك لەدوژمن بگرێت بیپێكێ یان نەیپێكێ وەكو ئەوەیە گەردنێكی ئازاد كرد بێت.**

٢٣٨١- من رمى بسهم في سبيل الله فهو له عدل محرر.

(صحيح) ( ت ن ك ) عن أبي نجيح. (الترغيب ١٢٨٥)

**٢٣٨١- هەركەسێك تیرێك بهاوێشێ لەپێناو خوادا، وەكو ئەوەیە گەردنێكی ئازاد كرد بێت.**

٢٣٨٢- من قاتل في سبيل الله فواق ناقة فقد وجبت له الجنة و من سأل الله القتل في سبيل الله من نفسه صادقا ثم مات أو قتل فإنه له أجر شهيد و من جرح جرحا في سبيل الله أو نكب نكبة فإنها تجيء يوم القيامة كأغزر ما كانت لونها لون الزعفران و ريحها ريح المسك و من خرج به خراج في سبيل الله كان عليه طابع الشهداء.

(صحيح) ( حم ٣ حب ) عن معاذ. (المشكاة ٣٨٢٥)

**٢٣٨٢- هەر كەسێك جەنگ بكات لەپێناو خوادا ماوەی نێوان دووجار دۆشینی وشترێك بەهەشتی بۆ مسۆگەر دەبێت، هەر كەسێكیش بەڕاستی داوای كوژرانی خۆی بكات لەپێناوی خواد دوایی بمرێت یان بكوژرێت پاداشتی شەهیدی هەیە، هەر كەسێكیش بریندار بێت لەپێناوی خوادا، یان تووشی كارەساتێك ببێت، لەڕۆژی قیامەتدا برینەكەی سوورە جوانترین دیمەنی هەیە ڕەنگی وەك زافەران و بۆنیشی بۆنی میسكە، هەر كەسێك شتێك لەبرینەكەی بتكێ ئەو مۆركی شەهیدانی لێ دەدرێت.**

٢٣٨٣- موقف ساعة في سبيل الله خير من قيام ليلة القدر عند الحجر الأسود.

(صحيح) ( حب هب ) عن أبي هريرة. (الصحيحة ١٠٦٨)

**٣٣٨٣- وەستانی کەسێك ساتێك لەپێناوی خوادا، چاکترە لە هەستانی شەوی قەدر لەلای بەردە ڕەشەکەدا.**

٣٣٨٤- و الذي نفسي بيده لولا أن رجالا من المؤمنين لا تطيب أنفسهم أن يتخلفوا عني و لا أجد ما أحملهم عليه ما تخلفت عن سرية تغزو في سبيل الله و الذي نفسي بيده لوددت أني أقتل في سبيل الله ثم أحيا ثم أقتل ثم أحيا ثم أقتل ثم أحيا ثم أقتل.

(صحيح) ( حم ق ن ) عن أبي هريرة. (المشكاة ٣٧٩٠)

**٣٣٨٤- سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە، لەبەرئەوە نەبێت کەسانێك لەئیمانداران هەن دڵیان ناهێنێت لەمن دواکەون و، منیش ناتوانم هەڵیان نێم و پڕ چەکیان کەم و لەگەڵ خوم بیانبەم، هەرگیز لەدوای پۆلێك سەربازی جەنگاوەر بێنە دەمام لەپێناوی خوادا، نجەنگێن سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە، ئاوات دەخوازم بکوژرێم لەپێناو خواداو ئینجا زیندوو ببمەوەو ئینجا بکوژرێم و زیندوو بکرێمەوەو ئینجا بکوژێمەوەو ئینجا زیندوو بکرێمەوە ئینجا، جارێکی تر بکوژرێمەوە.**

٣٣٨٥- لا تفعل فإن مقام أحدكم في سبيل الله أفضل من صلاته في بيته سبعين عاما ألا تحبون أن يغفر الله لكم و يدخلكم الجنة ؟ اغزوا في سبيل الله من قاتل في سبيل الله فواق ناقة وجبت له الجنة.

(حسن) ( ت ك ) عن أبي هريرة. (المشكاة ٣٨٣٠)

**٣٣٨٥- ئەو کارە مەکە، چونکە ڕاوەستانی کەسێکتان لەپێناوی خوادا چاکترە لەنوێژکردنی حەفتا ساڵ لە ناو ماڵەکەی خویدا، ئایا پێتان خۆش نییە خوای گەورە لێتان خۆش بێت و بتانخاتە بەهەشتەوە؟ غەزا بکەن لەپێناوی خوادا، هەر کەسێك لەڕێگای خوادا بجەنگێت بەئەندازەی ماوەی نیوان دوو جار دۆشینی وشترێك بەهەشتی بۆ مسۆگەر دەبێت.**

٣٣٨٦- لا يجتمع غبار في سبيل الله و دخان جهنم في جوف عبد أبدا و لا يجتمع الشح و الإيمان في قلب عبد أبدا.

(صحيح) ( ن ك ) عن أبي هريرة. (المشكاة ٣٨٢٨)

**٣٣٨٦- هەرگیز تەپو تۆزی ڕێگای خواو دووکەڵی دۆزەخ لەناخی کەسێکدا کۆنابنەوە، ڕەزیلی و ئیمانیش هەرگیز لەدڵی بەندەدا کۆنابنەوە.**

٣٣٨٧- لا يجتمع غبار في سبيل الله و دخان جهنم في منخري مسلم أبدا.

(صحيح) ( ن ه حب ) عن أبي هريرة. (المشكاة ٣٨٢٨)

**٣٣٨٧- تەپو تۆزی ڕێگەی خواو دووكەڵی دۆزەخ هەرگیز لەلووتی موسوڵماندا كۆنابێتەوە.**

٣٣٨٨- لا يجتمع كافر و قاتله في النار أبدا.

(صحيح) ( م د ) عن أبي هريرة. (صحيح أبي داود ٢٢٥٤)

**٣٣٨٨- هەرگیز بێباوەڕێك و بكوژەكەی لەدۆزەخدا كۆنابنەوە.**

٣٣٨٩- لا يجتمعان في النار اجتماعا يضر أحدهما الآخر: مؤمن قتل كافرا ثم سدد.

(صحيح) ( حم م ) عن أبي هريرة. (صحيح أبي داود ٢٢٥٤)

**٣٣٨٩- لەدۆزەخدا كۆنابنەوە كۆبوونەوەیەك یەكێكتان زیان بەوەی تر بگەیەنێت؛ ئیماندارێك بێ بڕوایەك بكوژێت و دوایی بێتە سەر ڕێگای ڕاست.**

٣٣٩٠- لا يجتمعان في النار مسلم قتل كافرا ثم سدد و قارب و لا يجتمعان في جوف مؤمن غبار في سبيل الله و فيح جهنم و لا يجتمعان في قلب عبد الإيمان و الحسد.

(صحيح) ( حم ن ك ) عن أبي هريرة. (الترغيب ١٢٧١)

**٣٣٩٠- هەرگیز لەدۆزەخدا كۆنابنەوە: موسوڵمانێك كافرێك بكوژێت و دوایی بێتە سەر ڕێگای ڕاست و لەخوا نزیك ببێتەوە، لەناخی ئیماندارێكیشدا هەرگیز كۆنابنەوە: تەپو تۆزی ڕێگەی خوا و هاڵاوی دۆزەخ، لەدڵی بەندەیەكیشدا كۆنابنەوە: ئیمان و ((ئیرەیی)) چاوتێبڕینی ماڵی خەڵكی.**

٣٣٩١- لا يلج النار رجل بكى من خشية الله حتى يعود اللبن في الضرع و لا يجتمع غبار في سبيل الله و دخان جهنم في منخري مسلم أبدا.

(صحيح) ( حم ت ن ك ) عن أبي هريرة. (المشكاة ٣٨٢٨)

**٣٣٩١- ناچێتە دۆزەخەوە پیاوێك گریابێت لەپێناوی خوادا گریا بێت، تاكو شیر نەچێتەوە ناو گوان، هەرگیز نابێتەوە لەلوتی موسوڵمانێكدا تەپو تۆزی ڕێگەی خواو دووكەڵی دۆزەخ.**

٣٣٩٢- يا أبا سعيد ! من رضي بالله ربا و بالإسلام دينا و بمحمد نبيا وجبت له الجنة و أخرى يرفع بها العبد مائة درجة في الجنة ما بين كل درجتين كما بين السماء و الأرض الجهاد في سبيل الله الجهاد في سبيل الله.

(صحيح) ( حم م ن ) عن أبي سعيد. (الصحيحة ٣٣٤)

**٣٣٩٢- ئەی ئەبا سەعید! هەر کەسێك ڕازی بێت بە پەروەردگاریێتی خواو، پەیڕەوی ئایینی ئیسلام و، پێغەمبەرایەتی موحەممەد ﷺ، بەهەشتی بۆ مسۆگەر دەبێت، بەندەیش لەبەهەشتدا سەد پلە پێی بەرز دەبێتەوە، لەنێوان دوو پلەدا وەکو نێوان ئاسمان و زەوییە، جیهاد بکەن لە پێناو خوادا، جیهاد بکەن لە پێناو خوادا.**

٣٣٩٣- يقول الله تعالى: المجاهد في سبيلي هو علي ضامن إن قبضته أورثته الجنة و إن رجعته رجعته بأجر أو غنيمة.

(صحيح) ( ت ) عن أنس. (الترغيب ١٣١٥)

**٣٣٩٣- خوای گەورە دەفەرموێت: ئەو کەسەی جیهاد دەکات لەڕێگەی مندا من لەخۆم دەگرم، ئەگەر گیانی وەرگرمەوە دەیخەمە بەهەشتەوە، ئەگەر بیشیگەڕێنمەوە بە پاداشت و دەستکەوتەوە دەیگەڕێنمەوە.**

٣٣٩٤- أخذ الراية زيد فأصيب ثم أخذها جعفر فأصيب ثم أخذها عبد الله بن رواحة فأصيب ثم أخذها خالد عن غير إمرة ففتح الله عليه و ما يسرني أنهم عندنا - أو قال - و ما يسرهم أنهم عندنا.

(صحيح) ( حم خ ن ) عن أنس . (الترغيب ١٣٦٤)

**٣٣٩٤- زەید ئاڵاکەی هەڵگرت و پێکرا، ئینجا جەعفەر هەڵیگرت و ئەویش پێکرا، دوای ئەوان عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحە هەڵیگرت و ئەویش پێکرا، ئینجا خالید ئاڵاکەی وەرگرت بەبێ فەرماندەیی و خوای گەورە سەریخست، حەزیشم نەدەکرد لامان بونایە، یان فەرمووی: پێیان خۆش نەبوو لامان بوایەن.**

٣٣٩٥- إن المؤمن يجاهد بسيفه و لسانه.

(صحيح) ( حم طب ) عن كعب بن مالك . (الصحيحة ١٦٣١)

**٣٣٩٥- ئیماندار بە شمشێری و زوبانی جیهاد دەکات.**

٣٣٩٦- ذروة سنام الإسلام: الجهاد في سبيل الله...

(صحيح) (طب) عن أبي أمامة. (الضعيفة ٥١٣٤)

**٣٣٩٦- چڵە پۆپەی ئیسلام، جیهاد کردنە لە پێناو خوادا...**

٣٣٩٧- زملوهم بدمائهم فإنه ليس من كلم يكلم في الله إلا و هو يأتي يوم القيامة يدمى لونه لون الدم و ريحه ريح المسك.

(صحيح) ( ن ) عن عبدالله بن ثعلبة. (الإرواء ٧٠٥)

**٣٣٩٧- بەخوێنەکانیانەوە بیانپێچنەوە، چونکە هەموو زامێك لەپێناوی خوادا دروست بوو بێت لەڕۆژی قیامەتدا خوێنی لێ دەتکێ، ڕەنگی ڕەنگی خوێنە و بۆنی بۆنی میسکە.**

٣٣٩٨- قوموا إلى جنة عرضها السموات و الأرض.

(صحيح) ( حم م ) عن أنس. (فقه السيرة ٢٤٣)

**٣٣٩٨- هەڵسن بەرەو بەهەشتێك پانایيەکەی وەکو پانایی ئاسمانەکان و زەوییە.**

٣٣٩٩- قيام ساعة في الصف للقتال في سبيل الله خير من قيام ستين سنة.

(صحيح) ( عد ابن عساكر ) عن أبي هريرة. (الصحيحة ٩٠٢)

**٣٣٩٩- وەستانی ساتێك لەڕیزەکانی جەنگدا لەپێناوی خوادا، چاکترە لەشەست ساڵ شەو نوێژ کردن.**

٣٤٠٠- من خير معاش الناس لهم رجل ممسك عنان فرسه في سبيل الله يطير على متنه كلما سمع هيعة أو فزعة طار عليه يبتغي القتل و الموت مظانه و رجل في غنيمة في رأس شعفة من هذه الشعف أو بطن واد من هذه الأودية يقيم الصلاة و يؤتي الزكاة و يعبد ربه حتى يأتيه اليقين ليس من الناس إلا في خير.

(صحيح) ( م ه ) عن أبي هريرة. (المشكاة ٣٧٩٦)

**٣٤٠٠- چاکترین بژێوی خەڵکی ئەوەیە پیاوێك هەوساری ئەسپەکەی بگرێت لەپێناوی خوادا، هەر کاتێك هاوارێك ببیسێت سواری ئەسپەکەی ببێت و بەدوای کوشتن مردندا بگەڕێت وە پیاوێکیش لەگەڵ ڕانە مەڕێکدا لەبەرزایی شاخێکدا لەو بەرزاییانە، یان لەدۆڵێك لەو دۆڵانەدا، نوێژەکەی بەجوانی بکات و زەکات بدات تاکو لەدونیا دەردەچێت، هەر کەسێك وا بێت لەچاکەدایە.**

٣٤٠١- سافروا تصحوا و اغزوا تستغنوا.

(صحيح) ( حم ) عن أبي هريرة. (الصحيحة ٣٣٥٢)

**٣٤٠١- گەشت و گوزار بکەن تەندروستیتان چاك دەبێت، غەزایش بکەن با لەخەڵکی بێ نیاز بن.**

## بابەتی حوكم و ڕێ و شوێنەكانی

٣٤٠٢- ابغوني الضعفاء فإنما ترزقون و تنصرون بضعفائكم.

(صحيح) ( حم م حب جد ك ) عن أبي الدرداء. (الصحيحة ٧٨٠)

**٣٤٠٢- داوای مافی لاوازەكانتان بكەم بۆم، چونكە ئێوە بەهۆی ئەوانەوە[١] ڕۆزی دەدرێن و سەردەخرێن.**

٣٤٠٣- هل تنصرون إلا بضعفائكم ؟ بدعوتهم و إخلاصهم.

(صحيح) ( حل ) عن سعد. (الترغيب ٢٣٠٥)

**٣٤٠٣- ئايا ئێوە بەهۆی لاوازەكانتانەوە نەبێت سەر كۆمەكی دەكرێن؟ بە پاڕانەوەو دڵسۆزییان.**

٣٤٠٤- هل تنصرون و ترزقون إلا بضعفائكم ؟.

(صحيح) ( خ ) عن سعد. (الترغيب ٣٢٠٥)

**٣٤٠٤- ئايا ئێوە بەهۆی لاوازەكانتانەوە نەبێت كۆمەكی دەكرێن و ڕۆزی دەدرێن؟**

٣٤٠٥- ادفنوا القتلى في مصارعهم.

(صحيح) ( ٤ ) عن جابر . (الجنائز ص١٤)

**٣٤٠٥- كوژراوەكان لە جێگەی كوژرانیان بنێژن.**

٣٤٠٦- ردوا القتلى إلى مضاجعها.

(صحيح) ( ت حب ) عن جابر. (فقه السيرة ٢٩٠)

**٣٤٠٦- كوژراوەكان بگێڕنەوە بۆ جێگاكانیان[٢].**

٣٤٠٧- أسلم ثم قاتل.

(صحيح) ( خ ) عن البراء . (الصحيحة ٢٩٣٢)

**٣٤٠٧- موسوڵمان ببەو ئینجا بجەنگە[٣].**

٣٤٠٨- اغزوا باسم الله و في سبيل الله و قاتلوا من كفر بالله اغزوا و لا تغلوا و لا تغدروا و لا تمثلوا و لا تقتلوا وليدا و إذا لقيت عدوك من المشركين فادعهم إلى ثلاث خصال فأيتهن ما

---

[١] واتە: بەهۆی نوێژو خوا پەرستی ئەوانەوە.

[٢] واتە: بۆ جێگە كوژرانیان.

[٣] پێغەمبەر سەلات و سەلامی خوای لەسەر بێت لەجەنگی ئوحودا بە ئوسەیریمی فەرموو.

أجابوك فاقبل منهم و كف عنهم: ادعهم إلى الإسلام فإن أجابوك فاقبل منهم و كف عنهم " ثم ادعهم أن التحول من دارهم إلى دار المهاجرين و أخبرهم أنهم إن فعلوا ذلك فلهم ما للمهاجرين و عليهم ما على المهاجرين فإن أبوا أن يتحولوا منها فأخبرهم أنهم يكونون كأعراب المسلمين يجري عليهم حكم الله الذي يجري على المؤمنين و لا يكون لهم في الغنيمة و الفيء شيء إلا أن يجاهدوا مع المسلمين فإن هم أبوا فسلهم الجزية فإن هم أجابوك فاقبل منهم و كف عنهم فإن أبوا فاستعن بالله و قاتلهم و إذا حاصرت أهل حصن و أرادوك أن تجعل لهم ذمة الله و ذمة نبيه فلا تجعل لهم ذمة الله و لا ذمة نبيه و لكن اجعل لهم ذمتك و ذمة أصحابك فإنكم إن تخفروا ذممكم و ذمم أصحابكم أهون من أن تخفروا ذمة الله و ذمة رسوله و إذا حاصرت أهل الحصن فأرادوك أن تنزلهم على حكم الله فلا تنزلهم على حكم الله و لكن أنزلهم على حكمك فإنك لا تدري أتصيب حكم الله فيهم أم لا؟

(صحيح) ( حم م ٤ ) عن بريدة . (الإرواء ١٢٣٤)

**٣٤٠٨- غەزا بکەن بەناوی خواو، لە پێناو خوادا، بەگژ هەر کەسدا بچن بێ باوەڕە، غەزا بکەن و زیادە ڕەوی و ناپاکی و ئەتك کردنی کوژراوەکان مەکەن، هەرگیز منالْ مەکوژن، ئەگەر ڕووبەڕووی دوژمنەکەت بوویتەوە لەهاوبەش دانەرەکان بانگی بکە بۆ سێ خەسلەت، بۆ هەر کامیان وەڵامی دایتەوە، تۆش لێ ی وەرگرەو وازیان لێ بهێنە: بانگیان بکە بۆ ئیسلام ئەگەر ڕازی بوون لێیان وەرگرە و وازیان لێ بهێنە، ئینجا داوایان لێ بکە کۆچ بکەن بۆ کۆچگا، ئاگاداریشیان بکە ئەگەر ئەوەیان ئەنجامدا، ماف و ئەرکی کۆچکردووەکانیان دەبێت، ئەگەر ڕازی نەبوون بگوێزنەوە بۆ مەدینە، ئاگاداریان بکە حاڵیان حاڵی موسڵمانە عەرەبە دەشتەکیەکان دەبێت، فەرمانی خوایان لەسەر جێ بەجێ دەکرێت وەکو بڕواداران، لە دەستکەوت و تالآنیشدا بەشیان نابێت مەگەر لەگەڵ موسوڵمانان دابچنە جیهاد، ئەگەر بەهەموو ئەمانە ڕازی نەبوون، داوای سەرانەیان لێ بکە، ئەگەر ڕازی بوون لێیان وەربگرەو وازیان لێ بهێنە، ئەگەر ڕازی نەبوون پشت بەخوا ببەستەو لەگەڵیان بجەنگێ ئەگەریش گەمارۆی قەلآنشینێکیشت دا داوای بەڵێن و ئەستۆگیری خواو پێغەمبەریان لێ کردی بەڵێنی ئەوەیان پێ مەدە، بەڵام بەڵێن و ئەستۆگیری خۆت و هاوەڵەکانتیان پی بدە، چونکە ئەگەر پەیمانی خۆتان هاوەڵەکانتان بشکێنن لەوە ئاسانترە پەیمانی خوا و پێغەمبەرەکەی بشکێنن، ئەگەر گەمارۆی قەلآیەکیشت دا و داوایان لێ کردی لەسەر**

**فەرمانی خوا دایانبەزێنی، ئەوە مەکە، بەڵکو لەسەر فەرمانی خۆت دایانبەزێنە، چونکە تۆ نازانی فەرمانی خوا دەپێکی دەربارەی ئەوانە یان ناپێکی.**

٣٤٠٩- إن بيتم فليكن شعاركم ( حم لا ينصرون ) .

(صحيح) ( د ت ك ) عن رجل من الصحابة . (المشكاة ٣٩٤٨)

**٣٤٠٩- ئەگەر بەشەو هێرشتان کرایە سەر، با دروشمتان (حم) (فصلت:١) (لا ينصرون) بێت**[١] .

٣٤١٠- انفذ على رسلك حتى تنزل بساحتهم ثم ادعهم إلى الإسلام و أخبرهم بما يجب عليهم من حق الله فيه فوالله لأن يهدي الله بك رجل واحدا خير لك من أن يكون لك حمر النعم.

(صحيح) ( حم ق ) عن سهل بن سعد . (فقه السيرة ٣٧١)

**٣٤١٠- لەسەر خۆت برۆ تادەگەیتە مەیدانی ئەوان ، ئینجا بانگیان بکە بۆ ئیسلام و ئاگاداریان بکە لەمافەکانی خوا کە لەسەریان پێویستە ، سوێند بەخوای بالا دەست ئەگەر خوای گەورە کەسێك لەسەر دەستت ڕێنوێنی بکات باشترە بۆت لەڕەوە وشتری سور**[٢] .

٣٤١١- إن الله تعالى ليؤيد الدين بالرجل الفاجر.

(صحيح) ( طب ) عن عمرو بن النعمان بن مقرن . (الصحيحة ١٦٤٩)

**٣٤١١- بێگومان خوای گەورە دینەکە بە پیاوی خراپەکار پشتیوانی دەکات. .**

٣٤١٢- إن الله تعالى يؤيد هذا الدين بأقوام لا خلاق لهم.

(صحيح) ( ن حب ) عن أنس ( حم طب ) عن أبي بكرة . (الصحيحة ١٦٤٩)

**٣٤١٢- خوای گەورە ئەم ئایینە پشتگیری دەکات بەخەڵکانێك کەئاکارو کردەوەی جوانیان نییە.**

٣٤١٣- سيشدد هذا الدين برجال ليس لهم عند الله خلاق.

(صحيح) ( المحاملي في أماليه ) عن أنس. (الصحيحة ١٦٤٩)

**٣٤١٣- ئەم ئایینە تۆکمە دەبێتەوە بە پیاوانێك هیچ وەسف و ستایشێکی چاکیان نییە لەلای خوا.**

٣٤١٤- إنا لا نستعين بالمشركين على المشركين.

(صحيح) ( حم تخ ) عن خبيب بن يساف . (الصحيحة ١١٠١)

**٣٤١٤- ئێمە پشتیوانی لە هاوبەشی دانەر ناخوازین دژی هاوبەشی دانەر.**

٣٤١٥- إنا لا نستعين بمشرك.

(صحيح) ( حم د ه ) عن عائشة . (الصحيحة ١١٠١)

---

**[١] با بەرنامە و شیمارتان سورەتی (فصلت) بێت.**

**[٢] وشتری سور یان مەیلەو سور زۆر پەسەند و بەنرخە.**

**٣٤١٥- ئێمە پشت بەهاوبەش دانەر نابەستین[١].**

٣٤١٦- أوكلما نفرنا في سبيل الله تخلف أحدهم له نبيب كنبيب التيس منح إحداهن الكثبة من اللبن ؟ ! و الله لا أقدر على أحدهم إلا نكلت به.

(صحيح) ( حم م د ) عن جابر بن سمرة ( م ) عن أبي سعيد . (الإرواء ٢٣٨٠)

**٣٤١٦- ئایا هەموو جارێك رۆیشتن بۆ دەبێ كەسێكمان لێ بەجێ بمێنێت مرقە مرقی بێت وەكو سابرێن ، ئەگەر یەكێكتان كەمێك لە شیر ببەخشێت ؟! سوێند بەخوا دەستم بە كامەیان بگات سزای دەدەم[٢].**

٣٤١٧- أيها الناس لا تتمنوا لقاء العدو و اسألوا الله العافية فإذا لقيتموهم فاصبروا و اعلموا أن الجنة تحت ظلال السيوف اللهم منزل الكتاب و مجري السحاب و هازم الأحزاب اهزمهم و انصرنا عليهم.

(صحيح) ( ق د ) عن عبدالله بن أبي أوفى . (صحيح أبي داود ٢٣٦٥)

**٣٤١٧- خەڵكینە خۆزگە مەخوازن بۆ بەرەوڕوو بونەوەی دوژمن، داوای سەلامەتی بكەن لەخوا، بەڵام ئەگەر رووبەڕوویان بوونەوە خۆگرتن و ئەوە بزانن كە بەهەشت لەژێر سایەی شمشێرادایە، خوایە، ئەی دابەزێنەری قورئان و بەرێوەبەری هەورەكان و بەزێنەری حیزبەكان، بیانبەزێنە و سەرمانخە بەسەریاندا.**

٣٤١٨- حرمة نساء المجاهدين على القاعدين كحرمة أمهاتهم و ما من رجل من القاعدين يخلف رجلا من المجاهدين في أهله فيخونه فيهم إلا وقف له يوم القيامة فقيل له: قد خلفك في أهلك فخذ من حسناته ما شئت فيأخذ من عمله ما شاء فما ظنكم ؟.

(صحيح) ( حم م د ن ) عن بريدة . (المشكاة ٣٧٩٨)

**٣٤١٨- رێز لێگرتنی خێزانی موجاهیدەكان لەسەر دانیشتووەكان پێویستە وەكو رێزگرتنیان لەدایكیان، هەر كەسێكیش لەو نیشتەجێیانە جێ نیشینی خەباتگێرێك بێت و لەوانە ئەگەر ناپاكییەك لەگەڵ كەس و كاری ئەو موجاهیدانە بكات حەتمەن رادەگیردرێت لەرۆژی قیامەتدا و پێی دەوترێت: ئەوە جێ نشینی تۆ بوو لەلای كەس و كارەكەت، جا چەندت دەوێت لەچاكەكانی هەڵگرە، ئەویش چەندی بوێت لەچاكەكانی دەبات، ئیتر دەبێ گومانتان چۆن بێت؟**

---

[١] واتە: بۆ هۆكاری جیهاد و خەبات.

[٢] مەبەست لە رێزی ئەو كەسەیە غەزا دەكات لە پێناو خوادا ، كە پێویستە شەرەف و ناموسی بپارێزرێت ، لە كاتی ئامادە نەبوونی خۆیدا.

**٣٤١٩-** الحرب خدعة.

(صحيح) ( حم ق د ت ) عن جابر ( ق ) عن أبي هريرة ( حم ) عن أنس ( د ) عن كعب بن مالك ( ه ) عن ابن عباس وعائشة ( البزار ) عن الحسين ( طب ) عن الحسين وزيد بن ثابت وعبدالله بن سلام وعوف بن مالك ونعيم بن مسعود والنواس بن سمعان ( ابن عساكر ) عن خالد بن الوليد . (صحيح أبي داود ٢٣٦٩)

**٣٤١٩- جەنگ فێڵ و پیلانە.**

**٣٤٢٠-** قاتلهم حتى يشهدوا أن لا إله إلا الله و أن محمدا رسول الله فإذا فعلوا ذلك فقد منعوا منك دماءهم و أموالهم إلا بحقها و حسابهم على الله.

( م ) عن أبي هريرة. (الصحيحة ٤٠٧)

**٣٤٢٠- لەدژیان بجەنگێ تاکو شایەتمان دەهێنن، ئەگەر وایان کرد ئیتر خوێن و ماڵیان لەتۆ قەدەغەیە، مەگەر بەمافی خۆی نەبێت[1] و لێپرسینەوەشیان لەلای خوایە.**

**٣٤٢١-** قفلة كغزوة.

(صحيح) ( حم د ك ) عن ابن عمرو. (الترغيب ١٨٤١)

**٣٤٢١- گەڕانەوەیەکە بەرامبەر غەزایەك[2].**

**٣٤٢٢-** كان إذا أراد أن يستودع الجيش قال: استودع الله دينكم و أمانتكم و خواتيم أعمالكم.

(صحيح) ( د ك ) عن عبدالله بن يزيد الخطمي. (الصحيحة ١٥)

**٣٤٢٢- پێغەمبەر ﷺ کەبیویستایە سوپایەك بەڕێ بکات و خوا حافیزی لێ بکات دەیفەرموو: ئایین و ئەمانەت و کۆتایی کارەکانتان بەخوای گەورە دەسپێرم.**

**٣٤٢٣-** كان إذا أراد غزوة ورى بغيرها.

(صحيح) ( د ن ) عن كعب بن مالك. (فقه السيرة ٥١)

**٣٤٢٣- پێغەمبەر ﷺ کەبیویستایە غەزایەکی بکردایە، بەشێکی تر پەردە پۆشی دەکرد و وای دەردەخست دەیەوێت بەلایەکی تردا بڕوات.**

**٣٤٢٤-** كان إذا غزا قال: اللهم أنت عضدي و أنت نصيري بك أحول و بك أصول و بك أقاتل.

(صحيح) ( حم د ت ه حب الضياء ) عن أنس. (الكلم ١٢٥)

---

**[1] وەکو تاوانێك بکات کەشایستەی کوشتن بێت وەکو لەخوێنا بکوژرێتەوە یان جەردەی و ڕێگری بکات یان هاوسەری هەبێت و زینا بکات یان ......هتد.**

**[2] واتە: زۆر گرانە لەسەفەر و گەشتو کوزار وەکو غەزا خێری هەیە. السراج المنير ج١ ص٥٥٦.**

**٣٤٢٤- كه‌غه‌زاى بكردايه ده‌يفه‌رموو: خوايه تۆ پشتيوان و كۆمه‌كى كار و سه‌رخه‌رى منى، به‌تۆ به‌رگرى ده‌كه‌م و، به‌تۆ دوژمنه‌كه‌م ده‌به‌زێنم و به پشتيوانى تۆ جه‌نگ ده‌كه‌م.**

٣٤٢٥- كان رايته سوداء و لواؤه أبيض.

(حسن) ( ه ك ) عن ابن عباس. (الصحيحة ٢١٠٠)

**٣٤٢٥- پێغه‌مبه‌رم بينى ﷺ ئالا گه‌وره‌كه‌ى له‌جه‌نگدا ڕه‌ش بوو، به‌يداخه‌كه‌شى سپى بوو.**

٣٤٢٦- كان يحب أن يخرج إذا غزا يوم الخميس.

(صحيح) ( حم خ ) عن كعب بن مالك. (الصحيحة ٢١٢٨)

**٣٤٢٦- پێغه‌مبه‌ر ﷺ پێى خۆش بوو له‌ڕۆژى پێنج شه‌ممه‌دا بچێت بۆ غه‌زا.**

٣٤٢٧- لينبعث من كل رجلين أحدهما و الأجر بينهما.

(صحيح) ( حم م ) عن أبي سعيد. (صحيح أبي داود ٢٢٦٧)

**٣٤٢٧- با له‌دوو كه‌سدا يه‌كێكتان ڕه‌وانه بكرێت و پاداشتيشتان به‌نيوه بێت.**

٣٤٢٨-لو كان المطعم بن عدي حيا ثم كلمني في هؤلاء النتنى لأطلقتهم له-يعني أسارى بدر-.

(صحيح) ( حم خ د ) عن جبير بن مطعم. (المشكاة ٣٩٦٥)

**٣٤٢٨- ئه‌گه‌ر موتعيمى كوڕى عه‌دى له‌ژياندا بووايه‌و قسه‌ى له‌گه‌ڵم بكردايه ده‌رباره‌ى ئه‌و بۆگه‌نانه ئازادم ده‌كردن له‌به‌ر خاترى ئه‌و - واته: ديله‌كانى به‌در- .**

٣٤٢٩- ما بال أقوام جاوز بهم القتل اليوم حتى قتلوا الذرية ؟ ألا إن خياركم أبناء المشركين ألا لا تقتلوا ذرية ألا لا تقتلوا ذرية كل نسمة تولد على الفطرة فما يزال عليها حتى يعرب عنها لسانها فأبواها يهودانها أو ينصرانها.

(صحيح) ( حم ن حب ك ) عن الأسود بن سريع. (الصحيحة ٤٠١)

**٣٤٢٩- ئه‌وه چييه كه‌سانێك هه‌ن ته‌نانه‌ت مناڵيش هه‌ر ده‌كوژن؟ چاكترينتان مناڵى بتپه‌رسته‌كانه، به‌هيچ شێوه‌يه‌ك مناڵان مه‌كوژن، به‌هيچ شێوه‌يه‌ك مناڵان مه‌كوژن، هه‌موو وه‌چه‌يه‌ك له‌سه‌ر فيتره‌ت له‌دايك ده‌بێت هه‌ر وايش ده‌مێنێته‌وه تاكو زمانى ده‌ريده‌بڕێت به‌ڵام باوك و دايكى ده‌يكه‌نه جوله‌كه‌يان گاور.**

٣٤٣٠- من ضيق منزلا أو قطع طريقا أو آذى مؤمنا فلا جهاد له.

(صحيح) ( حم د ) عن معاذ بن أنس. (المشكاة ٣٩٢٠)

**٣٤٣٠- هەر کەسێك تەنگ هەڵبچنێت خانوویەك ، یان ڕێگایەك بگرێت، یان ئیمانداریێك ئازار بدات، جیهادی بۆ ناژمێردرێت.**

٣٤٣١- النصر مع الصبر و الفَرَجُ مع الكرب: و إن مع العسر يسرا.

(صحيح) ( خط ) عن أنس. (الصحيحة ٢٣٨٢)

**٣٤٣١- سەرکەوتن لەگەڵ ئارام گرتندایە، خۆشیش لەگەڵ ناخۆشیدایە: بێگومان ئاسودەیش لەگەڵ تەنگانەدایە.**

٣٤٣٢- نهى عن المثلة.

(صحيح) ( ك ) عن عمران ( طب ) عن ابن عمر والمغيرة. (الإرواء ٢٢٩٢)

**٣٤٣٢- پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی کردووە ئەتك کردنی لاشەی مردوو.**

٣٤٣٣- نهى عن قتل النساء و الصبيان.

(صحيح) ( ق ) عن ابن عمر. (الإرواء ١٩٠٢)

**٣٤٣٣- پێغەمبەر ﷺ کوشتنی ئافرەتان و منداڵانی قەدەغە کردووە.**

٣٤٣٤- لا أعده كاذبا: الرجل يصلح بين الناس يقول القول لا يريد به إلا الإصلاح و الرجل يقول في الحرب و الرجل يحدث امرأته و المرأة تحدث زوجها.

(صحيح) ( د ) عن أم كلثوم بنت عقبة. (الصحيحة ٥٤٥)

**٣٤٣٤- بەدرۆزن نایژمێرم: پیاوێك ئاشتەوایی بکات لەنێوان خەڵکیدا، قسەیەکی نادروست بکات کەتەنها مەبەستی پێی چاکسازی بێت، پیاوێیش لە جەنگدا قسەیەکی وا بکات و، پیاوێکیش قسەیەکی وا لەگەڵ خێزانەکەی بکات و، ئافرەتێکیش قسەیەکی وا لەگەڵ مێردەکەی بکات.**

٣٤٣٥- إذا ضن الناس بالدينار و الدرهم و تبايعوا بالعينة و تبعوا أذناب البقر و تركوا الجهاد في سبيل الله أدخل الله تعالى عليهم ذلا لا يرفعه عنهم حتى يراجعوا دينهم.

(صحيح) ( حم طب هب ) عن ابن عمر . (الصحيحة ١١)

**٣٤٣٥- ئەگەر خەڵکی ڕەزیلیان کرد لەدینارو درهەمدا[1]، کڕین و فرۆشتنیان کرد بەعینە[1] و شوێن، کلکی مانگا کەوتن و، وازیان هێنا لەجیهاد لەپێناوی خوادا، خوای گەورە سەرشۆڕییەکیان بەسەردا دەدات، و هەڵی ناگرێت لەسەریان تاکو نەگەڕێنەوە بۆ ئایینەکەیان.**

---

[1] واتە: لەبەخشینی ئاڵتون و زیو.

٣٤٣٦- أمرت أن أقاتل الناس حتى يشهدوا أن لا إله إلا الله و أني رسول الله فإذا قالوها عصموا مني دماءهم و أموالهم إلا بحقها و حسابهم على الله.

(صحيح) ( ق ٤ ) عن أبي هريرة وهو متواتر . (الصحيحة ٤٠٧)

**٣٤٣٦- فەرمانم پێكراوە بجەنگم لەگەڵ خەڵكى تاكو شايەتمان دەهێنن كەهيچ پەرستراوێكى بەحەق نيە بێجگە لە الله و منيش پێغەمبەرى خوام، ئەگەر ئەوەيان وت خوێن و ماڵى خۆيان لەمن دەپارێزن بەمافى خۆى نەبێت و لێپرسينەوەشيان لاى خوايە.**

٣٤٣٧- أمرت أن أقاتل الناس حتى يشهدوا أن لا إله إلا الله و أني رسول الله و يقيموا الصلاة و يؤتوا الزكاة فإذا فعلوا ذلك عصموا مني دماءهم و أموالهم إلا بحقها و حسابهم على الله.

(صحيح) ( ق ) عن ابن عمر ( ن ) عن أبي بكرة ( ه ك ) عن أبي هريرة . (الصحيحة ٤٠٦)

**٣٤٣٧- فەرمانم پێكراوە بجەنگم لەگەڵ خەڵكى تاكو شايەتمان دەهێنن بەتاك وتەنيايى پەرستراويەتى خواو پێغەمبەرايەتى من و، كردنى نوێژەكان بەچاكى و زەكات دان و، ئەگەر ئەوانەيان ئەنجامدا خوێن و ماڵى خۆيان دەپارێزن لەمن و لێپرسينەوەشيان لەلاى خوايە.**

٣٤٣٨- أمرت أن أقاتل الناس حتى يشهدوا أن لا إله إلا الله و يؤمنوا بي و بما جئت به فإذا فعلوا ذلك فقد عصموا مني دماءهم و أموالهم إلا بحقها و حسابهم على الله عز و جل.

(صحيح) ( م ) عن أبي هريرة . (الصحيحة ٤٠٦)

**٣٤٣٨- فەرمانم پێكراوە بەگژ خەڵكيدا بچم، تاكو شايەتمان دەهێنن كەهيچ پەرستراوێكە بەحەق نيە جگە لەخوا و ئيمان بەوە دەهێنن كەمن پێى ڕەوانە كراوم، ئەگەر ئەوەيان كرد، خوێن وماڵى خۆيان لەمن دەپارێزن بەمافى خۆى نەبێت، لێپرسينەوشيان لەسەر خواى گەورەيە.**

٣٤٣٩- أمرت أن أقاتل الناس حتى يشهدوا أن لا إله إلا الله و يؤمنوا بي و بما جئت به فإذا فعلوا ذلك فقد عصموا مني دماءهم و أموالهم إلا بحقها و حسابهم على الله.

(صحيح) ( م ) عن أبي هريرة . (الصحيحة ٤٠٦)

---

[1] **(بيع العينه) ئەوەيە كەسێك شتێك دەفرۆشێت بەكەسێكى تر بەنرخێكى گران و لەهەمان كاتدا و دەست بەجێ بەهەرزان لێ دەكرێتەوە دەڵێ ئەوە تۆ ئەوەندە قەرزارى.**

**٣٤٣٩- فەرمانم پێكراوە بەگژ خەڵكیدا بچم تاكو دەڵێن (لا اله الا الله) هەركەسێ ئەوەی وت ماڵ و گیانی لەمن دەپارێزێت، مەگەر بەمافی خۆی نەبێت و، لێپرسینەوەشی لەلای خوایە.**

٣٤٤٠- إن أول الناس يقضى يوم القيامة عليه رجل استشهد فأتي به فعرفه نعمه فعرفها قال: فما عملت فيها ؟ قال: قاتلت فيك حتى استشهدت قال: كذبت و لكنك قاتلت ليقال جريء فقد قيل ثم أمر به فسحب على وجهه حتى ألقي في النار و رجل تعلم العلم و علمه و قرأ القرآن فأتي به فعرفه نعمه فعرفها قال: فما عملت فيها ؟ قال: تعلمت العلم و علمته و قرأت فيك القرآن قال: كذبت و لكنك تعلمت العلم ليقال عالم و قرأت القرآن ليقال: هو قارئ فقد قيل ثم أمر به فسحب على وجهه حتى ألقي في النار و رجل وسع الله عليه و أعطاه من أصناف المال كله فأتي به فعرفه نعمه فعرفها قال: فما عملت فيها ؟ قال: ما تركت من سبيل تحب أن ينفق فيها إلا أنفقت فيها لك قال: كذبت و لكنك فعلت ليقال: هو جواد فقد قيل ثم أمر به فسحب على وجهه ثم ألقي في النار.

(صحيح) ( حم م ن ) عن أبي هريرة . (الصحيحة ٣٥١٨)

**٣٤٤٠- یەكەمین كەس لەڕۆژی قیامەتدا لێپرسینەوەی لەگەڵ دەكرێت پیاوێكە شەهید بووە دەهێنرێتە لای خوا و بەهرەكانی دەخاتە پێش چاوی و ئەویش دەیناسێتەومو پێی دەفەرموێت: چیت بەو بەهرانە كرد؟ دەڵێت: لەپێناوت جەنگام تاكو شەهید بووم، دەفەرموێت: درۆت كرد، بەڵكو، شەڕت كرد تاكو بڵێن بوێرمو نەترسە ووترایش، ئینجا فەرمانی پێكرا لەسەر ڕوخساری خرایە نێو ئاگرەوە، پیاوێكیش فێری زانست بوومو خەڵكیشی فێر كردومو، قورئانی خوێندوە، دەیهێنرێت و خواش بەهرەكانی دەخاتەوە پێش چاوی و ئەویش بیری دێنەوە، پێی دەفەرموێت: كردەوەی چیت كرد بەو بەهرانە؟ دەڵێت: خۆم زانست فێر بووم و خەڵكیشم فێركرد و قورئانیشم لەبەر تۆ خوێند، دەفەرموێت: درۆت كرد، بەڵكو فێری زانست بووی بۆ ئەوەی بووترێت زانای قورئانیشت خوێند بۆ ئەوەی بوترێت ئەو قورئان زانە، ئەوەش وترا، ئینجا فەرمان كراو لەسەر ڕووخساری خستیانە ئاگرەوە، پیاوێكیش خوای گەورە هەموو جۆرە ماڵێكی پێداوە، دەهێنرێت و ئەو بەهرانەی دەخرێتە پێش چاوی و دەیان ناسێتەوە، پێی دەفەرمووێت: چی كردەوەیەكت پێیان كرد، دەڵێت: هیچ ڕێگەیەكم بەجێ نەهێشت تۆ پێت خۆش چاكەی تیا بكرێت و چاكەم تیا نەكردبێت، دەفەرموێت: درۆت كرد، بەڵكو واتكرد بۆ**

**ئه‌وه‌ی بوترێت به‌خشنده‌و چاوتێره، ئه‌وه وترایش، ئینجا فه‌رمانی پێکراو له‌سه‌ر رووه‌تی خرایه نێو دۆزه‌خه‌وه.**

٣٤٤١- صدق الله فصدقه.

(صحيح) ( طب ك ) عن شداد بن الهاد. (الجنائز ص٦١)

**٣٤٤١- ڕاستی کرد له‌گه‌ڵ خوا ، خوایش ڕاستی کرد له‌گه‌ڵی[1].**

٣٤٤٢- الغزو غزوان فأما من غزا ابتغاء وجه الله تعالى و أطاع الإمام و أنفق الكريمة و ياسر الشريك و اجتنب الفساد في الأرض فإن نومه و نبهه أجر كله و أما من غزا فخرا و رياء و سمعة و عصى الإمام و أفسد في الأرض فإنه لن يرجع بالكفاف.

(حسن) ( حم د ن ك هب ) عن معاذ. (الصحيحة ١٩٩)

**٣٤٤٢- غه‌زا دوو غه‌زایه، ئه‌و که‌سه‌ی غه‌زا بکات له‌ پێناو خوادا و، گوێڕایه‌ڵی فه‌رمانڕه‌وا بکات و ئاژه‌ڵی دابه‌سته ببه‌خشێت و هاوه‌ڵێکی چاك بێت بۆ هاوبه‌شه‌که‌ی و خۆی له‌خراپه‌کردن له‌سه‌ر زه‌ویدا به‌دوورگرێت، ئه‌و که‌سه خه‌وتن و نه‌خه‌وتنی پاداشت بۆی، به‌ڵام ئه‌و که‌سه‌ی غه‌زا بکات بۆ شانازی و ڕوپامایی و ناوبانگ و سه‌رپێچی فه‌رمانڕه‌وا بکات و خراپه له‌سه‌ر زه‌وی ئه‌نجام بدات، ئه‌و که‌سه به‌ پاداشته‌وه ناگه‌ڕێته‌وه.**

٣٤٤٣- خمس ليس لهن كفارة: الشرك بالله و قتل النفس بغير حق و بهت المؤمن و الفرار من الزحف و يمين صابرة يقتطع بها مالا بغير حق.

(حسن) ( حم أبو الشيخ في التوبيخ ) عن أبي هريرة . (الإرواء ١١٨٨)

**٣٤٤٣- پێنج تاوان سڕینه‌وه‌یان نییه: دانانی هاوبه‌ش بۆ خواو، کوشتنی ناهه‌ق و، بوختان بۆ باوه‌ڕدار و، هه‌ڵهاتن له‌ جه‌نگدا و، سوێندێکی درۆ که ماڵێکی به‌ناڕه‌وا پێ به‌ده‌ست بهێنێ هاوڕێکه‌شی پێ ببه‌ستێته‌وه.**

---

**[1] پیاوێکی عه‌ره‌بی ده‌شته‌کی هاته خزمه‌تی پێغه‌مبه‌ر و بڕوای پێ هێناو شوێنی که‌وت و له‌گه‌ڵت کۆچ ده‌که‌م، له‌ڕۆژ جه‌نگی خه‌یبه‌ردا پێغه‌مبه‌ر سه‌ڵات و سه‌لامی خوای لێ بێت ده‌ستکه‌وتی جه‌نگی دابه‌ش کرد به‌شێکیشی بۆ کابرا عه‌ره‌به ده‌شته‌کیه‌که دانا و بۆیان برد وتی ئه‌مه چیه وتیان ئه‌مه به‌شی خۆته پێغه‌مبه‌ر بۆی داناوی، هه‌ڵی گرت و ڕۆشت بۆ خزمه‌ت پێغه‌مبه‌ر وتی ئه‌مه چیه، وتی به‌شی خۆته بۆم داناوی، وتی خۆ من له‌سه‌ر ئه‌مه به‌ڵێنم به‌تۆ نه‌دا. به‌ڵکو له‌سه‌ر ئه‌وه‌ی تیرو شمشێر ئێره‌و ئێره‌م بکه‌وێت – هێمای بۆ قوڕگی کرد- بمرم و بچمه به‌هه‌شت پێغه‌مبه‌ر فه‌رمووی (( ئه‌گه‌ر له‌گه‌ڵ خوادا ڕاست بکات خواش له‌گه‌ڵی ڕاست ده‌کات )).**

٣٤٤٤- ما أجد له في غزوته هذه في الدنيا و الآخرة إلا دنانيره التي سمى.

(صحيح) ( د ك ) عن يعلى بن منية. (الصحيحة ٢٢١١)

**٣٤٤٤- وا نازانم لەغەزایەی کەکردی هیچ دەستکەوتێکی هەبێت جگە لەو دینارانەی کەداوای کرد[١].**

٣٤٤٥- من خرج من الطاعة و فارق الجماعة فمات مات ميتة جاهلية و من قاتل تحت راية عمية يغضب لعصبية أو يدعو إلى عصبية أو ينصر عصبية فقتل فقتلته جاهلية و من خرج على أمتي يضرب برها و فاجرها و لا يتحاشا من مؤمنها و لا يفي لذي عهدة عهده فليس مني و لست منه.

(صحيح) ( حم م ن ) عن أبي هريرة. (الصحيحة ٩٨٢)

**٣٤٤٥- هەر کەسێ بۆ گوێڕایەڵی خوا دەربچێت و بمرێت لەسەر ڕێبازی نەفامی دەمرێت، هەر کەسیش لەژێر ئالایەکی نادیاردا بجەنگێت و لە پێناو دەمارگیریدا تووڕە بێت، یان بانگەواز بکات بۆ دەمارگیری، یان پشتگیری دەمارگیری بکات و بکوژرێت، کوشتنەکەی لەسەر ڕێبازی نەفامیە، هەرکەسێکیش لەدژی ئوممەتی من ڕاپەڕێت و لەچاکە کارو خراپە کار یان بدات و، لەئیمانداریان خۆی نەپارێزێت و، بەئەمەك نەبێت بەرانبەر خاوەن پەیمان، ئەو کەسە لەمن نییە و من لەو نیم.**

٣٤٤٦- من غزا في سبيل الله و لم ينو إلا عقالا فله ما نوى.

(صحيح) ( حم ن ك ) عن عبادة بن الصامت. (المشكاة ٣٩٥٠)

**٣٤٤٦- هەر کەسێك غەزا بکات لە پێناو خواداو، مەبەستی تەنها گوریسی وشترێك بێت[٢]، لەسەر نییەتی خۆی پاداشت دەدرێتەوە.**

٣٤٤٧- من قاتل لتكون كلمة الله هي العليا فهو في سبيل الله.

(صحيح) ( حم ق ٤ ) عن أبي موسى. (صحيح ابي داود ٢٢٧٣)

**٣٤٤٧- هەر کەسێك لە پێناو بەرزو بڵند ڕاگرتنی ووتەی خوا بجەنگێت ئەوە لە پێناو خوادایە.**

---

[١] ئەم فەرمودەیەی دەربارەی ئەو پیاوە فەرمووە کە بە علی کوڕی ئومەییە بەکرێ ی گرتبو لەجیاتی ئەو بچی بۆ جیهاد و پێ ی وت چاوەڕێ بەشە دەست کەوتیش مەبە بەڵکو ئەو پارەو کرێ یەی خۆت وەرگرەو کە دیاری کراوە. السراج المنیر ج١ ص ٥٦٠.

[٢] زومەخشەری فەرموویەتی: واتە بەتەماو بەنیازی شتێکی بێ هودە و سادە بێت.

٣٤٤٨- من قتل تحت راية عمية ينصر العصبية و يغضب للعصبية فقتلته جاهلية.

(صحيح) ( م ن ) عن جندب ( هـ ) عن أبي هريرة. (الصحيحة ٤٣٣)

**٣٤٤٨- هەر كەسێك بكوژێت لەژێر بەیداخێكی نادیاردا، پشتیوانی لەدەمارگیری بكات و لەسەر دەمارگیری تووڕە بێت، كوژرانەكەی نەفامانەیە.**

٣٤٤٩- من مات و لم يغز و لم يحدث نفسه بغزو مات على شعبة من نفاق.

(صحيح) ( حم م د ن ) عن أبي هريرة. (صحيح ابي داود ٢٢٦٠)

**٣٤٤٩- هەر كەسێك بمرێت و غەزا نەكات و نیازی غەزا كردنیشی نەبێت، لەسەر بەشێك لەدوڕویی دەمرێت.**

٣٤٥٠- لا تتمنوا لقاء العدو و إذا لقيتموهم فاصبروا.

(صحيح) ( ق ) عن أبي هريرة. (المشكاة ٣٩٣٥)

**٣٤٥٠- ئاواتی ڕوبەڕو بونەوەی دوژمن مەخوازن، بەڵام ئەگەر ڕووبەڕوو بوونەوە خۆڕاگربن.**

٣٤٥١- لا هجرة بعد الفتح و لكن جهاد و نية و إذا استنفرتم فانفروا.

(صحيح) ( م ) عن عائشة ( حم ن ) عن صفوان بن أمية ( حم ت ن ) عن ابن عباس. (الإرواء ١١٧٣)

**٣٤٥١- لە پاش فە تحی مەككە كوچكردن نییە، بەڵام جیهادو نییەت هەیە، هەركاتێكیش داواتان لێكرا جیهاد بكەن گوێڕایەڵ بن.**

٣٤٥٢- إن أقواما بالمدينة خلفنا ما سلكنا شعبا و لا واديا إلا و هم معنا حبسهم العذر.

(صحيح) ( خ ) عن أنس . (الترغيب ١٢)

**٣٤٥٢- كەسانێكمان لەمەدینە بەجێ هێشتوون هیچ دۆڵ و شیوێكمان نەبڕیوە كە ئەوا نمان لەگەڵ نەبوبێت پاساوو بیانو ڕێگەی لێ گرتن لە بەڕێچكەی شاخەكاندا، یان بەناو دۆڵەكاندا دەڕۆشتین ، بەڵام پاساویان هەبوو نەهاتن.**

٣٤٥٣- أخرجوا المشركين من جزيرة العرب و أجيزوا الوفد بنحو ما كنت أجيزهم.

(صحيح) ( خ د ) عن ابن عباس . (الصحيحة ١١٣٢)

**٣٤٥٣- هاوبەش دانەرەكان لەدورگەی عەرەب، وەدەرنێن چیم دەمبەخشی بەنێردەكان ئێوەیش پێیان ببەخشن.**

٣٤٥٤- أخرجوا اليهود و النصارى من جزيرة العرب.

(صحيح) ( م ) عن عمر . (الصحيحة ١١٣٢)

**٣٤٥٤- جولەكەو گاورەكان لەدورگەی عەرەب دەربكەن.**

٣٤٥٥- شاهت الوجوه.

(صحيح) ( م ) عن سلمة بن الأكوع ( ك ) عن ابن عباس. (فقه السيرة ٢٤٤)

**٣٤٥٥- ڕوخسارەکان بشێوێن.**

٣٤٥٦- لأخرجن اليهود و النصارى من جزيرة العرب حتى لا أدع إلا مسلما.

(صحيح) ( م د ت ) عن عمر. (الصحيحة ٩٢١)

**٣٤٥٦- دەبێت جولەکە و گاورەکان وە لەدورگەی عەرەب، وە دەرنێم و تەنها موسوڵمان نەبێت ناهێڵم لەویٚ نیشتەجیٚ بێت.**

٣٤٥٧- لئن عشت إن شاء الله لأخرجن اليهود و النصارى من جزيرة العرب.

(صحيح) ( ت ك ) عن عمر. (الصحيحة ١١٣٤)

**٣٤٥٧- ئەگەر لەژیاندامام بەویستی خوا هەر چی جولەکەو گاورە لە دورگەی عەرەب دەریدەکەم.**

٣٤٥٨- عليكم بالدلجة فإن الأرض تطوى بالليل .

(صحيح) ( د ك هق ) عن أنس. (الصحيحة ٦٨١)

**٣٤٥٨- شەوڕەوی بکەن، چونکە بەشەو زەوی دێتەوەیەك[١].**

٣٤٥٩- ما من أهل بيت يغدو عليهم فدان إلا ذلوا.

(صحيح) ( طب ) عن أبي أمامة. (الصحيحة ١٠)

**٣٤٥٩- دانیشتوانی هەر بنەماڵەیەك هەر سەرگەرمی دەزگای جووتکردن بن، سەر شۆڕی روویان تیٚ دەکات[٢].**

٣٤٦٠- يا معشر المهاجرين و الأنصار ! إن من إخوانكم قوما ليس لهم مال و لا عشيرة فليضم أحدكم إليه الرجلين أو الثلاثة.

(صحيح) ( د ك ) عن جابر. (الصحيحة ٣٠٩)

**٣٤٦٠- ئەی کۆمەڵی کۆچکەرو یاریدەدەرەکان کەسانێك لەبراکانتان نەماڵ و نەعێلیان نییە، با هەر کەس لەئێوە دوو کەس و سیٚ کەس لەوانە بداتە پاڵ خۆی.**

[١] واتە بەشەو چاکتر ڕێگە دەبردرێت وتەی دەکرێت.

[٢] هەر کەس هەر سەرگەرم و سەرقاڵی دەزگا و ئامێری جوتکردن و جوتیاری بێت و ئەکە شەرعی و خواپەرستیەکانی بۆ بفەوتێنێت سەرشۆڕی دونیاو خەجاڵەتی لای خوا دەبێت بوخاریش ناوی ناوە ((دەرگای ئاگادارکردنەوە لە پاشەڕۆژی سەرقاڵ بوون بە ئامێری کشتوکاڵ و سنوربەزاندن تێیدا)) السراج المنير ج ١ ص ٥٦٢.

## بابەتی جۆرەكانی جیهاد

٣٤٦١- أحب الجهاد إلى الله كلمة حق تقال لإمام جائر.

(حسن) ( حم طب ) عن أبي أمامة . (الصحيحة ٤٩١)

**٣٤٦١- پەسەند ترین جیهاد لەلای خوا قسەیەكی هەقە لەلای فەرمانڕەوایەكی ستەمكار بكرێت.**

٣٤٦٢- أريت قوما من أمتي يركبون ظهر البحر كالملوك على الأسرة.

(صحيح) ( م ) عن أم حرام . (صحيح ابن ماجه ٢٧٧٦)

**٣٤٦٢- كەسانێكم لەئوممەتم پێ پیشاندرا لەدەریادا سواری كەشتی دەبن هەر، وەكو پاشاكان چۆن لەسەر تەختن.**

٣٤٦٣- أفضل الجهاد أن يجاهد الرجل نفسه و هواه.

(صحيح) ( ابن النجار ) عن أبي ذر . (الصحيحة ١٤٩٦)

**٣٤٦٣- چاكترین جیهاد ئەوەیە كەسێك جیهادی بەرەنگاری ئارەزووەكانی بكات.**

٣٤٦٤- أفضل الجهاد كلمة حق عند سلطان جائر.

(صحيح) ( ه ) عن أبي سعيد ( حم ه طب هب ) عن أبي أمامة ( حم ن هب ) عن طارق بن شهاب . (الصحيحة ٤٩١)

**٣٤٦٤- چاكترین جیهاد قسەیەكی ڕەوایە لەلای دەسەڵاتدارێكی ستەمكار.**

٣٤٦٥- أفضل المؤمنين إسلاما من سلم المسلمون من لسانه و يده و أفضل المؤمنين إيمانا أحسنهم خلقا و أفضل المهاجرين من هجر ما نهى الله تعالى عنه و أفضل الجهاد من جاهد نفسه في ذات الله عز و جل.

(صحيح) ( طب ) عن ابن عمرو . (الصحيحة ١٤٩١)

**٣٤٦٥- باشترین باوەڕدار لەموسوڵمانە تیدا ئەو كەسەیە موسوڵمانان لەزمانی و دەستی سەلامەت بن، چاكترین خاوەن باوەڕانیش لەبڕواكەیاندا ئەوانەن كەجوانترین ڕەوشتیان هەیە، چاكترین كۆچ كردووەكانیش ئەو كەسەیە قەدەغە كراوەكانی خوا واز لێ دێنێت، چاكترین جیهادیش ئەوەیە كەسێك جیهادی دەرونی خۆی بكات لە پێناو خوای گەورە.**

٣٤٦٦- إن بالمدينة أقواما ما سرتم مسيرا و لا أنفقتم من نفقة و لا قطعتم واديا إلا كانوا معكم فيه و هم بالمدينة حبسهم العذر.

(صحيح) ( حم خ د ه ) عن أنس ( م ه ) عن جابر. (صحيح أبي داود ٢٢٦٥)

**٣٤٦٦- کەسانێك هەن لەمەدینە، ئێوە ڕێگاکتان نەبڕیوەو ماڵێکتان خەرج نەکردوەو دۆڵێکتان بەبڕیوە، ئەوان لەگەڵتان تەبن بەڵام بیانویان هەیە و نەیانتوانیوە لەگەڵتان دەرچن.**

٣٤٦٧- إن من أعظم الجهاد كلمة عدل عند سلطان جائر.

(صحيح) ( ت ) عن أبي سعيد . (الصحيحة ٤٩١)

**٣٤٦٧- مەزنترین جیهاد قسەیەکی ڕاستە لای دەسەڵاتدارێکی ستەمکار.**

٣٤٦٨- أول جيش من أمتي يركبون البحر قد أوجبوا و أول جيش من أمتي يغزون مدينة قيصر مغفور لهم.

(صحيح) ( خ ) عن أم حرام بنت ملحان . (الصحيحة ٢٦٨)

**٣٤٦٨- یەکەمین سوپا لەئوممەتەکەم سواری کەشتی دەبن لەدەریا بەهەشتیان مسۆگەر کردووە، یەکەمین سوپاش لەئوممەتەکەم غەزای شاری قەیسەر[1] دەکەن خوای گەورە لێیان خۆش دەبێت.**

٣٤٦٩- أيكم خلف الخارج في أهله و ماله بخير كان له مثل نصف أجر الخارج.

(صحيح) ( م د ) عن أبي سعيد . (صحيح أبي داود ٢٢٦٧)

**٣٤٦٩- هەر کامتان بەجێ نشینی کەسێك بێت لەسەرپەرشتنی ماڵ و کەسوکاری کەسێکدا کە چووبێت بۆ جیهاد نیوەی پاداشتی ئەو تێکۆشەرەی دەستدەکەوێت.**

٣٤٧٠- جاهدوا المشركين بأموالكم و أنفسكم و ألسنتكم.

(صحيح) ( حم د ن حب ك ) عن أنس . (المشكاة ٣٨٢١)

**٣٤٧٠- جیهادی هاوبەش دانەرەکانی بکەن بەماڵەکانتان و گیانتان و زمانتان.**

٣٤٧١- عجبت من قوم من أمتي يركبون البحر كالملوك على الأسرة .

(صحيح) ( خ ) عن أم حرام. (صحيح النسائي ٣٢٤٤)

**٣٤٧١- سەیرم دێت لەکەسانێك لەئوممەتم سواری کەشتی دەبن لەدەریا، هەر وەکو چۆن پادشا لەسەر تەختی پادشایەتیە.**

---

[1] شاری قوستەنتەنیەیە.

٣٤٧٢- المجاهد من جاهد نفسه في الله.

(صحيح) ( ت حب ) عن فضالة بن عبيد. (الصحيحة ٥٤٩)

**٣٤٧٢- خەباتگێر ئەو كەسەیە خەباتی دەرونی خۆی بكات.**

٣٤٧٣- ناس من أمتي عرضوا علي غزاة في سبيل الله يركبون ثبج هذا البحر ملوكا على الأسرة.

(صحيح) ( ق ت ن ) عن أنس ( حم م ن ه ) عن أم حرام. (صحيح الترمذي ١٦٤٥)

**٣٤٧٣- خەڵكانێك لەئوممەتم پیشاندرا لەكاتی غەزاكردنیان لەپێناو خوادا سواری كەشتی دەبن لەناوەڕاستی دەریادا وەكو پادشا لەسەر تەختەكانیان[1].**

## بابەتی فەزڵی شەهیدبوون لە پێناو خوا

٣٤٧٤- أفضل الشهداء الذين يقاتلون في الصف الأول فلا يلفتون وجوههم حتى يقتلوا أولئك يتلبطون في الغرف العلى من الجنة يضحك إليهم ربك فإذا ضحك ربك إلى عبد في موطن فلا حساب عليه.

(صحيح) ( حم طب ) عن نعيم بن همار . (الصحيحة ٢٥٥٨)

**٣٤٧٤- چاكترین شەهیدەكان ئەوانەن كە لە ڕیزی یەكەمەدا دەجەنگن و، ڕوویان وەرناگێڕن تاكو دەكوژرێن، ئەوانە ڕادەبوێرن لەناو ژووره بەرزەكانی بەهەشتدا و، خوای گەورە بەدەمیانەوە پێدەكەنێ، ئەگەر پەروەردگاریشت لەهەر جێگەیەكدا بۆ بەندەیەك بێ پێبكەنێ لێپرسینەوەی لەسەر نیە.**

٣٤٧٥- أفضل الشهداء من سفك دمه و عقر جواده.

(صحيح) ( طب ) عن أبي أمامة . (الصحيحة ١٥٠٤)

**٣٤٧٥- چاكترین شەهیدان كەسێكە خوێنی بڕژێت و ئەسپەكەی بریندار و سەرەنگری بكرێت.**

٣٤٧٦- إن أرواح الشهداء في جوف طير خضر لها قناديل معلقة تحت العرش تسرح من الجنة حيث شاءت ثم تأوي إلى تلك القناديل فاطلع إليهم ربهم اطلاعة فقال: هل تشتهون شيئا ؟ قالوا: أي شيء نشتهي و نحن نسرح من الجنة حيث شئنا ؟ فيفعل ذلك بهم ثلاث مرات فلما رأوا أنهم لم يتركوا من أن يسألوا قالوا: يا رب نريد أن ترد أرواحنا في أجسادنا حتى نرجع إلى الدنيا فنقتل في سبيلك مرة أخرى ! فلما رأى أن ليس لهم حاجة تركوا.

(صحيح) ( م ت ) عن ابن مسعود . (الصحيحة ٢٦٣٣)

---

[1] لەبەر دەست ڕۆیشتویی و ماڵ خۆشی.

٣٤٧٦- گیانی شەهیدان لەناو باڵندەی سەوزدایە، چرای سەوزیان هەیە هەڵواسراوە لەژێر عەرشی خودا هەڵواسراون، بەئارەزووی خۆی لەنێو بەهەشتدا گەشتو گوزار دەکات و ئینجا دەگەڕێتەوە لای ئەو چرایانەو لەوێ ستار دەگرێت، خوای گەورە تەماشایەکی ئەوانی دەکات و دەفەرموێت: حەزتان لەچیە؟ وتیان: حەزمان لەچی بێت کە ئێمە لەناو بەهەشتدا دەگەڕێین بۆ هەر لایەك بمانەوێت دەچین، بەڵام خوای گەورە سێ جار ئەوەی لێ دووبارەکردنەوە، ئەوانیش کاتێك بینییان ناچارن داوای شتێك هەر بکەن دەڵێن: خوایە گیانەکانمان بگێڕەوە بۆ لاشەکانمان بۆ ئەوەی بگەڕێینەوە بۆ دونیا و جارێکی تر لە پێناوی تۆدا بکوژرێینەوە! ئەوسا کەبینی هیچ داواکارییەکیان نییە وازیان لێ هێنرا.

٣٤٧٧- إن أرواح الشهداء في طير خضر تعلق من ثمار الجنة.

(صحيح) ( ت ) عن كعب بن مالك . (الصحيحة ٩٩٥)

٣٤٧٧- گیانی شەهیدان لە دیمەنی باڵندەی سەوزدان و لەمیوەی بەهەشت دەخۆن.

٣٤٧٨- أول ما يهراق من دم الشهيد يغفر له ذنبه كله إلا الدين.

(حسن) ( طب ك ) عن سهل بن حنيف . (الصحيحة ١٧٤٢)

٣٤٧٨- لەگەڵ سەرەتای ڕژانی خوێنی شەهید خوای گەورە لەهەموو گوناهەکانی خۆش دەبێت بێجگە لە قەرزداری.

٣٤٧٩- شهداء الله في الأرض أمناء الله على خلقه قتلوا أو ماتوا.

(صحيح) ( حم ) عن رجال. (الصحيحة ١٩٠٢)

٣٤٧٩- شەهیدانی ڕێگای خوا لەسەر زەوی ئەمیندارانی خوان بۆ مەردومەکان بکوژرێن یان بمرن.

٣٤٨٠- الشهداء على بارق نهر بباب الجنة في قبة خضراء يخرج عليهم رزقهم من الجنة بكرة و عشيا.

(حسن) ( حم طب ك ) عن ابن عباس. (الترغيب ١٣٧٨)

٣٤٨٠- شەهیدان لەسەر بریقەی ڕوبارێکن لەگۆمەزێکی سەوزدا لەدەرگای بەهەشتا لەبەهەشتەوە بەیانیان و ئێواران بژێویان بۆ دێت.

٣٤٨١- الشهيد لا يجد ألم القتل إلا كما يجد أحدكم مس القرصة.

(صحيح) ( طس ) عن أبي قتادة. (الصحيحة ٩٦٠)

٣٤٨١- شەهید هەست ناکات بەئازاری کوژران، ئەوەندە نەبێت ئێوە هەست دەکەن بەگەستنێك.

٣٤٨٢- الشهيد لا يجد مس القتل إلا كما يجد أحدكم القرصة يقرصها.

(صحيح) ( ن ) عن أبي هريرة. (المشكاة ٣٨٣٦)

**٣٤٨٢- شەهید هەست بەئازاری کوژرانەکەی ناکات، ئەوەندە نەبێت کەسێك لەئێوە هەست گەستنی گەزندەیەك بکات.**

٣٤٨٣- الشهيد يشفع في سبعين من أهل بيته.

(صحيح) ( حب ) عن أبي الدرداء. (الصحيحة ٣٢١٣)

**٣٤٨٣- شەهید تکا دەکات بۆ حەفتا کەس لەکەس و کاری.**

٣٤٨٤- القتل في سبيل الله يكفر كل خطيئة إلا الدين.

(صحيح) ( م ) عن ابن عمرو ( ت ) عن أنس. (المشكاة ٣٨٠٢)

**٣٤٨٤- کوژران لە پێناو خوادا هەموو گوناهێك لادەبات قەرزاری نەبێت[1].**

٣٤٨٥- كفى ببارقة السيوف على رأسه فتنة.

(صحيح) ( ن ) عن رجل. (الجنائز ٣٦)

**٣٤٨٥- بەسە بریقەی شمشێرەکان لەسەر سەری شەهید وەکو گرفتاری[2].**

٣٤٨٦- كل كلم يكلمه المسلم في سبيل الله تعالى يكون يوم القيامة كهيئتها إذا طعنت تفجر دما و اللون لون الدم و العرف عرف مسك.

(صحيح) ( ق ) عن أبي هريرة. (الترغيب ١٣٢٥)

**٣٤٨٦- هەموو برینێك لە پێناو خوادا تووشی موسوڵمان دەبێت، لەڕۆژی قیامەتدا وەکو ئەو شێوەی ئەوکاتەیە کەتیرەکەی لێدراوە خوێنی لێ دەچۆڕێ، ڕەنگەکەی ڕەنگی خوێنە، بۆنیشی بۆنی میسکە.**

٣٤٨٧- للشهيد عند الله سبع خصال: يغفر له في أول دفعة من دمه و يرى مقعده من الجنة و يحلى حلة الإيمان و يزوج اثنين و سبعين زوجة من الحور العين و يجار من عذاب القبر و يأمن من الفزع الأكبر و يوضع على رأسه تاج الوقار الياقوتة منه خير من الدنيا و ما فيها و يشفع في سبعين إنسانا من أهل بيته.

(صحيح) ( حم ت ه ) عن المقدام بن معدي كرب. (الجنائز ٣٥)

**٣٤٨٧- شەهید لەلای خوا حەوت خەسڵەتی هەیە: لەگەڵ یەکەمین دڵۆپەی خوێنی خوا لێ ی خۆش دەبێت، جێگای خۆی لەبەهەشتدا دەبینێت، و پۆشاکی زێڕینی ئیمانیشی**

---

[1] چونکە مافی ئادەمیزادە. السراج المنير ج١ ص٥٦٥.

[2] واتە: دوبارە لەگۆڕەکەیدا دووچاری ناڕەحەتی و گرفتاری نابێت.

**لەبەر دەکرێت و، حەفتاو دوو لەحۆرییەکانی بەهەشتی پێدەدرێت و ، پەنا دەدرێت لەسزاو ئەشکەنجەی ناو گۆڕ و، بێترس دەبێت لەترس و بیمی ڕۆژی قیامەت، تاجی شکۆداریشی دەخرێتە سەر، کە تەنها مروارییەکی چاکترە لەدونیا و لەوەش لەدونیادا هەیە و، دەبێتە تکا کاریش بۆ حەفتا کەس لەکەس و کارەکانی.**

٣٤٨٨- لما أصيب إخوانكم بأحد جعل الله أرواحهم في جوف طير خضر ترد أنهار الجنة تأكل من ثمارها و تأوي إلى قناديل من ذهب معلقة في ظل العرش فلما وجدوا طيب مأكلهم و مشربهم و مقيلهم قالوا: من يبلغ إخواننا عنا أنا أحياء في الجنة نرزق لئلا يزهدوا في الجهاد و لا يتكلوا عند الحرب ؟ فقال الله تعالى: أنا أبلغهم عنكم.

(صحيح) ( حم د ك ) عن ابن عباس. (المشكاة ٣٨٥٣)

**٣٤٨٨- کاتێك براکانتان لەئوحود پێکران، خوای گەورە، گیانی ئەوانی خستە ناو باڵندەی سەوز، دەچنە سەر ڕوبارەکانی بەهەشت و لەبەر و بوومەکانی دەخۆن و دەچنە پاڵ چراگەلێکی ئاڵتوون کە لەسایەی عەرشدا هەڵواسراون، جا کاتێك خۆشی خواردن و خواردنەوەو سەرخەوی ئەوێیان بینی، وتیان: کێ براکانمان ئاگادار دەکاتەوە کەئێمە لەبەهەشتدا زیندووین و ڕۆزی خۆمان دەخۆین، نەکو ساردببنەوە لەشەهیدی و لەکاتی جەنگدا پاڵی لێ بەنەوە، خوای گەورە فەرموی: من ئاگاداریان دەکەمەوە بۆتان.**

٣٤٨٩- ما أحد يدخل الجنة يحب أن يرجع إلى الدنيا و أن له ما على الأرض من شيء غير الشهيد فإنه يتمنى أن يرجع فيقتل عشر مرات لما يرى من الكرامة.

(صحيح) ( ق ت ) عن أنس. (الترغيب ١٣٥٢)

**٣٤٨٩- کەس نییە بچێتە بەهەشتەوەو حەز بکات بگەڕێتەوە بۆ دونیا، تەنها شەهید نەبێت، حەز دەکات بگەڕێتەوەو دە جاری تر بکوژرێت، کە ئەو ڕێزو حورمەتەی دەبینێت.**

٣٤٩٠- ما على الأرض من نفس تموت و لها عند الله خير تحب أن ترجع إليكم و لها الدنيا إلا القتيل في سبيل الله فإنه يحب أن يرجع فيقتل مرة أخرى لما يرى من ثواب الله له.

(صحيح) ( حم ن ) عن عبادة بن الصامت. (الصحيحة ٢٢٢٨)

**٣٤٩٠- کەسێك نییە لەسەر زەوی بمرێت و لە چاکەیەکی لای خوای باش بێت و، حەز بکات بگەڕێتەوە بۆ دونیا، تەنها شەهید نەبێت لەپێناوی خوادا، حەز دەکات بگەڕێتەوە دونیا و جارێکی تر بکوژرێتەوە بەهۆی ئەو پاداشتەی خوا کە پێی بەخشیوە.**

٣٤٩١- ما من الناس من نفس مسلمة يقبضها ربها تحب أن ترجع إليكم و أن لها الدنيا و ما فيها غير الشهداء و لأن أقتل في سبيل الله أحب إلي من أن يكون لي أهل الوبر و المدر.

(حسن) ( حم ن ) عن محمد بن أبي عميرة وما له غيره. (الترغيب ١٣٥٧)

**٣٤٩١- له‌نێو خه‌ڵكيدا كه‌سێكى موسوڵمان نييه خواى گه‌وره گيانى وه‌ربگرێته‌وه‌و حه‌ز بكات بگه‌ڕێته‌وه لاتان ئه‌گه‌ر هه‌موو دونياشى پێ بده‌ن، ته‌نها شه‌هيده‌كان به‌بێ، ئه‌گه‌ر له پێناو خوادا بكوژرێم خۆشتره به‌لامه‌وه كه هه‌موو خه‌ڵكى لادێ وشار بۆ من بێت.**

٣٤٩٢- ما من مجروح يجرح في سبيل الله و الله أعلم بمن يجرح في سبيله إلا جاء يوم القيامة و جرحه كهيئته يوم جرح اللون لون الدم و الريح ريح المسك.

(صحيح) ( ه ) عن أبي هريرة. (الترغيب ١٣٢٥)

**٣٤٩٢- هه‌ر كه‌سێك بريندار بوو بێت له پێناو خوا گه‌وره خۆيشى ده‌زانێت كێ له پێناويدا بريندار ده‌بێت، له‌ڕۆژى قيامه‌تدا دێت و برينه‌كه‌ى وه‌كو ئه‌و ڕۆژه‌يه تيايدا بريندار بووه، ڕه‌نگى ڕه‌نگى خوێنه‌و، بۆنى بۆنى ميسكه.**

٣٤٩٣- ما من مكلوم يكلم في الله إلا جاء يوم القيامة و كلمه يدمى اللون لون الدم و الريح ريح المسك.

(صحيح) ( خ ) عن أبي هريرة. (الترغيب ١٣٢٥)

**٣٤٩٣- هه‌ر برينداريك له پێناو خوادا بريندار بوو بێت، له‌ڕۆژى قيامه‌تدا دێت و برينه‌كه‌ى خوێنى لێ ده‌تكێ، ڕه‌نگى ڕه‌نگى خوێنه وبۆنى بۆنى ميسكه.**

٣٤٩٤- ما من نفس تموت لها عند الله خير يسرها أن ترجع إلى الدنيا و أن لها الدنيا و ما فيها إلا الشهيد فإنه يتمنى أن يرجع إلى الدنيا فيقتل مرة أخرى لما يرى من فضل الشهادة.

(صحيح) ( حم ق ت ) عن أنس. (الترغيب ١٣٥٢)

**٣٤٩٤- كه‌س نييه بمرێت و لاى خواى خۆش بێت و حه‌ز بكات بگه‌ڕێته‌وه بۆ دونيا، با هه‌موو دونيايشى بدرێتێ، شه‌هيد نه‌بێ، ئاواته خوازه بگه‌ڕێته‌وه دونيا و جارێكى تر بكوژرێته‌وه، به‌هۆى ئه‌وه‌ى كه‌ده‌بينێ شه‌هيدى چه‌ند چاكه.**

٣٤٩٥- ما يجد الشهيد من مس القتل إلا كما يجد أحدكم من مس القرصة.

(حسن) ( ت هـ حب ) عن أبي هريرة. (الترغيب ١٣٦٧)

**٣٤٩٥- شه‌هيد هه‌ست ناكات به‌كاريگه‌رى كوژران ئه‌وه‌نده نه‌بێت كه‌سێك له‌ئێوه هه‌ست ده‌كات به‌كاريگه‌رى گه‌ستنێك.**

٣٤٩٦- من مات مرابطا في سبيل الله أجرى الله عليه عمله الصالح الذي كان يعمل عليه و أجرى عليه رزقه و أمن من الفتان و بعثه الله يوم القيامة آمنا من الفزع.

(صحيح) ( ه ) عن أبي هريرة. (الترغيب ١٢٢١)

**٣٤٩٦- هەر كەسێك بمرێت لەكاتی پاسەوانێتی لەپێناو خوادا، خوای گەورە كردەوە چاكەكەی دەیكرد بۆی بەردەوام دەكات، ڕۆزیشی بەردەوام بۆ دێت ئەنینی دەكات لەتاقیكردنەوەی گۆڕ و، لەڕۆژی قیامەتیشدا بەئارامی و بێ ترس قیامەت زیندووی دەكاتەوە.**

٣٤٩٧- من مات مرابطا في سبيل الله أمنه الله من فتنة القبر.

(صحيح) ( طب ) عن أبي أمامة. (الترغيب ١٢١٨)

**٣٤٩٧- هەر كەسێك لەكاتی پاسەوانێتی لەپێناو خوادا بمرێت خوای گەورە لەسزای گۆڕ دڵنیای دەكات.**

٣٤٩٨- من رابط ليلة في سبيل الله كانت له كألف ليلة صيامها و قيامها .

(حسن) ( ه ) عن عثمان. (الترغيب ١٢٢٤)

**٣٤٩٨- هەر كێ شەوێك لەپێناوی خوادا پاسەوانێتی بگرێت وەكو ئەوەیە هەزار ڕۆژ بەڕۆژوو بوو بێت و شەوەكەشی شەونوێژی كرد بێت.**

٣٤٩٩- و الذي نفسي بيده لا يكلم أحد في سبيل الله و الله أعلم بمن يكلم في سبيله إلا جاء يوم القيامة و جرحه يشخب اللون لون الدم و الريح ريح المسك.

(صحيح) ( حم ق ) عن أبي هريرة. (المشكاة ٣٨٠٢)

**٣٤٩٩- سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە، هەر كەسێكتان لەپێناو خوادا بریندار بن – خوای گەورەیش خۆی زانایە بەو كەسەی لەپێناو خۆیدا بریندار دەبێت- لەڕۆژی قیامەتدا دێت و برینەكەی خوێنی لێ دەتكێ، ڕەنگی ڕەنگی خوێنەو بۆنی بۆنی میسكە.**

٣٥٠٠- لا تبكيه ما زالت الملائكة تحفه بأجنحتها حتى رفعتموه.

(صحيح) ( ن ) عن جابر. (الجنائز ٢٠)

**٣٥٠٠- بۆ ئەو مەگری! بەردەوام فریشتەكان بەباڵیان دەورەیان دابوو تاكو بەرزتان كردەوە.**

٣٥٠١- لا يكلم أحد في سبيل الله و الله أعلم بمن يكلم في سبيله إلا جاء يوم القيامة و جرحه يثعب دما اللون لون الدم و الريح ريح المسك.

(صحيح) ( ت ن ) عن أبي هريرة. (المشكاة ٣٨٠٢)

**٣٥٠١- هەر كەسێك بریندار ببێت لە پێناو خوادا -خوای گەورە خۆیشی زاناترە بەو كەسەی لە پێناویدا بریندار دەبێت- لەڕۆژی قیامەتدا دێت و برینەكەی خوێنی لێ دەچۆڕێت، ڕەنگی ڕەنگی خوێنەو بۆنی بۆنی میسكە.**

٣٥٠٢- يا أم حارثة ! إنها جنات في جنة و إن ابنك أصاب الفردوس الأعلى و الفردوس ربوة الجنة و أوسطها و أفضلها.

(صحيح) ( ت ) عن أنس. (الصحيحة ١٨١١)

**٣٥٠٢- ئەی دایكی حاریسە! چەند بەهەشتێكەو لەیەك بەهەشتدا، كوڕەكەی تۆش فیردەوسی هەرە بەرزی بەدەست هێنا، فیردەوسیش تە پۆڵكەی بەهەشتەو ناوەڕاست و چاكترینێتی.**

٣٥٠٣- يا أم حارثة ! إنها ليست بجنة واحدة و لكنها جنان كثيرة و إن حارثة لفي الفردوس الأعلى.

(صحيح) ( حم خ ) عن أنس. (الصحيحة ١٨١١)

**٣٥٠٣- ئەی دایكی حاریسە! تەنها بەهەشتێك نییە، بەڵكو چەندین بەهەشتە، حاریسەیش لەفیردەوسی هەرە بەرزیدایە.**

٣٥٠٤- يؤتى بالرجل يوم القيامة من أهل الجنة فيقول له: يا ابن آدم ! كيف وجدت منزلك ؟ فيقول: أي رب ! خير منزل فيقول: سل و تمن فيقول: يا رب ما أسأل و لا أتمنى إلا أن تردني إلى الدنيا فأقتل في سبيلك عشر مرار لما يرى من فضل الشهادة و يؤتى بالرجل من أهل النار فيقول له: يا ابن آدم ! كيف وجدت منزلك ؟ فيقول: أي رب ! شر منزل فيقول له: أتفتدي منه بطلاع الأرض ذهبا ؟ فيقول: أي رب ! نعم فيقول: كذبت قد سألتك أقل من ذلك و أيسر فلم تفعل فيرد إلى النار.

(صحيح) ( حم م ن ) عن أنس. (الترغيب ١٣٥٣)

**٣٥٠٤- پیاوی وا دەهێنن بۆ لای پەروەردگار لەئەهلی بەهەشت و پێی دەفەرمووێت: ئەی ئادەمیزاد! شوێنەكەت چۆنە؟ ئەویش دەڵێت: خوایە گیان چاكترین ماڵ و مەنزڵە، دەفەرموێت: داوا بكەو خۆزگە بخوازە، ئەویش دەڵێت: داواكاری و ئاواتی من تەنها ئەوەیە بمگێڕیتەوە بۆ دونیاو هەتا دە جاری تر لە پێناوتدا بكوژرێمەوە، بەهۆی ئەوەی كە دەیبینێ لەگەورەیی شەهید بوون، كەسی وایش هەیە لەئەهلی دۆزەخ خوای گەورە پێی دەفەرموێت: ئەی ئادەمیزاد! شوێنەكەت چۆنە بەلاتەوە؟ ئەویش دەڵێت خوایە گیان، خراپترین شوێنە، خوای گەورەیش دەفەرموێت: دەتەوێ**

**خۆتی لێ ڕزگار کەی و بەرامبەر لێواو و لێوی زموی ئاڵتوون، بدەی ئەویش دەڵێت: ئەوێ واللە خوای گەورە پێی دەفەرمووێت: درۆ دەکەیت، من داوای زۆر لەوە کەمترم لێ کردیت نەتکرد، ئیتر دەیگێڕنەوە بۆ دۆزەخ.**

٣٥٠٥- يشفع الشهيد في سبعين من أهل بيته.

(صحيح) ( د ) عن أبي الدرداء. (صحيح أبي داود ٢٢٧٧)

**٣٥٠٥- شەهید دەبێتە تکاکار بۆ حەفتا کەس لەکەس و کاری.**

٣٥٠٦- يغفر للشهيد كل ذنب إلا الدين.

(صحيح) ( حم م ) عن ابن عمرو. (الإرواء ١١٨٢)

**٣٥٠٦- خوای گەورە لەهەموو گوناهێکی شەهید خۆش دەبێت قەرزاری نەبێت.**

## بابەتی ئەوەی چاوەڕوانی شەهیدی لێ دەکرێت

٣٥٠٧- اللهم اجعل فناء أمتي قتلا في سبيلك بالطعن و الطاعون.

(صحيح) ( حم طب ) عن أبي بردة الأشعري . (الإرواء ١٦٣٦)

**٣٥٠٧- خوایە لەناو چوونی ئوممەتەکەم با بەکوژران بێ لە پێناوتدا و بەتیرو بەتاعون بێت.**

٣٥٠٨- القتيل في سبيل الله شهيد و المبطون شهيد و المطعون شهيد و الغريق شهيد و النفساء شهيدة.

(صحيح) ( طب ) عن عبدالله بن بسر. (الجنائز ص٣٩)

**٣٥٠٨- کوژراو لە پێناو خوادا شەهیدە و، ئەوەش بەژانە سك بمرێت شەهیدە، ئەوەش بە پەتای تاعون بمرێت شەهیدە، خنکاویش شەهیدە، مردن بە زەیستانیش شەهیدیە.**

٣٥٠٩- القتل في سبيل الله شهادة و الطاعون شهادة و البطن شهادة و الغرق شهادة و النفساء شهادة.

(صحيح) ( حم الضياء ) عن عبادة بن الصامت. (الجنائز ص٣٩)

**٣٥٠٩- کوژران لە پێناو خوا شەهیدیە، مردن بە تاعون شەهیدیە، مردن بەژانە سك شەهیدیە، خنکاو شەهیدیە، ئافرەت بەزەیستانی بمرێت شەهیدیە.**

٣٥١٠- القتل في سبيل الله شهادة و الطاعون شهادة و الغرق شهادة و البطن شهادة و الحرق شهادة و السل و النفساء يجرها ولدها بسررها إلى الجنة.

(حسن) ( حم ) عن راشد بن حبيش. (الجنائز ص٣٩)

**٣٥١٠- كوژران لە پێناوی خوادا شەهیدیە، تاعون شەهیدیە، خنكان شەهیدیە،مردن بەژانە سك شەهیدیە، سووتان شەهیدیە، خنكان بەلافاو، مردن بەزەیستانی منداڵەكە دایكی بەناوكی ڕایدەكێشێ بۆ بەهەشت.**

٣٥١١- إن شهداء أمتي إذن لقليل القتل في سبيل الله شهادة و المطعون شهادة و المرأة تموت بجمع شهادة و الغرق و الحرق و المجنوب شهادة.

(صحيح) ( ه ) عن جابر بن عتيك . (الترغيب ١٣٤٩)

**٣٥١١- كەواتەی بەڕاستی شەهیدانی ئوممەتم كەمن، كوژران لەپێناو خوادا شەهیدیە، نەخۆشی تاعون شەهیدیە، ئافرەتیش بمرێت ومناڵی لەسكدا بێت شەهیدە، خنكان و سوتاوی و ئەو كەسەی بەنەخۆشی** ( ذات الجنب )[١] **هەوگرتنی پەردەكانی سیدەمرێت شەهیدبن.**

٣٥١٢- البطن و الغرق شهادة.

(صحيح) ( طس ) عن أبي هريرة . (الجنائز ٣٨)

**٣٥١٢- مردن بەژانە سك و خنكان شەهیدیە.**

٣٥١٣- خمس من قبض في شيء منهن فهو شهيد: المقتول في سبيل الله شهيد و الغريق في سبيل الله شهيد و المبطون في سبيل الله شهيد و المطعون في سبيل الله شهيد و النفساء في سبيل الله شهيدة.

(صحيح) ( ن ) عن عقبة بن عامر . (الجنائز ٣٩)

**٣٥١٣- پێنج شت هەن، هەر كەس بەیەكێكیان بمرێت شەهیدە: كوژراو لەپێناو خوادا شەهیدە، خنكاو لەپێناو خوادا شەهیدە، مردن بە ئازاری ناو سك لەپێناو خوادا شەهیدە، مردوو بەنەخۆشی تاعوون لەپێناوی خوادا شەهیدە، زەیستانیش لەپێناوی خوا شەهیدە.**

٣٥١٤- السل شهادة.

(صحيح) ( أبو الشيخ ) عن عبادة بن الصامت. (الجنائز ٤٠)

**٣٥١٤- تووش بوون بەسیل شەهیدیە.**

٣٥١٥- الشهادة سبع سوى القتل في سبيل الله المقتول في سبيل الله شهيد: و المطعون شهيد و الغريق شهيد و صاحب ذات الجنب شهيد و المبطون شهيد و صاحب الحريق شهيد و الذي يموت تحت الهدم شهيد و المرأة تموت بجمع شهيدة.

(صحيح) ( مالك حم د ن ه حب ك ) عن جابر بن عتيك. (المشكاة ١٥٦١)

**٣٥١٥- شه‌هيدى حه‌وت جۆره جگه له‌كوژران له‌پێناوى خوادا: كوژراو له‌پێناوى خوادا شه‌هيده، مردوى تاعون شه‌هيده، خنكاو شه‌هيده، مردوو به‌نه‌خۆشى (ذات الجنب)[1] هه‌وگرتنى په‌رده‌ى سى شه‌هيده، مردوو به‌ژانه سك شه‌هيده، سووتاو شه‌هيده، مردووى ژێر ڕوخان و وێرانه‌دا شه‌هيده، ئافره‌ت به‌سه‌ر مناڵه‌وه بمرێت شه‌هيده.**

٣٥١٦- الشهداء خمسة: المطعون و المبطون و الغريق و صاحب الهدم و الشهيد في سبيل الله.

(صحيح) ( مالك ق ت ) عن أبي هريرة. (المشكاة ١٥٤٦)

**٣٥١٦- شه‌هيده‌كان پێنج جۆرن: تاعون ومرده و، ژانه سكه و، خنكاو و، ئه‌و كه‌سه‌ى شتى به‌سه‌ريدا ده‌ڕوخێ و، ئه‌و كه‌سه‌ش له‌پێناوى خوادا شه‌هيد ده‌بێت.**

٣٥١٧- الطاعون شهادة لأمتي و وخز أعدائكم من الجن غدة كغدة الإبل تخرج في الآباط و المراق من مات فيه مات شهيدا ومن أقام فيه كان كالمرابط في سبيل الله و من فر منه كان كالفار من الزحف.

(حسن) ( طس أبو نعيم في فوائد أبي بكر بن خلاد ) عن عائشة. (الصحيحة ١٩٢٨)

**٣٥١٧- تاعون شه‌هيديه بۆ ئوممه‌ته‌كه‌م، زام و تيراوى ى[2] دوژمنه‌كانيشتان له جنۆكه، ئاڵۆيه‌كه وه‌كو ئاڵوى وشتر له‌ژێر باڵ و نه‌رمى سكدا ده‌رده‌چێت هه‌ر كه‌س به‌وه بمرێت به‌شه‌هيدى ده‌مرێت، هه‌ر كه‌سيش تيايدا بمێنێته‌وه[3] وه‌كو ئه‌وه‌يه پاسه‌وانيتى بكات له‌پێناو خوادا، هه‌ر كه‌سيش لێى هه‌ڵبێت وه‌كو ئه‌وه‌يه له‌ڕۆژى جه‌نگدا هه‌ڵهاتبێت.**

٣٥١٨- الطاعون شهادة لكل مسلم

(حسن) ( حم ق ك ) عن أنس. (الجنائز ٣٧)

**٣٥١٨- تاعون شه‌هيديه. بۆ هه‌موو موسوڵمانێك.**

٣٥١٩- الطاعون غدة كغدة البعير المقيم بها كالشهيد و الفار منها كالفار من الزحف

(صحيح) ( حم ) عن عائشة. (الصحيحة ١٩٢٨)

**٣٥١٩- تاعون ئاڵۆيه‌كه وه‌كو ئاڵۆى وشتر، ئه‌و كه‌سه‌ى تياشيدا بمێنێته‌وه وه‌كو شه‌هيده، ئه‌و كه‌سه‌يش لێى هه‌ڵبێت وه‌كو كه‌سێكه له‌جيهاد و له‌كاتى هێرش بردندا هه‌ڵهاتبێت.**

---

[1] هه‌وگرتنى په‌رده‌ى سى.

[2] واته: سزاو زام و برينى جێگه تيرى ئه‌وانه به‌زامێك ده‌وترێت به‌سه‌ره‌تير يان ده‌رزى كرا بێت ده‌راو ديو ئه‌بو بێت.

[3] واته: ببێته نه‌خۆشى درێژخايه‌ن.

٣٥٢٠- الطاعون كان عذابا يبعثه الله على من يشاء و إن الله جعله رحمة للمؤمنين فليس من أحد يقع الطاعون فيمكث في بلده صابرا محتسبا يعلم أنه لا يصيبه إلا ما كتب الله له إلا كان له مثل أجر شهيد .

(صحيح) ( حم خ ) عن عائشة. (الجنائز ٣٧)

**٣٥٢٠- تاعون سزایه‌که خوای گه‌وره ده‌ینێرێت بۆ هه‌ر که‌سێك بیه‌وێت، خوای گه‌وره‌یش کردوویه‌تی به‌سۆزێك بۆ ئیمانداران ، هه‌ر کاتێك تاعون بکه‌وێته‌وه و که‌سێك ناوچه‌که‌ی دوچاری بێت و له‌شوێنی و شاری خۆی بمێنێته‌وه‌و ئارام بگرێت و چاوه‌ڕوانی پاداشت بێ و بزانێت هه‌رچی تووشی ده‌بێت خوای گه‌وره بۆ نووسیوێتی، حه‌تمه‌ن پاداشتی شه‌هیدی بۆ ده‌نوسرێت.**

٣٥٢١- الطاعون و الغرق و البطن و الحرق و النفساء شهادة لأمتي .

(صحيح) ( حم طب الضياء ) عن صفوان بن أمية. (الجنائز ٣٨)

**٣٥٢١- مردن به‌تاعون و خنکان و ژانه سك و سووتان و زه‌یستانی، هه‌موو ئه‌مانه شه‌هیدین بۆ ئوممه‌ته‌که‌م.**

٣٥٢٢- الطاعون وخز أعدائكم من الجن و هو لكم شهادة .

(صحيح) ( ك ) عن أبي موسى. (الإرواء ١٦٣٦)

**٣٥٢٢- تاعون تێژه‌نینی دوژمنه‌کانتانه له‌جنۆکه، شه‌هیدیه بۆ ئێوه.**

٣٥٢٣- الطاعون آية الرجز ابتلى الله به ناسا من عباده فإذا سمعتم به فلا تدخلوا عليه و إذا وقع بأرض و أنتم بها فلا تفروا منه .

(صحيح) ( م ) عن أسامة بن زيد. (الصحيحة ٢٩٣١)

**٣٥٢٣- تاعون نیشانه‌ی تاوانه، خوای گه‌وره هه‌ندێ له‌به‌نده‌کانی پێ تاقی کردۆته‌وه، ئه‌گه‌ر بیستتان له‌جێگایه‌ك که‌وتووه‌ته‌وه مه‌چنه ئه‌و جێگایه، ئه‌گه‌ریش له‌جێگایه‌ك که‌وته‌وه‌و، ئێوه له‌و جێگا بوون لێی لێی ڕامه‌که‌ن.**

٣٥٢٤- الطاعون بقية رجز أو عذاب أرسل على طائفة من بني إسرائيل فإذا وقع بأرض و أنتم بها فلا تخرجوا منها فرارا منه و إذا وقع بأرض و لستم بها فلا تهبطوا عليها .

(صحيح) ( ق ت ) عن أسامة. (صحيح الترمذي ١٠٦٥)

**٣٥٢٤- تاعون پاشماوەی تاوان یان سزایە، نێردراوەتە سەر کۆمەڵێك لەبەنی ئیسرائیل، جا ئەگەر لەخاکێکدا کەوتەوەو، لەوێ بوون، لێی دەرمەچن وەکو هەڵهاتن، ئەگەریش لەشوێنێك کەوتەوەو، ئێوە لەوێ نەبوون، لەو شوێنە دامەبەزن.**

٣٥٢٥- الطعن و الطاعون و الهدم و أكل السبع و الغرق و الحرق و البطن و ذات الجنب شهادة .

(صحيح) ( ابن قانع ) عن ربيع الأنصاري. (الترغيب ١٣٩٥)

**٣٥٢٥- مردنی تیراوی و[1]، تاعون[2]و، ڕوخان و، خواردنی دڕندە و، خنکان و سوتان و، ژانە سك و، ( ذات الجنب ) هەوگرتنی پەردەی سی یەکان، شەهیدیە.**

٣٥٢٦- الغريق شهيد و الحريق شهيد ........ و المبطون شهيد و من يقع عليه البيت فهو شهيد و من قتل دون ماله فهو شهيد و من قتل دون نفسه فهو شهيد .......

(صحيح) ( ابن عساكر ) عن علي. (الضعيفة ٣٩٦٧)

**٣٥٢٦- خنکاو شەهیدە، سووتاو شەهیدە، بەژانە سك مردن شەهیدیە، ئەو کەسەی خانووی بەسەردا بڕوخێت شەهیدە، هەر کەسێك لەکاتی بەرگریکردنی ماڵی خۆی و نەفسی خۆی بمرێت شەهیدە.**

٣٥٢٧- الغريق في سبيل الله شهيد.

(صحيح) ( تخ ) عن عقبة بن عامر. (الجنائز ص٣٩)

**٣٥٢٧- خنکاو لە پێناوی خوادا شەهیدە.**

٣٥٢٨- فناء أمتي بالطعن و الطاعون وخز أعدائكم من الجن و في كل شهادة.

(صحيح) ( حم طب ) عن أبي موسى ( طس ) عن ابن عمر. (الإرواء ١٦٣٦)

**٣٥٢٨- لەناو چوونی ئوممەتم تیر بازیە[3]، تاعونیش تیر لێ دانی دوژمنە جنۆکەکانتان هەموشیان هەر شەهیدبن.**

٣٥٢٩- قاتل دون مالك حتى تحوز مالك أو تقتل فتكون من شهداء الآخرة.

(صحيح) ( حم طب ) عن مخارق. (الإرواء ١٥١٢)

---

[1] واتە : مردن لەئە نجامی بریندار بەڕم و تیر و وێنەیان.

[2] واتە : مردن بە(( کۆلێرا )) سك چون و ڕشانەوە.

[3] واتە بەکوشتارو جەنگە.

**٣٥٢٩- بجەنگێ لە پێناو ماڵەکەت تاکو بەدەستی دەهێنی یان دەکوژرێیت بۆ ئەوەی لە شەهیدانی دواڕۆژ بێت.**

٣٥٣٠- قتل الصبر لا يمر بذنب إلا محاه.

(حسن) ( البزار ) عن عائشة. (الصحيحة ٥٠١٦)

**٣٥٣٠- کوشتنی ئارام[1] بەسەر هیچ گوناهێکدا تێپەڕ نابێت تاکو نەیسڕێتەوە.**

٣٥٣١- للمائد أجر شهيد و للغريق أجر شهيدين.

(صحيح) ( طب ) عن أم حرام. (الإرواء ١١٨٠)

**٣٥٣١- ئەو کەسەی لەدەریا سەری لەگێژەوە دێت[2] پاداشتی شەهیدێکی هەیە، خنکاویش پاداستی دوو شەهیدی هەیە.**

٣٥٣٢- ما تقولون في الشهيد فيكم ؟ قالوا: القتل في سبيل الله قال: إن شهداء أمتي إذن لقليل من قتل في سبيل الله فهو شهيد و من مات في سبيل الله فهو شهيد و المبطون شهيد و المطعون شهيد و الغرق شهيد.

(صحيح) ( ە ) عن أبي هريرة. (الجنائز ص٣٦)

**٣٥٣٢- دەربارەی شەهیدی ناو خۆتان چی دەڵێن ؟ وتیان: کەسێکە بکوژرێت لە پێناو خوا، فەرمووی: کەواتە شەهیدانی ئوممەتەکەم کەمن، هەر کەسێك لە پێناو خوا بکوژرێت شەهیدە، هەر کەسێك بمرێت لە پێناو خوادا شەهیدە، هەر کەسێك بەژانە سك بمرێت شەهیدە، هەر کەسێك بە پەتای تاعون بمرێت شەهیدە، خنکاویش شەهیدە.**

٣٥٣٣- ما من مسلم يظلم مظلمة فيقاتل فيقتل إلا قتل شهيدا.

(صحيح) ( حم ) عن ابن عمرو. (الجنائز ص٤٢)

**٣٥٣٣- هەر موسوڵمانێك ستەمێکی لێ بکرێت و شەڕ لەگەڵ ستەمکارەکەی بکات و بکوژرێت، بەشەهیدی دەمرێت.**

٣٥٣٤- من أريد ماله بغير حق فقاتل فقتل فهو شهيد.

(صحيح) ( ٣ ) عن ابن عمرو. (الإرواء ١٥٢٦)

---

[1] **واتە گرتنی گیانلەبەرێك وکوشتنی بەزەلیلی و هێواش هێواش بۆ ئەوەی بەئەشکەنجە و ئازار گیانی دەربچێت جا مرۆڤ بێت یان هەر گیانلەبەرێکی تر.**

[2] **مەبەست ئەو کەسەیە کاتێك لەدەریادا ئاڵۆزی ئاوو هەوا و شەپۆلی سامناکی دەریا کەشتی و پاپۆڕ دوچاری شپرزەیی دەکات ئەویش سەر لەگێژەوە بێت.**

**٣٥٣٤- هەر كەسێك ماڵی ببڕێت بەناهەق و شەڕی لەسەر بكات و بكوژرێت.**

٣٥٣٥- من صرع عن دابته فهو شهيد.

(صحيح) ( طب ) عن عقبة بن عامر. (الصحيحة ٢٣٤٦)

**٣٥٣٥- هەر كەسێك لەولاخەكەی بكەوێتە خوارەوەو بمرێت شەهیدە.**

٣٥٣٦- من قتل في سبيل الله فهو شهيد و من مات في سبيل الله فهو شهيد و من مات في الطاعون فهو شهيد و من مات في البطن فهو شهيد و من غرق فهو شهيد.

(صحيح) ( م ) عن أبي هريرة. (المشكاة ٣٨١١)

**٣٥٣٦- هەر كەسێك لە پێناو خوا بكوژرێت شەهیدە، هەر كەسیكیش بمرێت لە پێناو خوا شەهیدە، هەر كەسێكیش بە پەتای تاعون بمرێت شەهیدە، هەر كەسیكیش بەژانە سك بمرێت شەهیدە، هەر كەسێكیش بخنكێت شەهیدە.**

٣٥٣٧- من قتله بطنه لم يعذب في قبره.

(صحيح) ( حم ت ن حب ) عن خالد بن عرفطة وسليمان بن صرد. (المشكاة ١٥٧٣)

**٣٥٣٧- هەر كەسێك ژانە سك بیكوژێت لەگۆڕەكەیدا ئازار نادرێت.**

٣٥٣٨- المائد في البحر الذي يصيبه القيء له أجر شهيد و الغريق له أجر شهيدين.

(صحيح) ( د ) عن أم حرام. (الإرواء ١١٨٠)

**٣٥٣٨- هەر كەسێك سەری گێژ بخوات لەدەریاداو و بڕشێتەوە پاداشتی شەهیدێكی هەیە، خنكاویش پاداشتی دوو شەهیدی هەیە.**

٣٥٣٩- الميت من ذات الجنب شهيد.

(صحيح) ( حم طب ) عن عقبة بن عامر. (الصحيحة ٢٣٧٢)

**٣٥٣٩- ئەو كەسەی بە( ذات الجنب ) هەوگرتنی پەردەی سیەكان بمرێت شەهیدە.**

٣٥٤٠- نعم الميتة أن يموت الرجل دون حقه.

(صحيح) ( حم ) عن سعد. (الصحيحة ٦٩٧)

**٣٥٤٠- چاكترین مردن مردنی پیاوێكە لە پێناو مافی خۆی.**

٣٥٤١- و الذي نفسي بيده إن السقط ليجر أمه بسرره إلى الجنة إذا احتسبته.

(حسن) ( ه ) عن معاذ. (الترغيب ٢٠٠٨)

**٣٥٤١- سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە منالی لەبارچوو بەناوكی دایكی بەرەو بەهەشت ڕادەكێشرێت ئەگەر دایكەكە چاوەڕوانی پاداشت بوبێت لەمردنی ناڵەكەیدا.**

٣٥٤٢- و ما تعدون الشهادة إلا من قتل في سبيل الله ؟ إن شهداءكم إذا لقليل القتل في سبيل الله شهادة و البطن شهادة و الحرق شهادة و الغرق شهادة و المغموم - يعني الهدم - شهادة و المجنوب شهادة و المرأة تموت بجمع.

(صحيح) ( ن ) عن عبدالله بن جبر. (الجنائز ٣٩)

**٣٥٤٢- ئێوە تەنها ئەو كەسەى لە پێناو خوا نەكوژريت بەشەهيدى نازانن؟ كەواتە شەهيدانى ئێوە كەمن، كوژرا لە پێناو خوا شەهيديە، مردن بەژانە سك شەهيديە، سوتان شەهيديە، خنكان شەهيديە، خانوو بەسەر كەسێكدا رِوخان شەهيديە، مردوو بەهۆى** (ذات الجنب) **هەوگرتنى پەردەى سيەكان شەهيديە، ئەو ئافرەتەى بەسەر منالەوە دمريت شەهيدە.**

٣٥٤٣- من سأل الله الشهادة بصدق بلغه الله منازل الشهداء و إن مات على فراشه.

(صحيح) ( م) عن سهل بن حنيف. (الصحيحة ١٧٤٢)

**٣٥٤٣- هەر كەسێك بەرِاستى داواى شەهيدى بكات، خواى گەورە دەيگەيەنێتە پلە و پايەى شەهيدان ئەگەر لەسەر جێگاى خۆيشى بمرێت.**

٣٥٤٤- من سأل الله القتل في سبيل الله صادقا من قلبه أعطاه الله أجر شهيد و إن مات على فراشه.

(صحيح) ( ت ) عن معاذ ( ك ) عن أنس. (الترغيب ١٢٧٧)

**٣٥٤٤- هەر كەسێك بەرِاستى و لەناخى دڵيەوە داواى كوژران بكات لە پێناو خوادا، خواى گەورە پاداشتى شەهيدى پێ دەدات ئەگەر لەسەر جێگاى خۆيشى بمرێت.**

٣٥٤٥- من طلب الشهادة صادقا أعطيها و لو لم تصبه.

(صحيح) ( حم م ) عن أنس. (الترغيب ١٢٧٧)

**٣٥٤٥- هەر كەسێك بەرِاستى داواى شەهيدى لەخوا بكات، پێى دەدرێت ئەگەر نەشكوژرێت.**

## بابەتى هاويشتن لە پێناو خوادا

٣٥٤٦- إذا أكثبوكم فارموهم بالنبل و استبقوا نبلكم.

(صحيح) ( خ د ) عن أبي أسيد . (فقه السيرة ٢٤٢)

**٣٥٤٦- ئەگەر لێتان نزيكبوونەوە تير بارانيان بكەن و كێ بەركێ بكەن لەتير هاويشتندا.**

٣٥٤٧- ارموا بني إسماعيل فإن أباكم كان راميا.

(صحيح) ( حم خ ) عن سلمة بن الأكوع ( ك ) عن أبي هريرة . (الصحيحة ١٤٣٩)

**٣٥٤٧- تیر بهاوێژن ئەی نەوەی ئیسماعیل، باوکتان تیر هاوێژ بوو.**

٣٥٤٨- ألا إن القوة الرمي ألا إن القوة الرمي ألا إن القوة الرمي ؟.

(صحيح) ( حم م د ه ) عن عقبة بن عامر . . (الأرواء ١٤٩٥)

**٣٥٤٨- بەڵێ هێز تێهاویشتنە، هێز تێ هاوێشتنە، هێز تێ هاوێشتنە.**

٣٥٤٩- ألا إن الله سيفتح لكم الأرض و ستكفون المؤنة ؟ فلا يعجزن أحدكم أن يلهو بأسهمه.

(صحيح) ( حم م ت ) عن عقبة بن عامر . (الترغيب ١٢٨٣)

**٣٥٤٩- ئاگادارین بەنزکانە خوا زەویتا بۆ ڕام دەکات و شیوی تەواوتان دەبێت دەی باهیچ کەسێکتان ئەوەند بێدەسەڵات نەبێت کەیاری بەتیرەکانی بکات.**

٣٥٥٠- رميا بني إسماعيل فإن أباكم كان راميا.

(صحيح) ( حم ه ك ) عن ابن عباس. (غاية المرام ٣٧٨)

**٣٥٥٠- تیر بهاویژن ئەی نەوەی ئیسماعیل، چونکە باوکی ئێوە تیرهاوێژ بوو.**

٣٥٥١- ستفتح عليكم أرضون و يكفيكم الله فلا يعجز أحدكم أن يلهو بأسهمه.

(صحيح) ( حم م ) عن عقبة بن عامر. (الترغيب ١٢٨٣)

**٣٥٥١- چەندین خاکتان بۆ ڕام دەکرێت و والا دەکرێت خوای گەورە پێویستیەکانتان دابین دەکات، با کەسێك لەئێوە ئەوەندە بێ دەسەڵات نەبێت یاری بە تیرەکانی بکات.**

٣٥٥٢- عليكم بالرمي فإنه من خير لعبكم .

(صحيح) ( طس ) عن سعد. (الصحيحة ٦٢٩)

**٣٥٥٢- تیر ئەندازی بکەن، بێگومان لە باشترین یارییەکانی ئێوەیە.**

٣٥٥٣- عليكم بالرمي فإنه من خير لهوكم .

(صحيح) ( البزار ) عن سعد. (الصحيحة ٦٢٩)

**٣٥٥٣- تیر هاوێژی بکەن چونکە چاکترین ڕابواردنەکانی ئێوەیە.**

٣٥٥٤- من أحسن الرمي ثم تركه فقد ترك نعمة من النعم.

(صحيح) ( القراب في الرمي ) عن يحيى بن سعيد مرسلا. (الترغيب ١٢٩٤)

**٣٥٥٤- هەر کەسێك شارەزا بێت لەتیر ئەندازی و دوایی وازی لێبهێنێ، ئەوە وازی لەبەهرەیەك لەبەهرەکان هێناوە.**

٣٥٥٥- من ترك الرمي بعد ما علمه رغبة عنه فإنها نعمة كفرها.

(صحيح) ( طب ) عن عقبة بن عامر. (الترغيب ١٢٩٤)

**٣٥٥٥- هەر كەسێك وازی هێنا لەتیر ئەندازی هێنا ئەوەی كەلێهاتوو بوو تیایدا، بێگومان ئەو بەرامبەر ئەو بەهرەیە سپڵەیی نواندووە.**

٣٥٥٦- من علم الرمي ثم تركه فليس منا.

(صحيح) ( م ) عن عقبة بن عامر. (الصحيحة ٣٤٤٨)

**٣٥٥٦- هەر كەسێك فێری تیر ئەندازی بوو، ئینجا وازی لێی هێنا، لەئێمە نییە.**

٣٥٥٧- اللهو في ثلاث: تأديب فرسك و رميك بقوسك و ملاعبتك أهلك.

(صحيح) ( القراب في فضل الرمي ) عن أبي الدرداء. (الصحيحة ١٥)

**٣٥٥٧- ڕابواردن لە سێ شتدایە: ڕاهێنانی ئەسپەكەت، تیر هاویشتنت بەكەوانەكەت، یاری كردن لەگەڵ خێزانەكەت.**

٣٥٥٨- من رمانا بالليل فليس منا.

(صحيح) ( حم ) عن أبي هريرة. (الصحيحة ٢٣٣٩)

**٣٥٥٨- هەر كەسێك بەشەو تیر باران بكات لەئێمە نییە.**

## بابەتی ڕاگیر كردنی ئەسپ

٣٥٥٩- إن المنفق على الخيل في سبيل الله كالباسط يديه بالصدقة لا يقبضها.

(حسن) ( طب ) عن سهل بن الحنظلية . (الترغيب ١٢٤٦)

**٣٥٥٩- بێگومان ئەو كەسەی خەرجی ئەسپێك دەكێشێت لەپێناوی خوادا وەكو ئەو كەسەیە دەستی واڵا كرد بێت و نەینوقێنێت.**

٣٥٦٠- إنه ليس من فرس عربي إلا يؤذن له مع كل فجر يدعو بدعوتين يقول: اللهم إنك خولتني من خولتني من بني آدم فاجعلني من أحب أهله و ماله إليه.

(صحيح) ( حم ن ك ) عن أبي ذر . (الترغيب ١٢٥١)

**٣٥٦٠- هەموو ئەسپێكی عەرەبی ڕێگە دەدرێت لەگەڵ بەرەبەیانی هەموو ڕۆژێكدا دوو نزا بكات، دەڵێت: خوایە بەڕاستی تۆ منت خستووەتە دەستی ئەو لەئادەمیزادەی پێت ڕەوا بینیوە، دەی خوایە بمكە بە خۆشەویسترین كەس و كارو ماڵی.**

٣٥٦١- الإبل عز لأهلها و الغنم بركة و الخير معقود في نواصي الخيل إلى يوم القيامة.

(صحيح) ( ه ) عن عروة البارقي . (الصحيحة ١٧٦٣)

**٣٥٦١- وشتر سەربەرزییە بۆ خاوەنەکەی، مەڕیش فەڕو پیرۆزییە، خێرو چاکەیش بەستراوە بەناوچەوانی ئەسپەوە تارۆژی قیامەت.**

٣٥٦٢- البركة في نواصي الخيل.

(صحيح) ( حم ق ن ) عن أنس . (الصحيحة ٣٦١٥)

**٣٥٦٢- پیرۆزی لەناوچەوانی ئەسپدایە.**

٣٥٦٣- خير الخيل الأدهم الأقرح الأرثم المحجل الثلاث مطلق اليمين فإن لم يكن أدهم فكميت على هذه الشية.

(صحيح) ( حم ت ه ك ) عن أبي قتادة . . (المشكاة ٣٨٧٧)

**٣٥٦٣- چاکترین ئەسپ ڕەش و نێو چاوان مارۆو،دەم و لووت سپی بێت، سێ پەل سپیە لای ڕاستی نەبێت، ئەگەر ڕەشیش نەبێت سوری ڕەشباو بێت، بەم شێوازە.**

٣٥٦٤- الخير معقود بنواصي الخيل إلى يوم القيامة و المنفق على الخيل كالباسط كفه بالنفقة لا يقبضها.

(صحيح) ( طس ) عن أبي هريرة . (الترغيب ١٢٤٤)

**٣٥٦٤- خێرو چاکە بەستراوە بەنێو چەوانی ئەسپەوە تارۆژی قیامەت، ئەو کەسەش خەرجی ئەسپ دەکێشێت وەکو کەسێکە دەستی والا کرد بێت بۆ بەخشین و هەرگیز نەینوقێنێ.**

٣٥٦٥- الخيل ثلاثة: ففرس للرحمن و فرس للشيطان و فرس للإنسان فأما فرس الرحمن فالذي يرتبط في سبيل الله فعلفه و روثه و بوله في ميزانه و أما فرس الشيطان فالذي يقامر أو يراهن عليه و أما فرس الإنسان فالفرس يرتبطها الإنسان يلتمس بطنها فهي ستر من الفقر.

(صحيح) ( حم ) عن ابن مسعود . (الإرواء ١٥٠٣)

**٣٥٦٥- ئەسپ سیانن: ئەسپێك بۆ خواو، ئەسپێك بۆ شەیتان و، ئەسپێك بۆ مرۆڤ ، ئەسپی خوا ئەوەیە لەپێناو خوای گەورە دادەبەسترێت، ئالیك و تەرس و میزی لەتەرازووی چاکەی خاوەنەکەیدایە، ئەسپی شەیتانیش ئەوەیە کە قومار و گرەوی لەسەر دەکرێت، ئەسپی مرۆڤیش ئەوەیە ئەسپەیە کە مرۆڤ کەدەییەسێتەوەو چاوەڕوانی بەرهەمێتی و، دەبێتە پەردەو هەژاری دادەپۆشێت.**

٣٥٦٦- الخيل في نواصي شقرها الخير.

(حسن) ( خط ) عن ابن عباس . (الترغيب ١٢٥٥)

**٣٥٦٦- پیرۆزی لەنێو چەوانی ئەسپی خەنەییدایە[1].**

---

[1] **سوێکە خەنەییە کەناوچەوان و کلکیشی سور بێت**

٣٥٦٧- الخيل لثلاثة: هي لرجل أجر و لرجل ستر و على رجل وزر فأما الذي هي له أجر فرجل ربطها في سبيل الله فأطال لها في مرج أو روضة فما أصابت في طيلها من المرج و الروضة كانت له حسنات و لو أنها قطعت طيلها فاستنت شرفا أو شرفين كانت آثارها و أرواثها حسنات له و لو أنها مرت بنهر فشربت و لم يرد أن يسقيها كان ذلك له حسنات و رجل ربطها تغنيا و سترا و تعففا ثم لم ينس حق الله في رقابها و ظهورها فهي له ستر و رجل ربطها فخرا و رياء و نواء لأهل الإسلام فهي له وزر.

(صحيح) ( مالك حم ق ت ن ه ) عن أبي هريرة . (صحيح النسائي ٣٥٦٣)

**٣٥٦٧- ئه‌سپ بۆ سێ كه‌سه: بۆ پیاوێك پاداشته‌و، بۆ پیاوێك هه‌ژاری په‌رێنه[1] بۆ پیاوێك گوناهه، ئه‌و كه‌سه‌ی كه‌بۆی ده‌بێته پاداشت كه‌سێكه به‌ستوویه‌تیه‌وه له‌ پێناو خواو گوریسه‌كه‌ی بۆ درێژ كردووه له له‌وه‌ڕگه‌یه‌كدا، یان له‌باخێكدا، ئیتر هه‌رچی گژوگیایه‌ك ئه‌سپه‌كه له‌درێژ كردنی گورسیه‌كه‌دا خواردویه‌تی هه‌موی چاكه‌یه بۆ خاوه‌نه‌كه‌ی، ئه‌گه‌ر ئه‌و گوریسه‌یش بقرتێنێت و سوڕێك یان دوو سوڕ غازی تێبكات، پاشماوه‌و ته‌رسه‌كه‌ی ده‌بێته چاكه‌و پاداشت بۆی، ئه‌گه‌ر به‌لای ڕووبارێكدا تێپه‌ڕبێت و لێی بخوات و خۆی نه‌یده‌ویست ئاو بیدات ئه‌وه‌ش ده‌بێته چاكه بۆی، كه‌سێكیش ئه‌سپه‌كه‌ی به‌ستۆته‌وه‌و چاوڕوانی به‌رهه‌مه‌كه‌ی ده‌كات و یارمه‌تیده‌رێك بێت دژی هه‌ژاری و، له‌ده‌ست پانكردنه‌وه ده‌یپارێزێت مافی خواش له‌بیر نه‌كات له‌به‌رهه‌می ئه‌سنۆو پشتی ئه‌و ئه‌سپه بۆی ده‌بێته ڕێگر له‌م په‌ڕی هه‌ژاریی، پیاوێكیش بیبه‌سێته‌وه بۆ شانازی و ڕوپامایی و دژایه‌تی موسوڵمانان ده‌بێته‌گوناه و تاوان بۆی.**

٣٥٦٨- الخيل معقود بنواصيها الخير إلى يوم القيامة الأجر و المغنم.

(صحيح) ( حم ق ت ن ) عن عروة البارقي ( حم م ن ) عن جرير . (فقه السيرة ٢٢٦)

**٣٥٦٨- خێر هه‌ڵواسراوه به‌نێو چه‌وانی ئه‌سپه‌وه تا ڕۆژی قیامه‌ت: پاداشت و ده‌ستكه‌وتیش.**

٣٥٦٩- الخيل معقود في نواصيها الخير إلى يوم القيامة.

(صحيح) ( مالك حم ق ن ه ) عن ابن عمر ( حم ق ن ه ) عن عروة بن الجعد ( خ ) عن أنس ( م ت ن ه) عن أبي هريرة ( حم ) عن أبي ذر وأبي سعيد ( طب ) عن سوادة بن الربيع والنعمان بن بشير وأبي كبشة . (الصحيحة ١٩٣٦)

**٣٥٦٩- خێر به نه‌وچه‌وانی ئه‌سپه‌وه به‌ستراوه تا ڕۆژی دوایی.**

---

[1] ((ستر)) واته: په‌رده‌یه‌كه له‌نێوان خاوه‌نه‌كه‌ی‌و هه‌ژاریدا به‌بونی ئه‌و ئه‌سپه خاوه‌نه‌كه‌ی له‌هه‌ژاری به‌دور ده‌بێت.

٣٥٧٠- الخيل معقود في نواصيها الخير إلى يوم القيامة و أهلها معانون عليها فامسحوا بنواصيها و ادعوا لها بالبركة و قلدوها لا تقلدوها الأوتار.

(حسن) ( حم ) عن جابر . (الترغيب ١٢٤٥)

**٣٥٧٠- چاكە بەستراوە بەنەوچەوانی ئەسپەوە، تاڕۆژی قیامەت، خاوەنەكانیشیان یارمەتیدراون بۆ بەخێوكردنیان، بۆیە نێوچەوانیان بسڕن و نزای پیرۆزییان بۆ بكەن، بۆ ڕاونانی دوژمنانتان بەكاری بهێنن و ڕەمزی نەفامیان پێوە هەڵمەواسن[1].**

٣٥٧١- الخيل معقود في نواصيها الخير و اليمن إلى يوم القيامة و أهلها معانون عليها قلدوها و لا تقلدوها الأوتار.

(حسن) ( طس ) عن جابر . (الترغيب ١٢٤٩)

**٣٥٧١- چاكە و پیرۆزی بەستراون بەنەوچەوانی ئەسپەوە تا ڕۆژی قیامەت، خاوەنەكانیشیان یارمەتیدراون بۆ بەخێوكردنی، ڕاوی دوژمنانتانی پێ بنەن و ڕەمزی نەفامیان پێوە هەڵمەواسن.**

٣٥٧٢- عليك بالخيل فإن الخيل معقود في نواصيها الخير إلى يوم القيامة .

(صحيح) ( طب الضياء ) عن سوادة بن الربيع. (الصحيحة ١٩٣٦)

**٣٥٧٢- ئەسپ ڕاگرە، چونكە چاكە بەستراوە بە نەوچەوانی ئەسپەوە تاكو ڕۆژی قیامەت.**

٣٥٧٣- الغنم بركة و الإبل عز لأهلها و الخيل معقود في نواصيها الخير إلى يوم القيامة ....

(صحيح) ( البزار ) عن حذيفة. (الصحيحة ١٧٦٣)

**٣٥٧٣- مەڕو بزن پیرۆزییە، وشتریش سەر بەرزییە بۆ خاوەنەكەی، چاكەیش بەستراوە بەنەچەوانی ئەسپەوە تا ڕۆژی قیامەت.**

٣٥٧٤- كان يسمي الأنثى من الخيل فرسا.

(صحيح) ( د ك ) عن أبي هريرة. (الصحيحة ٢١٣١)

**٣٥٧٤- پێغەمبەر ﷺ بەمێینەی بارگیری دەوت ئەسپ.**

٣٥٧٥- كان يضمر الخيل.

(صحيح) ( حم ) عن ابن عمر. (الصحيحة ٢١٣٣)

**٣٥٧٥- پێغەمبەر ﷺ ئەسپ قەڵەو و لاواز[1] دەكرد بۆ پتەوبوون.**

---

[1] لەسەردەمی نەفامیدا تەرتەنەو بەربەنەیان پێوە هەڵواسیون بۆ ڕیگری لەچاوەزار، پێغەمبەر سەلات و سەلامی خوای لەسەر بێت ئەوەی لێ قەدەغە كردن. السراج منير ج١ ص ٥٧٩

٣٥٧٦- كان يكره الشكال من الخيل.

(صحيح) ( حم م ) عن أبي هريرة. (صحيح أبي داود ٢٢٩٥)

**٣٥٧٦- پێغەمبەر سەلاّت و سەلای خوای لەسەر بێت کەیفی بەئەسپی دەست و قاچ بەڵەك نەدەهات**

٣٥٧٧- ما من امرئ مسلم ينقي لفرسه شعيرا ثم يعلقه عليه إلا كتب الله له بكل حبة حسنة.

(صحيح) ( حم هب ) عن تميم. (الصحيحة ٢٢٦٩)

**٣٥٧٧- هیچ کەسێك نیە ئالیك و جۆی پاكراو بۆ ئەسپەكەی دابنێت و سەری بخات و خوای گەورە بۆ هەر دەنكێك چاكەیەكی بۆ نەنوسێت.**

٣٥٧٨- من احتبس فرسا في سبيل الله إيمانا بالله و تصديقا بوعده كان شبعه و ريه و روثه و بوله حسنات في ميزانه يوم القيامة.

(صحيح) ( حم خ ن ) عن أبي هريرة. (الإرواء ١٥٨٥)

**٣٥٧٨- هەر كەسێك ئەسپێك لە پێناو خوا ڕاگیرێت، لەبەر باوەڕ بوونی بەخواو، بەڕاست زانینی بەبەڵێنی خوا، تێر خواردن و تێر ئاو بونی و تەرس و میزی ئەو ئەسپە دەبنە پاداشت و چاكە لەتەرازووی چاكەی ئەو كەسەدا لەڕۆژی قیامەتدا.**

٣٥٧٩- من ارتبط فرسا في سبيل الله ثم عالج علفه بيده كان له بكل حبة حسنة.

(صحيح) ( ه حب ) عن تميم الداري. (الروض ١٧٥)

**٣٥٧٩- هەر كەسێك ئەسپێك ڕابگرێت لە پێناو خوای گەورە و، ئالیكی بۆ ئامادە بكات بەدەستی خۆی، هەموو دەنكێكی دەبێتە چاكە بۆی.**

٣٥٨٠- ميامين الخيل في شقرها.

(حسن) ( الطيالسي ) عن ابن عباس. (الترغيب ١٢٥٥)

**٣٥٨٠- پیرۆزی لە ئەسپی سوردایە.**

٣٥٨١- المنفق على الخيل في سبيل الله كباسط يديه بالصدقة لا يقبضها.

(صحيح) ( حم د ك ) عن ابن الحنظلية. (الترغيب ١٢٤٦)

**٣٥٨١- ئەو كەسەی خەرجی ئەسپەكەی دەكێشێت وەكو كەسێكە هەر دوو دەستی كرد بێتەوە بۆ خێر كردن و نەیانوقێنێ[1].**

---

[1] ماوەیەك قەڵەوی دەكرد و ئالیكی باشی نەدایە دواتر لاوازی دەكرد بۆ ئەوەی لاشەی پتەوبێت. السراج منير ج٢ ص٥٨٠

٣٥٨٢- يمن الخيل في شقرها

(صحيح) ( حم د ت ) عن ابن عباس (صحيح أبي داود ٢٢٩٣)

**٣٥٨٢- پیرۆزی لە ئەسپی سوردایە.**

## بابەتی ئەوەی هاتووە دەربارەی مەلەوانی

٣٥٨٣- كل شيء ليس من ذكر الله لهو و لعب إلا أن يكون أربعة: ملاعبة الرجل امرأته و تأديب الرجل فرسه و مشي الرجل بين الغرضين و تعليم الرجل السباحة.

(صحيح) ( ن ) عن جابر بن عبدالله وجابر بن عمير. (الصحيحة ٣١٥)

**٣٥٨٣- هەر شتێك یادی خوا نەبێت گاڵتەو گەپو پاریە چوار شت نەبێت: یاری كردنی پیاو لەگەڵ ژنەكەی، پیاوێك ئەسپەكەی ڕابهێنێ، ڕۆشتنی پیاو لەنێوان دوو نیشانەدا، هەروەها پیاوێك خۆی فێری مەلەوانی بكات.**

## بابەتی غەزاكان

٣٥٨٤- إنكم ستلقون العدو غدا فليكن شعاركم ( حم )لا ينصرون .

(صحيح) ( حم ن ك ) عن البراء . (الصحيحة ٣٠٩٧)

**٣٥٨٤- ئێوە سبەینێ ڕووبەڕووی دووژن دەبنەوە، با دروشمتان ( حم ) ( لا ينصرون ) بێت.**

٣٥٨٥- الآن حمي الوطيس.

(صحيح) ( حم م ) عن العباس ( ك ) عن جابر ( طب ) عن شيبة . (فقه السيرة ٤٢٤)

**٣٥٨٥- ئێستا پێكداادان گەرم بوو.**

٣٥٨٦- الآن نغزوهم و لا يغزونا.

(صحيح) ( حم خ ) عن سليمان بن صرد . (فقه السيرة ٣٣٤)

**٣٥٨٦- ئێستا دەچینە سەریان ناتوانن بێنە سەرمان.**

٣٥٨٧- هذا جبريل آخذ برأس فرسه عليه أداة الحرب.

(صحيح) ( خ ) عن ابن عباس. (المشكاة ٥٨٧٣)

**٣٥٨٧- ئەوە جیبریلە سەری ئەسپەکەی گرتووە، و پۆشاکی جەنگی پۆشیوە.**

٣٥٨٨- يا ابن الأكوع ! ملكت فاسجح.

(صحيح) ( خ ) عن سلمة بن الأكوع.

**٣٥٨٨- ئەی کوڕی ئەکوەع! دەسەلاتت پەیدا کردووە بالێبوردنیشت هەبێت.**

٣٥٨٩- اذهبوا إلى صاحبكم فأخبروه أن ربي قد قتل ربه الليلة - يعني كسرى -.

(صحيح) ( أبو نعيم ) عن دحية . (الصحيحة ١٤٢٩)

**٣٥٨٩- بچنەلای هاوەڵەکەتان و پێی بڵێن خوای من ئەمشەو خواکەی ئەوی کوشت -واتە: کیسرا-.**

٣٥٩٠- نصرت بالصبا و أهلكت عاد بالدبور.

(صحيح) ( حم ق ) عن ابن عباس. (الروض ١٢٦)

**٣٥٩٠- من پشگیری کرام بەڕەشەبای (صەبا)[1] ، عادیش بەڕەشەبای (دەبور)[2] لەناو چوون.**

٣٥٩١- يا معشر يهود ! أسلموا تسلموا اعلموا أن الأرض لله و رسوله و إني أريد أن أجليكم من هذه الأرض فمن وجد منكم بماله شيئا فليبعه و إلا فاعلموا أن الأرض لله و رسوله.

(صحيح) ( ق د ) عن أبي هريرة. (المشكاة ٤٠٥٠)

**٣٥٩١- ئەی کۆمەڵانی جولەکە! موسوڵمان بن سەلامەت دەبن، چاك بزانن سەر زەوی بۆ خواو پێغەمبەرەکەیەتی، منیش دەمەوێت لەم خاکە دەرتان بکەم، جا هەر کەسێك ماڵێکی هەیە بابیفرۆشێت، ئەگەر نا ئەوە چاك بزانن کە سەر زەوی بۆ خواو پێغەمبەرەکەیەتی ﷺ.**

**[1] ئەو بابەهێزەیە لەپشتیەوە بێت پێشی دەوترێت ((القبول)) قەبول چونکە ڕووی لەدەرگای کەعبەیە لەهەندێ لەتەفسیرەکانیشدا وتراوە ئەو بایەیە کەبۆنی یوسفی هەڵگرت و گەیاندیە یەعقوب پێش گەیشتنی کاروانەکەو مژدەهێنەرەکە بۆیە هەموو دڵ و دەرونی غەمبارێك بەو بایە ئاسودە دەبێت. فيض القدير شرح الجامع الصغير ج٦ ص٣٦٨**

**[2] ئەو با بەهێزەیە بەرەو ڕوهەڵدەکات.**

## بابەتی دابەشكردنی دەستكەوتەكان و دزی كردن لەو دەستكەوتانە

٣٥٩٢- ما من غازية تغزو في سبيل الله فيصيبون الغنيمة إلا تعجلوا ثلثي أجرهم من الآخرة و يبقى لهم الثلث فإن لم يصيبوا غنيمة تم لهم أجرهم.

(صحيح) ( حم م د ن ه ) عن ابن عمرو. (صحيح أبي داود ٢٢٥٦)

**٣٥٩٢- هەر كۆمەڵێك غەزا بكەن لە پێناو خواداو دەستكەوتیان دەسكەوێت دوو لەسەر سێ ی پاداشتی دوا ڕۆژیان بۆ پێش دەخرێت و سێ یەكی دەمێنێ، ئەگەر دەستكەوتیان نەبێت هەموو پاداشتەكەیان بەتەواوی دەست دەكەوێت.**

٣٥٩٣- اتق الله يا أبا الوليد لا تأتي يوم القيامة ببعير تحمله و له رغاء أو بقرة لها خوار أو شاة لها ثؤاج.

(صحيح) ( طب ) عن عبادة بن الصامت . (الصحيحة ٨٥٥)

**٣٥٩٣- لەخوا بترسە ئەی باوكی وەلید[1]! لەڕۆژی قیامەتدا نەیێت و حوشترێكت پێبێت ببۆڕێنێ، یان مانگایەكت پێ بێت و بقۆڕێنێت یان مەڕێكت پێ بێت و ببارێنێت.**

٣٥٩٤- انطلق أبا مسعود ! لا ألفينك يوم القيامة تجيء على ظهرك بعير من إبل الصدقة له رغاء قد غللته.

(صحيح) ( د ) عن ابن مسعود . (الصحيحة ١٥٧٦)

**٣٥٩٤- بڕۆ ئەی ئەبو مەسعود! نەتبینم لەڕۆژی قیامەتدا بێیت و وشترێكی دزیت لەسەرشانت هەڵگرتبێت و ببوڕێنێت.**

٣٥٩٥- إن الله بعثني إلى كل أحمر و أسود و نصرت بالرعب و أحل لي المغنم و جعلت لي الأرض مسجدا و طهورا و أعطيت الشفاعة للمذنبين من أمتي يوم القيامة.

(صحيح) ( ابن عساكر ) عن علي . (الترغيب ٣٦٣٦)

**٣٥٩٥- خوای گەورە منی ڕەوانە كردووە بۆ لای هەموو سوور و ڕەشێك، بەوبیم سامناكی پاڵپشت كرام، دەستكەوتی جەنگیشم بۆ ڕەوا كراوە، هەموو سەر زەویشم بۆ كراوە بە مزگەوت و پاككەرەوە، تكا كردنیشم پێ بەخشراوە بۆ تاوانبارانی ئوممەتەكەم لەڕۆژی قیامەت.**

٣٥٩٦- إن النهبة ليست بأحل من الميتة.

(صحيح) ( د ) عن رجل . (الصحيحة ١٦٧٣)

---

[1] مەبەست عوبادەی كوڕی سامیتە ((كاتێك ناردی بۆ سەرپەرشتی خێرو زەكات)) السراج المنير ج١ ص٤٨٤

**٣٥٩٦- هەموو تالانییەك لەگۆشتی مردارەوە بوو حەلاڵتر نییە.**

٣٥٩٧- إن النهبة لا تحل.

(صحيح) ( ه حب ك ) عن ثعلبة بن الحكم . (الصحيحة ١٦٧٣)

**٣٥٩٧- تالانی ڕەوا نییە.**

٣٥٩٨- إني أعطي قريشا لأتألفهم لأنهم حديثو عهد بجاهلية.

(صحيح) ( خ ) عن أنس . (المشكاة ٦٢٠٨)

**٣٥٩٨- بەڕاستی من شت بەقوڕەیش دەبەخشم بۆ ئەوەی دڵە كانیان ڕاكێشم، چونكە تازە دابڕاون لەنەفامی.**

٣٥٩٩- إني أعطي رجالا حديثي عهد بكفر أتألفهم أما ترضون أن يذهب الناس بالأموال و ترجعون إلى رحالكم برسول الله ؟ فوالله لما تنقلبون به خير مما ينقلبون به إنكم سترون بعدي أثرة شديدة فاصبروا حتى تلقوا الله و رسوله فإني فرطكم على الحوض.

(صحيح) ( ق ) عن أنس . (المشكاة ٦٢٠٨)

**٣٥٩٩- من بەخشیش دەدەمە كەسێك تازە لەبێباوەڕی دابڕاون بۆ ئەوەی هۆگرو كەمنركێشیان بكەم، ئایا ڕازی نابن خەڵكی بەماڵ و دارایی بگەڕێنەوە؟ ئێوەیش بە پێغەمبەری خوا بگەڕێتەوە بێگومان ئەوەی ئێوە دەییەنەوە چاكترە لەوەی ئەوان پێی دەییەنەوە، ئێوە لە پاش خۆپەرسندیەكی زۆر دەبینن، بۆیە ئارام بگرن تاكو دەگەنە بەخواو پێغەمبەرەكەی دەگەن بێگومان من لەسەر حەوزەكە چاوەڕێتان دەكەم.**

٣٦٠٠- إني لأعطي رجالا و أدع من هو أحب إلي منهم لا أعطيه شيئا مخافة أن يكبوا في النار على وجوههم.

(صحيح) ( حم ن ) عن سعد . (الصحيحة ٣٥٩١)

**٣٦٠٠- بێگومان من بەكەسێك دەبەخشم و كەسانێكیش بێ بەش دەكەم كەلەوان خۆشەویسترن لەلام نەوەك لەسەر ڕوویان بخرێنە ئاگرەوە.**

٣٦٠١- أيما قرية أتيتموها و أقمتم فيها فسهمكم فيها و أيما قرية عصت الله و رسوله فإن خمسها لله و لرسوله ثم هي لكم.

(صحيح) ( حم م د ) عن أبي هريرة . (المشكاة ٣٩٩٤)

**٣٦٠١- چوونە ناو هەر گوندێك وتیامانەوە، پشكتان لەوێیە، هەر گوندێكیش لەخواو پێغەمبەر ﷺ یاخی بێت بێگومان پێنج یەكی بۆ خواو پێغەمبەرەكەیەتی دوای ئەوەش بۆ ئێوەیە.**

٣٦٠٢- كان إذا أتاه الفيء قسمه في يومه فأعطى الآهل حظين و أعطى العزب حظا.

(صحيح) ( د ك ) عن عوف بن مالك. (المشكاة ٤٠٥٧)

**٣٦٠٢- پێغەمبەر ﷺ کاتێك دەستكەوتەكانی بۆ دەهێنرا هەر لەو ڕۆژەدا دابەشی دەكرد، دوو پشكی دەدایە خێزاندار و یەك پشك بۆ ڕەبەن.**

٣٦٠٣- لم تحل الغنائم لأحد سود الرءوس من قبلكم كانت تجمع و تنزل نار من السماء فتأكلها.

(صحيح) ( ت ) عن أبي هريرة. (الصحيحة ٢١٥٥)

**٣٦٠٣- دەستكەوتەكان ڕەوا نەبوو بۆ هیچ كەسێك لە پێش ئێوە، بەڵكو كۆدەكرایەوەو، ئاگرێك لەئاسمان دەهاتە خوارێ و لەناویدە برد.**

٣٦٠٤- من أقام البينة على أسير فله سلبه.

(صحيح) ( هق ) عن أبي قتادة. (الإرواء ١٢٠٩)

**٣٦٠٤- هەر كەسێك بەڵگە بهێنێتەوە لەسەر كوشتنی دیلێك دەستكەوتەكانی بۆ خۆی دەبێت.**

٣٦٠٥- من انتهب فليس منا.

(صحيح) ( حم الضياء ) عن أنس ( حم د الضياء ) عن جابر. (المشكاة ٢٦٤٧)

**٣٦٠٥- هەر كەسێك تاڵانی بكات لەئێمە نییە.**

٣٦٠٦- من غل بعيرا أو شاة أتى يحمله يوم القيامة.

(صحيح) ( حم الضياء ) عن عبدالله بن أنيس. (الصحيحة ٢٣٥٤)

**٣٦٠٦- هەر كەسێك وشترێك یان مەڕێك لەدەستكەوتەكان حەشار بدات بۆ خۆی، لەڕۆژی قیامەتدا دێت و ئەو شتەی بەكۆڵداداوە.**

٣٦٠٧- من قتل كافر فله سلبه.

(صحيح) ( ق د ت ) عن قتادة ( حم د ) عن أنس ( حم ه ) عن سمرة. (الإرواء ١٢٠٩)

**٣٦٠٧- هەر كەسێك بێباوەڕێك بكوژێت دەستكەوتەكانی بۆ خۆیەتی.**

٣٦٠٨- نهى عن النهبى و المثلة.

(صحيح) ( حم خ ) عن عبدالله بن زيد. (المشكاة ٢٩٤١)

**٣٦٠٨- پێغەمبەر ﷺ تاڵانی و ئەتك كردنی مردووی قەدەغە كردووە.**

٣٦٠٩- نهى عن النهبة و الخلسة.

(صحيح) ( حم ) عن زيد بن خالد. (الصحيحة ١٦٧٣)

**٣٦٠٩- پێغەمبەر ﷺ تاڵان و برۆ حەشاردان قەدەغەكردووە.**

٣٦١٠- و الذي نفسي بيده إن الشملة التي أصابها يوم خيبر من المغانم لم تصبها المقاسم لتشتعل عليه نارا.

(صحيح) ( ق د ن ) عن أبي هريرة. (الترغيب ١٣٤٩)

**٣٦١٠- سوێند بەوە گیانی منی بەدەستە، ئەو عەبایەی لەڕۆژی خەیبەردا لەو دەستکەوتانە بوو کە دابەش نەکرا بوون بێگومان ئێستا ئاگری لێ هەڵدەستێ.**

٣٦١١- لا إسلال و لا غلول.

(حسن) ( طب ) عن عمرو بن عوف. (المشكاة ٤٠٤٦)

**٣٦١١- نەدزیکردن و نە لە حەشاردانی دەست کەوتی جەنگ دروست نین.**

٣٦١٢- لا ألفين أحدكم يجيء يوم القيامة على رقبته بعير له رغاء يقول: يا رسول الله أغثني فأقول: لا أملك لك شيئا قد أبلغتك " لا ألفين أحدكم يجيء يوم القيامة على رقبته فرس له حمحمة فيقول: يا رسول الله أغثني فأقول: لا أملك لك شيئا قد أبلغتك " لا ألفين أحدكم يجيء يوم القيامة على رقبته شاة لها ثغاء يقول: يا رسول الله أغثني فأقول: لا أملك لك شيئا قد أبلغتك " لا ألفين أحدكم يجيء يوم القيامة على رقبته نفس لها صياح فيقول: يا رسول الله أغثني فأقول: لا أملك لك شيئا قد أبلغتك " لا ألفين أحدكم يجيء يوم القيامة على رقبته رقاع تخفق فيقول: يا رسول الله أغثني فأقول: لا أملك لك شيئا قد أبلغتك " لا ألفين أحدكم يجيء يوم القيامة على رقبته صامت فيقول: يا رسول الله أغثني فأقول: لا أملك لك شيئا قد أبلغتك.

(صحيح) ( حم ق ) عن أبي هريرة. (الصحيحة ٣٩٩٦)

**٣٦١٢- با کەسێك لەئێوە نەبینم لەڕۆژی قیامەتدا بێت و وشترێکی لەسەر گەردەنی هەڵگر تبێت و بۆڕەی بێت و بڵێ: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ فریام کەوە و منیش بڵێم: هیچم پێناکرێت، بێگومان پێم ڕاگەیاندی، باکەسێك لەئێوە نەبینم لەڕۆژی قیامەتدا بێت و ئەسپێکی بەکۆڵدا بێت و بحیلێنێ، پێم بڵێت فریام: کەوە ئەی پێغەمبەری خوا، منیش بڵێم هیچم پێناکرێت ، خۆ پێم ڕاگەیاندی ، یا کەسێك لەئێوە نەبینم لەڕۆژی قیامەتدا بێت و مەڕێکی بەکۆڵدا دابێت وبباڕێنێ، پێم بڵێت: ئەی پێغەمبەری خوا بگە فریام، منیش بڵێم هیچم پێ ناکرێت، خۆ پێم ڕاگەیاندی. کەسێك لەئێوە نەبینم لەڕۆژی قیامەتدا بێت و کەسێکی بە کۆڵدا دابێت کە هاوار بکات، ئەویش پێم بڵێ: بگەرە فریام ئەی پێغەمبەری خوا، منیش بڵێم هیچم پێ ناکرێت بۆت، خۆ پێم**

**ڕاگەیاندی، کەسێکتان نەبینم لەڕۆژی قیامەتدا بێت و جل و بەرگێکی بەشانیدا دابێت و بڵێت: فریام بکەوە ئەی پێغەمبەری خوا، منیش بڵێم: هیچم پێناکرێت، خۆ پێم ڕاگەیاندی، کەسێکتان نەبینم لەڕۆژی قیامەتدا بێت و لەسەر شانی ئاڵتوون و زیوی هەڵگرتبێت و بڵێت: ئەی پێغەمبەری خوا فریام کەوە و منیش بڵێم: هیچم پێناکرێت، خۆ پێشتر لەدونیا پێمڕاگەیاندی.**

٣٦١٣- لا نفل إلا بعد الخمس.

(صحيح) ( حم د ) عن معن بن يزيد. (المشكاة ٤٠٠٩)

**٣٦١٣- دەسکەوتی جەنگ نابێتە زیادە دەستکەوت هەتا پێنج یەکی لێ جیانەکرێتەوە.**

٣٦١٤- لا يحل لي من غنائمكم مثل هذا إلا الخمس و الخمس مردود فيكم.

(صحيح) ( د ) عن عمرو بن عبسة. (الإرواء ١٢٢٧)

**٣٦١٤- لەدەستکەوتەکانتان تەنها پێنج یەکی نەبێت بۆ من ڕەوانیە، ئەویش دەگەڕێتەوە سەر خۆتاندا.**

٣٦١٥- لا يغل مؤمن.

(صحيح) ( طب ) عن ابن عباس.

**٣٦١٥- ئیماندار لەدەستکەوتی جەنگ حەشار نادات.**

٣٦١٦- يا أيها الناس ! إن هذا من غنائمكم أدوا الخيط و المخيط فما هو فوق فإن الغلول عار على أهله يوم القيامة و شنار و نار.

(صحيح) ( ه ) عن عبادة بن الصامت. (الصحيحة ٩٨٥)

**٣٦١٦- هۆ خەڵکینە ئاگاداربن! ئا ئەمە لەدەستکەوتەکانتانە، لە دەرزی و دەزووەوە بەرەو سەر ، چونکە دزی کردن لە دەستکەوت ئا بڕو چوون و شورەییە بۆ سەر ئە نجامدەرەکەی، لەڕۆژی قیامەتدا و ئابڕو چوون و ئاگریشە.**

٣٦١٧- يا أيها الناس ! إنه لا يحل لي مما أفاء الله عليكم قدر هذه إلا الخمس و الخمس مردود عليكم.

(صحيح) ( ن ) عن عبادة بن الصامت. (الصحيحة ٩٨٥)

**٣٦١٧- هۆ خەڵکینە! لەدەستکەوتەکانی ئێوە هیچم بۆ ڕەوا نییە جگە لە ئەو پێنج یەکەو ئەویش بۆ خۆتان دەگەڕێتەوە.**

٣٦١٨- يا أيها الناس ! إنه ليس لي من هذا الفيء شيء و لا هذا - و أشار إلى وبرة من سنام بعير - إلا الخمس و الخمس مردود عليكم فأدوا الخياط و المخيط.

(صحيح) ( د ن ) عن ابن عمرو. (الصحيحة ١٩٣٣)

**٣٦١٨- هۆ خەڵكینە! لەو دەستكەوتانەی ئێوە هیچی بۆ من نییە تەنانەت ئەوەیش - ئاماژەی بۆ تۆپەڵە موویەك كرد لەكۆپارەی وشترێكدا- جگە لە پێنج یەك، ئەمەیش بۆ خۆتان دەگەڕێتەوە، بۆیە دەرزی و دەزوویش بگەیەننە جێگای خۆی.**

٣٦١٩- يا أيها الناس ! ردوا علي ردائي فوالله لو أن لي بعدد شجر تهامة نعما لقسمته عليكم ثم لا تلقوني بخيلا و لا جبانا و لا كذوبا " يا أيها الناس ! ليس لي من هذا الفيء شيء و لا هذه الوبرة إلا الخمس و الخمس مردود فيكم فأدوا الخياط و المخيط فإن الغلول يكون على أهله عارا و نارا و شنارا يوم القيامة.

(حسن) ( حم ن ) عن ابن عمرو. (الصحيحة ١٩٧٣)

**٣٦١٩- هۆ خەڵكینە! پۆشاكەكەم بۆ بگێڕنەوە، سوێند بەخوا ئەگەر بە ژمارەی درەختەكانی تیهامە وڵاخم هەبێت دابەشی دەكەم بە سەرتاندا دوای ئەوەیش بەهیچ شێوە نە پیسكەیی وترسنۆكی و درۆزنی لەمن نابینن، هۆ خەڵكینە! هیچم بەرناكەوێت لەو دەستكەوتانە تەنانەت ئەو تاڵە موویەیش ، جگە لە پێنج یەك و ئەویش هەر بۆ خۆتان دەگەڕێتەوە ، بۆیە دەرزی و دەزوویش بگێڕنەوە ناو دەسكەوتەكان، چونكە دزی كردن لەدەستكەوت دەبێتە نەنگی و ئابڕو چوون بۆ ئەنجامدەرەكەی لەڕۆژی قیامەتدا.**

## بابەتی ڕێك كەوتن

٣٦٢٠- إذا اطمأن الرجل إلى الرجل ثم قتله بعدما اطمأن إليه نصب له يوم القيامة لواء غدر.

(صحيح) ( ك ) عن عمرو بن الحمق . (الصحيحة ٤٤٠)

**٣٦٢٠- ئەگەر كەسێك دڵنیا بوو لەلای كەسێك و دوایی كوشتی پاش ئەوەی هەستی بەئارامی كرد، لەڕۆژی قیامەتدا بەیداخی ناپاكی بۆ هەڵدەدرێت.**

٣٦٢١- أما و الله لولا أن الرسل لا تقتل لضربت أعناقكما.

(حسن) ( د ك ) عن نعيم بن مسعود . (المشكاة ٣٩٨٢)

**٣٦٢١- سوێند بەخوا لەبەر ئەوە نەبێت نێردراوان ناكوژرێت، لەگەردنم دەدان.**

٣٦٢٢- إن الغادر ينصب له لواء يوم القيامة فيقال: ألا هذه غدرة فلان بن فلان.

(صحيح) ( مالك ق د ت ) عن ابن عمر . (المشكاة ٣٧٥٢)

**٣٦٢٢- ناپاك ئالآيەكى بۆ هەڵدەدرێت لەڕۆژی قیامەتدا و دەوترێت: ئاگاداربن ئەمە ناپاكى فلآنى كوڕى فلآنە.**

٣٦٢٣- إن لكل غادر لواء يوم القيامة يعرف به عند استه.

(صحيح) ( الطيالسي حم ) عن أنس . (الصحيحة ١٦٩٠)

**٣٦٢٣- بێگومان هەموو ناپاكێك لەڕۆژی قیامەتدا لەلای پاشیەوە پەیداخێكی هەیە پێی دەناسرێتەوە.**

٣٦٢٤- إني لا أخيس بالعهد و لا أحبس البرد.

(صحيح) ( حم د ن حب ك ) عن أبي رافع . (الصحيحة ٧٠٢)

**٣٦٢٤- من پەیمان هەڵناوەشێنمەوە، نێردراوەكانیش زیندانی ناكەم.**

٣٦٢٥- أوفوا بحلف الجاهلية فإن الإسلام لم يزده إلا شدة و لا تحدثوا حلفا في الإسلام.

(حسن) ( حم ت ) عن ابن عمرو . (المشكاة ٣٩٨٣)

**٣٦٢٥- بەئەمەك بن بۆ پەیمانەكانی بەفامی بەڕاستی ئیسلام ئەو پەیمانانەی توند تر كردووەتەوە، پەیمانیش دامەهێنن لەئیسلامدا.**

٣٦٢٦- ألا إنه ينصب لكل غادر لواء يوم القيامة بقدر غدرته.

(صحيح) ( ه ) عن أبي سعيد . (الصحيحة ١٦٩٠)

**٣٦٢٦- لەڕۆژی قیامەتدا ئالآیەك هەڵدەدرێت بۆ هەموو ناپاكێك بەگوێرەی ناپاكییەكەی.**

٣٦٢٧- بسم الله الرحمن الرحيم من محمد عبد الله و رسوله إلى هرقل عظيم الروم سلام على من اتبع الهدى أما بعد " فإني أدعوك بدعاية الإسلام أسلم تسلم يؤتك الله أجرك مرتين فإن توليت فإن عليك إثم الأريسيين و ( يا أهل الكتاب تعالوا إلى كلمة سواء بيننا و بينكم أن لا نعبد إلا الله و لا نشرك به شيئا و لا يتخذ بعضنا بعضا أربابا من دون الله فإن تولوا فقولوا اشهدوا بأنا مسلمون .

(صحيح) ( حم ق ت ) عن أبي سفيان . (الصحيحة ٣٦٠٧)

**٣٦٢٧- (بسم الله الرحمن الرحيم) لە موحەممەدەوەكە بەندە و ڕەوانەكراوی خوایە بۆ هیرەقل گەورەی ڕۆم، سڵاو لەكەسێك شوێنكەوتووی ڕێنومایی خوایە، لەپاش ئەوەیش:**

من بانگت دەکەم بەبانگەوازی ئیسلام موسوڵمانیە سەلامەت دەبێت و خوای گەورە دووجار پاداشتت دەداتەوە، ئەگەر پشتیشت هەڵکرد بێگومان گوناهی جوتیارانەکانت لە ئەستۆتدایە، و ﴿قُلْ يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ تَعَالَوْا۟ إِلَىٰ كَلِمَةٍ سَوَآءٍۭ بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ أَلَّا نَعْبُدَ إِلَّا ٱللَّهَ وَلَا نُشْرِكَ بِهِۦ شَيْـًٔا وَلَا يَتَّخِذَ بَعْضُنَا بَعْضًا أَرْبَابًا مِّن دُونِ ٱللَّهِ ۚ فَإِن تَوَلَّوْا۟ فَقُولُوا۟ ٱشْهَدُوا۟ بِأَنَّا مُسْلِمُونَ ﴿٦٤﴾﴾ (آل عمران) واتە: ئەی خاوەن کتێبەکان وەرن سەرکەون بۆ وتەیەك کە لەنێوان ئێمەو ئێوەدا یەکسانە با بەهیچ جۆرێك خوا نەبێت هیچ پەرستراوێکی تر نەپەرستن و هاوبەشی بۆ بڕیار نەجەین و باهەندێکمان نەکەینە کۆلکە خواو واز لە الله بێنین ئەگەر پشتیان هەڵکرد ئێوە بڵێن ئێمە شاهیدی ئەدەین لەسەر موسوڵمانەتی خۆمان.

٣٦٢٨- ذمة المسلمين واحدة فإن جارت عليهم جائرة فلا تخفروها فإن لكل غادر لواء يعرف به يوم القيامة.

(صحيح) ( ك ) عن عائشة. (الضعيفة ٣٦٢٢)

٣٦٢٨- پەیمانی شەرعی موسڵمانان یەك پەیمانە، جا ئەگەر کەسێکیان پەنای بێباوەڕێکی دا با پەیمانەکەی بباتە سەر چونکە هەموو ناپاکێك ئاڵایەکی هەیە لەڕۆژی قیامەتدا پێی دەناسرێت.

٣٦٢٩- ألا من ظلم معاهدا أو انتقصه حقه أو كلفه فوق طاقته أو أخذ منه شيئا بغير طيب نفس منه فأنا حجيجه يوم القيامة.

(صحيح) ( د هق ) عن صفوان بن سليم عن عدة من ابناء الصحابة عن آبائهم . (غاية المرام ٤٦٧)

٣٦٢٩- هەر کەسێك ستەم بکات لەخاوەن پەیمانێك لەمافی کەم کاتەوە یان داوای زیاتر لەتوانای خۆی لێ بکات یان شتێکی بەزۆر لێ وەربگرێت ، بێگومان من لەبەرەنگاریدا دەوەستم لەڕۆژی قیامەتدا.

٣٦٣٠- الصلح جائز بين المسلمين إلا صلحا أحل حراما أو حرم حلالا .

(صحيح) ( حم د ك ) عن أبي هريرة ( ت هـ ) عن عمرو بن عوف. (الإرواء ١٢٩١)

**٣٦٣٠- ڕێککەوتن ڕەوایە لەنێو موسوڵمانانـدا، مەگەر نـاڕەوایەك بکاتـە ڕەوا، یـان ڕەوایەك بکات بەنـاڕەوا.**

٣٦٣١- فوا لهم و نستعين الله عليهم.

(صحيح) ( حم ) عن حذيفة. (الصحيحة ٢١٩١)

**٣٦٣١- ئەمەکتان هەبێت بەرامبەریان و، پەنا بەخوا دەگرین لەدژیان[1].**

٣٦٣٢- قد أجرنا من أجرت يا أم هانئ !.

(صحيح) ( ق ) عن أم هانئ زاد ( ت د ) : وأمنا من أمنت. (الصحيحة ٢٠٤٩)

**٣٦٣٢- بەڕاستی ئەو کەسەی تۆ پەنـات داوە ئەی دایکی ( هـانـیء ) ئێمەش پەنـامان داوە!**

٣٦٣٣- كل شرط ليس في كتاب الله تعالى فهو باطل و إن كان مائة شرط.

(صحيح) ( البزار طب ) عن ابن عباس. (الإرواء ١٣٠٨)

**٣٦٣٣- هەموو مەرجێك لەقورئـانـدا نەبێت پووچەڵە، ئەگەر سەد مەرجیش بێت.**

٣٦٣٤- لكل غادر لواء عند استه يوم القيامة.

(صحيح) ( م ) عن أبي سعيد. (الصحيحة ١٦٩٠)

**٣٦٣٤- هەموو نـا پـاکێك لە پـاشیەوە ئـاڵایەکی بۆ هەڵدەدرێت لەڕۆژی دواییـدا.**

٣٦٣٥- لكل غادر لواء يعرف به يوم القيامة.

(صحيح) ( حم ق ) عن أنس ( حم م ) عن ابن مسعود ( م ) عن ابن عمر. (الصحيحة ١٦٩٠)

**٣٦٣٥- هەموو نـا پـاکێك ئـاڵایەکی هەیە پێی دەنـاسرێت لەڕۆژی قیامەتـدا.**

٣٦٣٦- لكل غادر لواء ينصب بغدرته.

(صحيح) ( خ ) عن ابن عمر. (الصحيحة ١٦٩٠)

**٣٦٣٦- هەموو نـا پـاکێك ئـاڵایەکی بۆ هەڵدەدرێت بەهۆی ئەو نـا پـاکییەوە.**

٣٦٣٧- لكل غادر لواء يوم القيامة يرفع له بقدر غدرته ألا و لا غادر أعظم غدرا من أمير عامة.

(صحيح) ( م ) عن أبي سعيد. (الصحيحة ١٦٩٠)

---

**[1] پێغەمبەر سەڵات و سەلامی خوای لەسەر بێت فەرمانی کرد بەحوزەیفە و بـاوکی کەوەفادار و بەئەمەك بن بەرامبەر ئەو بەڵێنەی بەبت پەرستەکانیان دابوو کە لەدژیان نەجەنگن، پێغەمبەر بیانوەکەی وەرگرتن و مۆڵەتی دان نەجەنگن هـاوبەش دانەرەکان و وەفادارین بۆ بەڵێنەکەیـان. السراج المنير ج١ ص٥٨٥.**

**٣٦٣٧- هەموو ناپاکێك ئاڵایەکی هەیە لەڕۆژی قیامەتدا بەگوێرەی ناپاکییەکەی بۆی بەرزدەکرێتەوە، هیچ ناپاکیەکیش نییە گەورەتر بێت لەناپاکی فەرمانڕەوای گشتی.**

٣٦٣٨- لواء الغادر يوم القيامة عند استه.

(صحيح) ( الخرائطي في مساوئ الأخلاق ) عن معاذ. (الصحيحة ١٦٩٠)

**٣٦٣٨- ئاڵای کەسی ناپاك لەڕۆژی قیامەتدا لە پاشیەوەیە.**

٣٦٣٩- لولا أن الرسل لا تقتل لضربت أعناقكما.

(صحيح) ( حم طب ) عن نعيم بن مسعود الأشجعي. (الصحيحة ٣٩٨٢)

**٣٦٣٩- ئەوە نەبێت نێردراوان نابێت بکوژرێن لەگەردنتانم دەدا.**

٣٦٤٠- لولا أنك رسول لضربت عنقك.

(صحيح) ( حم د ك ) عن ابن مسعود. (الصحيحة ٣٩٨٢)

**٣٦٤٠- لەبەر ئەوە نەبێت تۆ نێردراوی[1]، لەگەردنتم دەدا.**

٣٦٤١- ما كان من حلف في الجاهلية فتمسكوا به و لا حلف في الإسلام.

(صحيح) ( حم ) عن قيس بن عاصم. (الصحيحة ٢٢٦٢)

**٣٦٤١- هەر هاوپەیمانێتی یە بووە لەنەفامیدا پەیوەست بن پێوەی، ئیسلام حوکمی ئەو هاوپەیمانیەتیەی سڕیوەتەوە[2].**

٣٦٤٢- من كان بينه و بين قوم عهد فلا يشد عقدة و لا يحلها حتى ينقضي أمدها أو ينبذ إليهم على سواء.

(صحيح) ( حم د ت ) عن عمرو بن عبسة. (الصحيحة ٢٣٥٧)

**٣٦٤٢- هەر کەسێك بەڵێنیکی هەبێت لەنێوان خۆی و کەسانێکدا، نەگرێ ی لێ زیاد بکات نەهەڵیوەشێنێتەوە تاکو ماوەکەی تەواو دەبێت، یان فڕێیداتەوە بۆیان.**

٣٦٤٣- من يخفر ذمتي كنت خصمه و من خاصمته خصمته.

(حسن) ( طب ) عن جندب.

---

[1] پێغەمبەر سەڵات و سەلامی خوای لەسەر بێت بە (ابن النواحه)ی فەرموو کە لەلایەن موسەیلەمە و بە نێردراوی هاتبوو. السراج المنير ج١ ص ٥٨٩

[2] فيض القدير ج٥ ص٥٩٠ رقم ٧٩٦٦، واتە ئەو هاوپەیمانی و بەڵێنەی سەردەمی نەفامی نیە کەمیراتیان لەیەك دەبردو شەڕیان لەسەر یەك دەکرد.

**٣٦٤٣- هەر كەسێك پەیمانم بشكێنێ، دەبم بەنەیاری، هەر كەسێكیش من نەیاری بكەم دەبیەزێنم.**

٣٦٤٤- المسلمون على شروطهم.

(صحيح) ( د ك ) عن أبي هريرة. (الإرواء ١٢٩١)

**٣٦٤٤- موسوڵمان لەسەر مەرجەكانی خۆیانن.**

٣٦٤٥- المسلمون عند شروطهم فيما أحل.

(صحيح) ( طب ) عن رافع بن خديج. (الإرواء ١٢٩١)

**٣٦٤٥- موسوڵمانان پێویستە بەئەمەك بن بۆ ئەو مەرجانەیان ڕەوان.**

٣٦٤٦- المسلمون عند شروطهم ما وافق الحق من ذلك.

(صحيح) ( ك ) عن أنس وعن عائشة. (الإرواء ١٢٩١)

**٣٦٤٦- موسوڵمانان لەسەر مەرجەكانی خۆیانن، لەوانەی كە لەگەڵ هەقدا وێك دێنەوە.**

٣٦٤٧- المكر و الخديعة في النار.

(صحيح) ( هب ) عن قيس بن سعد. (الصحيحة ١٠٥٧)

**٣٦٤٧- فێڵباز و تەڵەكەباز لەئاگردایە.**

٣٦٤٨- المكر و الخديعة و الخيانة في النار.

(حسن) ( د في مراسيله ) عن الحسن مرسلا. (الصحيحة ١٠٥٧)

**٣٦٤٨- فێڵباز و تەڵەكەباز و ناپاك لەئاگردایە.**

٣٦٤٩- نصبر و لا نعاقب.

(صحيح) ( عم ) عن أبي. (الصحيحة ٢٣٧٦)

**٣٦٤٩- ئارام دەگرین و سزا نادەین[1].**

٣٦٥٠- نفي بعهدهم و نستعين الله عليهم.

(صحيح) ( م ) عن حذيفة. (الصحيحة ٢١٩١)

**٣٦٥٠- وەفادار دەبن بە پەیمان و بەڵێنیان و پشت بەخواش دەبەستم لەدژیان.**

٣٦٥١- لا حلف في الإسلام و أيما حلف كان في الجاهلية لم يزده الإسلام إلا شدة.

(صحيح) ( حم م د ن ) عن جبير بن مطعم. (الصحيحة ٢٢٦٢)

**٣٦٥١- پەیمانی هاوشێوەی پەیمانی نەفامی لەئیسلامدا نیە، هەر هاوپەیمانێتییەکیش لەسەردەمی نەفامیدا بووە، ئیسلام هەر پتەو تری دەکات.**

٣٦٥٢- لا يلدغ المؤمن من جحر مرتين.

(صحيح) ( حم ق د ه ) عن أبي هريرة. (الصحيحة ١١٧٥)

**٣٦٥٢- ئیماندار دووجار لەکونێکەوە ناگەزرێت[1].**

٣٦٥٣- يجير على أمتي أدناهم.

(صحيح) ( حم ك ) عن أبي هريرة. (الصحيحة ٢٤٤٩)

**٣٦٥٣- سادەترین کەس لەئوممەتەکەم بۆی هەیە داڵدەی خەڵکی بدات[2].**

٣٦٥٤- إن المرأة لتأخذ على القوم - يعني تجير على المسلمين -.

(حسن) ( ت ) عن أبي هريرة . (الصحيحة ٣٩٧٨)

**٣٦٥٤- ئافرەت دەتوانێت داڵدەی کەسێك بدات. واتە: (( داڵدە بدات بەسەر موسڵماناندا )).**

٣٦٥٥- إن حسن العهد من الإيمان.

(حسن) ( ك ) عن عائشة . (الصحيحة ٢١٦)

**٣٦٥٥- رێك و پێکی بەڵێن لەئیمانەوەیە[3].**

## بابەتی کۆچکردن

٣٦٥٦- أنا بريء من كل مسلم يقيم بين أظهر المشركين لا تراءى نارهما.

(حسن) ( د ت الضياء ) عن جرير . (الإرواء ١١٩٣)

**٣٦٥٦- من بێ بەریم لەهەموو موسوڵمانێك نیشتەجێ دەبێت لەنێوان دارو دەستە هاوبەش دانەراندا بەڵکو، نابێت ئاگریان لەیەکەیەوە دیار بێت.**

٣٦٥٧- برئت الذمة ممن أقام مع المشركين في ديارهم.

(حسن) ( طب ) عن جرير . (الصحيحة ٧٦٨)

---

[1] واتە: بڕواداری چوست و چالاك گێژو گەلۆرنیە جار لەدوای جار بخەڵەتێنرێت و فێڵی لێ بکرێت.

[2] واتە: داڵدەدان و پەنادانی بێ باوەڕان تایبەت نیە بەموسوڵمانی خاوەن پلەو پایە و ناودارەو بەڵکو هەر موسوڵمانێك بێت کۆیلە بێت هەژاریش دەتوانێ داڵدە بدات. السراج المنير ج١ ص٥٩١

[3] واتە: وەفاداری و بەنەمەکی بەڵێن لەبڕواوەیە.

**٣٦٥٧- ئەستۆ بیٚ بەریە لەو کەسەی لەناو هاوبەش دانەراندا نیشتەجیٚ دەبیٚت.**

**٣٦٥٨-** من أقام مع المشركين فقد برئت منه الذمة.

(صحيح) ( طب هق ) عن جرير. (الصحيحة ١١٩٣)

**٣٦٥٨- هەرکەسیٚك لەنیٚو هاوبەش دانەراندا نیشتەجیٚ ببیٚت پەیوەندی لەگەڵمان نەماوە.**

**٣٦٥٩-** لا يقبل الله تعالى من مشرك أشرك بعد ما أسلم عملا حتى يفارق المشركين إلى المسلمين.

(حسن) ( ه ) عن معاوية بن حيدة. (الصحيحة ٣٦٩)

**٣٦٥٩- خوای گەورە کردەوە لەهاوبەش دانەریٚك وەرناگریٚت کەهاوبەشی دانابیٚت پاش موسوڵمانان بوونی هەتا لە هاوبەش دانەران جیا نەبیٚتەوەو نەگەڕیٚتەوە بۆ لای موسوڵمانان.**

**٣٦٦٠-** أفضل الهجرتين الهجرة الباتة و الهجرة الباتة: أن تثبت مع رسول الله و هجرة البادية: أن ترجع إلى باديتك و عليك السمع و الطاعة في عسرك و يسرك و مكرهك و منشطك و أثرة عليك.

(صحيح) ( طب ) عن واثلة . (الضعيفة ٦٩٤٨)

**٣٦٦٠- چاکترین دوو کۆچکردن: کۆچکردنی بەکجاری[1] و، واتە: ئەو کۆچەیە لەگەڵ پیٚغەمبەر ﷺ کرا بیٚت کۆچ کردنی چۆڵەوانیش، واتە: بگەڕیٚیتەوە بۆ چۆڵەوانی، لەسەر تە گویٚ ڕایەڵ بیت لە تەنگانە و خۆشیدا و ، لە ناڕەحەتی و گورجوگۆڵیدا و ، بە خواستی خۆت.**

**٣٦٦١-** أنا زعيم لمن آمن بي و أسلم و هاجر ببيت في ربض الجنة و بيت في وسط الجنة و بيت في أعلى غرف الجنة و أنا زعيم لمن آمن بي و أسلم و جاهد في سبيل الله ببيت في ربض الجنة و بيت في وسط الجنة و بيت في أعلى غرف الجنة فمن فعل ذلك لم يدع للخير مطلبا و لا من الشر مهربا يموت حيث شاء أن يموت.

(صحيح) ( ن حب ك ) عن فضالة بن عبيد . (الترغيب ١٣٠٠)

**٣٦٦١- من دەستەبەرم بۆ کەسیٚك باوەڕم پیٚ بهیٚنیٚ و موسوڵمان ببیٚت و کۆچ کرد بیٚت، خانویٚك مسۆگەر دەکەم، لەدامیٚنی بەهەشت هەروەها خانویٚك لەناوەڕاستی بەهەشت، خانویٚك لە ژوورەکانی سەرەوەی بەهەشت وە من بۆ کەسیٚك بڕوای پیٚ هینابم و موسڵمان بوو بیٚت و لە پیٚناوی خوادا جیهادی کرد بیٚت خانویٚك لەناوەڕاستی بەهەشت و خانویٚك لە ژورەکانی هەرە سەرەوەی بەهەشت، هەر کەسیٚك وایکرد چاکەی نەهیٚشتووەتەوە نەیکات و خراپە نەماوە خۆی لیٚ بەدوور نەگریٚت، ئیتر لەهەر کویٚ بیەویٚت بامریٚت.**

---

[1] ئەو کۆچەی گەڕانەوەی تیا نەبیٚت.

٣٦٦٢- إن الهجرة لا تنقطع ما دام الجهاد.

(صحيح) ( حم ) عن جنادة . (الصحيحة ١٦٧٤)

**٣٦٦٢- کۆچکردن نابڕێتەوە تاکو جیهاد بمێنێت.**

٣٦٦٣- ثلاث للمهاجر بعد الصدر.

(صحيح) ( خ هـ ) عن العلاء بن الحضرمي . (صحيح ابن ماجه ١٠٧٣)

**٣٦٦٣- سێ ڕۆژ مانەوە لەمەککە لە پاش گەڕانەوە لەمینا[1].**

٣٦٦٤- ذهب أهل الهجرة بما فيها.

(صحيح) ( طب ك ) عن مجاشع بن مسعود. (الصحيحة ٧٦٢)

**٣٦٦٤- کۆچکردووەکان هەرچی لەکۆچکردندا هەیە بردیان.**

٣٦٦٥- عليك بالهجرة فإنه لا مثل لها .............عليك بالصوم فإنه لا مثل له عليك بالسجود فإنك لا تسجد لله سجدة إلا رفعك الله بها درجة و حط عنك بها خطيئة.

(صحيح) ( طب ) عن أبي فاطمة . (الصحيحة ١٩٣٧)

**٣٦٦٥- پێویستە لەسەرت کۆچ بکەیت چونکە وێنەی نییە... پێویستە لەسەرت ڕۆژوو بگریت چونکە وێنەی نیە، لەسەرتە کڕنووش ببەیت چونکە بەهەموو کڕنووشێك خوای گەورە پلەیك بەرزت دەکاتەوەو خرا پەیەکت بۆ دەکوژێنێتەوە.**

٣٦٦٦- لكم أنتم أهل السفينة هجرتان.

(صحيح) ( ق ) عن أبي موسى. (صحيح السيرة ١٧٠)

**٣٦٦٦- ئێوە ئەی ئەهلی کەشتی دووکۆچتان بۆ نوسراوە[2].**

٣٦٦٧- للمهاجرين إقامة بعد الصدر ثلاث.

(صحيح) ( م د ) عن ابن الحضرمي. (صحيح أبي داود ١٧٦٣)

**٣٦٦٧- بۆ کۆچکردووان هەیە سێ ڕۆژ بمێننەوە لەمەککە پاش گەڕانەوەیان لەمینا.**

---

[1] سیوطی لە دیباجدا دەڵێت: واتە ئەوانەی کۆچیان کرد لە مەدینەوە پێش فەتح بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) ، قەدەغەیە لەسەریان نیشتەجێ بوون لە مەککە ، دوایی ڕێگەیان پێدرا ئەگەر چوونە مەککە بۆ حەج و عومرە و کاری تر ، کە سێ ڕۆژ بمێننەوە پاش تەواو بوونی کارەکەیان لەوەزیاتر بواریان پێ نەدراوە پاش گەڕانەوەیان لە مینا.

[2] کۆمەڵێ موسوڵمان بون ئەبو موساشیان لەگەڵ بوو لەیەمەنەوە بەکەشتی ڕۆیشتن بۆ حەبەشە لەحەبەشەشەوە کۆچیان کرد بۆ خزمەتی پێغەمبەر سەلات و سەلامی خوای لەسەر بێت بۆ مەدینە.

٣٦٦٨- لن تنقطع الهجرة ما قوتل الكفار.

(صحيح) ( حم ن حب ) عن عبدالله بن وقدان السعدي. (الصحيحة ١٦٧٤)

**٣٦٦٨- کۆچکردن کۆتایی پێنایەت تاکو بێباوەڕان شەڕیان لەگەڵ بکرێت.**

٣٦٦٩- مضت الهجرة لأهلها أبايعه على الإسلام و الجهاد.

(صحيح) ( ق ) عن مجاشع بن مسعود. (الصحيحة ٢٩٠)

**٣٦٦٩- کۆچکردن بۆ خەڵکانی خۆی بەسەر چووە، بەیعەتی پێدەدەم لەسەر ئیسلام و جیهاد.**

٣٦٧٠- من جامع المشرك و سكن معه فإنه مثله.

(حسن) ( د ) عن سمرة. (الترغيب ٢٣٣٠)

**٣٦٧٠- هەر کەسێ لەگەڵ شەریك بۆ خوا پەیداکەر کۆبێتەوە و لەگەڵی نیشتەجێ ببێت وەکو ئەوە.**

٣٦٧١- الهجرة هجرتان: هجرة الحاضر و هجرة البادي فأما البادي فيجيب إذا دعي و يطيع إذا أمر و أما الحاضر فهو أعظمهما بلية و أعظمهما أجرا.

(صحيح) ( ن ) عن ابن عمرو. (الصحيحة ١٤٦٢)

**٣٦٧١- کۆچکردن دوو کرچکردنە: کۆچکردنی شارنشینی و، کۆچکردنی دەشتودەر نشینی، دەشتو دەر نشین وەڵام دەداتەوە ئەگەر بانگکراو، گوێڕایەڵ دەبێت ئەگەر فەرمانی پێکرا، بەڵام شارنسینی تاقی کردنەوەکەی گەورەترە و پاداشتەکەشی مەزنترە.**

٣٦٧٢- لا هجرة بعد فتح مكة.

(صحيح) ( خ ) عن مجاشع بن مسعود. (الإرواء ١٠٧٣)

**٣٦٧٢- کۆچکردن نییە لە پاش فەتحی مەککە**[1].

٣٦٧٣- لا هجرة و لكن جهاد و نية و إذا استنفرتم فانفروا فإن هذا بلد حرمه الله يوم خلق السموات و الأرض و هو حرام بحرمة الله إلى يوم القيامة و إنه لم يحل القتال فيه لأحد قبلي و لا يحل لي إلا ساعة من نهار فهو حرام بحرمة الله إلى يوم القيامة لا يعضد شوكه و لا ينفر صيده و لا يلتقط لقطته إلا من عرفها و لا يختلى خلاها إلا الإذخر.

(صحيح) ( حم ق د ت ) عن ابن عباس. (الإرواء ١٠٤٢)

---

[1] **چونکە بووە بە (دار الاسلام) خانەی موسڵمانان. السراج المنير ج١ ص٥٩٤**

**٣٦٧٣- کۆچکردن نییه[1]، بەڵام جیهاد و نیەتە، ئەگەر داواتان لێکراوە دەرکەون بۆ جیهاد وە دەکەون، چونکە ئەم شارە خوای گەورە لەو ڕۆژەی ئاسمانەکان و زەوی دروستکرد قەدەغەی کردووە، قەدەغە بووە بەقەدەغە بوونی خوای گەورە تا ڕۆژی قیامەت، شەڕکردنیش تیایدا پێش من بۆ هیچ کەسێك ڕەوا نەبووە تەنها ماوەیەکی کەم نەبێت بۆ منیش ڕەوا نەکراوە، بۆیە حەرام کراوە بەحەرام بوونی خوای گەورە تاڕۆژی قیامەت، دڕکی نابڕدرێت و نیچیری پەلامار نادرێت، شتی کەوتوویشی هەڵی ناگیردرێتەوە بۆ کەسێك نەبێت پێناسەی بکات، پووش و درەختیشی بەبێ هودە نابڕدرێت تەنها (إذخر) نەبێت[2].**

٣٦٧٤- يا أبا بكر ! ما ظنك باثنين الله ثالثهما.

(صحيح) ( حم ق ت ) عن أبي بكر. (فقه السيرة ١٧٣)

**٣٦٧٤- ئەی ئەبابەکر! گومانت چۆنە دەربارەی دوان خوا سێهەمیان بێت**

## بابەتی ئەوەی کەهاتووە دەربارەی نیشتەجێ بوون لەبیابان

٣٦٧٥- من بدا جفا.

(صحيح) ( حم ) عن البراء. (الصحيحة ١٢٧٢)

**٣٦٧٥- هەرکەسێك نیشتەجێی دەشتودەر ببێت و بیابان نشین بێت دڵڕەق دەبێت.**

٣٦٧٦- من بدا جفا و من اتبع الصيد غفل و من أتى أبواب السلطان افتتن.

(صحيح) ( طب ) عن ابن عباس. (الصحيحة ١٢٧٢)

**٣٦٧٦- هەرکەسێك نیشتەجێی بیابان نشین بێت دڵڕەق دەبێت، هەر کەسیش بەدوای ڕاودا وێڵ و سەرقاڵ بێت بێ ئاگا دەبێت ، هەر کەسیش بچێتە دەرگای فەرمانڕەوا گرفتار دەبێت.**

٣٦٧٧- من سكن البادية جفا و من اتبع الصيد غفل و من أتى السلطان افتتن.

(صحيح) ( حم) عن ابن عباس. (المشكاة ٣٧٠١)

**٣٦٧٧- هەرکەس کۆسار نشین بێت وشك و نەوسن دەبێت ، و هەرکەسیش بە دوی نێچیر کەوێت بێ ئاگا دەبێت و ، هەرکەسیش بچێتە لای دەسەڵاتدار گرفتار دەبێت.**

---

[1] واتە: کۆچکردن لەمەککەوە بۆ مەدینە نیە چونکە بۆتە (دار الاسلام) کۆچکردنیش لە (دارالکفر)ەوە بۆ (دار الاسلام) دروستە. السراج المنير ج١ ص٥٩٤

[2] ئەو گیایەیە ئاسنگەر بەکاریان هیناوە بۆ ئاگر خۆشکردن.

# پەڕاوی
# فەرمانڕەوایەتی

## بابەتی خیلافەت لەقورەیشدا

٣٦٧٨- أما بعد يا معشر قريش ! فإنكم أهل هذا الأمر ما لم تعصوا الله فإذا عصيتموه بعث عليكم من يلحاكم كما يلحى هذا القضيب.

(صحيح) ( حم ) عن ابن مسعود . (الصحيحة ١٥٥٢)

**٣٦٧٨- پاشان ئەی کۆمەڵانی قورەیش! ئێوە شایستەی ئەم فەرمانەن هەتا بێ فەرمانی خوا نەکەن، ئەگەر لێ ی یاخی بون، خوای گەورە کەسێکتان بۆ دەنێرێ تویکڵتان لێ دەکاتەوە وەکو چۆن ئەم قامیشە تویکڵی لێ دەکرێتەوە.**

٣٦٧٩- قريش ولاة الناس في الخير و الشر إلى يوم القيامة.

(صحيح) ( حم ت ) عن عمرو بن العاص. (الصحيحة ١١٥٥)

**٣٦٧٩- قورەیش سەرپەرشتی خەڵکن لەچاکەو خراپەدا[٥٢] تارۆژی قیامەت.**

٣٦٨٠- قريش ولاة هذا الأمر فبر الناس تبع لبرهم و فاجرهم تبع لفاجرهم.

(صحيح) ( حم ) عن أبي بكر وسعد. (الصحيحة ١١٥٦)

**٣٦٨٠- قورەیش سەرپەشتیاری ئەو فەرمانڕەواییەن، چاکی خەڵکی شوێنکەوتووی چاکی ئەوانە، خراپیشان شوێن بەخراپیانن.**

٣٦٨١- إن هذا الأمر في قريش لا يعاديهم أحد إلا كبه الله على وجهه ما أقاموا الدين.

(صحيح) ( حم خ ) عن معاوية . (الصحيحة ٢٨٥٦)

---

[٥٢] واتە: لەسەردەمی نەفامی و لەسەردەمی ئیسلامدا.

**٣٦٨١- بەڕاستی ئەم فەرمانڕەواییە لەقوڕەیشدایە، هەر کەسێك دژایەتییان بکات، خوای گەورە لەسەر ڕوو بەزەویدا ئەدات تا ئەو کاتەی ئەوان ئایین بەرپا دەکەن.**

٣٦٨٢- الأئمة من قريش أبرارها أمراء أبرارها و فجارها أمراء فجارها و إن أمرت عليكم قريش عبدا حبشيا مجدعا فاسمعوا له و أطيعوا ما لم يخير أحدكم بين إسلامه و ضرب عنقه فإن خير بين إسلامه و ضرب عنقه فليقدم عنقه.

(صحيح) ( ك هق ) عن علي . (الإرواء ٥١٣)

**٣٦٨٢-فەرمانڕەوایان لەقوڕەیشن، چاکانیان فەرمانڕەوای چاکەکانن، خراپەکانیشیان فەرمانڕەوای خراپەکانیانن، ئەگەر قوڕەیش کۆیلەیەکی حەبەشی لووت بڕاوی کردە فەرمانڕەوا بەسەرتانەوە گوێڕایەڵی فەرمانی بکەن، مەگەر کەسێك لەئێوە سەر پشك بکرێت لەنێوان موسڵمان بوونی و لێدانی گەردنی، ئەگەر کاتێك ئەوەی لەگەڵ کرا با گەردنی خۆی پێش بخات.**

٣٦٨٣- الأئمة من قريش و لهم عليكم حق و لكم مثل ذلك ما إن استرحموا رحموا و إن استحكموا عدلوا و إن عاهدوا وفوا فمن لم يفعل ذلك منهم فعليه لعنة الله و الملائكة و الناس أجمعين لا يقبل منه صرف و لا عدل.

(صحيح) ( حم ن الضياء ) عن أنس . (الإرواء ٥١٣)

**٣٦٨٣- پێشەواکان لەقوڕەیشن، مافیشیان هەیە لەسەرتان، ئێوەیش بەهەمان شێوە، ئەگەر داوای بەزییان لێ بکرێت بەبەزەیین، ئەگەر داوای فەرمان ڕواییان لێ بکرێت دادگەرن، ئەگەر پەیمان بدەن بەئەمەکن، هەر کێ لەئێوە وا نەکات نەفرینی خوا و فریشتەکان و هەموو خەڵکی لەسەر بێت، نە فەرزو نەسوننەتی لێ وەرناگیردرێت.**

٣٦٨٤- الأمراء من قريش ما عملوا فيكم بثلاث: ما رحموا إذا استرحموا و أقسطوا إذا قسموا و عدلوا إذا حكموا.

(صحيح) ( ك ) عن أنس . (الإرواء ٥١٣)

**٣٦٨٤- فەرمانڕەوایان لەقوڕەیشن، تا ئەو کاتەی سێ شت لەناو ئێوەدا ئەنجام دەدەن: بەسۆزو بەزەیی بن ئەگەر داوای ئەوەیان لێکرا، دادپەروەربن لەکاتی دابەشکردندا، لەحوکم کردنیشدا داد پەروەربن.**

٣٦٨٥- الخلافة في قريش و الحكم في الأنصار و الدعوة في الحبشة و الجهاد و الهجرة في المسلمين و المهاجرين بعد.

(صحيح) ( حم طب ) عن عتبة بن عبد . (الصحيحة ١٨٥١)

**٣٦٨٥- خيلافەت لەقوڕەيشدايە، داوەريش لەياريدەدەران دايە، بانگەوازيش لە حەبەشەيە. جيهاد و كۆچكردنيش لەهەموو موسڵمانانداية‌و، موهاجيرەكان دواتر.**

٣٦٨٦- فضل الله قريشا بسبع خصال: فضلهم بأنهم عبدوا الله عشر سنين لا يعبد الله إلا قريش و فضلهم بأنهم نصرهم يوم الفيل و هم مشركون و فضلهم بأنه نزلت فيهم سورة من القرآن لم يدخل فيها أحد من العالمين و هي ( لإيلاف قريش) (قريش : ١) و فضلهم بأن فيهم النبوة و الخلافة و الحجابة و السقاية .

(حسن) ( طس ) عن الزبير بن العوام. (الصحيحة ١٩٤٤)

**٣٦٨٦- خواى گەورە زيادەى پەسندى بە قوڕەيشى داوە بەحەوت خسڵەت: بەوەى كە دە ساڵ خوايان پەرست، كەس نەبوو خواپەرستێت جگە لە قوڕەيش ، هەروەها بەرزكردوتەوە بەسەر خستنيان لەڕۆژى فيل دا لەكاتێكدا ئەوان بت پەرست بوون، هەروەها زيادە پەسەندى پێداون بەدابەزاندنى سورەتێك لەقورئاندا دەربارەيان كە هيچ كەسێكى تريان لەگەڵدا باس نەكراوە ئەويش ( لايلف قريش )( قريش:١)، هەروەها زيادە پەسندى پێداون بە پێغەمبەرايەتى و خيلافەت و پاسەوانێتى[٥٣] و ئاودان.**

٣٦٨٧- لا يزال هذا الأمر في قريش ما بقي من الناس اثنان.

(صحيح) ( حم ق ) عن ابن عمر. (الصحيحة ٣٧٤)

**٣٦٨٧- ئەم فەرمانڕەوايەتييە بەردەوام هەر لەقوڕەيش دەمێنێتەوە تاكو دوو كەس مابن لەخەڵكى.**

٣٦٨٨- كان هذا الأمر في حمير فنزعه الله منهم و جعله في قريش و سيعود إليهم.

(صحيح) ( حم طب ) عن ذي مخمر. (الصحيحة ٢٠٢٢)

**٣٦٨٨- فەرمانڕەوايەتى لەحيميەرادا[٥٤] بوو، خواى گەورە لێى وەرگرتنەوە و بەقوڕەيشى دا ، جارێكى تريش بۆيان دەگەڕێتەوە[٥٥].**

[٥٣] واتە: پاسەوانيەتى و پارێزگارى كەعبەى ماڵى خوا بەگان و ماڵيان و، ئاودابەش كردنيش بەسەر حاجيانى ماڵى خوادا لەوەرزى حەج كردندا.

[٥٤] هۆزێكى يەمەنيە.

٣٦٨٩- لا يزال هذا الدين قائما حتى يكون عليكم اثنا عشر خليفة .... كلهم من قريش ....
(صحيح) ( حم ق د ت ) عن جابر بن سمرة . (الصحيحة ٣٧٥)

**٣٦٨٩- ئەم ئایینە هەر دەمێنێتەوە تاکو دوانزە خەلیفەتان حوکمتان دەکەن .. هەموویان لە قورەیشن.**

٣٦٩٠- يكون من بعدي اثنا عشر أميرا كلهم من قريش.
(صحيح) ( ت ) عن جابر بن سمرة. (الصحيحة ١٠٧٥)

**٣٦٩٠- لە پاش من دوانزە فەرمانڕەوا دێن هەموویان لەقورەیشن.**

٣٦٩١- يهلك الناس هذا الحي من قريش قالوا: فما تأمرنا ؟ قال: لو أن الناس اعتزلوهم.
(صحيح) ( حم ق ) عن أبي هريرة.

**٣٦٩١- ئەم گەڕەکەی قورەیش خەڵکی لەناو[٥٦] دەبەن، وتیان: فەرمانی چیمان پێ دەکەیت؟ فەرمووی: ئەگەر خەڵکی لەئەوان چاکترە دابڕێن .**

## بابەتی پەیماندان (البيعة)

٣٦٩٢- أبايعك على أن تعبد الله لا تشرك به شيئا و تقيم الصلاة المكتوبة و تؤتي الزكاة و تنصح لكل مسلم و تبرأ من الشرك.
(صحيح) ( حم ن ) عن جرير . (الإرواء ١١٩٣)

**٣٦٩٢- پەیمانت لێ وەردەگرم لەسەر ئەوەی خوای گەورە بپەرستی و هاوبەشی بۆ پەیدا نەکەی، هەروەها نوێژە فەرزەکانیش بەباشی بکەیت و، زەکات بدەیت و، ئامۆژگاری هەموو موسوڵمانێك بکەیت و خۆت بێ بەری بکەیت لەبتپەرستی.**

٣٦٩٣- أبايعكم على أن لا تشركوا بالله شيئا و لا تسرقوا و لا تزنوا و لا تقتلوا أولادكم و لا تأتوا ببهتان تفترونه بين أيديكم و أرجلكم و لا تعصوني في معروف فمن وفى منكم فأجره على الله و من أصاب من ذلك شيئا فأخذ به في الدنيا فهو له كفارة و طهور و من ستره الله فذلك إلى الله عز و جل إن شاء عذبه و إن شاء غفر له.
(صحيح) ( حم ق ت ن ) عن عبادة بن الصامت . (المشكاة ١٨)

---

[٥٥] جارێکی تریش لەکۆتایی زەماندا لەقوریشدا نامێنێ دەست حیمیەر دەکەوێتەوە، ئەمەش یەکێکە لەنیشانەکانی کۆتایی زەمان و دونیا.

[٥٦] واتە: بەهۆی هەڵپەکردن بەدوای دەسەڵات و مڵك و ماڵدا و بەرپاکردنی جەنگ و کوشتار و درێژکێشانی.

**٣٦٩٣- پەيمانتان لىٚ وەردەگرم كە هاوبەش بۆ خوا بڕيار نەدەن و، دزى نەكەن و، داوێن پيسى نەكەن و، منداڵەكانى خۆتان نەكوژن و، هيچ جۆرە بوختانێك[٥٧] نەكەن و، سەرپێچيم نەكەن لەكارى چاكەدا، ئەگەر كەسێك لەئێوە بەئەمەك بوو پاداشتى لەلاى خوايە، هەر كەسێكيش تووشى تاوانێك لەوانە و، لەسەرى سزا درا لەدونيادا ئەوە تاوانەكە دەسڕێتەوەو پاكى دەكاتەوە، هەر كەسيش خوا داپۆشىٚ ئەوە لەلاى خواى گەورە خۆى دەمێنىٚ، ئەگەر بيەوێت سزاى دەدات و، ئەگەر بيشيەوێت ليٚى خۆش دەبێت.**

٣٦٩٤- إذا بويع خليفتان فاقتلوا الآخر منهما.

(صحيح) ( حم م ) عن أبي سعيد . (الصحيحة ٣٠٨٩)

**٣٦٩٤- ئەگەر بەيعەت درايە دوو خەليفە دووەميان[٥٨] بكوژن.**

٣٦٩٥- ستكون بعدي هنات و هنات فمن رأيتموه فارق الجماعة أو يريد أن يفرق أمر أمة محمد كائنا من كان فاقتلوه فإن يد الله مع الجماعة و إن الشيطان مع من فارق الجماعة يركض.

(صحيح) ( ن حب ) عن عرفجة. (إصلاح المساجد ٦١)

**٣٦٩٥- كەمێك دواى من خراپەكارى و كوشت و بڕ باڵ دەكێشێت، بۆيە ئەگەر يەكێكتان بينى لەكۆمەڵ لايداوە، يان دەيەوێت فرمانى ئوممەتى موحەممەد پەرتەوازە بكات، بيكوژن هەر كەسێك بێت، بەڕاستى دەستى خوا لەگەڵ لەكۆمەڵدايە بيگومان، شەيتانيش شان بەشانى كەسێك ڕادەكات لەكۆمەڵ جيا بوبێتەوە.**

٣٦٩٦- ألا تبايعوني على أن تعبدوا الله و لا تشركوا به شيئا و أن تقيموا الصلوات الخمس و تؤتوا الزكاة و تسمعوا و تطيعوا و لا تسألوا الناس شيئا ؟.

(صحيح) ( م ن ) عن عوف بن مالك . (الصحيحة ٣٦٠٠)

**٣٦٩٦- ئەرىٚ بەيعەتم پىٚ نادەن لەسەر ئەوەى خوا بپەرستن و هاوبەشى بۆ پەيدا نەكەن، پێنج فەرزە نوێژ بەچاكى بكەن و، زەكات بدەن و، گوىٚ بگرن گوێڕايەڵى بكەن و، داواى هيچ لەخەڵكى مەكەن.**

---

[٥٧] ((بين أيديكم وأرجلكم)) واتە هيچ جۆر بوختانێك يان منداڵى دۆزراوە مەكەنە منداڵى خۆتان. زاد المنير ج٨ ابن الجوزى.

[٥٨] واتە: موسڵمانان دەبىٚ يەك پێشەوايان هەبێت و نابىٚ لەيەك كاتدابەيعەت بدرێت بەدوو خەليفە و ئاژاوە دروست بێت و كوشتار بەرپا بێت.

٣٦٩٧- كان إذا بايعه الناس يلقنهم: فيما استطعت.

(صحيح) ( حم ) عن أنس. (صحيح أبي داود ٢٩٤٠)

**٣٦٩٧- پێغەمبەری خوا ﷺ كاتێك خەڵكی بەیعەتیان پێ دەدا، زمانی ڕادەهێنان كە بڵێن: بەگوێرەی توانام[٥٩].**

٣٦٩٨- كان لا يصافح النساء في البيعة.

(حسن) ( حم ) عن ابن عمرو. (الصحيحة ٥٢٩)

**٣٦٩٨- پێغەمبەری خوا ﷺ تەوقەی نەدەكرد لەگەڵ ئافرەتان لەكاتی بەیعەتدان.**

٣٦٩٩- من خلع يدا من طاعة لقي الله يوم القيامة لا حجة له و من مات و ليس في عنقه بيعة مات ميتة جاهلية.

(صحيح) ( م ) عن ابن عمر. (الصحيحة ٩٨٣)

**٣٦٩٩- هەر كەسێك خۆی دەستی بكێشێتەوە لەگوێڕایەڵی بەبێ بەڵگە بە خوا دەكات لەڕۆژی دواییدا، هەركێیش بمرێت و بەیعەتێكی لەگەردندا نەبێت مردنێكی نەفامی دەمرێت.**

٣٧٠٠- كانت بنو إسرائيل تسوسهم الأنبياء كلما هلك نبي خلفه نبي و إنه لا نبي بعدي و سيكون خلفاء فيكثرون قالوا: فما تأمرنا قال: فوا ببيعة الأول فالأول و أعطوهم حقهم الذي جعله الله لهم فإن الله سائلهم عما استرعاهم.

(صحيح) ( حم ق هـ ) عن أبي هريرة. (الإرواء ٢٥٣٩)

**٣٧٠٠- بەنو ئیسرائیل پێغەمبەران كارو باریان بۆ بەڕێوە دەبردن، هەر كە پێغەمبەرێك بمردایە پێغەمبەرێك دەبووە جێنشینی، بێگومان لەدوای من پێغەمبەر نییە، بەڵام خەلیفە زۆر دەبن، وتیان: بەچی فەرمانمان پێ دەكەیت، فەرمووی: بەئەمەك بن بۆ بەیعەتی یەكەم كەس، ئەو مافەیش كەخوای گەورە پێیانی داوە ئێوە دانی پیابنێن بۆ یان، بەڕاستی خوا پرسیایان لێ دەكات دەربارەی ئەوانەی لەژێر دەستیاندا بوون.**

---

**[٥٩] بۆ ئەوەی دوچاری بەڵێنێكی خۆیان نەبن كەدواتر بۆیان ئە نجام نەدرێت و ببێتە ئەركێكی لەتوانا بەدەر هەروەها بەتەنگەوە هاتن و مشورخۆری و پێغەمبەر دەگەیەنێت بۆ ئوممەتەكەی.**

## بابەتی ترساندن لەستەم

٣٧٠١- أربعة يبغضهم الله تعالى: البياع الحلاف و الفقير المختال و الشيخ الزاني و الإمام الجائر.

(صحيح) ( ن هب ) عن أبي هريرة . (الصحيحة ٣٦٢)

**٣٧٠١- چوار کەس هەن خوای گەورە ڕقی لێیانە: فرۆشیاری زۆر سوێند خۆرو، هەژاری لەخۆبایی خۆپەسند، پیری زیناکەری داوێن پیس و فەرمانڕەوای ستەمکار.**

٣٧٠٢- أشد الناس عذابا للناس في الدنيا أشد الناس عذابا عند الله يوم القيامة.

(صحيح) ( حم هب ) عن خالد بن الوليد ( ك ) عن عياض بن غنم وهشام بن حكيم .(الصحيحة ١٤٤٢)

**٣٧٠٢- ئەوانەی کەسزای سەختی خەڵکی دەدەن لەدونیادا، هەر ئەوانەن سەختترین سزا دەدرێن لەڕۆژی قیامەتدا.**

٣٧٠٣- أشد الناس يوم القيامة عذابا إمام جائر.

(حسن) ( ع طس حل ) عن أبي سعيد . (الروض ٩٦٥)

**٣٧٠٣- سەختترین سزا لەڕۆژی قیامەتدا بۆ فەرمانڕەوایەکی ستەمکارە.**

٣٧٠٤- اللهم من ولي من أمر أمتي شيئا فشق عليهم فاشقق عليه و من ولي من أمر أمتي شيئا فرفق بهم فارفق به.

(صحيح) ( م ) عن عائشة . (إصلاح المساجد ٣٤)

**٣٧٠٤- خوایە هەرکەسێك لێپرسراوێتیەکی گرتە دەست لەئوممەتم و توند بوو لەگەڵیان خوایە توند بە لەگەڵی، خوایە هە کەسێکیش لێپرسراوێتییەکی گرتە دەست و نەرم بوو لەگەڵیان خوایە تۆیش لەگەڵی نەرم و نیان بە.**

٣٧٠٥- إن أخوف ما أخاف على أمتي الأئمة المضلون.

(صحيح) ( حم طب ) عن أبي الدرداء . (الصحيحة ١٥٨٢)

**٣٧٠٥- بەڕاستی زۆرترین ترسم دەربارەی ئوممەتەکەم لەفەرمانڕەوا گومڕاکانە.**

٣٧٠٦- إن الأمير إذا ابتغى الريبة في الناس أفسدهم

(صحيح) ( د ك ) عن جبير بن نفير وكثير بن مرة والمقدام وأبي أمامة . (غاية المرام ٤٢٣)

**٣٧٠٦- فەرمانڕەوا ئەگەر بەگومان بێت بەرامبەر خەڵکی خراپیان دەکات.**

٣٧٠٧- إن الله تعالى سائل كل راع عما استرعاه أحفظ ذلك أم ضيعه ؟ حتى يسأل الرجل عن أهل بيته.

(حسن) ( ن حب ) عن أنس . (الصحيحة ١٦٣٦)

**٣٧٠٧- بەڕاستی خوای گەورە لێپرسینەوە دەکات لەگەڵ هەموو کەسێك ڕاسپاردەیەکی پێ سپێردرا بێت، ئایا پاراستوویەتی یان کەمتەر خەمی تیادا کردووە، تاکو پرسیاریش دەکات لەخاوەن ماڵ دەربارەی ژن و منداڵەکانی.**

٣٧٠٨- إن الله تعالى يعذب يوم القيامة الذين يعذبون الناس في الدنيا.

(صحيح) ( حم م د ) عن هشام بن حكيم ( حم هب ) عن عياض بن غنم . (المشكاة ٣٥٢٢)

**٣٧٠٨- بێگومان خوای گەورە لەڕۆژی قیامەتدا سزای ئەوانە دەدات کە لەدونیادا سزای خەڵکی دەدەن.**

٣٧٠٩- إن شر الرعاء الحطمة.

(صحيح) ( حم م ) عن عائذ بن عمرو . (الصحيحة ٢٨٨٥)

**٣٧٠٩- خراپترین فەرمانڕەواکان ئەوانەن کەستەم کار و بێبەزەیین.**

٣٧١٠- إنك إن اتبعت عورات الناس أفسدتهم أو كدت تفسدهم.

(صحيح) ( د ) عن معاوية . (الترغيب ٢٣٤٢)

**٣٧١٠- ئەگەر تۆ بەدوای ئەنگی و کەموکوڕی خەڵکیدا بگەڕێی خراپیان دەکەیت، یان لەوانە خراپیان بکەیت.**

٣٧١١- إنما أخاف على أمتي الأئمة المضلين.

(صحيح) ( ت ) عن ثوبان . (الصحيحة ١٥٨٢)

**٣٧١١- بەڕاستی ترسی فەرمانڕەوا گومڕاکانم هەیە لەدژی ئوممەتم.**

٣٧١٢- إنما الإمام جنة يقاتل من ورائه و يتقى به فإن أمر بتقوى الله و عدل فإن له بذلك أجرا و إن أمر بغيره فإن عليه وزرا.

(صحيح) ( ق ن ) عن أبي هريرة . (المشكاة ٣٦٦١)

**٣٧١٢- بەڕاستی فەرمانڕەوا قەڵغانە لەپشتیەوە شەڕ دەکرێت و خۆپارێز پێ دەکرێت، جا ئەگەر فەرمانی کرد بە لەخوا ترسان و دادپەروەری پاداشتی هەیە لەسەری، ئەگەر فەرمانیش بەشتی تر بکات گوناهبار دەبێت.**

٣٧١٣- إنه سيكون عليكم أئمة تعرفون و تنكرون فمن أنكر فقد برئ و من كره فقد سلم و لكن من رضي و تابع.

(صحيح) ( حم ت ) عن أم سلمة . (صحيح أبي داود ٤٧٦٠)

**٣٧١٣- بێگومان هەندێك فەرمانڕەواتان دێتە سەر لەهەندێ كاریان ڕازی دەبن و لەهەندێكی نكۆڵی دەكەن، جا هەر كەس نكۆڵێ كرد گەردنی خۆی ئازاد دەكات، هەر كەسیش ڕەقی لەو كارە بێت سەلامەت دەبێت، بەڵام هەركەسێك پێی ڕازی بێت و بەدوای كەوێت خراپە.**

٣٧١٤- إنه سيلي أموركم بعدي رجال يعرفونكم ما تنكرون و ينكرون عليكم ما تعرفون فلا طاعة لمن عصى الله فلا تضلوا بربكم.

(صحيح) ( حم ك ) عن عبادة بن الصامت . (الصحيحة ٥٩٢)

**٣٧١٤- بەڕاستی ماوەیەك لەدوای من پیاوانێك لێپرسراوێتی كاروباری ئێوە دەگرنە دەست ئەوە ئەنجام دەدەن كەئێوە بەخراپی دەزانن و، ئەوەیش ئێوە بەباشی دەزانن ئەوان نكۆڵی لێ دەكەن، بۆیە گوێڕایەڵی ڕەوانییە بۆ كەسێك لەخوا یاخی بێت، دەربارەی فورمانی پەروەردگارتان گومڕاو سەر لێ شێواو مەبن.**

٣٧١٥- أيما راع غش رعيته فهو في النار.

(صحيح) ( ابن عساكر ) عن معقل بن يسار . (الصحيحة ١٧٥٧)

**٣٧١٥- هەر لێپرسراوێك فێڵ و ناپاكی بكات لەڕەعیەتەكەی لە دۆزەخدایە.**

٣٧١٦- صنفان من أمتي لن تنالهما شفاعتي: إمام ظلوم غشوم و كل غال مارق.

(حسن)( طب) عن أبي أمامة . (الصحيحة ٤٧٠)

**٣٧١٦- دوو چین لەئوممەتم تكای منیان بەنسیب نابێت: پێشەوایەكی ستەمكاری دڵڕەق، هەموو توندڕەوێكی لادەریش.**

٣٧١٧- صنفان من أهل النار لم أرهما بعد: قوم معهم سياط كأذناب البقر يضربون بها الناس و نساء كاسيات عاريات مميلات مائلات رءوسهن كأسنمة البخت المائلة لا يدخلن الجنة و لا يجدن ريحها و إن ريحها ليوجد من مسيرة كذا و كذا .

(صحيح) ( حم م ) عن أبي هريرة. (الصحيحة ١٣٢٦)

**٣٧١٧- دوو پێڕ دۆزەخین و منیش ئێستا نەم بینیون: كەسانێك قەمچیان پێیە وەكو كلكی مانگا وایە پێ ی لەخەڵكی دەدەن، وە ئافرەتانێك بەڕاواڵەت داپۆشراو و لەهەمان كاتدا ڕۆتیشن**

**سەرنج ڕاکێش و مەیلدەرن بە پیاوان، قژی سەریان وەکو دونگەی سەر پشتی وشتر بەرز و مەبلان دەکەن ناچنە بەهەشتەوەو بۆنیشی نانەکەن، بێگومان بۆنی بەهەشت ئەوەندەو ئەوەندە دەڕوات.**

٣٧١٨- كل راع مسئول عن رعيته.

(صحيح) ( خط ) عن أنس. (غاية المرام ٢٦٧)

**٣٧١٨- هەموو لێپرسراوێك بەرپرسە لەوەی ڕەعیەتەکەی.**

٣٧١٩- كلكم راع و كلُّ مسئول عن رعيته فالإمام راع و هو مسئول عن رعيته و الرجل راع في أهله و هو مسئول عن رعيته و المرأة راعية في بيت زوجها و هي مسئولة عن رعيتها و الخادم راع في مال سيده و هو مسئول عن رعيته و الرجل راع في مال أبيه و هو مسئول عن رعيته فكلكم راع و كلكم مسئول عن رعيته.

(صحيح) ( حم ق د ت ) عن ابن عمر. (غاية المرام ٢٦٧)

**٣٧١٩- هەمووتان شوانن و، هەموتان بەرپرسن لەوەی شوانێتی دەکەن، فەرمانڕەوا شوانە بەرپرسە لەژێر دەستەی خۆی، پیاویش شوانە بەسەر کەس و کاری خۆی و بەرپرسە لێیان، ئافرەتیش شوانە و بەرپرسە لەماڵی هاوسەرەکەیدا لێپرسراویشە لەژێر دەستەکانی خزمەتکار شوانە لەماڵی گەورەکەیدا و بەرپرسە لەوەی خراوەتە ژێر دەستی، پیاویش شوانە لەماڵی باوکی و بەرپرسە لەوەی خراوەتە ژێر دەستی، هەمووتان شوانن و هەمووتان بەرپرسن لەژێر دەستەکانتان.**

٣٧٢٠- ما من أمير عشرة إلا و هو يؤتى به يوم القيامة مغلولا حتى يفكه العدل أو يوبقه الجور.

(صحيح) ( هق ) عن أبي هريرة. (الصحيحة ٣٤٤)

**٣٧٢٠- هیچ فەرماندەی کۆمەڵێك نیە لەڕۆژی قیامەتدا بەکۆتکراوی نەهێنرێت، تاکو دادپەروەری دەیکاتەوە، یان ستەم بەدبەختی دەکات.**

٣٧٢١- ما من أمير عشرة إلا يؤتى به يوم القيامة و يده مغلولة إلى عنقه.

(صحيح) ( هق ) عن أبي هريرة. (المشكاة ٣٦٩٧)

**٣٧٢١- هیچ فەرمانڕەوای کۆمەڵێك نیە لەڕۆژی دواییدا نەهێنرێت بەکۆتکراوی.**

٣٧٢٢- ما من أمير يلي أمر المسلمين ثم لا يجهد لهم و ينصح إلا لم يدخل معهم الجنة.

(صحيح) ( م ) عن معقل بن يسار. (الصحيحة ٢٦٣١)

**٣٧٢٢- هەر فەرمانڕەوایەك لێپرسراوێتی موسوڵمانان لەدەست بگرێت ئینجا خۆی ماندوو نەكات بۆیان و ئامۆژگارییان نەكات، هەرگیز لەگەڵیان ناچێتە بەهەشتەوە.**

٣٧٢٣- ما من رجل يلي أمر عشرة فما فوق ذلك إلا أتى الله مغلولا يده إلى عنقه فكه بره أو أوثقه إثمه أولها ملامة و أوسطها ندامة و آخرها خزي يوم القيامة.

(حسن) ( حم ) عن أبي أمامة. (الصحيحة ٣٤٨)

**٣٧٢٣- هەر كەسێك ببێتە فەرمانڕەوای كۆمەڵێك لە دە كەس و بەوەو ژوورتر لەڕۆژی قیامەتدا دێت و دەستی بەستراوە بەگەردەنییەوە، چاكەكاری خۆی دەیكاتەوە، یان گوناهەكانی شەكەتی دەدەن، سەرەتاكەی سەرزەنشتە، ناوەڕاستەكەی پەشیمانییە و، كۆتاییەكەشی ڕیسوایی ڕۆژی قیامەتە.**

٣٧٢٤- ما من عبد يسترعيه الله رعية يموت يوم يموت و هو غاش لرعيته إلا حرم الله عليه الجنة.

(صحيح) ( ق ) عن معقل بن يسار. (الصحيحة ٢٦٣١)

**٣٧٢٤- هەر بەندەیەك خوای گەورە كەسانێك بخاتە ژێر دەستی لەو ڕۆژەی كەدەمرێت فێڵی لێ كردبێتن، تاكاتی مردنەكەی[٦٠] حەتمەن خوای گەورە بەهەشتی لێ قەدەغە دەكات.**

## بابەتی ترساندن لەخۆشاردنەوەی فەرمانڕەوا لەژێر دەستەكەی

٣٧٢٥- ما من إمام أو وال يغلق بابه دون ذوي الحاجة و الخلة و المسكنة إلا أغلق الله أبواب السماء دون خلته و حاجته و مسكنته.

(صحيح) ( حم ت ) عن عمرو بن مرة. (الصحيحة ٦٣٠)

**٣٧٢٥- هەر پێشەوایەك یان فەرمانڕەوایەك دەرگاكەی دابخات[٦١] لەڕووی خاوەن پێویستی و نەدار و هەژاراندا، خوای گەورە دەرگاكانی ئاسمان دادەخات لەڕووی پێویستی ونەداری هەژاری ئەو فەرمانڕەوایە.**

---

[٦٠] واتە: هەتا كاتی مردنەكەی هەر فێڵ و ناپاكی لێ كردین و تەوبەی نەكرد بێت پێش مردن.

[٦١] واتە: ڕێگە نەدات خەڵكی بۆ داواكردنی پێویستیەكانیان و داواكاریەكانیان بچنە ژوورو، خۆی لەوە بەگەورەتر دەزانێت گوێ بۆ قسەیان بگرێت. السراج المنير ج١ ص٦٠٣.

٣٧٢٦- من ولي من أمور المسلمين شيئا فاحتجب دون خلتهم و حاجتهم و فقرهم و فاقتهم احتجب الله عنه يوم القيامة دون خلته و حاجته و فاقته و فقره.

(صحيح) ( د ه ك ) عن أبي مريم الأزدي. (الصحيحة ٦٢٩)

**٣٧٢٦- هەر کەسێك بەرپرسێتییەکی موسڵمانانی گرتە دەست، پەرژینێکی دانا لەنێوان خۆی و پێویستی و هەژاری نەبونی و نەداری ئەواندا خوای گەورە پەرژینێك لە نێوان خۆی و پێویستی و هەژاری و نەبونی نەداری ئەودا دادەنێ لەڕۆژی قیامەتدا.**

## بابەتی چاکترین و خراپترین فەرمانڕەواکان

٣٧٢٧- ألا أخبركم بخيار أمرائكم و شرارهم ؟ خيارهم الذين تحبونهم و يحبونكم و تدعون لهم و يدعون لكم و شرار أمرائكم الذين تبغضونهم و يبغضونكم و تلعنونهم و يلعنونكم.

(صحيح) ( ت ) عن عمر . (صحيح الترمذي ٢٢٦٤)

**٣٧٢٧- ئایا ئاگادارتان بکەمەوە لەچاکترین و خراپترین فەرمانڕەواکانتان؟ چاکترینیان ئەوانەن خۆشتان دەوێن و خۆشیان دەوێن، نزایان بۆ دەکەن و نزاتان بۆ دەکەن، خراپترینی فەرمانڕەواکانتانیش ئەوانەن کەڕقتان لێیانە و ، ڕقیان لێتانە، نەفرێنیان لێ دەکەن و نەفرینتان لێ دەکەن.**

٣٧٢٨- خيار أئمتكم الذين تحبونهم و يحبونكم و تصلون عليهم و يصلون عليكم و شرار أئمتكم الذين تبغضونهم و يبغضونكم و تلعنونهم و يلعنونكم.

(صحيح) ( م ) عن عوف بن مالك . (الصحيحة ٩٠٤)

**٣٧٢٨- چاکترین فەرمانڕەواکانتان ئەوان کەخۆشتان دەوێن و خۆشیان دەوێن، بۆیان دەپاڕێنەوە و بۆتان دەپاڕێنەوە، خراپترین فەرمانڕەواکانتانیش ئەوانەن کە ڕقتان لێیانە و ڕقیان لێتانە، نەفرینیان لێ دەکەن و نەفرینتان لێ دەکەن.**

# بابەتی ترساندن لەداواکردنی فەرمانڕەوایەتی

٣٧٢٩- إن شئتم أنبأتكم عن الإمارة و ما هي ؟ أولها ملامة و ثانيها ندامة و ثالثها عذاب يوم القيامة إلا من عدل.

(حسن) ( طب ) عن عوف بن مالك . (الصحيحة ١٥٦٢)

**٣٧٢٩- ئەگەر بتانەوێت ئاگادارتان دەكەمەوە لە فەرمانڕەوایەتی؟ سەرەتای سەرزەنشتەو، دووەمیشی پەشیمانییە و، سێ یەمیشی سزای ڕۆژی قیامەتە، مەگەر كەسێك دادگەر بوو بێت.**

٣٧٣٠- إنا لن نستعمل على عملنا من أراده.

(صحيح) ( حم ق د ن ) عن أبي موسى . (صحيح أبي داود ٣٥٧٩)

**٣٧٣٠- ئێمە كەسێك بەكار ناهێنێن لەسەر كارو بارمان داوای بكات.**

٣٧٣١- إنا و الله لا نولي على هذا العمل أحدا سأله و لا أحدا حرص عليه.

(صحيح) ( م ) عن أبي موسى . (الصحيحة ٣٠٩٢)

**٣٧٣١- سوێند بەخوا ئێمە كەسێك ناكەینە بەر پرسی ئەم كارە كە داوای بكات، یان كەسێك بۆی بە پەرۆش بێت.**

٣٧٣٢- إنكم ستحرصون على الإمارة و إنها ستكون ندامة و حسرة يوم القيامة فنعم المرضعة و بئست الفاطمة.

(صحيح) ( خ ن ) عن أبي هريرة . (الصحيحة ٢٥٣٠)

**٣٧٣٢- ئێوە پەرۆشی دەكەن بۆ دەست خستنی فەرمانڕەوایەتی، بێگومان هەر زوو دەبێتە پەشیمانی و، ئاخ و داخ لەڕۆژی قیامەتدا، شیر دەرێكی چاكە، لەكاتی لەدەست دانیشیدا خراپترین لەشیربڕانەوەیە.**

٣٧٣٣- العرافة[٦٢] أولها ملامة و آخراها ندامة و العذاب يوم القيامة.

(صحيح) ( الطيالسي ) عن أبي هريرة. (الصحيحة ١٩٨٢)

**٣٧٣٣- فەرمانڕەوایەتی سەرەتاكەی سەرزەنشتەو، كۆتاییەكەی پەشیمانی یە، سزای لەڕۆژی قیامەتیشە.**

[٦٢] العرافة : الأمارة السراج المنير ج١ ص ٦٠٤

٣٧٣٤- ليتمنين أقوام لو أكثروا من السيئات الذين بدل الله عز و جل سيئاتهم حسنات.

(حسن) ( ك ) عن أبي هريرة. (الصحيحة ٣٦١)

**٣٧٣٤- کەسانێك ئاوات دەخوازن کەگوناهی زۆریان بکردایە کەدەبینن خوا کردەوە خراپەکانیان بۆ گۆڕیون بەچاکە.**

٣٧٣٥- ليوشكن رجل أن يتمنى أنه خر من الثريا و لم يل من أمر الناس شيئا.

(حسن) ( ك ) عن أبي هريرة. (الصحيحة ٣٦١)

**٣٧٣٥- لەوانەیە پیاوێك ئاوات بخوازێت لەسەر ئەستێرەی سورەییاوە بکەوێتە خوارەوەو، هیچ لێپرسراوێتی یەکی موسوڵمانانی لەئەستۆ نەگرتایە.**

٣٧٣٦- يا أبا ذر ! إنك ضعيف و إنها أمانة و إنها يوم القيامة خزي و ندامة إلا من أخذها بحقها و أدى الذي عليه فيها.

(صحيح) ( م ) عن أبي ذر. (المشكاة ٣٦٨٢)

**٣٧٣٦- ئەی ئەبا زەڕ! تۆ لاوازی، ئەمەیش ڕاسپادەیە و، لەڕۆژی قیامەتدا دەبێتە ئابڕوو چوون و پەشیمانی، مەگەر کەسێك مافەکانی جێبەجێ بکات و ئەوەی لەسەرێتی لەو بارەوە ئەنجامی بدات.**

٣٧٣٧- يا أبا ذر إني أراك ضعيفا و إني أحب لك ما أحب لنفسي لا تتأمرن على اثنين و لا تولين مال يتيم.

(صحيح) ( م د ن ) عن أبي ذر. (المشكاة ٣٦٨٢)

**٣٧٣٧- ئەی ئەبا زەڕ من دەتبینم لاوازی، منیش ئەوەی بۆ خۆم پێم خۆشە بۆ تۆش پێم خۆشە، مەبەرە لێپرسراوی دوو کەس، ماڵی هەتیوویش لەدەست مەگرە.**

٣٧٣٨- يا عبد الرحمن بن سمرة ! لا تسأل الإمارة فإنك إن أوتيتها عن مسألة وكلت إليها و إن أوتيتها عن غير مسألة أعنت عليها و إذا حلفت على يمين فرأيت غيرها خيرا منها فكفر عن يمينك و ائت الذي هو خير.

(صحيح) ( حم ق ٣ ) عن عبدالرحمن بن سمرة. (الإرواء ٢٦٦٨)

**٣٧٣٨- ئەی عەبەدو ڕڕەحمانی کوڕی سەمورە! داوای فەرمانڕەوایەتی مەکە چونکە ئەگەر لەسەر داوای خۆت بتدرێتێ تەنها بەخۆت دەسپێردرێت بەڵام ئەگەر بەبێ داواکردن بتدەنێ یارمەتیدەدرێیت لەسەری، ئەگەر سوێندیکت خواردو شتێکی لەوە**

**چاكترت بینی لەوەی سوێندت لەسەر خواردووە، بارتەقای[٦٣] سوێندەكەت بدەو، ئەوەی چاكترە ئەوە ئەنجام بدە.**

٣٧٣٩- ليودن رجل أنه خر من عند الثريا و أنه لم يل من أمر الناس شيئا.

(حسن) ( الحارث ك ) عن أبي هريرة. (الصحيحة ٣٦١)

**٣٧٣٩- ڕۆژێك دێت پیاو خۆزگە بخوازن كە لەسەر ئەستێرەی سورەییاوە بكەوتنایەتە خوارەوە، بەڵام لێپرسراو نەبوایە بەسەر هیچ كارو بارێكی خەڵكی دا.**

## بابەتی ئەوەی هاتووە دەربارەی چوون بۆ لای فەرمانڕەواكان

٣٧٤٠- إياكم و أبواب السلطان فإنه قد أصبح صعبا هبوطا[٦٤].

(صحيح) ( طب ) عن رجل من سليم . (الصحيحة ١٢٥٣)

**٣٧٤٠- نەكەن نزیك بكەونەوە لەدەرگای فەرمانڕەواكان، چونكە سەختە و زەلیلی و نزمیە.**

## بابەتی فەرمانڕەوا ستەمكارەكان

٣٧٤١- ستكون أمراء فتعرفون و تنكرون فمن كره برئ و من أنكر سلم و لكن من رضي و تابع لم يبرأ.

(صحيح) ( م د ) عن أم سلمة. (الصحيحة ٣٠٠٧)

**٣٧٤١- هەندێ فەرمانڕەوا پەیدا دەبن بەهەندێ كردەوەكانیان ئاشنا دەبن و نكۆڵی لەهەندێكیان دەكەن، هەر كێ ناقابل بێت بێ بەرییە لەخراپەیان، هەر كەسیش نكۆڵی بكات سەلامەت دەبێت و بەشداری سزای ئەوان نیە، بەڵام هەر كەسێك ڕازی بێت و شوێنیان بكەوێت بەشداریانە.**

٣٧٤٢- ستكون بعدي أثرة و أمور تنكرونها قالوا: فما تأمرنا ؟ قال: تؤدون الحق الذي عليكم و تسألون الله الذي لكم.

---

[٦٣] **بارتەقا: كەففارەت.**

[٦٤] **((هبوطا)) سوێن و مەقامێكە هەر كەس دەستی لێ ی گیر بوو دوجاری زەلیكی وپلە نزمی دونیاو دواڕۆژ دەبێت بەڵام لەنوسخەی بەیهەمی و تەبەراتیدا بە ((حبوطا)) هاتوە واتە: كردەو پلەو پایەی لای خوا پوچەڵ دەكاتەوە. السراج المنير ج١ ص ٦٠٥**

(صحيح) ( حم ق ) عن ابن مسعود. (الصحيحة ٣٥٥٥)

**٣٧٤٢- لەدوای من خۆپەسەندی شتگەلێك سەر هەڵدەدەن ئیوە نكۆڵی لێ دەكەن، ووتیان: بەچی فەرمانمان پێ دەكەیت؟ فەرمووی: ئەو مافەی لەسەرتانە بیدەن، داوا لەخوا بكەن.**

٣٧٤٣- سيكون أمراء تعرفون و تنكرون فمن نابذهم نجا و من اعتزلهم سلم و من خالطهم هلك.

(صحيح) ( ش طب ) عن ابن عباس.(الصحيحة ٣٠٠٧)

**٣٧٤٣- هەندێك فەرمانڕەوا پەیدا دەبن بەهەندێك لەكارەكانیان ئاشنا دەبن و هەندێكیشیان بەلاتانەوە نامۆن، هەر كێ نارەزایی دەربڕێ بەرامبەر كارە ناشەرعیەكانیان ڕزگاری دەبێت، هەر كەسێش لێیان دوورە پەرێز بێت سەلامەت دەبێت، هەر كەسێكیش تێكەڵیان بكات تیا دەچێت.**

٣٧٤٤- سيكون عليكم أمراء يؤخرون الصلاة عن مواقيتها و يحدثون البدع قال ابن مسعود: فكيف أصنع ؟ قال: تسألني يا ابن أم عبد كيف تصنع ؟ لا طاعة لمن عصى الله.

(صحيح) ( ه هق ) عن ابن مسعود. (الصحيحة ٥٩٢)

**٣٧٤٤- لەمەو دوا هەندێك فەرمانڕەوایەتیتان دەكەن نوێژەكان دوا دەخەن لەكاتەكانی خۆیدا و شتی تازە دادەهێنن، ئیبنو مەسعود فەرمووی: ئەی چی بكەم؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەی كوڕی ئومموعەبد پرسیارم لێ دەكەیت چی بكەیت؟! گوێڕایەڵی نییە بۆ كەسێك لەخوا یاخی بێت.**

٣٧٤٥- طاعة الإمام حق على المرء المسلم ما لم يأمر بمعصية الله فإذا أمر بمعصية الله فلا طاعة له .

(حسن) ( هب ) عن أبي هريرة. (الصحيحة ٧٥٢)

**٣٧٤٥- گوێڕایەڵی پێشەوا پێویستە لەسەر كەسی موسڵمان، تاكو فەرمان نەكات بە یاخی بوون لەخوا، ئەگەر وایكرد كەس بۆی نییە گوێڕایەڵی بكات.**

٣٧٤٦- غير الدجال أخوف على أمتي من الدجال الأئمة المضلون.

(صحيح) ( حم ) عن أبي ذر. (الصحيحة ١٩٨٩)

**٣٧٤٦- جگە لەدەجال لە فەرمانڕەوا گومڕاكەرەكان لەدەجال زیاتریان لێ دەترسم بۆ ئوممەتەكەم.**

٣٧٤٧- لا بد من العريف و العريف في النار.

(حسن) ( أبو نعيم في المعرفة ) عن جعونة بن زياد. (الصحيحة ١٤١٧)

**٣٧٤٧- پێویستە سیاسە تمەدار هەبێت ، سیاسە تمەداریش[٦٥] لەئاگردایە.**

٣٧٤٨- يكون عليكم أمراء من بعدي يؤخرون الصلاة فهي لكم و هي عليهم فصلوا معهم ما صلوا بكم القبلة.

(صحيح) ( د ) عن قبيصة بن وقاص. (صحيح أبي داود ٤٦٠)

**٣٧٤٨- لەدوای من فەرمانڕەواتان دەبن نوێژەكان دوا دەخەن، پاداشتی بۆ ئێوەیەو گوناهی لەسەر ئەوانە، ئێوەیش نوێژیان لەگەڵ بكەن تاكو نوێژتان پێ بكەن ڕووەو قبیلە[٦٦].**

## بابەتی خیلافەت

٣٧٤٩- خلافة النبوة ثلاثون سنة ثم يؤتي الله الملك من يشاء.

(صحيح) ( د ك ) عن سفينة . (الصحيحة ٤٥٩)

**٣٧٤٩- خیلافەتی پێغەمبەرایەتی (٣٠) سی ساڵە، دوای ئەو خوای گەورە موڵكی خۆی دەداتە هەر كەسێك بیەوێت.**

٣٧٥٠- الخلافة بعدي في أمتي ثلاثون سنة ثم ملك بعد ذلك[٦٧].

(صحيح) ( حم ت ع حب ) عن سفينة . (الصحيحة ٤٥٩)

**٣٧٥٠- خیلافەت لەدوای من لەئوممەتمدا (٣٠) سی ساڵە، لەدوای ئەویش دەبێتە پاشایەتی.**

## بابەتی وەرنەگرتنی ئافرەت بۆ فەرمانڕەوایەتی

٣٧٥١- لن يفلح قوم ولوا أمرهم امرأة.

(صحيح) ( حم خ ت ن ) عن أبي بكرة. الإرواء ٢٤٤٥)

**٣٧٥١- هیچ گەلێك سەرفراز نابن كەكارو باری خۆیان بدەنە دەست ئافرەت[٦٨].**

---

[٦٥] واتە: زۆرینەی سیاسە تمەدار و بەڕێوەبەری كاری موسوڵمانان لەسنوری خوا لادەدەن و تێكەڵی خرا پەدەبن. السراج المنير ج ١ ص ٦٠٦

[٦٦] واتە: لێیان هەڵمەگەڕێنەوە با ئاژاوە و پشێوی و پاشاگەردانی دروست نەبێت.

[٦٧] لەڕیوایەتێكی تردا بەم شێوەیە هاتووە (ثم يكون ملكا) فيض القدير ج٣ ص٦٧٩.

## بابەتی ئەگەر خەڵكانێك لەگەشت دا بن

٣٧٥٢- إذا خرج ثلاثة في سفر فليؤمروا أحدهم.

(صحيح) ( د الضياء ) عن أبي هريرة وأبي سعيد . (الصحيحة ١٣٢٢)

**٣٧٥٢- ئەگەر سێ كەس چونە گەشت و گوزار با یەكێكیان بكەنە ( فەرماندە ).**

٣٧٥٣- إذا كان ثلاثة في سفر فليؤمروا أحدهم.

(صحيح) ( هق ) عن أبي هريرة . (الإرواء ٢٥٢٠)

**٣٧٥٣- ئەگەر سێ كەس بوو لە گەشتێكدا با یەكێكیان بكەنە ( ئەمیر ) فەرماندە**

## بابەتی فەرمانڕەوا قەڵغانە

٣٧٥٤- إنما الإمام جنة يقاتل به.

(صحيح) ( د ) عن أبي هريرة . (المشكاة ٣٦٦١)

**٣٧٥٤- فەرمانڕەوا قەڵغان[69] و پەناگەیە شەڕی لە پاڵدا دەكرێت[70].**

## بابەتی وابەستە بوون بەكۆمەڵەوە

٣٧٥٥- من فارق الجماعة شبرا فقد خلع ربقة الإسلام من عنقه.

(صحيح) ( حم د ك ) عن أبي ذر. (المشكاة ١٨٥)

**٣٧٥٥- هەر كەسێك لەكۆمەڵ جیا بێتەوە ئەوەندەی بستێك ، تەوقی ئیسلام لەگەردەنی خۆی دادەكەنێ.**

---

[68] پێشەوایەتی موسوڵمانان و بونە قازی نادرێتە ئافرەت و دروست نیە.

[69] واتە : قەڵغان و سوپەرە بۆ پاراستنی ئیسلام: السراج المنير ج١ ص ٦٠٨.

[70] تاریكستانی خرا پەی پێ دەرەوێتەوەو خەڵكیش پەنای بۆ دەبەن لەتەنگانەدا و فەرماندەی جەنگیش دەبێت.

# بابەتی گوێڕایەڵی کردن بۆ فەرمانڕەوا

٣٧٥٦- آمركم بثلاث و أنهاكم عن ثلاث آمركم أن تعبدوا الله و لا تشركوا به شيئا و أن تعتصموا بحبل الله جميعا و لا تفرقوا و تسمعوا و تطيعوا لمن ولاه الله أمركم و أنهاكم عن قيل و قال و كثرة السؤال و إضاعة المال.

(صحيح) ( حل ) عن أبي هريرة. (الصحيحة ٦٨٥)

**٣٧٥٦- فەرمانتان پێ دەکەم بە کردنی سێ شت، لەسێ شتیش ڕێگریتان لێ دەکەم، فەرمانتان پێ دەکەم خوای گەورە بپەرستن و هاوبەشی بۆ بڕیار مەدەن، هەروەها دەست بگرن بەڕێنمونی خوای گەورە و پەرتەوازەیی مەکەن، گوێڕایەلیش بن بۆ فەرمانڕەواکانتان، ڕێگریشاتان لێ دەکەن لەقسەی وتی وتی و، زۆر پرسیار کردن و، ماڵ بەفیڕۆدان.**

٣٧٥٧- اتقوا الله و صلوا خمسكم و صوموا شهركم و أدوا زكاة أموالكم طيبة بها أنفسكم و أطيعوا ذا أمركم تدخلوا جنة ربكم.

(صحيح) ( ت حب ك ) عن أبي أمامة. (الصحيحة ٨٦٧)

**٣٧٥٧- خۆتان لە بێ فەرمانی خوا بپارێزن و، پێنج فەرزەتان ئەنجام بدەن و، ڕۆژووی مانگەکەتان بگرن و، زەکاتی ماڵەکانتان بدەن، بەخۆشی خۆتان و، گوێڕایەڵی فەرمانڕەواکانتان بن، دەچنە بەهەشتی پەروەردگارتانەوە.**

٣٧٥٨- اسمع و أطع و لو لعبد حبشي مجدع الأطراف.

(صحيح) ( حم م ) عن أبي ذر . (ظلال الجنة ٩٤٢)

**٣٧٥٨- گوێبگرە و گوێڕایەڵ بە ئەگەر بۆ کۆیلەیەکی حەبەشەییش بێت کە، ئەندامەکانی بڕابنەوە.**

٣٧٥٩- اسمعوا و أطيعوا فإنما عليهم ما حملوا و عليكم ما حملتم.

(صحيح) ( م ت ) عن وائل . (الصحيحة ١٩٨٧)

**٣٧٥٩- گوێبگرن و گوێڕایەڵی بکەن، بێگومان ئەوان لەسەریانە کۆڵی خۆیان هەڵگرن[٧١]، ئێوەش لەسەرتانە کۆڵی خۆتان هەڵگرن[٧٢].**

---

**[٧١] لە دادگەری و جێ بەجێ کردنی مافی ژێر دەستەکانی**

٣٧٦٠- اسمعوا و أطيعوا و إن استعمل عليكم عبد حبشي كأن رأسه زبيبة.

(صحيح) ( حم خ ه ) عن أنس . (الإرواء ٢٥٢١)

**٣٧٦٠- گوێگرن و گوێڕایەڵ بن ئەگەر کۆیلەیەکی حەبەشیش بووە و فەرمانڕەواتان بێت کە سەری وەکو مێوژ بێت[٧٣].**

٣٧٦١- إن أمر عليكم عبد مجدع أسود يقودكم بكتاب الله فاسمعوا له و أطيعوا.

(صحيح) ( م ه ) عن أم الحصين . (المشكاة ٣٦٦٢)

**٣٧٦١- ئەگەر کۆیلەیەکی لووت بڕاوی ڕەش پێست کرایە فەرمانڕەواتان بە کیتابی خوای ئێوەی بەڕێوە دەبرد گوێڕایەڵی بکەن و لەقسەی دەرمەچن.**

٣٧٦٢- إنما الطاعة في المعروف.

(صحيح) ( حم ق ) عن علي . (الصحيحة ١٨١)

**٣٧٦٢- بەڕاستی گوێڕایەڵی تەنها لەکاری چاکەدا بە[٧٤].**

٣٧٦٣- إنه ستكون هنات و هنات فمن أراد أن يفرق أمر هذه الأمة و هي جميع فاضربوه بالسيف كائنا من كان.

(صحيح) ( حم م د ن ) عن عرفجة . (الإرواء ٢٥١٨)

**٣٧٦٣- بەڕاستی لەمەودوا خراپە و پشێوی و هات و هوت دێتە کایەوە، هەر کەسێکیش ویستی کاروباری ئوممەتی موحەممەد پەرتەوازە بکات و خۆی کۆك بوو، بەشمشێر لەگەردنی بدەن هەر کەسێك هەیە با بێت.**

٣٧٦٤- أيما رجل خرج يفرق بين أمتي فاضربوا عنقه.

(صحيح) ( ن ) عن أسامة بن شريك . (المشكاة ٣٥٥٢)

**٣٧٦٤- هەر پیاوێك دەرچوو دەیەویست پەرتەوازەیی بخاتە نێوان ئوممەتمەوە لەگەردنی بدەن.**

٣٧٦٥- السمع و الطاعة حق على المرء المسلم فيما أحب أو كره ما لم يؤمر بمعصية فإذا أمر بمعصية فلا سمع عليه و لا طاعة.

(صحيح) ( حم ق عق ) عن ابن عمر. (صحيح أبي داود ٢٣٦١)

---

**[٧٢] ژێر دەستەکانیش لەسەریانە گوێ ڕایەڵ و گوێ لە مست و خۆ ڕاگر بن.**

**[٧٣] واتە: قژی سەری لول و تێنالاو بێت، هەر کۆمەڵە موێکی سەری کول بوبێت وەکو مێوژی لێ هاتبێت.**

**[٧٤] واتە: ئەوەی شەرعییە و شەرع بە چاکی دەزانێت، چونکە گوێ ڕایەڵی لەبێ فەرمانی خوادا دروست نییە.**

**٣٧٦٥- گوێ گرتن و گوێڕایەڵی پێویستە لەسەر موسوڵمان لەوەی کە پێی خۆشە و پێی ناخۆشە بەمەرجێك فەرمانی یاخی بوون لەخوا پێنەکرێت، ئەگەر فەرمانی بەتاوان پێ کرا نابێت گوێڕایەڵی بکات.**

٣٧٦٦- عليك السمع و الطاعة في عسرك و يسرك و منشطك و مكرهك و أثرة عليك .

(صحيح) ( حم م ن ) عن أبي هريرة. (ظلال الجنة ١٠٢٦)

**٣٧٦٦- لەسەرتە گوێ گرتن و گوێڕایەڵی بکەیت لەکاتی تەنگانەو ئاسانیدا و، لەگورج و گۆڵی و ناڕەحەتیتدا و، لەکاتی هەڵنای کەسانێکی تر بەسەرتا[٧٥].**

٣٧٦٧- عليهم ما حملوا و عليكم ما حملتم .

(صحيح) ( طب ) عن زيد بن سلمة الجعفي. (الصحيحة ١٩٨٧)

**٣٧٦٧- ئەوان کۆڵی خۆیان لەسەرە و کۆڵی خۆتان لەسەرە[٧٦].**

٣٧٦٨- من أتاكم و أمركم جميع على رجل واحد يريد أن يشق عصاكم و يفرق جماعتكم فاقتلوه.

(صحيح) ( م ) عن عرفجة. (المشكاة ٣٦٧٨)

**٣٧٦٨- هەر کێ هاتە لاتان و ئێوە کۆبوو لەسەر یەك پیاو و، دەیەویست کۆچانی دەستان بشکێنێ و بیکوژن.**

٣٧٦٩- من أجل سلطان الله أجله الله يوم القيامة.

(حسن) ( طب ) عن أبي بكرة. (الصحيحة ٢٢٩٧)

**٣٧٦٩- هەر کەسێك فەرمانڕەوای خوا شکۆدا ڕابگرێت، خوای گەورە ئەو کەسە شکۆدا ڕادەگرێت.**

٣٧٧٠- من أطاعني فقد أطاع الله و من عصاني فقد عصى الله و من يطع الأمير فقد أطاعني و من يعص الأمير فقد عصاني.

(صحيح) ( حم ق ن ه ) عن أبي هريرة. (الإرواء ٣٩٣)

**٣٧٧٠- هەر کەسێك گوێڕایەڵی من بێت گوێڕایەڵی خوایە، هەر کەسیش سەرپێچی فەرمانی من بکات سەرپێچی خوای کردووە، هەر کەسیش گوێڕایەڵ بێت بۆ فەرمانڕەوا بێگومان گوێڕاڵی منی کردووە، هەر کەسیش لەقسەی فەرمانڕەوا دەربچێت بێگومان لەقسەی من دەرچووە.**

---

[٧٥] واتە کاتێك کاربەدەستی موسڵمانان کەسێکی کردە فەرمانڕەوات کە وەکو خۆست و شایستە نەبوو یان مافی تۆ بوو دای بەو دەبێ خۆڕاگر بێت و فە لە فەرمانی دەرنەچێت.

[٧٦] واتە کاربەدەستەکان ئەرکی خۆیان لەسەر...

٣٧٧١- من أمركم من الولاة بمعصية فلا تطيعوه.

(حسن) ( حم ه ك ) عن أبي سعيد. (الصحيحة ٢٣٢٤)

**٣٧٧١- هەر كەسێك لەفەرمانڕەواكان فەرمانيان پێكردن بەبێ فەرمانى خوا گوێڕايەڵييان مەكەن.**

٣٧٧٢- من أهان سلطان الله في الأرض أهانه الله.

(حسن) ( ت ) عن أبي بكرة. (الصحيحة ٢٢٩٦)

**٣٧٧٢- هەر كێ سوكايەتى بەفەرمانڕەواى خوا بكات خواى گەورە سووكايەتى پێ دەكات.**

٣٧٧٣- من رأى من أميره شيئا يكرهه فليصبر عليه فإنه ليس أحد يفارق الجماعة شبرا فيموت إلا مات ميتة جاهلية.

(صحيح) ( حم ق ) عن ابن عباس. (الإرواء ٢٥١٩)

**٣٧٧٣- هەر كەسێك لەئەميرەكەى شتێكى بينى كە پێى ناخۆشە بائارام بگرێت، چونكە هەر كەسێك بستێك لە كۆمەڵى موسڵمانان جيا بێتەوەو بمرێت بەشێوەيەكى نەفامى مردووە.**

٣٧٧٤- هل أنتم تاركوا لي أمرائي ؟ لكم صفوة أمرهم و عليهم كدره.

(صحيح) ( د ) عن عوف بن مالك. (الإرواء ١٢١١)

**٣٧٧٤- ئايا وازدەهێنن لەفەرمانڕەواكانم؟ پاك و بێ گەردى ئەوان بۆ ئێوەيە و لێڵييان بۆ خۆيانە.**

٣٧٧٥- هل أنتم تاركوا لي أمرائي ؟ إنما مثلكم و مثلهم كمثل رجل استرعى إبلا أو غنما فرعاها ثم تحين سقيها فأوردها حوضا فشرعت فيه فشربت صفوه و تركت كدره فصفوه لكم و كدره عليهم.

(صحيح) ( م ) عن عوف بن مالك. (الإرواء ١٢١١)

**٣٧٧٥- ئايا ئێوە وازدەهێنن لەفەرمانڕەواكانم؟ بێگومان نموونەى ئێوەو ئەوان وەكو نموونەى پياوێكە داواى لێ كراوە كۆمەڵە وشترێك يان ڕانە مەڕێك بلەوەڕێنێ و بەخێويان بكات، كە كاتى ئاو خواردنيان دێت دەيانباتە سەر حەوزەكەو ئەوانيش ئاوە پاكە كە دەخۆن و قوڕ و ليتەكەى بەجێ دەهێڵن، بۆيە ئاوە ساف و پاكەكە بۆ ئێوەيە و قوڕ و ليتەكەشى بۆ ئەوانە.**

٣٧٧٦- لا طاعة لأحد في معصية الله إنما الطاعة في المعروف.

(صحيح) ( ق ن ) عن علي. (الصحيحة ١٨١)

**٣٧٧٦- ڕەوا نییە گوێڕایەڵی کەس بکرێت لەکارێکدا سەرپێچی فەرمانی خوای تیا بێت، گوێڕایەڵی لەکاری چاکەدایە.**

٣٧٧٧- لا طاعة لمخلوق في معصية الخالق.

(صحيح) ( حم ك ) عن عمران والحكم بن عمرو الغفاري. (الصحيحة ١٧٦)

**٣٧٧٧- گوێڕایەڵی دروست نییە بۆ هیچ کەسێك لەکارێکدا سەرپێچی کردنی پەروەردگاری تیادا بێت.**

٣٧٧٨- لا طاعة لمن لم يطع الله.

(صحيح) ( حم ) عن أنس. (الصحيحة ٥٩٠)

**٣٧٧٨- گوێڕایەڵی دروست نییە بۆ کەسێك گوێڕایەڵی فەرمانی خوا نەبێت[٧٧].**

٣٧٧٩- يا أيها الناس ! اتقوا الله و إن أمر عليكم عبد حبشي مجدع فاسمعوا له و أطيعوا ما أقام لكم كتاب الله.

(صحيح) ( حم ت ك ) عن أم الحصين. (ظلال الجنة ١٠٦٣)

**٣٧٧٩- خەڵکینە! لەبێ فەرمانی خوا خۆ بپارێزن ئەگەر کۆیلەیەکی حەبەشی لووت بڕاویش کرایە فەرمانڕەواتان، گوێڕایەڵی بکەن تا ئەو کاتەی پەڕاوی خوا (قورئان) لەناوتاندا بەرپا دەکات.**

## بابەتی دەسو پێوەندی چاك[٧٨]

٣٧٨٠- إذا أراد الله بالأمير خيرا جعل له وزير صدق إن نسي ذكره و إن ذكر أعانه و إذا أراد به غير ذلك جعل له وزير سوء إن نسي لم يذكره و إن ذكر لم يعنه.

(صحيح) ( د هب ) عن عائشة . (المشكاة ٣٧٠٧)

**٣٧٨٠- ئەگەر خوای گەورە بیەوێت چاکە بکات لەگەڵ فەرمانڕەوایەکدا( ومزیر ) شالیاری چاکی بۆ ئامادە دەکات، لەکاتی بیرچوونەوە بیری دەخاتەوە لەکاتی پێویستیشدا**

٧٧ واتە لە فەرمان و قەدەغەکراوەکانیدا.

٧٨ یان دار و دەستە.

**یارمەتی دەدات، ئەگەر بیەوێت شتێکی تری لەگەڵدا بکات شالیاری خراپی بۆ دادەنێ، لەکاتی بیرچوونەوە بیر ناخاتەوە، لەکاتی وەبیر هاتنیشدا یارمەتی نادات[79].**

٣٧٨١- إن الله تعالى لم يبعث نبيا و لا خليفة إلا و له بطانتان: بطانة تأمره بالمعروف و تنهاه عن المنكر و بطانة لا تألوه خبالا و من يوق بطانة السوء فقد وقي.

(صحيح) ( خد ت ) عن أبي هريرة . (الصحيحة ١٦٤١)

**٣٧٨١- خوای گەورە هیچ پێغەمبەرێکی نە خەلیفەیەکی نەناردووە ، کە دوو دەسوپێوەندی نەبوبێت: یەکێکیان فەرمانی بەچاکەی پێ دەکات و داوای لێ دەکات لەخراپە دوور کەوێتەوە،دەست و پێوەندێکی تریش درێغی ناکات لەخراپکردنی کارو بارەکانی، هەر کەسیش خۆی بپارێزرێت لەدەسوپێوەنی خراپ ئەو کەسە پارێزراوە[80].**

٣٧٨٢- ما بعث الله من نبي و لا استخلف من خليفة إلا كانت له بطانتان: بطانة تأمره بالمعروف و تحضه عليه و بطانة تأمره بالشر و تحضه فالمعصوم من عصمه الله.

(صحيح) ( حم خ ن ) عن أبي سعيد. (الصحيحة ١٦٤١)

**٣٧٨٢- خوای گەورە هیچ پێغەمبەرێکی نەناردووە یان خەلیفەیەکی جێنشین نەکردووە، تاکو دوو دەسو پێوەندی نەبێت: یەکێکیان فەرمانی پێدەکەن بەچاکەو هانی دەدەن لەسەری، یەکێکیشیان فەرمانی پێدەکەن بەخراپەو هانی دەدەن لەسەری، پارێزراویش ئەو کەسەیە خوا بیپارێزێت.**

٣٧٨٣- ما بعث الله من نبي و لا كان بعده من خليفة إلا كان له بطانتان: بطانة تأمره بالمعروف و تنهاه عن المنكر و بطانة لا تألوه خبالا فمن وقي بطانة السوء فقد وقي.

(صحيح) ( ن ) عن أبي أيوب. (الصحيحة ١٦٤١)

**٣٧٨٣- خوای گەورە هیچ پێغەمبەرێکی نەناردووە، یان خەلیفەیەکی بەدوای ئەودا جێنشین نەکردووە تاکو دەسوپێوەنی نەبوو بێت، یەکێکیان فەرمان بەچاکەو ڕێگری خراپەی لێ دەکات، یەکێکیشیان درێغی ناکەن لەخراپکردنی، جا هەرکەس پارێزراوبێت لە دەست پێوەندی خراپ ڕزگاری بووە.**

---

[79] خۆی لە تەواوە و سەرجەم شەڕو شەڕەنگێزی پارستووە.

[80] خۆی لە تەواوە و سەرجەم شەڕو شەڕەنگێزی پاراستووە.

٣٧٨٤- ما من أمير إلا و له بطانتان من أهله بطانة تأمره بالمعروف و تنهاه عن المنكر و بطانة لا تألوه خبالا فمن وقي شرها فقد وقي و هو من التي تغلب عليه منهما.

(صحيح) ( ن ) عن أبي هريرة. (الصحيحة ٢٢٧٠)

**٣٧٨٤- هەموو فەرمانڕەوايەك نييە دوو دەسو پێوەنى نەبووبێت لەكەسە نزيكەكانى خۆى، يەكێكيان فەرمانى پێدەكات بەچاكەو ڕێگرى لىٚ دەكات لەخراپە، يەكێكيشيان دريٚغى لە خراپەكارى ناكات، جا هەر كەسىٚ ڕزگار ببێت لەو جۆرە كەسانە ئەوە ڕزگارى بووە، خۆيشى لەو بەشەيان دەبێت كەزاڵدەبێت بە سەرياندا.**

٣٧٨٥- من ولي منكم عملا فأراد الله به خيرا جعل له وزيرا صالحا إن نسي ذكره و إن ذكر أعانه.

(صحيح) ( ن ) عن عائشة. (الصحيحة ٤٨٩)

**٣٧٨٥- هەر كەسىٚ لەئێوە كارێكى پىٚ سپێردرا و خواى گەورە بيەوێت چاكەى لەگەڵدا بكات شاليارێكى چاكى بۆ ڕێكدەخات ئەگەر لەبيرى بچێتەوە بيرى دەخاتەوە، كە بە بيريشى هاتەوە يارمەتى دەدات.**

# پەڕاوی
# سەرەتای بونەوەر و
# چۆنیەتی دروستکراوەکان

٣٧٨٦- أذن لي أن أحدث عن ملك من حملة العرش رجلاه في الأرض السفلى و على قرنه العرش و بين شحمة أذنيه و عاتقه خفقان الطير سبعمائة عام يقول ذلك الملك سبحانك حيث كنت.

(صحيح) ( طس ) عن أنس . (الصحيحة ١٥٠)

**٣٧٨٦- ڕێگەم پێدراوە باسی فریشتەیەك بکەم لەهەڵگرانی عەرش هەردوو پێی لەزەوی خوارووداییەو ، عەرشیش لەسەر شاخێتی، نێوان نەرمەی گوێچکەکانی و شانی حەو سەد ساڵە بەهەڵفرینی باڵندە، ئەو فریشتەیە دەڵێت: پاکی و بێگەردی بۆ تۆ خوایە لەهەر کوێ هەیت.**

٣٧٨٧- أذن لي أن أحدث عن ملك من ملائكة الله تعالى حملة العرش ما بين شحمة أذنه إلى عاتقه مسيرة سبعمائة سنة.

(صحيح) ( د الضياء ) عن جابر . (الصحيحة ١٥١)

**٣٧٨٧- مۆڵەتدراوم باسی فریشتەیەك لەفریشتەکانی هەڵگرانی عەرش بکەم: نێوان نەرمەی گوێچکەی و ناو شانی ڕێگەی حەوت سەد ساڵە پیادەیە.**

٣٧٨٨- أطت السماء و يحق لها أن تئط و الذي نفس محمد بيده ما فيها موضع شبر إلا و فيه جبهة ملك ساجد يسبح لله بحمده.

(صحيح) ( ابن مردويه ) عن أنس . (الصحيحة ٨٥٠)

**٣٧٨٨- ئاسمان نرکەی دێتو حەقی خۆیشیەتی نرکەی بێت، سوێند بەوەی گیانی موحەممەدی بەدەستە، جێگای یەك بستی تیادا نییە ناوچەوانی فریشتەیەك لە سوژدە نەبێت کە سوپاس و ستایشی خوای پەروەردگار دەکات.**

**٣٧٨٩**- إن آدم خلق من ثلاث تربات: سوداء و بيضاء و حمراء.

(حسن) ( ابن سعد ) عن أبي ذر . (الصحيحة ١٥٨٠)

**٣٧٨٩- ئادەم لەسێ جۆر خۆڵ دروست كراوە: رەش و سپی و سور[1].**

**٣٧٩٠**- إن إبليس يضع عرشه على الماء ثم يبعث سراياه فأدناهم منه منزلة أعظمهم فتنة يجيء أحدهم فيقول: فعلت كذا و كذا فيقول: ما صنعت شيئا و يجيء أحدهم فيقول: ما تركته حتى فرقت بينه و بين أهله فيدنيه منه و يقول: نعم أنت !.

(صحيح) ( حم م ) عن جابر . (الصحيحة ٣٢٦١)

**٣٧٩٠- ئیبلیس تەختی خۆی لەسەر ئاو دادەنێ و، پۆلەكانی دەنێرێت، نزيكترينيان لێی ئەوەيانە كەزياتر خەڵكی لەخشتە ببات، كەسێكتان دێت و دەڵێت: ئاوهاو ئاوهام كرد، پێی دەڵێت :هيچت نەكردووە، كەسێكی تريشيان دێت و دەڵێت: وازم لێی نەهێنا تاكو لەگەڵ ژنەكەيدا لێكم جيا نەكردنەوە، ئيتر ئەوەيان لەخۆی نزيك دەكاتەوە و پێی دەڵێت: بەڵێ تۆ!**

**٣٧٩١**- إن ابن آدم إن أصابه حر قال: حس و إن أصابه برد قال: حس.

(صحيح) ( حم طب ) عن خولة . (الصحيحة ١٥٧٨)

**٣٧٩١- ئادەميزاد كە گەرمای دەبێت دەڵێت گەرما بردمی، كەسەرمايشی دەبێت دەڵێت سەرما بردمی.**

**٣٧٩٢**- إن الإبل خلقت من الشياطين و إن وراء كل بعير شيطانا.

(حسن) ( ص ) عن خالد بن معدان مرسلا . (حقيقة الصيام ٦٣)

**٣٧٩٢- وشتر لەشەيتانەكان دروستكراوە[2]، لە پشت هەموو وشترێكيشەوە شەيتانێك هەيە.**

**٣٧٩٣**- إن المسلم المسدد ليدرك درجة الصوام القوام بآيات الله بحسن خلقه و كرم ضريبته.

(صحيح) ( حم طب ) عن ابن عمرو . (الصحيحة ٥٢١)

**٣٧٩٣- موسوڵمانی ئاراستەكراو بەجوانی رەوشت و سروشتی، دەگاتە پلەی ئەو كەسەی هەميشە بەرۆژووەو شەو نوێژ دەكات.**

---

[1] ئەوەكانيشيان سەربەخۆيان داوە رەش و سوور و سپين هەر وەكو ئەو قورەی لای دروست كراون ( السراج المنير ج١ ص ٦١٣ )

[2] واتە لە ئاگر دروست كراوە هەروەكو شەيتانيش لەئاگر دروست كراوە

٣٧٩٤- إن الشيطان قد أيس أن يعبده المصلون و لكن في التحريش بينهم.

(صحيح) ( حم م ت ) عن جابر . (الصحيحة ١٦٠٨)

**٣٧٩٤- بەڕاستی شەیتان بێ هیوا بووە لەوەی نوێژكەران بیپەرستن، بەلاّم بە تێكدانی نێوانیان دەست دەوەشێنێ.**

٣٧٩٥- إن الشيطان يجري من ابن آدم مجرى الدم.

(صحيح) ( حم ق د ) عن أنس ( ق د ه ) عن صفية . (المشكاة ٦٨)

**٣٧٩٥- بێگومان شەیتان لەگەڵ دەمرای خوێنی ئادەمیزاددا هاتوچۆ دەكات.**

٣٧٩٦- إن القلوب بين أصبعين من أصابع الله يقلبها.

(صحيح) ( حم ت ك ) عن أنس . (الصحيحة ١٦٨٩)

**٣٧٩٦- بەڕاستی دڵەكان[1] لەنێوان دوو پەنجەن لە پەنجەكانی خوای گەورە هەڵیاندەگێڕێتەوە.**

٣٧٩٧- إن الله أخذ الميثاق من ظهر آدم بنعمان يوم عرفة و أخرج من صلبه كل ذرية ذرأها فنثرهم بين يديه كالذر ثم كلمهم قبلا قال: ( ألست بربكم قالوا بلى) (الأعراف )١٧٢ .

(صحيح) ( حم ن ك هق في الأسماء ) عن ابن عباس . (الصحيحة ١٦٢٣)

**٣٧٩٧- خوای گەورە پە یمانی لە پشتی ئادەم وەرگرتووە لە عەرەفە لەڕۆژی عەرەفەدا، هەرچی نەوەشی هەیە كە لە پشتی ئەو دروستیان دەكات، لە پێش دەستی خۆی پەخش و بلاّویكردەوە وەكو گەردیلە، دوایی بەرەو ڕوو قسەی لەگەڵكردن و فەرمووی: ( ألست بربكم قالو بلى )[2]( الاعراف )**

٣٧٩٨- إن الله أذن لي أن أحدث عن ديك قد مرقت رجلاه الأرض و عنقه مثنية تحت العرش و هو يقول: سبحانك ما أعظمك ! فيرد عليه: لا يعلم ذلك من حلف بي كاذبا.

(صحيح) ( أبو الشيخ في العظمة طس ك ) عن أبي هريرة . (الصحيحة ١٥٠)

**٣٧٩٨- خوای گەورە ڕێگای پێداوم باسی كەڵەشێرێك بكەم هەردوو قاچی لە زەوی چەقانەوە و[3]، ملی چەماوەتەوە لەژێر عەرشدا، دەڵێت: خوایە پاكی و بێگەردی بۆ تۆ چەند مەزنی! وەلاّم دەدرێتەوە :ئەو ڕاستییە نازانێت كەسێك بەدرۆوە سوێند بەمن بخوات.**

---

[1] واتە دڵی ئادەمیزادەكان. السراج المنير ج١ ص٦١٤.

[2] واتە ئەرێ من پەروەردگاری ئێوە نیك.

[3] ئەو خوایەی دروستی كردووە وەلاّمی دەداتەوە.

٣٧٩٩- إن جبريل أتاني حين رأيت فناداني فأخفاه منك فأجبته فأخفيته منك و لم يكن يدخل عليك و قد وضعت ثيابك و ظننت أن قد رقدت فكرهت أن أوقظك و خشيت أن تستوحشي فقال: إن ربك يأمرك أن تأتي أهل البقيع فتستغفر لهم.

(صحيح) ( م ) عن عائشة . (الجنائز ١٨٢)

**٣٧٩٩- بەڕاستی جیبریل هاتە لام و، بانگی کردم و لەتۆی شاردەوە[1]، منیش وەڵامم دایەوەو لەتۆم شاردەوە، ئەو نەدەهاتە ژوورەکەت چونکە تۆ جلەکانت لەبەر داکەند بوو، منیش وامزانی خەوتوی بۆیە حەزم نەکرد بەئاگات بکەمەوە، ترسیشم بوو هەست بەتەنیایی بکەیت، فەرمووی: پەروەردگارت فەرمانت پێ دەکات بچیتە گورستانی بەقیع و داوای لێبوردنیان بۆ بکەیت.**

٣٨٠٠- إن النطفة تقع في الرحم أربعين ليلة ثم يتسور عليها الملك الذي يخلقها فيقول: يا رب أذكر أو أنثى ؟ فيجعله الله ذكرا أو أنثى ثم يقول: يا رب أسوي أو غير سوي ؟ فيجعله الله سويا أو غير سوي ثم يقول: يا رب ما رزقه ؟ ما أجله ؟ ما خلقه ؟ ثم يجعله الله شقيا أو سعيدا.

(صحيح) ( م ) عن حذيفة بن أسيد . (الضعيفة ٢٣٢٢)

**٣٨٠٠- تۆ چل شەو لەناو مناڵداندا دەمێنیتەوە، دوای ئەوە ئەو فریشتەی کەدروستی دەکات دادەبەزێتە سەری و دەڵێت: خوایە کوڕە یان کچە؟ ئیتر خوای گەورە دەیکاتە کوڕ یان کچ و ، ئینجا فریشتەکە دەڵێت: خوایە تەواو بێت یان ناتەواو؟ ئیتر خوای گەورە دەیکاتە تەواو یان ناتەواو، ئینجا دەڵێ: خوایە کامە ڕۆزیەتی؟ ئەجەلی چەندە؟ شێوەی چۆنە؟ ئینجا خوای گەورە بەدبەختی دەکات یان بەختەوەری دەکات.**

٣٨٠١- إن بالمدينة جنا قد أسلموا فإذا رأيتم منهم شيئا فآذنوه ثلاثة أيام فإن بدا لكم بعد ذلك فاقتلوه فإنما هو شيطان.

(صحيح) ( حم م ) عن أبي سعيد . (الضعيفة ٣١٦٣)

**٣٨٠١- لەمەدینە هەندێ جنۆکە هەن موسوڵمان بوون، ئەگەر شتێکتان لەوانە بینی سێ ڕۆژ مۆڵەتیان بدەن، ئەگەر دوای ئەوە بەچاکتان زانی بیکوژن، چونکە ئەوە شەیتانە.**

٣٨٠٢- إن قلوب بني آدم كلها بين أصبعين من أصابع الرحمن كقلب واحد يصرفه حيث شاء.

(صحيح) ( حم م ) عن ابن عمر . (الصحيحة ١٦٨٩)

---

[1] **واتە بە عائیشەی فەرموو.**

**٣٨٠٢- بێگومـان دڵـی ئـادەمیزادەکـان هـەمووی لـەنێوان دوو پە نجـەدان لە پە نجـەکانی ڕەحماندان، وەکو یەك دڵ، بەهەر لایەکدا بیەوێت ئاڕاستەی دەکات.**

٣٨٠٣- إن لله تعالى ملائكة في الأرض تنطق على ألسنة بني آدم بما في المرء من الخير و الشر.

(صحيح) ( ك هب ) عن أنس . (الصحيحة ١٦٩٤)

**٣٨٠٣- بێگومان خوای گەورە فریـشتەی هەیـە لەسـەر زەوی لەسـەر زمـانی ئادەمیزادەکـان قسە دەکەن دەربـارەی هەر چاکە و خرا پەیەك لەکەسێکدا هەبێت.**

٣٨٠٤- إن لله تعالى ملكا أعطاه سمع العباد فليس من أحد يصلي علي إلا أبلغنيها و إني سألت ربي أن لا يصلي علي عبد صلاة إلا صلى عليه عشر أمثالها.

(حسن) ( طب ) عن عمار بن ياسر . (الصحيحة ١٥٣٠)

**٣٨٠٤- خوای گەورە فریشتەگەلێکی هەیە لە قسەی هەموو جنۆکە و ئـادەمیزاد تێدەگـەن، هەر کەسـێك سـەڵەواتێك بداتـە لەسـەر من ئـەو پـێم دەگەیـەنێت، منـیش داوام کـردووە لە پەروەردگـارم هـیچ سـەڵاوات نەداتـە دیـارم بەندەیـەك تـاکو خـوای گـەورە دە ئەوەنـدە سەلاواتی لەسەر نەدات.**

٣٨٠٥- إن لهذه البيوت عوامر فإذا رأيتم شيئا منها فحرجوا عليها ثلاثا فإن ذهب و إلا فاقتلوه فإنه كافر.

(صحيح) ( م ) عن أبي سعيد. (الضعيفة ٣١٦٣)

**٣٨٠٥- بەڕاسـتی ئـەم خانووانـە نیـشتەجێی خۆیـان هەیـە لەجنۆکـە، جـا ئەگـەر شتێکتـان بینی، لەوانە، سێ جار ئاگاداری بکەنەوە، ئەگەر ڕۆیـشت بـاشـە ئەگـەر نـا بیکوژن چونکە بێبـاوەڕە.**

٣٨٠٦- إن من الناس ناسا مفاتيح للخير مغاليق للشر و إن من الناس ناسا مفاتيح للشر مغاليق للخير فطوبى لمن جعل الله مفاتيح الخير على يديه و ويل لمن جعل الله مفاتيح الشر على يديه.

(حسن) ( ه ) عن أنس . (الصحيحة ١٣٣٢)

**٣٨٠٦- بەڕاسـتی خـەڵکانێك هـەن کلیلـی چـاکەن و قفڵـی کـاری خرا پـەن، بێگومـان خەڵکانێکیش هەن کلیلی کاری خرا پەن و قفڵی کاری چاکەن، جا خۆش بەختی بۆ کەسـێك خوا کلیلەکانی خۆشی بداتـە دەستی ئەو ، وەی بۆ کەسێکیش خوای گەورە دەرگاکانی خرا پە لەسەر دەستی ئەو بکاتەوە.**

٣٨٠٧- إن هذا الخير خزائن لتلك الخزائن مفاتيح فمفاتيحه الرجال فطوبى لعبد جعله الله مفتاحا للخير مغلاقا للشر و ويل لعبد جعله الله مفتاحا للشر مغلاقا للخير.

(حسن) ( ه حل ) عن سهل بن سعد . (المشكاة ٥٢٠٨)

**٣٨٠٧- بەڕاستی چاكەكان گە نجینەن، ئەو گە نجینانەیش كلیلیان هەیە، كلیلەكانیان پیاوانێكن، خۆشبەختی بۆ بەندەیەك خوای گەورە بیكاتە كلیلی خێرو چاكە، قفڵی خرا پە، وەی بۆ بەندەیەكیش خوای گەورە بیكاتە كلیلی خرا پە و قفڵی چاكە.**

٣٨٠٨- إنما سمي القلب من تقلبه إنما مثل القلب مثل ريشة بالفلاة تعلقت في أصل شجرة يقلبها الريح ظهرا لبطن.

(صحيح) ( طب ) عن أبي موسى . (المشكاة ١٠٣)

**٣٨٠٨- دڵ بۆیە پێی دەوترێت ( قلب ) لەبەر هەڵگەڕانەوەی، دڵ وەكو پەڕێكە لە چۆڵەوانیەكدا، هەڵواسراوە قەدی درەختێكەوە با ئەم دیوو ئەو دیوی پێ دەكات.**

٣٨٠٩- إنه ليس شيء بين السماء و الأرض إلا يعلم أني رسول الله إلا عاصي الجن و الإنس.

(حسن) ( حم الدارمي الضياء ) عن جابر . (الصحيحة ١٧١٨)

**٣٨٠٩- هیچ شتێك نییە لەنێو ئاسمان و زەویدا نەزانێت من پێغەمبەری خوام، تەنها جنۆكە و ئادەمیزاد یاخی نەبێت.**

٣٨١٠- إني أرى ما لا ترون و أسمع ما لا تسمعون أطت السماء و حق لها أن تئط ما فيها موضع أربع أصابع إلا و ملك واضع جبهته لله تعالى ساجدا و الله لو تعلمون ما أعلم لضحكتم قليلا و لبكيتم كثيرا ،...، و لخرجتم إلى الصعدات تجأرون إلى الله.

(حسن) ( حم ت ه ك ) عن أبي ذر . (الصحيحة ١٠٥٩)

**٣٨١٠- من شتانێك دەبینم و دەبیستم ئێوە نایبینن و نایبیسن، ئاسمان جیڕە جیڕی لێ دێت و جێگای خۆیەتی جیڕەی بێت، جێگای چوار پە نجەی تیا نییە فریشتەیەك ناوچەوانی نەخستبێتە سەری و لەكڕنووشدا نەبێت، سوێند بەخوا ئەوەی من دەیزانم ئێوە بتانزانیبا كەم پێدەكەنین و زۆر دەگریان، ....[1]، دەریشدە چوونە بەرزاییەكان هاوارتان دەبردە لای خوا.**

---

[1] ئەم دەستەوازیە مانانەكراوە چونكە لە كتێبی ( السراج المنير ) دانەهاتووە ( وماتلذذتم بالنساء على الفرش ) واتە لەزەت و چێژتان لە ئافرەتەنتان نەدەكرد لەسەر جێگە.

٣٨١١- ألا أخبركم بخيركم من شركم ؟ خيركم من يرجى خيره و يؤمن شره و شركم من لا يرجى خيره و لا يؤمن شره.

(صحيح) ( حم ت حب ) عن أبي هريرة . (المشكاة ٤٩٩٣)

**٣٨١١- ئايا ئاگادارتان بكەم كێ چاكترو خراپترى ئێوەيە؟ چاكترى ئێوە ئەو كەسەيە چاوەڕوانى چاكەى لێ دەكرێت دەكرێت و دڵنياى لە خراپەنەكردنى، خراپترى ئێوەيش كەسێكە چاوەڕوانى چاكەى لێ ناكرێت و لە خراپەشى يەى دڵنيايى نييە.**

٣٨١٢- الأرواح جنود مجندة فما تعارف منها ائتلف و ما تناكر منها اختلف.

(صحيح) ( خ ) عن عائشة ( حم م د ) عن أبي هريرة ( طب ) عن ابن مسعود . (المشكاة ٥٠٠٣)

**٣٨١٢- گيانەكان كۆمەڵى دەستەجەمعن، هەرئەوانەيا يەكتر بناسن هۆگر دەبن، ئەوانەشيان يەكتر نەناسنەوە ناكۆك دەبن.**

٣٨١٣- الجن ثلاثة أصناف فصنف لهم أجنحة يطيرون بها في الهواء و صنف حيات و كلاب و صنف يحلون و يظعنون.

(صحيح) ( طب ك البيهقي في الأسماء ) عن أبي ثعلبة الخشني . (المشكاة ٤١٤٨)

**٣٨١٣- جنۆكە سێ چەشنن: چەشنێكيان باڵدارن بەئاسماندا هەڵدەفڕن، چەشنێكيشيان مارو سەگن، چەشنێكيش نيشتەجێ دەبن و گەشت و هاتوچۆ دەكەن.**

٣٨١٤- خلق الله آدم على صورته و طوله ستون ذراعا ثم قال: اذهب فسلم على أولئك النفر و هم نفر من الملائكة جلوس فاستمع ما يحيونك فإنها تحيتك و تحية ذريتك فذهب فقال: السلام عليكم فقالوا: السلام عليك و رحمة الله فزادوه و رحمة الله فكل من يدخل الجنة على صورة آدم في طوله ستون ذراعا فلم تزل الخلق تنقص بعده حتى الآن.

(صحيح) ( حم ق ) عن أبي هريرة . (الصحيحة ٤٤٩)

**٣٨١٤- خواى گەورە ئادەمى لەسەر ئەو شێوە دروست كرد كە لەسەريێتى، درێژى شەست گەز، دواى ئەوە فەرمووى بڕۆ سڵاو بكە لەو چەند كەسە كۆمەڵى فريشتەبوون و دانيشتوون، گوێيان لێ بگرە چۆن سڵاوت لێ دەكەن چونكە ئەوە سڵاوى خۆت و ئەوەكانتە ئەويش ڕۆيشت و ، وتى: (السلام عليكم) وتيان: (السلام عليك ورحمه الله) واتە: وتيان ئاشتى و بەزەيى خوات لەسەر**

**بێت، ئەو وشەی بەزەیی خوایەیان بۆ زیاد کرد، جاهەموو کەسێك دەچێتە بەهەشتەوە لەسەر شێوەی ئادەمە درێژی شەست گەزە، لەو ڕۆژەوە تاکو ئەمڕۆ خەڵکی هەر کەم دەکەن.**

٣٨١٥- خلق الله التربة يوم السبت و خلق فيها الجبال يوم الأحد و خلق الشجر يوم الاثنين و خلق المكروه يوم الثلاثاء و خلق النور يوم الأربعاء و بث فيها الدواب يوم الخميس و خلق آدم بعد العصر من يوم الجمعة في آخر الخلق في آخر ساعة من ساعات الجمعة فيما بين العصر إلى الليل.

(صحيح) ( حم م ) عن أبي هريرة . (الصحيحة ١٨٣٣)

**٣٨١٥- خوای گەورە خۆڵی لەڕۆژی شەممە دروست کرد، چیاکانیشی لەڕۆژی یەك شەممەدروست کرد، دارو درەختی لەڕۆژی دوو شەممە دروست کرد، ناخۆشی و تەنگانەی لەڕۆژی سێ شەممە دروست کرد، ڕۆشنایی لەڕۆژی چوارشەممە دروست کرد، گیانلەبەرانیشی لەڕۆژی پێنج شەممە تیادا بڵاوکردەوە، ئادەمیشی لەدوای عەسر دروست کرد لەڕۆژی هەینی لەکۆتایی دروستکراوەکاندا لەکۆتا ساتەکانی ئەو ڕۆژە لەنێوان ئێوارەو شەو.**

٣٨١٦- خلقت الملائكة من نور و خلق الجان من مارج من نار و خلق آدم مما و صف لكم.

(صحيح) ( حم م ) عن عائشة . (الصحيحة ٤٥٨)

**٣٨١٦- فریشتەکان لەڕوناکی دروست کراون، جنۆکەکانیش لەکڵپەی ئاگر، ئادەمیش لەوە دروستکراوە کەبۆتان باس کراوە.**

٣٨١٧- ألا إن ربي أمرني أن أعلمكم ما جهلتم مما علمني يومي هذا كل مال نحلته عبدا حلال و إني خلقت عبادي حنفاء كلهم و إنهم أتتهم الشياطين فاجتالتهم عن دينهم و حرمت عليهم ما أحللت لهم و أمرتهم أن يشركوا بي ما لم أنزل به سلطانا " و إن الله نظر إلى أهل الأرض فمقتهم عربهم و عجمهم إلا بقايا من أهل الكتاب و قال: إنما بعثتك لأبتليك و أبتلي بك و أنزلت عليك كتابا لا يغسله الماء تقرؤه نائما و يقظانا و إن الله أمرني أن أحرق قريشا فقلت يا رب إذن يثلغوا رأسي فيدعوه خبزة قال: استخرجهم كما استخرجوك و اغزهم نغزك و أنفق فسننفق عليك و ابعث جيشا نبعث خمسة مثله و قاتل بمن أطاعك من عصاك و أهل الجنة ثلاثة: ذو سلطان مقسط متصدق موفق و رجل رحيم رقيق القلب لكل ذي قربى و مسلم و عفيف متعفف ذو عيال " و أهل النار خمسة: الضعيف الذي لا زبر له الذين هم فيكم تبع لا يبتغون أهلا و لا مالا و الخائن الذي لا يخفى

له طمع و إن دق إلا خانه و رجل لا يصبح و لا يمسي إلا و هو يخادعك عن أهلك و مالك "
و ذكر البخل و الكذب و الشنظير الفحاش.

(صحيح) ( حم م ) عن عياض بن حمار . (الصحيحة ٣٥٩٩)

**٣٨١٧- خوای گەورە فەرمانی پێکردووم ئەو شتانەی نایزانن فێرتان بکەم لەوەی کەئەمڕۆ منی فێر کردووە، هەر ماڵێکم داوە بەبەندەیەکم حەلاڵە، بەڕاستی منیش بەندەکانم بەموسوڵمانی دروست کردووە هەموویان، بەلام شەیتانەکان هاتن و لەدینەکایان لایاندان، بۆیە ئەوەی بۆم حەلاڵ کرد بوون لێ ی قەدەغە کردنەوەو، فەرمانیشی پێکردن هاوبەش بۆ بڕیار بدەن کە شتانێك کەمن هیچ بەلگەیەکم لەسەر دانەبەزاندون، خوای گەورەیش تەماشای هەموو دانیشتوانی سەرزەوی کردو، ، ڕقی هەلگرت لەهەر چی عەرەب و عەجەم هەیە، تەنها هەندێ لە پاشماوەی خاوەن کیتابەکان نەبێت و، فەرمووی: من تەنها تۆم بۆ ئەوە ڕەوانە کردووە تاقیت بکەمەوەو، خەلکت پێ تاقی بکەمەوە، کیتابێکیشم بۆ ناردویت ئاو نایشۆرێتەوە[1]، دەیخوێنیتەوە لەخەوو ئاگابووندا ئینجا خوای گەورە فەرمانی پێکرد کەقورەیش بسوتێنم، منیش وتم: خوایە گیان کەواتە سەرم دەشکێنن بە برینداری وازی لێ دێنن ، خوای گەورە فەرمووی: دەریان بکە وەکو چۆن دەرتیان کردی، غەزایانیش بکە پشتیوانت دەبین، خەرجیش بکە، پێت دەبەشترێ، سوپایەکیش ڕاوانە بکە ئێمەش پێنج بەرانبەری ڕەوانە دەکەین، بەوانەیش کە گوێڕایەلێن بەگژ ئەوانەدا بچۆ کە لێت یاخی بوون، خەلکی بەهەشت سێ چەشنن: دەسەلاتدارێکی دادگەری خێرخوازی سەرکەوتوو، هەروەها پیاوێکی بەبەزەیی دلنەرم بۆ هەموو خزم و موسوڵمانێك، هەروەها داوێن پاکێکی خۆپاك ڕاگری خێزاندا، خەلکی دۆزەخیش پێنج چەشنن: ئەو لاوازەی کەبیرو هۆشی نییە، ئەوانەی کەهەمیشە شوێنکەوتوون و کەس وکار و ماڵیان مەبەست نییە، ئەو ناپاکەیش کەهەر تەماعێکی بۆ ڕێکەوێت با چەند بچووکیش بێت هەر ناپاکی لێ دەکات، پیاوێکیش هەموو بەیانی و ئێوایەك هەر خەریکی هەلخەلەتاندنتە دەربارەی کەس وکارو ماڵەکەت، ئینجا پیسکەیی و درۆزنی و بەدڕەوشتی باس کرد.**

٣٨١٨- رأيت جبريل له ستمائة جناح.

(صحيح) ( طب ) عن ابن مسعود. (المشكاة ٥٦٦٢)

---

[1] **واتە لە سنگی کەسانێکدا دەپارێزرێت.**

**٣٨١٨- جیبریل [1]م بینی شەش سەد باڵی بوو.**

٣٨١٩- الرعد ملك من ملائكة الله موكل بالسحاب معه مخاريق من نار يسوق بها السحاب حيث شاء الله.

(حسن) ( ت ) عن ابن عباس. (الصحيحة ١٨٧٢)

**٣٨١٩- گرمەی هەور فریشتەیەکە لەفریشتەکانی خوا هەورەکانی پێ سپێردراوە، گوزرێکی ئاگرینی پێیە، هەورەکان لێ دەخورێ بۆ هەر کوێ بیەوێت.**

٣٨٢٠- صياح المولود حين يقع نزغة من الشيطان .

(صحيح) ( م ) عن أبي هريرة. (الروض ١١٠٠)

**٣٨٢٠- گریانی منداڵ لەکاتی لەدایکبوونی ختوکەیە لەشەیتانەوە.**

٣٨٢١- عند الله خزائن الخير و الشر مفاتيحها الرجال فطوبى لمن جعله الله مفتاحا للخير مغلاقا للشر و ويل لمن جعله الله مفتاحا للشر مغلاقا للخير.

(حسن) ( طب الضياء ) عن سهل بن سعد. (السنة ٢٩٦)

**٣٨٢١- گه نجینەکانی چاکەو خراپە لەلای خوایە، کلیلەکانی پیاوانن، جا خۆشبەختی بۆ کەسێك خوای گەورە بیکاتە کلیلی چاکە و خراپەو قفلی خراپە و وای بۆ ئەو کەسەی خوا دەیکاتە کلیلی خراپە و قفلی چاکە.**

٣٨٢٢- كل خلق الله تعالى حسن.

(صحيح) ( حم طب ) عن الشريد بن سويد. (الصحيحة ١٤٤١)

**٣٨٢٢- هەموو دروستکراوەکانی خوا جوانن.**

٣٨٢٣- لقلب ابن آدم أشد انقلابا من القدر إذا استجمعت غليانا.

(صحيح) ( حم ك ) عن المقداد بن الأسود. (الصحيحة ١٧٧٢)

**٣٨٢٣- دڵی ئازمیزاد زیاتر هەڵدەگەڕێتەوە لە مە نجەڵێك لە ئەوپەڕی کوڵان و قوڵپداندا بێت.**

٣٨٢٤- لما خلق الله آدم و نفخ فيه الروح عطس فقال: الحمد لله فحمد الله بإذنه فقال له ربه: يرحمك الله يا آدم ! اذهب إلى أولئك الملائكة إلى ملأ منهم جلوس فقل: السلام عليكم قالوا: و عليك السلام و رحمة الله ثم رجع إلى ربه فقال: إن هذه تحيتك و تحية بنيك بينهم فقال الله له و

[1] واتە لەسەر شێوەی خۆی.

يداه مقبوضتان: اختر أيهما شئت قال: اخترت يمين ربي و كلتا يدي ربي يمين مباركة ثم بسطها فإذا فيها آدم و ذريته فقال أي رب ! ما هؤلاء ؟ قال: هؤلاء ذريتك فإذا كل إنسان مكتوب عمره بين عينيه فإذا فيهم رجل أضوؤهم أو من أضوئهم قال: يا رب من هذا ؟ قال: هذا ابنك داود و قد كتبت له عمر أربعين سنة قال يا رب زد في عمره قال: ذاك الذي كتبت له قال: أي رب فإني قد جعلت له من عمري ستين سنة قال: أنت و ذاك ثم أسكن الجنة ما شاء الله ثم أهبط منها فكان آدم يعد لنفسه فأتاه ملك الموت فقال له آدم: قد تعجلت قد كتب لي ألف سنة قال بلى و لكنك جعلت لابنك داود ستين سنة فجحد فجحدت ذريته و نسي فنسيت ذريته فمن يومئذ أمر بالكتاب و الشهود.

(صحيح) ( ت ك ) عن أبي هريرة. (المشكاة ٤٦٦٢)

**٣٨٢٤- كاتێك خواى گەورە ئادەمى دروست كرد و گيانى بەبەردا كرد پژمى و، وتى: ( الحمد لله ) سوپاسى خواى كرد بەڕێگە پێدانى خواى گەورە خۆى، پەروەردگارى پێى فەرموو: بەر سۆزو بەزەيى خوا بكەوى ئەى ئادەم، برۆ بۆ لاى ئەو فريشتانە بۆ لاى كۆلێكيان كەدانيشتوون و بڵێ: ( السلام عليكم ) ئەوانيش وتيان: ( وعليك السلام ورحمه الله ) ئينجا گەڕايەوە لاى پەروەردگارى و ئەويش پێى فەرموو: ئەمە سڵاوى خۆت و نەوەكانتە لەنێو خۆياندا، خواى گەورە هەردوو دەستى نووقانوو پێى فەرموو: هەڵبژێرە كاميانت دەوێت، وتى: ڕاستى پەروەردگارم هەڵبژارد و هەردوو دەستى پەروەردگارم هەر ڕاست و پيرۆزە، ئينجا كردييەوە كەچى ئادەم و نەوەكانى تێدايە، وتى :ئەى خوايە! ئەوانە كێن؟ فەرمووى: ئەوانە نەوەى تۆن، هەموو كەسێك لەوانە تەمەنى لەنێوچاوەنى نوسرابوو، يەكێكيشيان تيابوو لەهەموويان نورانى تر بوو يەكێك بوو لە نورانيەكان، ئادەم وتى: خوايە! ئەوە كێ يە؟ فەرمووى: ئەوەداودى كوڕتە، چل ساڵ تەمەنى بۆ نواسراوە، وتى: خوايە تەمەنى زياتر بكە، وتى: هەر ئەوەى بۆ نوسراوە، وتى: خوايە من شەست ساڵ لەتەمنى خۆم دەخەمە سەر تەمەنى، فەرمووى: باشە، ئينجا لەبەهەشت نيشتەجێ بە ئەوەندەى ويستى خواى لەسەر بێت، دواى ئەوە دابەزە، جا ئادەم خۆى ئامادە دەكرد ئەو كاتەى فريشتەى مەرگ هاتە لاى، ئادەم پێى وت: پەلەت كرد، من هەزار ساڵم بۆ نوسراوە، وتى بەڵێ، بەلام تۆ شەست ساڵت بۆ داودى كورت دانا، جا نكوڵى كرد و نەوەكەشى نكوڵييان كرد، لەبيريشى چوو، نەوەكانيشى لەبيريان چوو، ئيتر لەو ڕۆژەوە فەرمان كرا بەنووسين و شايەت.**

٣٨٢٥- ليس شيء إلا و هو أطوع لله تعالى من ابن آدم.

(حسن) ( البزار ) عن بريدة. (الروض ١٦٩)

**٣٨٢٥- هه موو شتێك گوێڕایه ڵ تره بۆ خوا له ئادەمیزاد.**

٣٨٢٦- ليس شيء خيرا من ألف مثله إلا الإنسان.

(حسن) ( طب الضياء ) عن سلمان. (الصحيحة ٢١٨٣)

**٣٨٢٦- هيچ شتێك نییه هه زار جار له هاوشێوەی خۆی چاكتر بێت ئادەمیزاد نه بێت[1].**

٣٨٢٧- ماء الرجل أبيض و ماء المرأة أصفر فإذا اجتمعا فعلا مني الرجل مني المرأة أذكرا بإذن الله و إذا علا مني المرأة مني الرجل أنثا بإذن الله.

(صحيح) ( م ن ) عن ثوبان. (الضعيفة ٤٦٨٩)

**٣٨٢٧- ئاوی پیاو[2] سپی یه و، ئاوی ژن زەردە، ئه گەر یه كبگرن له منداڵاندا و ئاوی پیاو پێش بكه وێت به سەر ئافرەتدا كوڕیان دەبێت به مۆڵه تی خوای گه ورە، ئه گەر ئاوی ئافرەتیش پێش ئاوی پیاو بكه وێت كچیان دەبێت به ویستی خوای گه ورە.**

٣٨٢٨- ماء الرجل غليظ أبيض و ماء المرأة رقيق أصفر فأيهما سبق أشبهه الولد.

(صحيح) ( حم م ه ك ) عن أنس. (الصحيحة ١٣٤٢)

**٣٨٢٨- ئاوی پیاو خه ست و سپی یه، ئاوی ئافرەتیش ڕوون و زەردە، هه ركامیان پێش كه وێت مناڵه كه له وەیان دەچێت.**

٣٨٢٩- ما مسخ الله تعالى من شيء فكان له عقب و لا نسل.

(صحيح) ( طب ) عن أم سلمة. (الصحيحة ٢٢٦٤)

**٣٨٢٩- خوا هیچی شتێكی نه سریوه ته وه و دوایی ئه وەی بوو بێت[3].**

٣٨٣٠- ما من القلوب قلب إلا و له سحابة كسحابة القمر بينما القمر يضيء إذ علته سحابة فأظلم إذ تجلت.

(حسن) ( طس ) عن علي. (الصحيحة ٢٢٦٨)

---

[1] ئادەمیزاد بڕاوادار و چاكه كار و ڕەوشت بەر كه ژیانی ته رخان كات بۆ خزمه ت و بەرژەوەندی موسڵمانان السراج المنير ج١ ص٦٢٠.

[2] واته ئاوی تۆوی پیاو و ئاوی تۆوی ئافرەت.

[3] واته وەكو كه سانێك بەبێ زانست بڵێن مه یمون و بەراز ئه وەی ئه و كه سان خوا كردوونی به مه یموون و بەراز (السراج المنير ج١ ص٦٢١).

**٣٨٣٠- هەر دڵێك لەدڵەكان هەورێكی هەیە وەكو هەوری مانگ، بەلام مانگ دەدرەو شێتەوە لەناكاو پەڵە هەورێك بەردەمی دەگرێت و تاریك دەبێت و لا دەچێت جارێكی تر دەدرەوشێتەوە.**

٣٨٣١- ما من كل الماء يكون الولد و إذا أراد الله خلق شيء لم يمنعه شيء.

(صحيح) ( م ) عن أبي سعيد. (الصحيحة ١٤٦٢)

**٣٨٣١- منالْ لەهەموو ئاوەكەوە دروست نابێت، ئەگەر خوای گەورەیش بیەوێت شتێك دروست بكات هیچ شتێك ڕێگای لێ ناگرێت.**

٣٨٣٢- ما منكم من أحد إلا و قد وكل به قرينه من الجن و قرينه من الملائكة قالوا: و إياك ؟ قال: و إياي إلا أن الله أعانني عليه فأسلم فلا يأمرني إلا بخير.

(صحيح) ( حم م ) عن ابن مسعود. (المشكاة ٦٧)

**٣٨٣٢- هیچ كەس لەئێوە نیە هاودەمی خۆی لەجنۆكە و لەفریشتە لەگەڵ دانەنرابێت، وتیان: تۆش؟ فەرمووی: بەڵێ بۆ منیش بەلاّم خوای گەورە یارمەتی داوم و موسوڵمان بووە بە چاكە نەبێت فەرمانم پێ نەكات.**

٣٨٣٣- ما منكم من أحد إلا و معه شيطان قالوا: و أنت يا رسول الله ؟ قال: و أنا إلا أن الله أعانني عليه فأسلم.

(صحيح) ( م ) عن عائشة. (المشكاة ٦٧)

**٣٨٣٣- هیچ كەسێك نیە لەئێوە شەیتانێكی لەگەڵدا نەبێت، وتیان: ئەی تۆش ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی: منیش بەلاّم خوای گەورە كۆمەكی كردم بەسەر یا زاڵ بووم و موسوڵمان بوو.**

٣٨٣٤- مثل القلب مثل الريشة تقلبها الرياح بفلاة.

(صحيح) ( ه ) عن أبي موسى. (المشكاة ١٠٣)

**٣٨٣٤- نموونەی دڵ وەكو پەڕە ، ڕەشەبا لەچۆڵەوانیدا ئەم دیوو ئەو دیوی بكات.**

٣٨٣٥-نطفة الرجل بيضاء غليظة ونطفة المرأة صفراء رقيقة فأيهما غلبت صاحبتها فالشبه له.

(صحيح) ( أبو الشيخ في العظمة ) عن ابن عباس. (الضعيفة ٤٦٨٩)

**٣٨٣٥- تۆی پیاو سپی و خەستە، تۆی ئافرەتیش زەردو ڕوونە، هەر كامیان زاڵبن لەسەر ئەویتریان منالّەكە لەئەو دەچێت.**

٣٨٣٦- الناس معادن كمعادن الذهب و الفضة خيارهم في الجاهلية خيارهم في الإسلام إذا فقهوا و الأرواح جنود مجندة فما تعارف منها ائتلف و ما تناكر منها اختلف.

(صحيح) ( م ) عن أبي هريرة. (المشكاة ٥٠٠٣)

**٣٨٣٦- خەڵكى كانزان وەكو كانزاى ئاڵتوون و زيو، چاكترينيان لەنەفاميدا چاكترينيانە لە ئيسلامدا ئەگەر تێگەشتوو بن، گيانەكانيش سەربازى ئامادە كراون، ئەوانەيان يەكتر بناسن هۆگرى يەكتر دەبن، ئەوانە شيان يەكتر نەناسن بەيەكتر نامۆ دەبن.**

٣٨٣٧- الناس ولد آدم و آدم من تراب.

(حسن) ( ابن سعد ) عن أبي هريرة. (الصحيحة ١٠٠٩)

**٣٨٣٧- خەڵكى نەوەى ئادەمن، ئادەميش لە گڵە.**

٣٨٣٨- يا أم سلمة ! إنه ليس آدمي إلا و قلبه بين إصبعين من أصابع الله فمن شاء أقام و من شاء أزاغ.

(صحيح) ( ت ) عن أم سلمة. (السنة ٢٢٢)

**٣٨٣٨- ئەى ئوممو سەلەمە! هيچ ئادەميزادێك نيە دڵى لەنێوان دوو پەنجە لە پەنجەكانى خوادا نەبێت، هەركەسێك حەز بكات رێك و پێكى دەكات و هەركەسێكيش بيەوێت لەخشتەى دەبات.**

٣٨٣٩- يدخل الملك على النطفة بعد ما تستقر في الرحم بأربعين ليلة فيقول: يا رب ! ماذا ؟ أشقى أم سعيد ؟ أذكر أم أنثى ؟ فيقول الله فيكتبان و يكتب عمله و أثره و مصيبته و رزقه و أجله ثم تطوى الصحيفة فلا يزاد على ما فيها و لا ينقص.

(صحيح) ( حم م ) عن حذيفة بن أسيد. (الضعيفة ٢٣٢٢)

**٣٨٣٩- فريشتەكە دواى چل شەو دەچێتە سەر دڵۆپە تۆومكە پاش جێگير بوونى لەمناڵدانداا، دەڵێت خوايە! چى يە؟ بەدبەختە يان بەختەوەرە؟ نێرە يان مێ يە؟ خواى گەورەيش دەفەرموێت و، دەنوسرێن، كردەوەى دەنوسرێت، هەروەها شوێنەوارى و توشهاتەكانى و، رۆزى و، كاتى مردنى، ئينجا لاپەڕەكە دادەخرێت و هيچ زيادو كەمى لەسەر ناكرێت.**

٣٨٤٠- أتاني جبريل في خضر تعلق به الدر.

(حسن) ( الدارقطني في الأفراد ) عن ابن مسعود . (الصحيحة ٣٤٨٥)

**٣٨٤٠- جيبريل بە پۆشاكێكى سەوزى گەوهەر[1] بەندەوە هات بۆ لام.**

٣٨٤١- أتسمعون ما أسمع ؟ إني لأسمع أطيط السماء و ما تلام أن تئط و ما فيها موضع شبر إلا و عليه ملك ساجد أو قائم.

(صحيح) ( طب الضياء ) عن حكيم بن حزام . (الصحيحة ٨٥٠)

**٣٨٤١- ئايا ئەبيستن ئەوەى من دەيبيستم؟ من گوێم لەجيڕەى ئاسمان دەبيستم و مافى خۆيشێتى جيڕەى بێت، چونكە جێگاى يەك بستى تيا نەماوە، كە فريشتەيەكى لەسەرى نەبێت لە كڕنووشدا يان بە پێوە نەبێت.**

٣٨٤٢- إن الله تعالى لم يجعل لمسخ نسلا و لا عقبا و قد كانت القردة و الخنازير قبل ذلك.

(صحيح) ( حم م ) عن ابن مسعود . (الصحيحة ١٨٢٤)

**٣٨٤٢- خواى گەورە نەوەى نەخستۆتەوە لە كەسانێك كە مەسخ كرابنەوە[2] مەيموون و بەرازيش پێش ئەوانە بووە.**

٣٨٤٣- إن أمة من بني إسرائيل مسخت دواب في الأرض و إني لا أدري أي الدواب هي ؟.

(صحيح) ( حم د ن ه ) عن ثابت بن وديعة ( ه ) عن أبي سعيد . (صحيح أبي داود ٣٧٥٩)

**٣٨٤٤- كۆمەڵێك لەبەنى ئيسرائيل شێوێنران گران بۆ گياندار لەسەر زەوى منيش نازانم چى جۆرە گيانداريێكن؟**

٣٨٤٤- إن نفرا من الجن أسلموا بالمدينة فإذا رأيتم أحدا منهم فحذروه ثلاث مرات ثم إن بدا لكم بعد أن تقتلوه فاقتلوه بعد الثلاث.

(صحيح) ( حم د ) أبي سعيد . (الضعيفة ٣١٦٣)

**٣٨٤٥- چەند كەسێك لەجنۆكەكان لەمەدينە موسوڵمان بوون، ئەگەر كەسێكتان لەوان بينى[3]، سێ جار ئاگاداريان بكەنەوە، دواى ئەوە ئەگەر بەباشتان زانى بيكوژن پاش سێ ڕۆژەكە.**

٣٨٤٥- لا غول.

(صحيح) ( د ) عن أبي هريرة. (الصحيحة ٧٨٤)

**٣٨٤٥- دێو و درنج نى يە .**

---

[1] واتە دانەى گەوهەر گەورە گەورەى پێوە هەلاوەسرا بوون. ( السراج المنير ج١ ص٦٢٣ )

[2] ئەو كەسانەى خوا خەشم و قينى لىٚ گرتن و كردنيە مەيموون و بەراو بەوحاڵە مردن و نەوەيان لىٚ نەكەوتەوە.

[3] واتە لەسەر شێوەى مار. ( السراج المنير ج١ ص٦٢٣ )

# پەراوی پێغەمبەران

٣٨٤٦- لم يبعث الله تعالى نبيا إلا بلغة قومه.

(صحيح) ( حم ) عن أبي ذر. (الصحيحة ٣٥٦١)

**٣٨٤٦- خوای گەورە هیچ پێغەمبەرێکی نەناردووە بە زمانی گەلەکەی خۆی نەبێت.**

٣٨٤٧- لم يقبر نبي إلا حيث يموت.

(صحيح) ( حم ) عن أبي بكر. (صحيح ابن ماجه ١٦٢٨)

**٣٨٤٧- هیچ پێغەمبەرێك بەخاك نەسپێردراوە لەو جێگە نەبێت کە لێی مردووە.**

٣٨٤٨- ما توفى الله نبيا قط إلا دفن حيث يقبض روحه.

(صحيح) ( ابن سعد ) عن ابن أبي مليكة مرسلا. (الجنائز ١٣٧)

**٣٨٤٨- خوای گەورە گیانی هیچ پێغەمبەرێکی نەکێشاوە کە لەو جێگایە نەنێژرا بێت لێی مردووە.**

٣٨٤٩- ما قبض الله تعالى نبيا إلا في الموضع الذي يحب أن يدفن فيه.

(صحيح) ( ت ) عن أبي بكر. (الجنائز ١٣٧)

**٣٨٤٩- خوای گەورە گیانی هیچ پێغەمبەرێکی نەکێشاوە لەو شوێنە نەبێت کە حەزی کردووە تیایدا بنێژرێت.**

٣٨٥٠- ما مات نبي إلا دفن حيث يقبض.

(صحيح) ( ه ) عن أبي بكر. (الجنائز ٣٣٧)

**٣٨٥٠- هیچ پێغەمبەرێك نەمردووە کە لەو جێگە نەنێژرابێت کە تیایدا مردووە .**

٣٨٤١- ما من نبي يمرض إلا خير بين الدنيا و الآخرة.

(صحيح) ( ه ) عن عائشة. (المشكاة ٥٩٦٠)

**٣٨٤١- هيچ پێغه‌مبه‌رێك نييه نه‌خۆش بكه‌وێت تاكو خواى گه‌وره سه‌ر پشكى نه‌كردووه له نێوان دونيا و دوارۆژ.**

٣٨٥٢- أرسل ملك الموت إلى موسى فلما جاءه صكه ففقأ عينه فرجع إلى ربه فقال: أرسلتني إلى عبد لا يريد الموت فرد الله إليه عينه و قال ارجع إليه و قل له: يضع يده على متن ثور فله بما غطت يده بكل شعرة سنة قال: أي رب ! ثم ماذا ؟ قال: ثم الموت قال: فالآن فسأل الله أن يدنيه من الأرض المقدسة رمية بحجر فلو كنت ثم لأريتكم قبره إلى جانب الطريق تحت الكثيب الأحمر.

(صحيح) ( حم ق ن ) عن أبي هريرة . (الصحيحة ٣٢٧٩)

**٣٨٥٢- فريشته‌ى مردن نێردرا بۆ لاى مووسا ، كاتێك گه‌يشته لاى مووسا زلله‌يه‌كى لێيدا و چاوى كوێركرد ، فريشته‌كه گه‌ڕايه‌وه لاى په‌روه‌ردگارى و وتى: منت ناردووه بۆ لاى به‌نده‌يه‌ك مردنى ناوێت ، خواى گه‌وره چاوى بۆ گه‌ڕانده‌وه و ، فه‌رمووى : بگه‌ڕێره‌وه لاى و پێى بلێ: با ده‌ست بخاته سه‌ر پشتى گايه‌ك ، هه‌موو تاڵه موويه‌ك ده‌ستى ده‌كه‌وێته سه‌رى ساڵێ ته‌مه‌نى بۆ ده‌نوسرێت ، وتى : خوايه ئه‌ى دواى ئه‌وه چى؟ فه‌رمووى : مردن. وتى : كه‌واته ئێستا، ئينجا داواى كرد خواى گه‌وره نزيكى بكاته‌وه له خاكى پيرۆز به‌دورى به‌رد هاويشتنێك ، ئه‌گه‌ر له‌وێ بومايه ئارامگاكه‌يم پێ نيشان ده‌دان لاى رێگه‌كه له‌ژێر ته پۆلكه سووره‌كه‌دا .**

٣٨٥٣- أشد الناس بلاء الأنبياء ثم الأمثل فالأمثل يبتلى الرجل على حسب دينه فإن كان في دينه صلبا اشتد بلاؤه و إن كان في دينه رقة ابتلي على قدر دينه فما يبرح البلاء بالعبد حتى يتركه يمشي على الأرض و ما عليه خطيئة.

(صحيح) ( حم خ ن ه ) عن سعد . (الصحيحة ١٤٣)

**٣٨٥٣- سه‌ختترين تاقى كردنه‌وه بۆ پێغه‌مبه‌رانه ، ئينجا شايسته تر و شايسته‌تر ، هه‌ركه‌سێك و به‌گوێره‌ى دينداری تاقى ده‌كرێته‌وه ئه‌گه‌ر پته‌و بوو له ديندارييدا تاقى كردنه‌وه‌كه‌ى گرانتر ده‌بێت ئه‌گه‌ر نه‌رم و نيانى له ديندارييدا هه‌بێت به پێى ئه‌وه تاقى ده‌كرێته‌وه ئه‌و تاقى كردنه‌وانه‌ش به‌رده‌وام له به‌نده‌كانى نابێته‌وه به‌سه‌ر زه‌ويدا ده‌ڕوات و هيچ گوناهى پێوه نه‌ماوه.**

٣٨٥٤- أشد الناس بلاء الأنبياء ثم الأمثل فالأمثل يبتلى الناس على قدر دينهم فمن ثخن دينه اشتد بلاؤه و من ضعف دينه ضعف بلاؤه و إن الرجل ليصيبه البلاء حتى يمشي في الناس ما عليه خطيئة.

(صحيح) ( حب ) عن أبي سعيد . (الصحيحة ١٤٤)

**٣٨٥٤- سەختترین تاقی کردنەوە بۆ پێغەمبەرانە ، ئینجا شایستەتر و شایستە تر ، خەڵکی بە پێی دینداریان تاقی دەکرێنەوە ، هەرکەسێك ئایینی پتەو و توند بێت تاقی کردنەوەی توند دەکرێت ، هەرکێیش دینداریەکەی لاواز بێت تاقی کردنەوەکەشی لاواز دەبێت ، بەڕاستی کەسی وایش هەیە ئەوەندە تووشی بەلا دەبێت تاکو لەناو خەڵکی دا بەڕێگەدا دەڕوات و گوناهی لەسەر نەماوە.**

٣٨٥٥- أشد الناس بلاء الأنبياء الصالحون ثم الأمثل فالأمثل.

(صحيح) ( طب ) عن أخت حذيفة . (المشكاة ١٥٦٢)

**٣٨٥٥- پێغەمبەران دوچاری سەختترین تاقی کردنەوە دەبن ، ئینجا پیاو چاکان، ئینجا ئەوانەی زیاتر لەوان دەچن.**

٣٨٥٦- أشد الناس بلاء الأنبياء ثم الصالحون لقد كان أحدهم يبتلى بالفقر حتى ما يجد إلا العباءة يجوبها فيلبسها و يبتلى بالقمل حتى يقتله و لأحدهم كان أشد فرحا بالبلاء من أحدكم بالعطاء.

(صحيح) ( ه ع ك ) عن أبي سعيد . (الصحيحة ١٤٤)

**٣٨٥٦- گرانترین تاقی کردنەوە بۆ پێغەمبەرانە ، ئینجا پیاو چاکان ، کەسی واهەبوو بە هەژاری تاقی دەکرێتەوە تاکو دەگاتە ئەوەی هیچی دەست نەکەوێت تەنها عەباکەی نەبێت دەیدڕی و پارچە پارچەی دەکات و لەبەری دەکات ، ئینجا بە ئەسپێ تاقی بکرێتەوە تاکو دەیکوژێت ، بەڕاستی کەسی وایان هەیە دوچار بوونی بە بەلاو ناڕەحەتی لێ خۆشترە لە وەرگتنی بەخشش لەلایان ئێوەوە.**

٣٨٥٧- أشد الناس بلاء الأنبياء ثم الذين يلونهم ثم الذين يلونهم.

(صحيح) ( حم طب ) عن فاطمة بنت اليمان . (الصحيحة ١٤٥)

**٣٨٥٧- سەختترین تاقی کردنەوە تووشی پێغەمبەران دەبێت ، ئینجا ئەوانەی دوای ئەوان دێن و، ئەوانەی دوای ئەوانیشدا دێن.**

٣٨٥٨- أعطي يوسف شطر الحسن.

(صحيح) ( ش حم ع ك ) عن أنس . (الصحيحة ١٤٨١)

**٣٨٥٨- یوسف نیوەی جوانی پێدراوە.**

٣٨٥٩- أعطي يوسف و أمه شطر الحسن.

(صحيح) ( ك ) عن أنس . (الصحيحة ١٤٨١)

**٣٨٥٩- یوسف و دایکی نیوەی جوانیان پێدراوە.**

٣٨٦٠- أكرم الناس يوسف بن يعقوب بن إسحاق بن إبراهيم.

(صحيح) ( ق ) عن أبي هريرة ( طب ) عن ابن مسعود. (الضعيفة ٣/٣٠)

**٣٨٦٠- بەرزترین کەس یوسفی کوڕی یەعقوبی کوڕی ئیسحاقی کوڕی ئیبراهیمە**[1].

٣٨٦١- إنه لم يقبض نبي قط حتى يرى مقعده من الجنة ثم يخير.

(صحيح) ( حم ق ) عن عائشة . (الصحيحة ٣٥٨٠)

**٣٨٦١- هیچ پێغەمبەرێك لە دونیا دەرنەچووە تاکو جێگاکەی خۆی لە بەهەشتا نیشان نەدرێت ، و ئینجا سەرپشك نەکرێت.**

٣٨٦٢- أما إبراهيم فانظروا إلى صاحبكم و أما موسى فجعد آدم كأني أنظر إليه انحدر في الوادي يلبي على جمل أحمر مخطوم بخلبة.

(صحيح) ( حم ق ) عن ابن عباس . (الصحيحة ٣٤٩٢)

**٣٨٦٢- دەربارەی ئیبراهیم تەماشای هاوەڵەکەی خۆتان بکەن ، دەربارەی مووسایش ، قژ لوولێکی گەنم ڕەنگ بوو، دەڵێی بەبەرچاومەوەیە لە دۆڵەکەدا دەرواتە خوارەوە خوار لە لەبەیکە لەبەیکە داکەت بەسواری وشترێکەوە کە ڕەشمەکەی حەبلێکی نەنراوە.**

٣٨٦٣- أمرت الرسل أن لا تأكل إلا طيبا و لا تعمل إلا صالحا.

(حسن) ( ك ) عن أم عبدالله بنت أخت شداد بن أوس . (الصحيحة ١١٣٦)

**٣٨٦٣- فەرمانم کردووە بە ڕەوانە کراوەکان شتی پاك و حەڵاڵ نەبێت نە یخۆن و کردەوەی چاك نەبێت نەیکەن.**

٣٨٦٤- أنا أولى الناس بعيسى بن مريم في الدنيا و الآخرة ليس بيني و بينه نبي و الأنبياء أولاد علات أمهاتهم شتى و دينهم واحد.

(صحيح) ( حم ق د ) عن أبي هريرة . (صحيح أبي داود ٤٦٧٨)

---

[1] واتە ڕەچەڵەك و بنەچەی لە هەموان چاکترە چونکە پلە و پایەی پێغەمبەرایەتی و ڕەچەڵەکت بۆ کراوەتەوە، چونکە خۆی و باوکی و باپیری و باپیرە گەورەی پێغەمبەر بوون. (السراج المنير ج١ ص٦٢٧)

**٣٨٦٤- من له پێش ترین كەسم به عیسای كوڕی مەریەم له دونیـا و دواڕۆژدا، لـه نێوان من و ئەودا هیچ پێغەمبـەرێك نیـە، پێغەمبـەرانیش كـوڕی یـەك بـاوكن و دایكانیان جیایه و ئاینیان یەكە.**

٣٨٦٥- أول من غير دين إبراهيم عمرو بن لحي بن قمعة بن خندف أبو خزاعة.

(صحيح) ( طب ) عن ابن عباس . (الصحيحة ١٦٧٧)

**٣٨٦٥- یەكەم كەس ئایینی ئیبراهیمی گۆڕی[1]، عەمری كوڕی لوحەی كـوڕی قەمعـەی كـوڕی خیندفی ئەبو خوزاعه بوو.**

٣٨٦٦- إن الكريم ابن الكريم ابن الكريم يوسف بن يعقوب بن إسحاق بن إبراهيم و لو كنت في السجن ما لبث ثم أتاني الرسول لأجبت و رحمة الله على لوط إن كان ليأوي إلى ركن شديد قال: ﴿قَالَ لَوۡ أَنَّ لِي بِكُمۡ قُوَّةً أَوۡ ءَاوِيٓ إِلَىٰ رُكۡنٖ شَدِيدٖ ٨٠﴾ (هود) فمابعث الله بعده نبيا إلا في ذروة من قومه.

(حسن) ( ت ك ) عن أبي هريرة . (الصحيحة ١٦١٧)

**٣٨٦٦- بەخشندەی كوڕی بەخشندەی كوڕی بەخشندەی كوڕی بەخشندە، یوسفی كوڕی یەعقوبی كوڕی ئیسحاقی كوڕی ئیبراهیمە، ئەگەر لەزایندا بومایه و نێر دراو[2] بهاتایه بەدوامدا بۆ بەرەڵا كردنم وەڵامم دەدایەوە، ڕەحمەتی خوایش لەسەر** (لوط) **بێت، خۆی دایه گۆشەیەكی قایم و فەرمووی:** ﴿قَالَ لَوۡ أَنَّ لِي بِكُمۡ قُوَّةً أَوۡ ءَاوِيٓ إِلَىٰ رُكۡنٖ شَدِيدٖ ٨٠﴾ (هود) **ئیتر له پاش ئەوە خوای گەورە پێغەمبەرێكی نەناردووە لەبەرزترین نەژادی كەس و كارەكەیدا نەبێت.**

٣٨٦٧- إن إبراهيم لما ألقي في النار لم يكن في الأرض دابة إلا أطفأت النار عنه غير الوزغ فإنها كانت تنفخ عليه.

(صحيح) ( حم ه حب ) عن عائشة . (الصحيحة ١٥٨١)

---

[1] واته حوكم و شەریعەتی ئیبراهیمی گۆڕی و به ئاڤارێكی تریدا برد. (السراج المنير ج١ ص٦٢٨)

[2] واته دوای چەند ساڵ مانەوه له بەندینخانه نێردراوی پاشا چوو یوسف بانگ بكات بەلأم لەبەندینخانه نەهاته دەر و فەرمووی ئەو دەنگ و باسەی ژن گەلی میسر بڵاویان كردوە یەكلای بكەوه ئینجا له بەندینخانه دێمەدەر بۆ پێغەمبەر وەسفی خۆدا گری یوسف دەكات دەفەرموێ: من بومایه یەكسەر دەهاتمه دەر.

**٣٨٦٧- كاتێـك ئیـبراهیم فڕێـدراوه نـاو ئاگرەكـه هەرچـی گیانلەبـەرانی زەوی هەیـە ئاگرەكەیان لێ دەكوژاندەوە تەنها قوم قومە نەبێت فووی پیا دەكرد.**

٣٨٦٨- أوتي موسى الألواح و أوتيت المثاني.

(صحيح) ( أبو سعيد النقاش في فوائد العراقيين ) عن ابن عباس . (الصحيحة ٢٨١٣)

**٣٨٦٨- موسا ئەلواحەكانی بۆ نێردراو، منیش (المثانی)[1] م پێ دراوە.**

٣٨٦٩- أنزلت صحف إبراهيم أول ليلة من شهر رمضان و أنزلت التوراة لست مضت من رمضان و أنزل الإنجيل لثلاث عشرة مضت من رمضان و أنزل الزبور لثمان عشرة خلت من رمضان و أنزل القرآن لأربع و عشرين خلت من رمضان.

(حسن) ( طب ) عن واثلة . (الصحيحة ١٥٧٥)

**٣٨٦٩- لاپـەڕەكانی پـەڕاوی ئیـبراهیم لەیەكـەم شـەوی ڕەمـەزان دابـەزین، تـەوراتیش كاتێك دابەزی شەش ڕۆژ تێپەڕ بوو بوو لەڕەمەزان دابەزی، ئینجیلیش لەسیانزەی ڕەمەزان دابەزی، زەبوریش لەهەژدەی ڕەمەزان، قورئانیش لەبیست و چوارەم ڕۆژی ڕەمەزان دابەزی.**

٣٨٧٠- إن داود النبي كان لا يأكل إلا من عمل يده.

(صحيح) ( خ ) عن أبي هريرة . (الصحيحة ٣٥٢٧)

**٣٨٧٠- بەڕاستی داود پێغەمبەر لە ڕەنجی شانی خۆی نەبوایە نەیدەخوارد.**

٣٨٧١- إن لكل نبي ولاة من النبيين و إن وليي أبي و خليل ربي.

(صحيح) ( ت ) عن ابن مسعود . (المشكاة ٥٧٦٩)

**٣٨٧١- هـەموو پێغەمبـەرێك خـاوەن و پـشتیوانێكی هەیـە لە پێغەمبـەران، دۆسـت و خۆشەویستی منیش بـاوكم و خۆشەویستی پەروەردگارمە.**

٣٨٧٢- إن موسى كان رجلا حييا ستيرا لا يرى من جلده شيء استحياء منه فآذاه من آذاه من بني إسرائيل فقالوا: ما استتر هذا التستر إلا من عيب بجلده إما برص و إما أدرة و إما آفة و إن الله عز و جل أراد أن يبرئه مما قالوا فخلا يوما وحده فوضع ثيابه على الحجر ثم اغتسل فلما فرغ أقبل إلى ثيابه ليأخذها و إن الحجر عدا بثوبه فأخذ موسى عصاه و طلب الحجر فجعل يقول: ثوبي حجر ثوبي حجر ! حتى انتهى إلى ملأ من بني إسرائيل فرأوه عريانا أحسن ما خلق

---

[1] لە مانای (المثاني) دا زاناكان زۆر ڕای جیاوازیان هەیە. لەوانەش واتە (قورئان) زاد المسير ج٤ ص٣١٤-٣١٥ ابن الجوزي الطبعة الاولى.

الله و برأه مما يقولون و قام الحجر فأخذ ثوبه فلبسه و طفق بالحجر ضربا بعصاه فوالله إن بالحجر لندبا من أثر ضربه ثلاثا أو أربعا أو خمسا فنلك قوله تعالى: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَكُونُواْ كَٱلَّذِينَ ءَاذَوۡاْ مُوسَىٰ فَبَرَّأَهُ ٱللَّهُ مِمَّا قَالُواْۚ وَكَانَ عِندَ ٱللَّهِ وَجِيهٗا ﴿٦٩﴾ ﴾ (الأحزاب).

(صحيح) ( حم خ ت ) عن أبي هريرة . (الصحيحة ٣٠٧٥)

**٣٨٧٢- موسى پیاوێكی شەرمنی دا پۆشراو بوو هیچ شوێنێك لە پێستی نەدەبینرا، لەبەر شەر و شكۆی خۆی ئیتر هەندێ لەبەنی ئیسرائیل ئازاریان ئەدا و ئەیان ووت: بەخۆڕایی نیە دانەشیوە بەم شێوە خۆی دا پۆشیوە كەم و كوریەكەی لە پێستدا خۆی دانەشیوە لەبەر نوقسانییەك كەلە پێستیدا هەیە، یان بەڵەكە یان قۆڕە، یان لەبەر نەخۆشییەكەی، خوای گەورەیش پاكیەتی ئەو دەربخات لەوەی دەیڵێن، بۆیە جارێك بەتەنیا خۆی بوو، جلەكانی لەسەر بەردێك دانا ئینجا خۆی شت كاتێك لێ بووەوە ڕۆیشت جلەكانی لەبەركاتەوە، بەردەكەیش بەجلەكانییەوە ڕایكرد، موسایش دارەكەی هەڵگرت و بەدوای بەردەكەدا ڕۆیشت و دەیوت: جلەكانم ئەی بەرد، جلەكانم ئەی بەرد! تاكو گەیشتە كۆمەڵێك لەبەنی ئیسرائیل ئەوانیش بەڕووتی بینیان وەكو جوانترین دروستكراوی خوا، خوای گەورە پاكی كردەوە لەو قسانە، بەردەكە وەستا و مووسایش جلەكانی لەبەر كرد، ئینجا بەدارەكە دەستی كرد بە لێدانی بەردەكە، سوێند بەخوا شوێنەواری لێدان لەسەر بەردەكە دیار مابوو لەسێ یان چواریان پێنج جێگادا، بۆیە خوای گەورەیش فەرموویەتی:** ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَكُونُواْ كَٱلَّذِينَ ءَاذَوۡاْ مُوسَىٰ فَبَرَّأَهُ ٱللَّهُ مِمَّا قَالُواْۚ وَكَانَ عِندَ ٱللَّهِ وَجِيهٗا ﴿٦٩﴾ ﴾ (الأحزاب) **هۆخەڵكی موسڵمان و بڕوادار وەكو ئەوانە مەكەن كە موسایان ئازار ئەدا بە پێ وتنی قسەی نابەجێ هەتا خوا پاكی و بێ كەم وكوڕی ئەوی دەرخست ئەو لەلای خوا پەسەند و شایستەیە.**

٣٨٧٣- إنا معشر الأنبياء تنام أعيننا و لا تنام قلوبنا.

(صحيح) ( ابن سعد ) عن عطاء مرسلا . (الصحيحة ١٧٠٥)

**٣٨٧٣- ئێمەی كۆمەڵی پێغەمبەران چاوەكا نمان دەخەوێت و دڵەكا نمان ناخەوێت[1].**

٣٨٧٤- إنما سمي الخضر خضرا لأنه جلس على فروة بيضاء فإذا هي تهتز تحته خضراء.

---

[1] بەڵكو هەمیشە ئاگا و هۆشیارن و بێ ئاگایی و غەفڵەتیان بەسەردا نایەت. (السراج المنير ج١ ص٦٢٩)

(صحيح) ( حم ق ت ) عن أبي هريرة ( طب ) عن ابن عباس . (المشكاة ٥٧١٢)

**٣٨٧٤- ( خَضِرْ ) لەبەر ناونراوەر ( خضر ) چونكە لەسەرهەر زەوییەكی وشكی بێ ڕووەك دابنیشتایە، زەویەكە لەژێریدا ڕادەچڵەكێ و دەلەرزی و بووە سەوزایی.**

٣٨٧٥- إنه لا ينبغي لنبي أن تكون له خائنة الأعين.

(صحيح) ( د ن ك ) عن سعد . (الصحيحة ١٧٢٣)

**٣٨٧٥- ڕەوا نییە و ناگونجێ هیچ پێغەمبەرێك نا پاكی چاوی هەبێت[1].**

٣٨٧٦- أول من فتق لسانه بالعربية المبينة إسماعيل و هو ابن أربع عشرة سنة.

(صحيح) ( الشيرازي في الألقاب ) عن علي .

**٣٨٧٦- یەكەمین كەس بەعەرەبییەكی ڕەوان قسەی كرد ئیسماعیل بوو، لەچواردە ساڵاندا[2].**

٣٨٧٧- أول نبي أرسل نوح.

(صحيح) ( ابن عساكر ) عن أنس . (الصحيحة ١٢٨٩)

**٣٨٧٧- یەكەمین پێغەمبەری ڕەوانە كراو نوح بوو[3].**

٣٨٧٨- بينا أيوب يغتسل عريانا خر عليه جراد من ذهب فجعل أيوب يحثي في ثوبه فناداه ربه تبارك و تعالى: يا أيوب ألم أكن أغنيتك عما ترى ؟ قال: بلى و عزتك و لكن لا غنى بي عن بركتك.

(صحيح) ( حم خ ن ) عن أبي هريرة . (الصحيحة ٣٦ذ٣)

**٣٨٧٨- لەكاتێكدا ئەییوب بەڕووتی خۆی دەشت ، كوللەی ئاڵتوونی بەسەردا باری ئەویش دەستی كرد بە كۆكردنەوەی لە پۆشاكەكەیدا، پەروەردگاری بانگی لێكرد: ئەی ئەییوب**

---

[1] خەتتابی فەرموویەتی: نابێ لەبنەوە بڕ بێت واتە پێچەوانەی ئەوەی دلیدایە دەری بڕێت، ئەگەر بە زمان قسەی نەكرد بەلام بە چاو ئاماژەی كرد ئەوە نا پاكی چاوە (خائنه العین). السراج المنير ج١ ص٦٣٠

[2] واتە بە ئاشكرا كردبێت لە ناو خەڵكدا و ڕەوانی پاراوی قسەی پێ كردبێت لەناو خەڵكیدا دەنا یەكەم كەس كە بەعەرەبی قسەی كردووە جورهوم (جرهم) بووە ئیسماعیل پێغەمبەریش سەلامی خوای لێ بێت بە جورهومەوە فێری عەرەبی بووە (چونكە عەرەب نەبووە) دواتر خوا بەهەرەی فێربوونی ڕەوانبێژی و زمانپاراوی پێ بەخشیوە. السراج المنير ج١ ص ٦٣٠

[3] ئەم قسەش لەگەڵ ئەو قسەیەدا تێكینا گیرێن كە ئادەم یەكەم پێغەمبەر بووە سەلامی خوای لێ بێت چونكە نوح یەكەم پێغەمبەر بووە بۆ بێ باوەڕەكان ڕەوانە كرابێت و ئادەمیش یەكەم پێغەمبەر بووە بۆ نەوەكانی خۆی. السراج المنير ج١ ص٦٣٠

**ئایا من بێ نیازم نەکردبووی لەوەی کە دەیبینی ؟ وتی : بەڵێ سوێند بە شکۆداریت ، بەڵام هەرگیز لە پیرۆزی تۆ بێ نیاز نابم.**

٣٨٧٩- خفف على داود القرآن فكان يأمر بدوابه فتسرج فيقرأ القرآن من قبل أن تسرج دوابه و لا يأكل إلا من عمل يده.

(صحيح) ( حم خ ) عن أبي هريرة . (المشكاة ٥٧١٨)

**٣٨٧٩- خوێندنەوەی زەبور[1] بۆ داوود ئاسان کرا بوو، جا کەفەرمانی دەکرد ولاخەکانی زین بکرێن، پێش زین کردنیان دەیخوێندەوە، لەدەستکەوتی خۆیشی نەبێ نەیدەخوارد.**

٣٨٨٠- رأى عيسى ابن مريم رجلا يسرق فقال له: أسرقت ؟ قال: كلا و الذي لا إله إلا هو فقال عيسى: آمنت بالله و كذبت عيني.

(صحيح) ( حم ق ن ه ) عن أبي هريرة. (صحيح النسائي ٥٤٢٧)

**٣٨٨٠- عیسای کوڕی مەریەم پیاوێکی بینی دزی دەکرد، پێی وت : ئەوە دزیت کرد؟ وتی : نەخێر سوێند بەو کەسەی جگە لەئەو خوایەکی تر نییە ، عیسا فەرمووی : باوەڕم بەخوا هێناو ئەوا چاوی خۆمم بەدرۆخستەوە.**

٣٨٨١- رأيت عيسى و موسى و إبراهيم فأما عيسى فأحمر جعد عريض الصدر و أما موسى فآدم جسيم سبط كأنه من رجال الزُّط و أما إبراهيم فانظروا إلى صاحبكم - يعني نفسه -.

(صحيح) ( خ ) عن ابن عباس. (الصحيحة ٣٤٩٢)

**٣٨٨١- چاوم بە عیسا و موسا و ئیبراهیم کەوت، عیسا سوورو سپیەکی قژ لوولی سنگ پان بوو، موساش گەنم ڕەنگ و تێك سمڕاو و قژ خاو بوو، دەتووت یەکێکە لە پیاوانی ( زطی سۆدانیە )[2] ، سەبارەت بەئیبراهیم یش تەماشای هاوەڵەکەتان بکەن -مەبەستی خۆی بوو- .**

٣٨٨٢- رحم الله أخي يوسف لو أنا أتاني الرسول بعد طول الحبس لأسرعت الإجابة حين قال: (﴿ٱرۡجِعۡ إِلَىٰ رَبِّكَ فَسۡـَٔلۡهُ مَا بَالُ ٱلنِّسۡوَةِ ﴿٥٠﴾﴾ ( **يوسف:٥٠** )

[1] مەبەست بە قورئان لێرەدا زەبوورە بە گوێرەی زمانەوانی عەرەبی چونکە (قورئن) واتە قورئان ( جمع ). السراج المنير ج١ ص ٦٣٠.

[2] جۆرە ڕەگەزێکی خەڵکی سۆدانە کە باڵا بەرز و گۆشتن و پەل ئەستورن.

(صحيح) ( حم في الزهد ابن المنذر ) عن الحسن مرسلا. (الصحيحة ١٨٦٧)

**٣٨٨٢- ڕەحمەتی خوا لەیوسف ی برام بێت ئەگەر من ڕەوانە كراوەكە بهاتایە بەدوای مندا بۆ بەندینخانە خێرا وەڵامم دەدایەوە كاتێك ئەو لێی فەرموو: بگەڕێرەوە بۆ لای گەورەكەت و پرسیاری لێ بكە دەربارەی دەنگ و باسی ئافرەتەكانی ماڵی عەزیزی میسر[1]. ﴿ٱرۡجِعۡ إِلَىٰ رَبِّكَ فَسۡـَٔلۡهُ مَا بَالُ ٱلنِّسۡوَةِ ﴿٥٠﴾﴾ (يوسف)**

٣٨٨٣- الأنبياء أحياء في قبورهم يصلون.

(صحيح) ( ع ) عن أنس . (الصحيحة ٦٢٢)

**٣٨٨٣- پێغەمبەران زیندوون لەگۆڕەكانیاندا نوێژدەكەن[2].**

٣٨٨٤- رحم الله لوطا كان يأوي إلى ركن شديد و ما بعث الله بعده نبيا إلا و هو في ثروة من قومه.

(حسن) ( ك ) عن أبي هريرة. (الصحيحة ١٨٦٧)

**٣٨٨٤- ڕەحمەتی خوا لە ((لوط)) پەنای بۆ گۆشەیەكی پتەو برد، خوای گەورە لەدوای ئەو هیچ پێغەمبەرێكی نەناردووە كە خاوەن خزم و كەسوكاری زۆر نەبووبێت.**

٣٨٨٥- رحم الله موسى قد أوذي بأكثر من هذا فصبر.

(صحيح) ( حم ق ) عن ابن مسعود. (الصحيحة ٣١٧٥)

**٣٨٨٥- ڕەحمەتی خوا لەموسا لەمەش زیاتر ئازار دراو ئارامیشی گرت[3].**

٣٨٨٦- رحمة الله علينا و على موسى لو صبر لرأى من صاحبه العجب.

(صحيح) ( د ن ك ) عن أبي زاد الباوردي: العجاب. (صحيح أبي داود ٣٩٨٤)

**٣٨٨٦- ڕەحمەتی خوا لەئێمەو لەموسا بێت، ئەگەر ئارامی بگرتایە شتی سەیری لەهاوەڵەكەی دەبینی[4].**

---

[1] واتە یەكلای بەكەنەوە بزانن درۆ و بۆختانی ئەو ژنانە بۆ منیان هۆنیەوەتەوە گەیشتووە.

[2] چۆنیەتی نوێژ كردنیان هەر خوا دەیزانێت و نادیارە.

[3] پێغەمبەر سەلات و سەلامی خوای لەسەر بێت ئەم فەرمایشتەی لە حونەینەیندا فەرموو كاتێك پیاوێك هەستایەوە و ووتی: والله ئەم دەبەشكردنە دادبەروەری تیانە بوو و مەبەستیش ڕەزامەندی خوا نەبوو ئینجا پێغەمبەر رووخساری گۆڕاو ئەم فەرموودەیەی فەرموو:((لەكاتی دابەش كردنی دەست كەوتی جەنگدا بوو)) السراج المنير ج١ ص٦٢٣

[4] واتە شتی سەیر و سەمەرە و سەر سوڕهێنەری لە ((خضر)) دەبینی.

٣٨٨٧- سألت جبريل أي الأجلين قضى موسى ؟ قال: أكملهما و أتمهما.

(صحيح) ( ع ك ) عن ابن عباس. (الصحيحة ١٨٨٠)

**٣٨٨٧- پرسیارم کرد لەجیبریل موسا کام لەدوو کاتە دیاریکراوەکەی بردە سەر؟ وتی: تەواوترینیان[1].**

٣٨٨٨- صلوا على النبيين إذا ذكرتموني فإنهم قد بعثوا كما بعثت.

(حسن) ( الشاشي ابن عساكر ) عن وائل بن حجر. (فضل الصلاة ٤٥)

**٣٨٨٨- سەڵاوات بدەن لە سەر پێغەمبەرەكان ئەگەر ناوی منتان هێنا، چونكە ئەوانیش وەكو من ڕەوانە كراون.**

٣٨٨٩- صلوا على أنبياء الله و رسله فإن الله بعثهم كما بعثني.

(حسن) ( ابن أبي عمر هب ) عن أبي هريرة ( خط ) عن أنس. (فضل الصلاة ٤٢)

**٣٨٨٩- سەڵەوات بدەن سەر پێغەمبەران و ڕەوانە كراوانی خوای گەورە چونكە بەڕاستی خوای گەورە ئەوانیشی وەكو من ڕەوانە كردووە.**

٣٨٩٠- عجبت لصبر أخي يوسف و كرمه و الله يغفر له حيث أرسل إليه ليستفتى في الرؤيا و لو كنت أنا لم أفعل حتى أخرج و عجبت لصبره و كرمه و الله يغفر له أتي ليخرج فلم يخرج حتى أخبرهم بعذره و لو كنت أنا لبادرت الباب و لولا الكلمة لما لبث في السجن حيث يبتغي الفرج من عند غير الله عز و جل .

(صحيح) ( طب ابن مردويه ) عن ابن عباس. (الصحيحة ١٩٤١)

**٣٨٩٠- سەرم سوڕ دەمێنێ لەدان بەخۆدا گرن و بەخشندەیی یوسفی برام خوای گەورەیش لێی خۆش دەبێت، كاتێك ناردیان بەدوایدا بۆ لێكدانەوەی خەونەكە، من بومایە خەونەكەم لێك نەدەدایەوە تاكو لەبەندینخانە نەهاتمایەدەر، هەروەها سەرسام بووم لەئارامگرتن و بەخشندەیی ئەو، خوای گەورەیش لێی خۆش بێت، هاتنە لای تا لەزیندان**

[1] واتە كاتێك شوعەیب بە موسای فەرموو سەلامی خوایان لێ بێت كچەكەمت دەدەمێ بە مەرجێک هەشت ساڵ شوانیم بۆ بكەیت خۆ ئەگەر دەساڵیش تەواو بكەی ئەو چاكەی خۆتە، لەم فەرموودەدا دەفەرموێت لە (جیبریل)م پرسی كامیانی تەواو كرد فەرمووی دەساڵەكەی تەواو كرد.

بێتەدەر بەڵام نەهاتەدەر تاکو بیانووکەی خۆی بۆ باسەنەکردن، ئەگەر من بووایەم یەکسەر شاڵاوم بۆ دەرگاکە دەبرد، لەبەر ئەو وتەیەش نەبوایە ئەوەندە لەزینداندا نەدەمایەوە[1].

٣٨٩١- عرض علي الأنبياء فإذا موسى ضرب من الرجال كأنه من رجال شنوءة و رأيت عيسى ابن مريم فإذا أقرب من رأيت به شبها عروة بن مسعود و رأيت إبراهيم فإذا أقرب من رأيت به شبها صاحبكم - يعني نفسه صلى الله عليه وسلم - و رأيت جبريل فإذا أقرب من رأيت به شبها دحية .

(صحيح) ( م ت ) عن جابر. (الصحيحة ١١٠٠)

**٣٨٩١- پێغەمبەرانم پێ پیشاندران، موسام بینی دەتوت یەکێکە لە پیاوانی شەنوئە، عیسای کوڕی مەریەمیشم بینی، تەماشام کرد زۆر لە عوروەی کوڕی مەسعود دەچێت، ئیبراهیم یشم بینی زۆرترین کەس لەئەو بچێت هاوەڵەکەتانە - واتە خۆی درود و سەلاوی خوای لێبێت- جیبریل یشم بینی زۆر لەدیحیەی دەکرد.**

٣٨٩٢- ( غزا نبي من الأنبياء فقال لقومه: لا يتبعني منكم رجل ملك بضع امرأة و هو يريد أن يبني بها و لما يبن بها و لا أحد بنى بيوتا و لم يرفع سقوفها و لا أحد اشترى غنما أو خلفات و هو ينظر ولادها فغزا فدنا من القرية صلاة العصر أو قريبا من ذلك فقال للشمس: إنك مأمورة و أنا مأمور اللهم احبسها علينا فحبست حتى فتح الله عليه فجمع الغنائم فجاءت النار لتأكلها فلم تطعمها فقال: إن فيكم غلولا فليبايعني من كل قبيلة رجل فلزقت يد رجل بيده فقال: فيكم الغلول فلتبايعني قبيلتك فلزقت يد رجلين أو ثلاثة بيده فقال: فيكم الغلول: فجاءوا برأس مثل رأس بقرة من الذهب فوضعوها فجاءت النار فأكلتها ثم أحل الله لنا الغنائم رأى ضعفنا و عجزنا فأحلها لنا )

(صحيح) (حم ق ) عن أبي هريرة. (الصحيحة ٢٠٢)

**٣٨٩٢- پێغەمبەرێك لە پێغەمبەران[2] غەزای کرد و بەگەلەکەی خۆی وت: با هەر پیاوێك ژنی مارە بڕیوە و بەتەمای گواستنەوەیەتی و هێشتا نەیگواستۆتەوە لەگەڵمان نەبێت، هەروەها کەسێکیش چەند ژوورێکی دروست کردبێت و دیوارەکانی بەرز نەکردبێتەوە و**

[1] ئەویش ئەوە بوو بە کابرای فەرموو:(( للذي ظنَّ أنَّهُ ناجٍ منها أذكرني عند ربك )) واتە بەو کەسەیان ووت کە دەیزانی بەرەڵا دەبێت و رزگاری دەبێت لە دووهاورێکەی بەندینخانەی لەلای گەورەکەت باسی ستەم دیدەیی من بکە (بۆیە خوا چەند ساڵە زۆرە لە بەندینخانەدا هێشتیەوە هەتا ئەدەبی دابدات) السراج المنير ج١ ص٦٢٣

[2] ئەویش یوشەعی کوڕی نونە.

سەری نەگرتبێت، و کەسێکیش مەڕیان وشتری ئاوسی کڕیبێ و چاوەڕوانی زانیان دەکات، ئینجا ئەو پێغەمبەرە غەزای کردو لەگوندەکە[1] نزیك بوەوە، لەکاتی نوێژی عەسردا لە گوندەکە نزیك بوەوە و، بە خۆری وت: تۆ فەرمانپێکراوی و منیش فەرمانپێکراوم، دەی خوایە ئەو خۆرەمان بۆ ڕاوەستێنە، ئیتر خۆرەکە ڕاوەستا تاکو خوای گەورە سەری خستن و، دەستکەوتەکان کۆکرانەوەو ئاگر هات بۆ خواردنی و نە یخوارد، پێی وتن: بێگومان لە ناو ئێوەدا ناپاکی لە دەستکەوتەکە کراوە، با لە هەموو هۆزێك کەسێك پە یمانم پێ بدات، لە کاتی پە یمان وەرگرتنەکەدا دەستی کەسێك نوسا بەدەستیەوە، وتی: ناپاکیەکە لەناو ئێوەدایە، با هۆزەکەت پە یمانم پێ بدەن، دەستی دوو یا سێ پیاویان نوسا بەدەستیەوە، وتی: ناپاکیتان تیایە، ئەوانیش سەرێکی ئاڵتونیان هێنا لەسەری مانگا دەچوو خستیانەوە ناو دەستکەوتەکانەوە، ئیتر ئاگرەکە هات و لەناوی برد، ئینجا خوای گەورە دەستکەوتی بۆ ئێمە حەڵاڵ کرد لاوازی و بێ دەسەلاتی ئێمەی بینی بۆی حەڵاڵ کردین.

٣٨٩٣- قال سليمان بن داود: لأطوفن الليلة على مائة امرأة كلهن تأتي بفارس يجاهد في سبيل الله فقال له صاحبه: قل: إن شاء الله فلم يقل: إن شاء الله فطاف عليهن فلم تحمل منهن إلا امرأة واحدة جاءت بشق إنسان و الذي نفس محمد بيده لو قال: إن شاء الله لم يحنث و كان دركا لحاجته.

(صحيح) ( حم ق ن ) عن أبي هريرة. (صحيح النسائي ٣٨٥٦)

**٣٨٩٣- سولە یمانی کوڕی داود وتی: ئەمشەو دەبێت بەسەر سەد ئافرەتدا بگەڕێم هەر یەکێك لەوانە سوار چاکێکی ببێت و لە پێناو خوادا جیهاد بکات، هاوڕێکەی پێی وت: بڵێ: بەویستی خوا، ئەویش ئەوەی نەووت، بەسەر ئافرەتەکاندا گەڕا کەسیان منداڵی نەبوو یەکێکیان نەبێت نیوە منداڵێکی بوو، سوێند بەو کەسەی گیانی موحەممەدی بەدەستە ئەگەر بیوتایە: ( إن شاء الله ) سوێنەکەی نەدەشکاو ئاواتەکەی دەهاتە دی.**

٣٨٩٤- قام موسى خطيبا في بني إسرائيل فسئل أي الناس أعلم ؟ فقال: أنا فعتب الله عليه إذ لم يرد العلم إليه و أوحى الله إليه: إن لي عبدا بمجمع البحرين هو أعلم منك قال: يا رب ! و كيف لي به ؟ فقيل: احمل حوتا في مكتل فإذا فقدته فهو ثم فانطلق و انطلق معه فتاه يوشع بن نون و حملا حوتا في مكتل حتى كانا عند الصخرة فوضعا رءوسهما فناما فانسل الحوت من

---

[1] كە (( بيت المقدس )) بوو.

المكتل فاتخذ سبيله في البحر سربا و كان لموسى و فتاه عجبا فانطلقا بقية يومهما و ليلتهما فلما أصبحا قال موسى لفتاه: ( آتنا غداءنا لقد لقينا من سفرنا هذا نصبا و لم يجد موسى مسا من النصب حتى جاوز المكان الذي أمره الله به فقال له فتاه: ( أرأيت إذ أوينا إلى الصخرة فإني نسيت الحوت ) قال موسى: ( ذلك ما كنا نبغ فارتدا على آثارهما قصصا ) فلما انتهيا إلى الصخرة إذا رجل مسجى بثوب فسلم موسى فقال الخضر: أنى بأرضك السلام ؟ قال: أنا موسى قال: موسى بني إسرائيل ؟ قال: نعم ( قال: هل أتبعك على أن تعلمني مما علمت رشدا ؟ قال: إنك لن تستطيع معي صبرا ) يا موسى إني على علم من علم الله تعالى علمنيه لا تعلمه أنت و أنت على علم من علم الله تعالى علمكه الله لا أعلمه ( قال: ستجدني إن شاء الله صابرا و لا أعصي لك أمرا ) فانطلقا يمشيان على الساحل فمرت سفينة فكلموهم أن يحملوهما فعرفوا الخضر فحملوهما بغير نول و جاء عصفور فوقع على حرف السفينة فنقر نقرة أو نقرتين في البحر فقال الخضر: يا موسى ما نقص علمي و علمك من علم الله إلا كنقرة هذا العصفور في هذا البحر ! فعمد الخضر إلى لوح من ألواح السفينة فنزعه فقال موسى: قوم حملونا بغير نول عمدت إلى سفينتهم فخرقتها لتغرق أهلها ؟ ( قال: ألم أقل إنك لن تستطيع معي صبرا قال: لا تؤاخذني بما نسيت ) فكانت الأولى من موسى نسيانا فانطلقا فإذا غلام يلعب مع الغلمان فأخذ الخضر برأسه من أعلاه فاقتلع رأسه بيده فقال له موسى: ( أقتلت نفسا زكية بغير نفس ) ( قال: ألم أقل لك إنك لن تستطيع معي صبرا ) ( فانطلقا حتى إذا أتيا أهل قرية استطعما أهلها فأبوا أن يضيفوهما فوجدا فيها جدارا يريد أن ينقض ) قال الخضر بيده ( فأقامه ) فقال موسى: ( لو شئت لاتخذت عليه أجرا قال هذا فراق بيني و بينك ) يرحم الله موسى لوددنا لو صبر حتى يقص علينا من أمرهما )

(صحيح) ( ق ت ن ) عن أبي. (صحيح الترمذي ٣١٤٩)

**٣٨٩٤- موسا لە لەنێو بەنی ئیسرائیل وتاری ئەدا کاتێك پرسیاری لێکرا: کێ لەهەموو کەس زاناترە؟ وتی: من، خوای گەورەیش سەرزەنشتی کرد چونکە زانستی نەگێڕایەوە بۆ خوا، و خوای گەورەش وەحیی بۆ نارد: لە شوێنی تێکەڵ بوونی هەردوو دەریاکە بەندەیەکم هەیە ئەو لەتۆ زاناترە، وتی: خوایە! چۆن دەست بیگاتێ؟ پێی وترا: ماسی یەك هەڵگرە لەسەبەتەیەکدا، لەهەر کوێ لێت ون بوو ئەو لەوێیە، ئیتر موسا لەگەڵ یوشەعی کوڕی نونی خولامی ڕۆیشتن، ماسیەکەشیان لەسەبەتەیەکدا هەڵگرت و بردیان،**

**تاكو گەیشتنە لای تاوێرەكە و، لەوێ سەرخەویێكیان شكاند، لەو كاتەدا ماسی یەكە لەسەبەتەكە دەپەری و، ملی ڕێگەی گرت بۆ ناو دەریاكە، ئەمەیش كارێكی سەرسوڕهێنەر بوو بۆ مووسا و خوڵامەكەی، ئیتر ئەو دەمەو ئێوارە و تەواوی شەویش بردیانەوە، كەڕۆژ بوەوە موسا بەخوڵامەكەی وت:** ((اتنا غداءنا لقد لقينا من سفرنا هذا نصباً ))[1] **موسا وتی:** (( ذلك ما كنا نبغ فارتدا على اثارهما قصصا))[2] ﴿الكهف: ٦٤﴾. **جا كاتێك گەیشتنەوە لای تاوێرەكە پیاوێكیان بینی پۆشاكێكی جوانی لەبەردابوو، موسا سەلامی كرد و خدر[3] وتی: كوانێ ئاشتی لەم خاكەی تۆ؟ وتی: من موسام، وتی: موسای بەنی ئیسرائیل؟ وتی: بەڵێ،** (( قال له موسى هل اتبعك على ان تعلمن مما علمت رشدا. قال انك لن تستطيع معي صبرا ))[4] ﴿الكهف: ٦٦، ٦٧﴾ **ئەی موسا من خوای گەورە زانستێكی فێر كردووم تۆ نایزانیت، تۆیش شارەزای زانستێكی لەلای خواوەی من نایزانم،** (( قال ستجدني ان شاء الله صابرا ولا اعصي لك امرا))[5] ﴿الكهف: ٦٩﴾ **ئینجا بەكەناری دەریادا ڕێیان گرتەبەر، كەشتییەك تێپەڕی و ئەوانیش قسەیان لەگەڵ كردن بۆ ئەوەی سواریان كەن، ئەوانیش خدریان دەناسی و بەبێ كرێ هەڵیانگرتن، چۆلەكەیەك هات و، لەسەر لێواری كەشتی یەكە نیشتەوە و، دەنووكێ یان دوو دەنوكی لەدەریاكەدا، خدر وتی: ئەی موسا! زانستی من و زانستی تۆ لەزانستی خوای كەم نەكردووەتەوە ئەوەندەی دەنووكە ئەو چۆلەكەیە نەبێت لەو دەریایە! ئیتر خدر بەئەنقەست تەختەیەكی كەشتییەكەی هەڵكەند و دەریهێنا، مووسا وتی: خەڵكانێك ئێمەیان بەبێ هەڵگرت تۆش بە ئەنقەست كەشتییەكەیان كون دەكەیت بۆ ئەوەی نوقم بن؟** (( قال الم اقل انك لم تستطيع معي صبرا، قال لاتؤاخذني بما نسيت ))[6] **بۆیە یەكەمیان لەموساوە لەبیرچوونەوە بوو، ئینجا بەڕێكەوتن و مناڵێكیان بینی لەگەڵ مناڵەكان یاری دەكات، خدریش لەسەرەوە**

---

[1] **واتە خواردنەكە بێنە با بیخۆین بەراستی لەم گەشتەماندا زۆر ماندوو بوین.**

[2] **دەی ئەمە ئەوەیە ئێمە بۆی دەگەڕێین یەكسەر بە شوێن پێی خۆیاندا بە چاوگێڕان گەڕانەوە**

[3] **ناوەكە بەعەرەبی ( خَضِرَ ).**

[4] **موسا پێی فەرموو ئەرێ دەتوانم دوات كەوم و لەو زانستەی فێركراوی منیش وەكو خۆش ڕابێنی و فێرم بكەیت، فەرمووی تۆ هەرگیز ناتوانی لەگەڵ من دەربەری و خۆبگری**

[5] **موسی فەرمووی: ئەگەر خوا ویستی هەبێت بەخۆ ڕاگرم دەبینی و هیچ نا فەرمانیەكت ناكەم.**

[6] **ئاخر پێم نەوتی تۆ ناتوانی لەگەڵ من خۆ ڕاگری، فەرمووی لەمەی فەرمووی لە بیرم چوو لێم مەگرە.**

**پـەلاماری سـەریدا و بەدەسـتی خـۆی سـەری منداڵەکـەی هەڵکێشا و لـەگیانی جیـای کردەوە، موسا پێی وت:** ((اقتلت نفسا زكية بغير نفس))﴿الكهف: ٧٤﴾ ((قال الم اقل لك انك لن تستطيع معي صبرا))﴿الكهف:٧٥﴾ ((فانطلقا حتى اذا اتيا اهل قرية استطعما حتى اذا انيا اهل قرية استطعهما اهلها فابوا ان يضيفوهما فوجدا فيها جدارا يريد ان ينقض فاقامه))[1] **﴿الكهف:٧٧﴾ بەلام خدر بەدەستی خۆی دروستی کردەوە** (( فاقامه )) **﴿الكهف:٧٧﴾ موسا وتی:** ((لو شئت لاتخذت عليه اجراً قال هذا فراق بيني و بينك))[2] **ڕەحمەتی خـوا لەموسـا بێـت، پێمـان خـۆش بـوو، ئـارامی بگرتایـە تـاکو بەتـەواوی چیرۆکی هەردوو گیانی بۆ دەگێڕاینەوە.**

٣٨٩٥- قرصت نملة نبيا من الأنبياء فأمر بقرية النمل فأحرقت فأوحى الله تعالى إليه أن قرصتك نملة أحرقت أمة من الأمم تسبح ؟ !.

(صحيح) ( ق د ن هـ ) عن أبي هريرة. (المشكاة ٤١٢٢)

**٣٨٩٥- مێرولەیـەك پێغەمبـەرێکی لە پێغەمبـەران گەسـت، ئـەویش فـەرمانی کـرد بەسووتـاندنی شارە مێروولەکە، خوای گەورە نیگای بۆ کـرد و فـەرمووی مێروولەیـەك تـۆی گەشـت نەتەوەیـەکت سـووتـاند لەونەتەوانـەی سـەرگەرمی دەربڕینـی پـاك و بێگـەردی و پەسەندی خودای خۆیانن؟!**

٣٨٩٦- لما خلق الله آدم مسح ظهره فسقط من ظهره كل نسمة هو خالقها إلى يوم القيامة ثم جعل بين عيني كل إنسان منهم وبيصا من نور ثم عرضهم على آدم فقال: أي رب من هؤلاء ؟ قال: هؤلاء ذريتك فرأى رجلا منهم أعجبه نور ما بين عينيه فقال: أي رب من هذا ؟ قال: رجل من ذريتك في آخر الأمم يقال له داود قال: أي رب كم عمره ؟ قال ستون سنة قال: فزده من عمري أربعين سنة: قال: إذن يكتب و يختم و لا يبدل فلما انقضى عمر آدم جاء ملك الموت فقال:

---

[1] **بەرێ کەوتن هەتا تووشی منداڵێکی خنجیلە بوون یەکسەر کوشتی موسی فەرمووی: بۆچی کەسێکی پاك و بێگەرد و بێتاوانت بە ناهەق کوشت بە ڕاستی کارێکی نابەجێت مرد. فەرمووی بە موسی: ئەرێ پێم نەوتی هەرگیز تۆ ناتوانی لەگەڵ من خۆڕاگری. دیسان ڕۆیشتن تا گەیشتنە شاری ئەنگاکیە داوای خواردنیان لە خەڵکەکە کرد ڕازی نەبوون مێوانداریان بکەن، لەوێدا دیوارێکیان بینی خەریك بوو دەرووخا ویستی ڕاستی بکاتەوە ڕاستیشی کردەوە.**

[2] **موسی فەرمووی ئەگەر بنویستایە کرێ ئەم کارەت وەردەگرن فەرمووی ئەمە جیابوونەوەی من و تۆیە.**

أو لم يبق من عمري أربعون سنة ؟ قال: أو لم تعطها ابنك داود ؟ فجحدت ذريته و نسي آدم فنسيت ذريته و خطئ آدم فخطئت ذريته.

(صحيح) ( ت ك ) عن أبي هريرة. (السنة ٢٠٤)

**٣٨٩٦- کاتێك خوای گەورە ئادەمی دروست کرد دەستی بە پشتیدا هێنا هەرچی کەسێك تارۆژی قیامەت دروستی دەکات لە پشتی کەوتە خوار، ئینجا کۆپلەیەك ڕووناکی خستە ناوچەوانی هەر ئادەمیزادێك، ئینجا پیشان بەئادەمی دان و ئەویش وتی: ئەرێ خوایە ئەمانە کێن؟ فەرمووی: ئەوانە نەوەی تۆن، جا یەکێکیانی بینی سەرسام بوو بەڕوناکی نیو چەوانی، وتی: ئەرێ خوایە ئەوەیان کێ یە؟ فەرمووی: پیاوێکە لەنەوەی تۆ ئوممەتەکانی کۆتاییدا دێت داودی پێ دەوترێت داود، وتی: خوایە ئەو تەمەنی چەندە؟ فەرمووی: شەست ساڵە، وتی: خوایە لەتەمەنی من چل ساڵی بۆ زیاد بکە و بیخەرە سەر تەمەنی، فەرمووی: کەواتە دەنوسرێت و مۆردەکرێت ناگوردرێت: کاتێك تەمەنی ئادەم تەواو بوو، فریشتەی مردن هات و ئادەم پێی وتی: ئایا هێشتا چل ساڵ لەتەمەنم نەماوە؟ ئەویش وتی: ئەی تۆ نەتبەخشی بە داودی کوڕت؟ ئەوسا ئادەم نکۆڵی کرد، ئوممەتەکەشی نکۆڵی دەکەن، ئادەم لەبیری چوو، نەتەوەکەشتیان لەبیر دەچێت، ئادەم گوناهی کرد و نەوەکانیشی گوناهدەکەن.**

٣٨٩٧- ما أكل أحد طعاما قط خيرا من أن يأكل من عمل يده و إن نبي الله داود كان يأكل من عمل يده.

(صحيح) ( حم خ ) عن المقدام. (غاية المرام ١٦٣)

**٣٨٩٧- هەرگیز هیچ کەسێك خواردنی چاکتری نەخواردوە لەبەرهەمی دەستی خۆی، بەڕاستی پێغەمبەری خوا داودیش لەڕەنجی شانی خۆی دەخوارد.**

٣٨٩٨- كان داود أعبد البشر.

(حسن) ( ت ك ) عن أبي الدرداء. (الصحيحة ٧٠٧)

**٣٨٩٨- داود لەهەموو کەسێك خوا پەرست تر بووە.**

٣٨٩٩- كان زكريا نجارا.

(صحيح) ( حم م ه ) عن أبي هريرة. (المشكاة ٥٧٢١)

**٣٨٩٩- زەکەریا دارتاش بووە.**

٣٩٠٠- كانت بنو إسرائيل يغتسلون عراة ينظر بعضهم إلى بعض و كان موسى عليه السلام يغتسل وحده فقالوا: و الله ما يمنع موسى أن يغتسل معنا إلا أنه آدر فذهب مرة يغتسل فوضع ثوبه على حجر ففر الحجر بثوبه فجمح موسى في أثره يقول: ثوبي يا حجر ثوبي يا حجر حتى نظرت بنو إسرائيل إلى موسى فقالوا: و الله ما بموسى من بأس و أخذ ثوبه فطفق بالحجر ضربا.

(صحيح) ( حم ق ) عن أبي هريرة. (الصحيحة ٢٠٧٥)

**٣٩٠٠- نەوەی ئیسرائیل[1] بەڕووتی خۆیان دەشت و تەماشای یەکتریان دەکرد، بەڵام موسا بەتەنها خۆی دەشت، وتیان: سوێند بەخوا هیچ موسی قەدەغە ناکات لەگەڵ ئێمە خۆی بشوات قۆڕیەتی نەبێت، جارێك چوو بۆ خۆشۆردن و جل و بەرگەکانی لەسەر بەردێك دانا، بەردەکە جل و بەرگەکانی فڕاند ئیتر موسا بە پەلە بەدوای بەردەکەدا ڕایکرد و دەیووت: جلەکانم بەردەکە، جلەکانم بەردەکە تاکو بەنو ئیسرائیل موسایان بینی و، وتیان سوێند بەخوا موسا هیچ ناتەواویەکی نییە، جل و بەرگەکانی هەڵگرتەوە و، دەستی کرد بەلێدانی بەردەکە.**

٣٩٠١- كأني أنظر إلى موسى في هذا الوادي محرما بين قطوانتين.

(حسن) ( طب ) عن ابن مسعود. (الصحيحة ٢٠٢٣)

**٣٩٠١- هەر دەڵێی سەیری موسا دەکەم لەو دۆڵەدایە بەئیحرامەوە و عەبایەکی سپی کورتی پۆشیوە.**

٣٩٠٢- كأني أنظر إلى يونس على ناقة خطامها ليف و عليه جبة من صوف و هو يقول: لبيك اللهم لبيك.

(صحيح) ( ك ) عن ابن عباس. (الترغيب ١١٢٦)

**٣٩٠٢- دەڵێی تەماشای یونس دەکەم بەسەر وشترێکەوەیە، هەوسارەکەی ڕیشاڵی تەنراوە، جوبەیەکی خوری پۆشیوە و دەڵێت: ( لبيك اللهم لبيك ).**

٣٩٠٣- كل بني آدم يطعن الشيطان في جنبيه بإصبعه حين يولد غير عيسى ابن مريم ذهب يطعن فطعن في الحجاب.

(صحيح) ( خ ) عن أبي هريرة. (الصحيحة ٢٧١١)

**٣٩٠٣- هەموو ئادەمیزادێك لەکاتی لەدایکبوونیدا شەیتان بە پەنجەی تێوەی دەژەنێ، تەنها عیسای کوڕی مریەم نەبێت کاتێك چوو پەنجەی تێکوتی بەر پەردەکە کەوت.**

---

[1] **ئیسرائیل: نازناوی یعقوب پێغەمبەرە.**

٣٩٠٤- كل بني آدم يمسه الشيطان يوم ولدته أمه إلا مريم و ابنها.

(صحيح) ( م ) عن أبي هريرة. (الصحيحة ٢٧١١)

**٣٩٠٤- هەموو ئادەمیزادێك شەیتان دەستێكی پێ دەگەیەنێتێ پێدەگەیەنێ تەنها مەریەم و كوڕەكەی نەبێت.**

٣٩٠٥- كما يضاعف لنا الأجر كذلك يضاعف علينا البلاء.

(حسن) ( ابن سعد ) عن عائشة. (الصحيحة ٢٠٤٧)

**٣٩٠٥- وەكو چۆن پاداشتمان بۆ چەندانەیە[1]، بەهەمان شێوە بەلایش لەسەرمان هەر چەندانەیە.**

٣٩٠٦- الكريم ابن الكريم ابن الكريم ابن الكريم: يوسف بن يعقوب بن إسحاق بن إبراهيم.

(صحيح) ( حم خ ) عن ابن عمر ( حم ) عن أبي هريرة. (المشكاة ٤٨٩٤)

**٣٩٠٦- خانەدانی كوڕی خانەدان كوڕی خانەدان كوڕی خانەدان ، یوسفی كوڕی یەعقوبی كوڕی ئیسحاقی كوڕی ئیبراهیم.**

٣٩٠٧- لم يكذب إبراهيم إلا ثلاث كذبات: ثنتين منهن في ذات الله قوله: ( إني سقيم و قوله: (بل فعله كبيرهم هذا ) و بينما هو ذات يوم و سارة إذ أتى على جبار من الجبابرة فقيل له: إن هاهنا رجلا معه امرأة من أحسن الناس فأرسل إليه فسأله عنها فقال: من هذه ؟ قال: أختي فأتى سارة فقال: يا سارة ليس على وجه الأرض مؤمن غيري و غيرك و إن هذا سألني فأخبرته أنك أختي فلا تكذبيني فأرسل إليها فلما دخلت عليه ذهب يتناولها بيده فأخذ فقال: ادعي الله لي و لا أضرك فدعت الله فأطلق ثم تناولها ثانية فأخذ مثلها أو أشد فقال: ادعي الله لي و لا أضرك فدعت فأطلق فدعا بعض حجبته فقال: إنك لم تأتني بإنسان ! إنما أتيتني بشيطان ! فأخدمها هاجر فأتته و هو قائم يصلي فأومأ بيده مهيا ؟ قالت: رد الله كيد الفاجر في نحره و أخدم هاجر ) .

(صحيح) ( حم ق ) عن أبي هريرة. (الإرواء ١٨٧٥)

**٣٩٠٧- ئیبراهیم هەرگیز درۆی نەكردووە ، سێ جار نەبێت : دووانیان لە پێناو خوای گەورە بوو كەفەرمووی ( ( انی سقیم ) ) واتە من نەخۆشم. ( الصافات:٨٩ ) هەروەها فەرمووی : ( (بل فعلهم كبيرهم هذا ) ) (الأنبياء: ٦٣) واتە : بتە گەورەكەیان ئەوەی ئەنجام داوە جارێكیش خۆی و سارە چوونە لای یەكێك لە زۆردارەكان و پێی وترا پیاوێك**

---

[1] واتە : پێبڕی پێغەمبەرەكان سەلامی خوایان لێ بێت.

لێرەیە ئافرەتێکی زۆر جوانی لەگەڵە ، ئەویش ناردی بە دوای ئیبراهیم و پرسیاری سارەی لێکرد، وتی: ئەوە کێ یە ؟ وتی: خوشکمە ، ئیتر سارەیان هێنا ، ئیبراهیم بە پەنهانی پێی فەرموو: ئەی سارە لەسەر زەوی دا بڕوادار نی یە ، جگە لە من و تۆ ، ئەمیش پرسیاری کرد و وتم خوشکمە ، بۆیە بە درۆم مەخەرەوە ، ناردی بە دوایدا و کاتێك چووە لای هات دەستی بۆ ببات ووشك بوو ، ووتی لە خوا بپاڕێرەوە بۆم و زیانت پێ ناگەیەنم ، ئەویش لەخوا پاڕایەوە و زۆردارەکە چاك بوویەوە ، جارێکی تر دەستی بۆ برد و لە جاری یەکەم خرا پتری بەسەرهات ، وتی لە خوا بپاڕێرەوە و چاکم کاتەوە زیانت پێ ناگەیەنم ، ئەویش لەخوا پاڕایەوە و زۆردارەکە چاك بوویەوە ، زۆردارەکە بانگی دەرگاوانەکانی کرد و ، وتی : ئێوە ئادەمیزادتان بۆ نەهێناوم بەڵکو شەیتانتان بۆ هێنام ! ئیتر هاجەری کردە خزمەتکاری سارە ، ئینجا گەڕایەوە لای ئیبراهیم و ، ئەو لە ناو نوێژدا بوو بە دەستی ئاماژەی بۆ کرد . سارە وتی: خوای گەورە پیلانی خرا پەکارەکەی بەسەر خۆیدا گەڕانەوەو هاجەریشی کردە خزمەتکارم.

٣٩٠٨- لما صور الله تعالى آدم في الجنة تركه ما شاء الله أن يتركه فجعل إبليس يطيف به ينظر إليه فلما رآه أجوف عرف أنه خلق لا يتمالك.

(صحيح) ( حم م ) عن أنس. (الصحيحة ٢١٥٨)

**٣٩٠٨- کاتێك خوای گەورە ئادەمی لەبەهەشتدا دروست کرد و نیگاری کێشا، ماوەیەك کەویستی هێشتیەوە لەبەهەشتدا،ئیبلیس یش هەر سوڕ و دەوری دەدا و لێی ورد دەبوەوە، کاتێك کە بینی کلۆرە، بینی دروستکراوێکە بەرگری وەسوەسەو خۆت خۆتەی بۆ ناکرێت.**

٣٩٠٩- لما عرج بي رأيت إدريس في السماء الرابعة.

(صحيح) ( ت حب ) عن أنس. (صحيح الترمذي ٣١٥٧)

**٣٩٠٩- کاتێك بەرزکرامەوە[1] ئیدریسم لەئاسمانی چوارەم دا بینی.**

٣٩١٠- لما نفخ في آدم الروح مارت و طارت فصارت في رأسه فعطس فقال: الحمد لله رب العالمين فقال الله: يرحمك الله.

(صحيح) ( حب ك ) عن أنس. (الصحيحة ٢١٥٩)

[1] لەشەوی ٢٧ی ڕەجب شەوی (شەو ڕەوی و بەرز کردنەوەی پێغەمبەر بۆ ئاسمان).

**٣٩١٠- کاتێك گیان کراوەبە بەر ئادەمدا بە دەوى خۆیدا خولایەوە و دوودڵ بوو ، پژمەیەکیشى لەسەریدا بۆ دروست بوو ، وتى : سوپاس و ستایش بۆ پەروەردگارى هەموو جیهانیان ، خواى گەورەش فەرمووى : خوا بەزەیى پێتا بێتەوە.**

٣٩١١- ما حبست الشمس على بشر قط إلا على يوشع بن نون ليالي سار إلى بيت المقدس.

(صحيح) ( خط ) عن أبي هريرة. (الصحيحة ٢٢٢٦)

**٣٩١١- خۆر هەرگیز بۆ کەس ڕانەوەستاوە بۆ یوشەعى کوڕى نون نەبێت ، چەند شەوێك ڕاوەستا تا گەیشتە بەیتولەقدیس.**

٣٩١٢- ما من بني آدم مولود إلا يمسه الشيطان حين يولد فيستهل صارخا من مس الشيطان غير مريم و ابنها.

(صحيح) ( خ ) عن أبي هريرة. (الصحيحة ٢٧١١)

**٣٩١٢- هیچ ئادمیزادێك نییە لە کاتى لەدایکبوونیدا شەیتان دەستێکى نەگەیەنێتێ و ئەویش لەکاتى لەدایکبوونیدا دەگریت بەهۆى دەست لێدانى شەیتان ، بێجگە لە مەریەم و کوڕەکەى.**

٣٩١٣- ما من مولود يولد إلا نخسه الشيطان فيستهل صارخا من نخسة الشيطان إلا ابن مريم و أمه.

(صحيح) ( حم م ) عن أبي هريرة. (الصحيحة ٢٧١١)

**٣٩١٣- هیچ منداڵێك نییە لەدایك بێت و شەیتان سیخورمەى لێنەدا و ئەویش لەکاتى لەدایك بوونیدا دەگرى، تەنها کوڕەکەى مەریەم و دایکى نەبێت.**

٣٩١٤- مثلي في النبيين كمثل رجل بنى دارا فأحسنها و أكملها و أجملها و ترك فيها موضع لبنة لم يضعها فجعل الناس يطوفون بالبنيان و يعجبون منه و يقولون: لو تم موضع هذه اللبنة فأنا في النبيين موضع تلك اللبنة.

(صحيح) ( حم ت ) عن أبي ( حم ق ت ) عن جابر ( حم ق ) عن أبي هريرة ( حم م ) عن أبي سعيد. (فقه السيرة ١٤١)

**٣٩١٤- نموونەى من لەناو پێغەمبەرەکاندا نموونەى پیاوێکە خانوویەکى درووست کردووە ، بە چاکترین و تەواوترین و جوانترین شێوە ، جێگاى خشتێکى تیا بەجێهێشتبێت و داینەنابێت ، خەڵکیش بە دەورى کۆشکەکەدا دەسوڕێنەوە و پێى سەرسام دەبوون و دەیانووت : خۆزگە جێى ئەم خشتەش تەواو بکرایە، من لەناو پێغەمبەرەکاندا وەکو ئەو خشتە وام .**

٣٩١٥- من قال أنا خير من يونس بن متى فقد كذب.

(صحيح) ( خ ت ه ) عن أبي هريرة. (المشكاة ٥٧١٠)

**٣٩١٥- هەرکەسێك بڵێ : من چاکترم لە یونسی کوڕی مەتتا ، درۆی کردووە.**

٣٩١٦- لا تفضلوا بين أنبياء الله فإنه ينفخ في الصور فيصعق من في السموات و من في الأرض إلا ما شاء الله ثم ينفخ فيه أخرى فأكون أول من بعث فإذا موسى آخذ بالعرش فلا أدري أحوسب بصعقته يوم الطور أم بعث قبلي و لا أقول إن أحدا أفضل من يونس بن متى.

(صحيح) ( ق ) عن أبي هريرة. (الطحاوية ١٠٩)

**٣٩١٦- پۆلێنی پێغەمبەرەکان مەکەن ، چونکە فوو بە کەڕەنا دەکرێت و هەرچی لە ئاسمانەکان و زەوی دا هەیە دەمرن کەسێك نەبێت خوا بیەوێت نەمرێت ، ئینجا فوویەکی تری پیا دەکرێت ، من یەکەم کەس دەبم زیندوو دەبمەوە ،دەبینم مووسا دەستی بە عەرشەوەیە ، ئیتر نازانم بێهۆشبوونی رۆژی (طور) ی بە مردن بۆ حساب کراوە ، یان لە پیش مندا زیندوو کراوەتەوە، بە ڕاستی ناشڵێم کەس هەیە چاکتر بێت لە یونسی کوڕی مەتتا.**

٣٩١٧- لا يقولن أحدكم: إني خير من يونس بن متى.

(صحيح) ( خ ) عن ابن مسعود. (المشكاة ٥٧١٠)

**٣٩١٧- با هەرگیز کەسێك لە ئێوە نەڵێت من چاکترم لە یونسی کوڕی مەتتا.**

٣٩١٨- لا ينبغي لعبد أن يقول: أنا خير من يونس بن متى.

(صحيح) ( حم ق د ) عن ابن عباس ( حم خ ) عن أبي هريرة وابن مسعود. (الطحاوية ١١٠)

**٣٩١٨- دروست نی یە بۆ هیچ بەندەیەك بڵێ من چاکترم لە یونسی کوڕی مەتتا.**

٣٩١٩- ما ينبغي لنبي أن يقول: إني خير من يونس بن متى.

(صحيح) ( حم د ) عن عبدالله بن جعفر. (الضعيفة ٦٩٥٧)

**٣٩١٩- بۆ هیچ پێغەمبەرێك دروست نیە بڵێ من چاکترم لە یونسی کوڕی مەتتا.**

٣٩٢٠- موسى بن عمران صفي الله.

(صحيح) ( ك ) عن أنس. (الصحيحة ٢٣٦٤)

**٣٩٢٠- موسای کوڕی عیمران هەڵبژێردراوی خوایە.**

٣٩٢١- نزل نبي من الأنبياء تحت شجرة فلدغته نملة فأمر بجهازه فأخرج من تحتها ثم أمر ببيتها فأحرق بالنار فأوحى الله إليه: فهلا نملة واحدة.

(صحيح) ( حم خ د ن ) عن أبي هريرة. (الترغيب ٢٩٨٩)

**٣٩٢١- یەکێك لە پێغەمبەرەکان لە ژێر دارێکدا لای داو مێروولەیەك گەستی ، ئەویش فەرمانی کرد کەل و پەلەکانی لەژێری درەختەکە لابران و فەرمانی کرد شارە مێروولەکە سوتێنرا ، خوای گەورەش نیگای بۆ نارد : دەبوایە یەك مێرولەت بکوشتایە.**

٣٩٢٢- أخذ الله عز و جل مني الميثاق كما أخذ من النبيين ميثاقهم و بشر بي عيسى ابن مريم و رأت أمي في منامها أنه خرج من بين رجليها سراج أضاءت له قصور الشام.

(حسن) ( طب أبو نعيم في الدلائل ابن مردويه ) عن أبي مريم الغساني . (الصحيحة ١٥٤٥)

**٣٩٢٢- خوای گەورە پەیمانی لێ وەرگرتووم وەکو چۆن پەیمانی لە پێغەمبەرانی تریش وەرگرتووە ، مژدەی منیشی بە عیسای کوڕی مەریەم داوە، دایکیشم لە خەونیدا بینی لە نێو هەردوو پێیەوە ڕۆشناییەك دەرچوو تەلارەکانی شامی ڕۆشن کردەوە.**

٣٩٢٣- قال الله تعالى: لا ينبغي لعبد لي أن يقول: أنا خير من يونس بن متى.

(صحيح) ( م ) عن أبي هريرة. (المشكاة ٥٧١٠)

**٣٩٢٣- خوای گەورە فەرموویەتی هیچ بەندەیەکم بۆی نییە بڵێت : من چاکترم لە یونسی کوڕی مەتتا.**

٣٩٢٤- لما توفي آدم غسلته الملائكة بالماء وترا و ألحدوا له و قالوا: هذه سنة آدم في ولده.

(صحيح) ( ك ) عن أبي. (الضعيفة ٢٨٧٢)

**٣٩٢٤- کاتێك ئادەم گیانی دەرچوو فریشتەکان بە ئاو شۆردیان بە شێوەی تاك و لەگۆڕیچەدا ئەسپەردەیان کرد و ، وتیان: ئەمە سوننەتی ئادەمە لە نەوەکانی.**

٣٩٢٥- ألحد آدم و غسل بالماء وترا فقالت الملائكة: هذه سنة ولد آدم من بعده.

(صحيح) ( ابن عساكر ) أبي . (الضعيفة ٢٨٧٢)

**٣٩٢٥- ئادەم بەگۆڕ سپێردرا و بە ئاو شۆردرا بە تاك و ئینجا[1] ، فریشتەکان وتیان ئەمە سوننەتی ئادەمە بۆ نەوەکانی دوای خۆی.**

---

[1] **واتە: بەتاك شۆردیان نەك بەجوت واتە یەك جار یان سێ جار یان پێنج جار دەستیان هەڵگرت**

# پەڕاوی
# ئاكارە جوانەكانی پێغەمبەر (ﷺ)

## بابەتی (ناوەكانی پێغەمبەر (ﷺ))

٣٩٢٦- أنا أبو القاسم الله يعطي و أنا أقسم.

(حسن) ( ك ) عن أبي هريرة . (الصحيحة ١٦٢٨)

**٣٩٢٦- من (أبو القاسم) م ، خوای گەورە دەبەخشێت و من دابەشی دەكەم .**

٣٩٢٧- أنا محمد بن عبد الله بن عبد المطلب إن الله تعالى خلق الخلق فجعلني في خيرهم ثم جعلهم فرقتين فجعلني في خيرهم فرقة ثم جعلهم قبائل فجعلني في خيرهم قبيلة ثم جعلهم بيوتا فجعلني في خيرهم بيتا فأنا خيركم بيتا و أنا خيركم نفسا.

(صحيح) ( حم ت ) عن المطلب بن أبي وداعة . (المشكاة ٥٧٥٧)

**٣٩٢٧- من موحەممەدی كوڕی عەبدوڵلای كوڕی عەبدولموتتەلیبم، بێگومان خوای گەورە دروست كراوەكانی دروست كردوە و منیشی كردووە بە چاكترینی دروستكراوەكان، ئینجا كردنی بە دوو بەشەوە منی كردە چاكترینی ئەو دوو بەشە، ئینجا كردنی بە هۆز هۆز منی خستە باشترین هۆز، لەوانە ، ئینجا كردنی بە خانەوادە منی خستە ناو چاكترین خانەوادە و، بەڕاستی من لە چاكترین ماڵی ئێومم و چاكترین كەسی ناو ئێومم.**

٣٩٢٨- أنا محمد و أحمد و المقفي و الحاشر و نبي التوبة و نبي الرحمة.

(صحيح) ( حم م ) عن أبي موسى زاد ( طب ) : ونبي الملحمة .

**٣٩٢٨- من موحەممەد و ، ئەحمەد و ، موقەففی و[1]، حاشیر و پێغەمبەری ئێومم و پێغەمبەری سۆز و بەزەییم.**

---

[1] واتە لەدوای هەموو پێغەمبەران هاتووم لەدوای من پێغەمبەری تر نایەت.

٣٩٢٩- إن لي خمسة أسماء أنا محمد و أنا أحمد و أنا الحاشر: الذي يحشر الناس على قدمي و أنا الماحي: الذي يمحو الله بي الكفر و أنا العاقب.

(صحيح) ( مالك ق ت ن ) عن جبير بن مطعم . (المشكاة ٥٧٧٦)

**٣٩٢٩- من پێنج ناوم هەیە : من موحوممەدم و من ئەحمەدم من حاشیرم: کە خەڵکی لەبەرپێمدا[1] حەشر دەکرێن ، هەروەها من ( الماحی ) م واتە: لەناوبەر : کە خوای گەورە بێ باوەڕیم پێ لەناو دەبات، هەروەها ناوم ( عاقب )ە.**

٣٩٣٠- إنما أنا رحمة مهداة.

(صحيح) ( ابن سعد الحكيم ) عن أبي صالح مرسلا ( ك ) عنه عن أبي هريرة . (الصحيحة ٤٩٠)

**٣٩٣٠- بەڕاستی من سۆز و بەزەیی و بەخششم.**

٣٩٣١- ألا تعجبون كيف يصرف الله عني شتم قريش و لعنهم يشتمون مذمما و يلعنون مذمما و أنا محمد.

(صحيح) ( خ ن ) عن أبي هريرة . (فقه السيرة ٦٢)

**٣٩٣١- ئایا سەرسام نابن چۆن خوای گەورە جنێو و نەفرینی قورەیشم لەسەرلادەبات ، ئەوان جنێو بە (مُذَمَّمْ) دەکەن دەدەن و نەفرین لە (مُذَمَّمْ) واتە : زەمکراو دەکەن ، بەلام من موحەممەدم واتە: ستایشکراو.**

٣٩٣٢- أنا النبي لا كذب أنا ابن عبد المطلب.

(صحيح) ( حم ق ن ) عن البراء . (المشكاة ٤٨٩٥)

**٣٩٣٢- من پێغەمبەرم و درۆ نیە، من ئەوەی عەبدولموتەلیب م .**

٣٩٣٣- نحن بنو النضر بن كنانة لا نقفو أمنا و لا ننتفي من أبينا.

(صحيح) ( حم ه ) عن الأشعث بن قيس. (الصحيحة ٢٣٥٧)

**٣٩٣٣- ئێمە ئەوەی ئەزری کوڕی کینانەین ، بوختان بۆ دایکی خۆمان ناکەین ، نکۆڵی لە باوکایەتی باوکمان ناکەین.**

---

[1] واتە: لە پێغەمبەرایەتی مندا دونیا کۆتایی دێت و پێغەمبەری تر نایەت.

# بابەتی ڕەوشتەكانی پێغەمبەر (ﷺ)

٣٩٣٤- كان خلقه القرآن.

(صحيح) ( حم م د ) عن عائشة. (صحيح أبي داود ١٢١٣)

**٣٩٣٤- ڕەوشتی پێغەمبەر ( ﷺ ) هەر قورئان بووە .**

٣٩٣٥- آكل كما يأكل العبد فوالذي نفسي بيده لو كانت الدنيا تزن عند الله جناح بعوضة ما سقى منها كافرا كأسا .

(حسن) ( هناد ) الزهد عن عمرو بن مرة مرسلا . (الصحيحة ٥٤١)

**٣٩٣٥- وەكو بەندە خواردن دەخۆم سوێند بەو كەسەی گیانی منی بەدەستە ، ئەگەر دونیا باڵە مێشوولەیەكی بهێنایە، پەرداخێك ئاوی بە بێ باوەڕێك نەدەدا.**

٣٩٣٦- آكل كما يأكل العبد و أجلس كما يجلس العبد.

(صحيح) ( ابن سعد ع حب ) عن عائشة . (الصحيحة ٥٤٤)

**٣٩٣٦- وەكو كۆیلە خواردن دەخۆم، وەكو كۆیلەش دادەنیشم.**

٣٩٣٧- آكل كما يأكل العبد و أجلس كما يجلس العبد فإنما أنا عبد .

(صحيح) ( ابن سعد هب ) عن يحيى بن أبي كثير مرسلا . (الصحيحة ٥٤٤)

**٣٩٣٧- وەكو كۆیلە خواردن دەخۆم و، وەكو كۆیلەش دادەنیشم ، لە ڕاستیدا من تەنها بەندەیەكم.**

٣٩٣٨- أما و الله إني لأمين في السماء و أمين في الأرض.

(صحيح) ( طب ) عن أبي رافع .

**٣٩٣٨- سوێند بەخوا من ئەمیندارم لە ئاسمان و ئەمیندارم لە زەوی.**

٣٩٣٩- إن الله تعالى جعلني عبدا كريما و لم يجعلني جبارا عنيدا

(حسن) ( د ه ) عن عبدالله بن بسر . (الإرواء ٢٠٢٦)

**٣٩٣٩- خوای گەورە منی كردۆتە بەندەیەكی بەخشندە و نەیكردوومە بە زۆردارێكی كەللەڕەق.**

٣٩٤٠- إنه ليس لنبي أن يومض.

(صحيح) ( حم د ) عن أنس . (الصحيحة ١٧٢٣)

**٣٩٤٠- هيچ پێغەمبەرێك بۆى نى يە ئاماژەى پەنهانى بكات[1].**

٣٩٤١- إني لأرجو أن أفارقكم و لا يطلبني أحد منكم بمظلمة ظلمته.

(صحيح) ( ه ) عن أبي سعيد . (صحيح ابن ماجه ٢٢٠١)

**٣٩٤١- بەڕاستى ئومێدم دەخوازم كاتێك لێتان جيا دەبمەوە ، هيچ كەسێك لە ئێوە سكالأيەكى لەسەر نەبێت بەهۆى ستەمێكەوە لێم كردبێت.**

٣٩٤٢- كان أحسن الناس خلقا.

(صحيح) ( م د ) عن أنس. (الإرواء ٥٣١)

**٣٩٤٢- پێغەمبەر (ﷺ) لە هەموو خەڵكى ڕەوشتى جوانتر بوو.**

٣٩٤٣- كان أحسن الناس و أجود الناس و أشجع الناس.

(صحيح) ( ق ت ه ) عن أنس. (الإرواء ٤١٦١)

**٣٩٤٣- پێغەمبەر (ﷺ) جوانترين و بەخشندەترين و ئازاترين كەس بوو.**

٣٩٤٤- كان أشد حياء من العذراء في خدرها.

(صحيح) ( حم ق ه ) عن أبي سعيد. (مختصر الشمائل ٣٠٧)

**٣٩٤٤- پێغەمبەر (ﷺ) بە شەرمتر بوو لە كچ لە پەردەى ماڵى خۆيدا .**

٣٩٤٥- كان وسادته التي ينام عليها بالليل من أدم حشوها ليف.

(صحيح) ( حم د ت ه ) عن عائشة. (الصحيحة ٢١٠٣)

**٣٩٤٥- پێخەفى پێغەمبەرى خوا (ﷺ) كە شەو لەسەر دەخەوت خۆشەكراو بوو ، ناو ئاخنەكەشى گەڵاى داو خورما بوو.**

٣٩٤٦- كان لا يدفع عنه الناس و لا يضربوا عنه.

(صحيح) ( طب ) عن ابن عباس. (الصحيحة ٢١٠٧)

**٣٩٤٦- خەڵكى دوور نەدەخرانەوە لە پێغەمبەر (ﷺ) و لێشيان نەدەدرا[2].**

٣٩٤٧- كان لا يسأل شيئا إلا أعطاه أو سكت.

(صحيح) ( ك ) عن أنس. (الصحيحة ٢١٠٩)

---

[1] واتە : بەپەنهانى و بە دزيەوە هێما و ئاماژە بە دەست وشاندن يان كوشتنى كەسێك يان كەسانێك بكات و لەسەر زارەكيش خۆى وانيشان نەدات.

[2] لەكاتى پاڵە پەستۆكردندا بۆ خزمەتى پێغەمبەر.

**٣٩٤٧- پێغەمبەر (ﷺ) داوای هیچی لێنەكراوە كەنەیبەخشیبێ یان بێدەنگ نەبوبێت[1].**

٣٩٤٨- كان لا يكاد يسأل شيئا إلا فعله.

(صحيح) ( طب ) عن طلحة. (الصحيحة ٢١٠٩)

**٣٩٤٨- لەوانەیە داوای هەرچی لێبكرایە هەر دەیبەخشی.**

٣٩٤٩- كان لا يكاد يقول لشيء لا فإذا هو سئل فأراد أن يفعل قال: نعم و إذا لم يرد أن يفعل سكت.

(صحيح) ( ابن سعد ) عن محمد ابن الحنفية مرسلا. (الصحيحة ٢١٠٩)

**٣٩٤٩- پێغەمبەر (ﷺ) بە دەگمەن بە شتێكی بیوتایە نەخێر ، ئەگەر داوای شتێكی لێبكرایە و بیویستایە بیبەخشێت دەیووت : بەڵێ : ئەگەریش نەیویستایە بیبەخشێت بێ دەنگ دەبوو.**

٣٩٥٠- كان يأتي ضعفاء المسلمين و يزورهم و يعود مرضاهم و يشهد جنائزهم.

(صحيح) ( ع طب ك ) عن سهل بن حنيف. (الصحيحة ٢١١٢)

**٣٩٥٠- پێغەمبەر (ﷺ) دەهاتە لای موسوڵمانە لاوازەكان و سەردانی دەكردن و دەچووە لای نەخۆشەكانیان و ئامادەی ڕێ و ڕەسمی ئەسپەردەكردنی تەرمەكانیان دەبوو.**

٣٩٥١- كان يتخلف في المسير فيزجي الضعيف و يردف و يدعو لهم.

(صحيح) ( د ك ) عن جابر. (الصحيحة ٢١٢٠)

**٣٩٥١- لە كاروان دوا دەكەوت و یارمەتی لاوازی دەدا لەڕۆیشتندا و لەگەڵ خۆی سواری دەكردن و بۆیان دەپاڕایەوە.**

٣٩٥٢- كان يجلس على الأرض و يأكل على الأرض و يعتقل الشاة و يجيب دعوة المملوك على خبز الشعير.

(صحيح) ( طب ) عن ابن عباس. (الصحيحة ٢١٢٥)

**٣٩٥٢- پێغەمبەر (ﷺ) لەسەر زەوی دادەنیشت و لەسەر زەوی نانی دەخوارد و مەڕ و بزنی دەدۆشی و دەڕۆیشت بۆ سەرخوانی كۆیلەیەك كەهەر نانی جۆی هەبوو.**

٣٩٥٣- كان يردف خلفه و يضع طعامه على الأرض و يجيب دعوة المملوك و يركب الحمار.

(صحيح) ( ك ) عن أنس. (الصحيحة ٢١٢٥)

---

[1] واتە ئەگەر بە دەستیەوە بووبێت بەخشیوەتی و ئەگەر نا بێدەنگ بووە و نەیفەرمووە نابێ یان ئەو شتەت نادەمێ.

**٣٩٥٣- پێغەمبەر (ﷺ) لەسەر وولاخەكەی لەدوای خۆیەوە كەسی تری سوار دەكرد لەگەڵ خۆی و، خواردنەكەشی لەسەر زەوی دادەنا و ، دەڕۆیشت بۆ دەعووەتی كۆیلە سواری گوێدرێژیش دەبوو.**

٣٩٥٤- كان يركب الحمار و يخصف النعل و يرفع القميص و يلبس الصوف و يقول: من رغب عن سنتي فليس مني.

(حسن) ( ابن عساكر ) عن أبي أيوب. (الصحيحة ٢١٣)

**٣٩٥٤- پێغەمبەر (ﷺ) سواری گوێدرێژ دەبوو ، نەعلی چاكدەكردەوە، وە كراسی پینە دەكرد و ، پۆشاكی خوری لەبەر دەكرد و ، دەیفەرموو ، كەسێك پشت لە سوننەتی من بكات لە من نییە.**

٣٩٥٥- كان يزور الأنصار و يسلم على صبيانهم و يمسح رءوسهم.

(صحيح) ( ن ) عن أنس. (الصحيحة ١٢٧٨)

**٣٩٥٥- پێغەمبەر (ﷺ) سەردانی یاریدەدەرەكانی دەكرد[1] و سڵاوی لە منداڵەكانیان دەكرد و دەستی دەهێنا بەسەریاندا.**

٣٩٥٦- كان يفلي ثوبه و يحلب شاته و يخدم نفسه.

(صحيح) ( حل ) عن عائشة. (الصحيحة ٦٧١)

**٣٩٥٦- پێغەمبەر (ﷺ) جلەكانی خۆی دەوەشاند و ، مەڕی دەدۆشی و ، خزمەتی خۆی دەكرد.**

٣٩٥٧- ما رأينا من فزع و إن وجدناه لبحرا.

(صحيح) ( د ) عن أنس. (الإرواء ١٥٠٧)

**٣٩٥٧- هەستمان بە ترس نەكرد ، ئەگەر وەكو ئاوی دەریاش پەلی نەدایە.**

٣٩٥٨- هون عليك فإني لست بملك إنما أنا ابن امرأة من قريش كانت تأكل القديد.

(صحيح) ( ه ك ) عن أبي مسعود البدري ( ك ) عن جرير. (الصحيحة ١٨٧٦)

**٣٩٥٨- ئارام بە ، بەڕاستی من پادشا نیم ، بەڵكو كوڕی ئافرەتێكم لە قوڕەیش گۆشتی ووشكەوە بووی دەخوارد.**

٣٩٥٩- يا أم فلان ! اجلسي في أي نواحي السكك شئت أجلس إليك.

(صحيح) ( حم م د ) عن أنس. (صحيح أبي داود ٤٨١٨)

**٣٩٥٩- ئەی دایكی فڵان ! لە هەر لایەكی ڕێگادا دەتەوێت دانیشی لە لات دادەنیشم .**

---

[1] **موسڵمانە مەدینەییەكان ((الانصار))**

٣٩٦٠- كان رحيما بالعيال.

(صحيح) ( الطيالسي ) عن أنس. (الصحيحة ٢٠٩٤)

**٣٩٦٠- پێغەمبەر (ﷺ) بە سۆز بوو بەرامبەر منداڵ و خێزان.**

٣٩٦١- كان رحيما و كان لا يأتيه أحد إلا وعده و أنجز له إن كان عنده.

(حسن) ( خد ) عن أنس. (الصحيحة ٢٠٩٤)

**٣٩٦١- پێغەمبەر (ﷺ) بە سۆز بوو ، هەركەسێكیش بهاتایەتە لای بەڵێنی پێدەدا بەڵێنەكەشی بۆ دەبردە سەر ئەگەر ئەو شتەی هەبوایە.**

٣٩٦٢- السفل أرفق.

(صحيح) ( حم م ) عن أبي أيوب. (الإرواء ١٩٩٢)

**٣٩٦٢- خوارەوە باشتر[1] و ئاسانترە.**

٣٩٦٣- عرش كعرش موسى .

(صحيح) ( هق ) عن سالم بن عطية مرسلا. (الصحيحة ٦١٨)

**٣٩٦٣- كە پرێك وەكو كە پرەكەی مووسا[2].**

٣٩٦٤- عريشا كعريش موسى ثمام و خشيبات و الأمر أعجل من ذلك .

(حسن) ( المخلص في فوائده ابن النجار ) عن أبي الدرداء. (الصحيحة ٦١٨)

**٣٩٦٤- كە پرێك لە چەشنی كە پرەكەی مووسا و بەهەندێ قامیش و دار بیتەنن ، كارەكە لەوە بە پەلەترە .**

[1] كاتێك پێغەمبەری خوا سەلات و سەلامی خوای لەسەر بێت گەیشتە مەدینە لە ڕێوە لەماڵی ئەبو ئەیوبی ئەنساری لایدا و لەقاتی خوارەوە و ئەبو ئەیوبیش چووە سەرەوە، دواتر ئەبو ئەیوب لەبەر ئەدەب و ڕێزی بۆ پێغەمبەر فەرمووی ئەی پێغەمبەری خوا تۆ بچۆرە قاتی سەرەوە ئەویش فەرمووی قاتی خوارەوە بۆ هاوەڵان و زیارەت كاران چاكتر و ئاسانترە.

[2] كاتێك ئەم فەرمایشتەی فەرموو هاوەڵان ویستیان لە دەوروبەری مزگەوت ژورێكی بۆ دروست بكەن ئەویش پێی خۆش نەبوو فەرمووی:(( عريش كعريش موسى )) واتە : ساباتێك وەكو كە پر و ساباتەكری موسى (( سابات يان كە پر بەشوێنێكی سێبەر دەوترێت یا خێمە و بان دەوار یان ڕەشماڵیش بێت )) السراج المنير ج١ ص٦٤٦

## بابەتی تایبه تمەندیەکانی پێغەمبەر( ﷺ )

٣٩٦٥- اللهم اجعل رزق آل محمد ...... قوتا .

(صحيح) ( م ت ه ) عن أبي هريرة . (الصحيحة ١٣٠)

**٣٩٦٥- خوایه رۆزی خاوو خێزانی موحەممەد نانەسکی و مەمره و مەژی بێت.**

٣٩٦٦- اللهم إني أتخذ عندك عهدا لن تخلفنيه فإنما أنا بشر فأيما مؤمن آذيته أو شتمته أو جلدته أو لعنته فاجعلها له صلاة و زكاة و قربة تقربه بها إليك يوم القيامة.

(صحيح) ( ق ) عن أبي هريرة . (الصحيحة ٣٩٩٩)

**٣٩٦٦- خوایه من پەیمانێکت لێ وەردەگرم و تۆیش هەرگیز پەیمانەکەم ناشکێنی ، بەڕاستی منیش ئادەمیزادێکم هەر ئیمانداریکم ئازار دا یان جنێوم پێدا ، یان بە قامچی لێمدا یان نەفرینم لیکرد ، خوایه ئەوەی بۆ بکەیتە نوێژ و زەکات و، نزیك بوونەوەی له تۆ له رۆژی قیامەتدا .**

٣٩٦٧- أما و الله إني لأتقاكم لله و أخشاكم له.

(صحيح) ( م ) عن عمرو بن أبي سلمة . (الإرواء ٩١٦)

**٣٩٦٧- سوێند بەخوا له هەمووتان زیاتر پارێزگاری لەبێ فەرمانی خوا لەهەمووشتان زیاتر لەخوا دەترسم دەکەم.**

٣٩٦٨- أما و الله إني لأخشاكم لله و أتقاكم له لكني أصوم و أفطر و أصلي و أرقد و أتزوج النساء فمن رغب عن سنتي فليس مني.

(صحيح) ( خ ) عن أنس . (المشكاة ١٤٥)

**٣٩٦٨- سوێند بەخوا له هەمووتان له خواترسترو و پارێزگارترم ، بەلام رۆژووش دەگرم و بەرۆژوش نابم ، شەونوێژدەکەم و دەشخەوم و له ئافرەتانیش هاوسەرگیری دەکەم ، هەرکەسێکیش له سووننەتی من لابدات له من نییه.**

٣٩٦٩- امشوا أمامي خلوا ظهري للملائكة.

(صحيح) ( ابن سعد ) عن جابر . (الصحيحة ١٥٥٧)

**٣٩٦٩- له پێشمەوه برۆن پشتم بۆ فریشتەکان چۆڵ بکەن.**

٣٩٧٠- أنا أتقاكم لله و أعلمكم بحدود الله.

(صحيح) ( حم ) عن رجل من الأنصار . (الصحيحة ٣٢٩)

**٣٩٧٠- من لە هەمووتان زیاتر لەخوا دەترسم و لەهەمووشتان شارەزاترم بە سنوورە قەدەغەکراوەکانی خوا.**

٣٩٧١- أنا دعوة إبراهيم و كان آخر من بشر بي عيسى بن مريم.

(صحيح) ( ابن عساكر ) عن عبادة بن الصامت . (الصحيحة ١٥٤٦)

**٣٩٧١- من گیرا بوونی نزاکەی ئیبراهیمم و دواترین کەسێ مژدەی منی بلاوکردۆتەوە عیسای کوڕی مەریەم بوو.**

٣٩٧٢- إن أتقاكم و أعلمكم بالله أنا.

(صحيح) ( خ ) عن عائشة . (الصحيحة ٣٥٠٢)

**٣٩٧٢- لە هەمووتان لەخواترستر و شارەزاترم لە خوا منم.**

٣٩٧٣- إنما أنا بشر و إني اشترطت على ربي عز و جل: أي عبد من المسلمين شتمته أو سببته أن يكون ذلك له زكاة و أجرا.

(صحيح) ( حم م ) عن جابر . (الصحيحة ٨٢)

**٣٩٧٣- من تەنها مرۆڤێکم و ، مەرجم کردووە لەگەڵ خوای خۆم قسەم بەهەر موسوڵمانێك ووتبێت یان جنێوم پێدابێت ، بۆی بکاتە پاك بوونەوە و پاداشت.**

٣٩٧٤- إن الله أخرجني من النكاح و لم يخرجني من السفاح.

(حسن) ( هب ) عن محمد بن علي مرسلا. (الإرواء ١٩١٤)

**٣٩٧٤- خوای گەورە منی لە هاوسەرگیریەوە هێناوە نەك لە داوێنپیسی.**

٣٩٧٥- خرجت من لدن آدم من نكاح غير سفاح.

(حسن) (ابن سعد) عن ابن عباس. (الإرواء ١٩١٤)

**٣٩٧٥- من لە سەردەمی ئادەمەوە بە هاوسەرگیری هاتووم نەك داوێن پیسی.**

٣٩٧٦- خرجت من نكاح غير سفاح.

(حسن) ( ابن سعد ) عن عائشة . (الإرواء ١٩١٤)

**٣٩٧٦- من لە هاوسەرگیری لەدایك بووم کە داوێن پیسی نەبووە.**

٣٩٧٧- خرجت من نكاح و لم أخرج من سفاح من لدن آدم إلى أن ولدني أبي و أمي لم يصبني من سفاح الجاهلية شيء.

(حسن) ( العدني عد طس ) عن علي . (الإرواء ١٩١٤)

**٣٩٧٧- من لە هاوسەرگیریەوە لەدایك بووم لە داوێن پیسی یەوە نەهاتوومە سەردونیا هەر لە ئادەمەوە تا ئەو کاتەی لە باوك دایکمەوە پەیدابووم ، لەداوێن پیسی سەردەمی نەفامی یەوە هیچم بەرنەکەوتووە.**

٣٩٧٨- إن الله أرسلني مبلغا و لم يرسلني متعنتا.

(صحيح) ( م ) عن عائشة . (الصحيحة ١٥١٦)

**٣٩٧٨- خوای گەورە منی ناردووە وەکو ڕاگەیەنەر نەیناردووم بە تێکدەر و خۆسە پێنەر.**

٣٩٧٩- إن الله فضلني على الأنبياء بأربع: أرسلني إلى الناس كافة و جعل الأرض كلها لي و لأمتي طهورا و مسجدا فأينما أدرك رجل من أمتي الصلاة فعنده مسجده و عنده طهوره و نصرني بالرعب مسيرة شهر و أحل لي المغانم.

(صحيح) ( طب الضياء ) عن أبي أمامة . (المشكاة ٤٠٠١)

**٣٩٧٩- خوای گەورە منی بەچوار شت بەسەر پێغەمبەراندا بەرزکردوتەوە ، ناردوومی بۆ سەرجەم خەڵکی و، هەموو سەرزەوی بۆ خۆم و ئوممەتەکەم کردووە بە پاککەرەوە و تات و بەرماڵ ، بۆیە هەرکەسێك لە ئوممەتەکەم گەیشتە کاتی نوێژی لەو شوێنە بەرماڵ و پاککەرەوەی[1] هەیە، پشگیریش کراوم بە ترس و بیم لە دووری مانگەڕێیەکەوە ، دەسکەوتەکانیشم بۆ ڕەوا و حەڵاڵ کراوە.**

٣٩٨٠- إن الله قد اتخذني خليلا.

(صحيح) ( ك ) عن جندب . (الإرواء ٢٨٦)

**٣٩٨٠- خوای گەورە منی کردۆتە بە خۆشەویستی خۆی.**

٣٩٨١- أوما علمت ما شارطت عليه ربي ؟ قلت: اللهم إنما أنا بشر فأي المسلمين لعنته أو سببته فاجعله له زكاة و أجرا.

(صحيح) ( م ) عن عائشة . (الصحيحة ٨٣)

---

[1] واتە لەهەموو شوێنێکی سەر زەوی دەتوانێت نوێژ بکات و دەست نوێژ یان تەیەموم بگرێت بەئاو ئەگەر نەبوو بەگڵ.

**٣٩٨١- ئایا نەتزانیوە لەسەرچی لەگەڵ خوای خۆم مەرجم کردووە ؟ وتم: خوایە من مرۆڤێکم هەر موسوڵمانێك نەفرینم لێ کردووە یان جوێنم پێ داوە ، خوایە بۆی بکەرە پاککەرەوە و پاداشت.**

٣٩٨٢- أيما رجل من أمتي سببته سبة أو لعنته لعنة في غضبي فإنما أنا من ولد آدم أغضب كما تغضبون و إنما بعثني الله رحمة للعالمين فأجعلها عليهم صلاة يوم القيامة.

(صحيح) ( حم ه ) عن سلمان . (الصحيحة ١٧٥٨)

**٣٩٨٢- هەر کەسێك لە ئوممەتەکەم قسەیەکی ناخۆشم پێوتوە یان نەفرینم لێ کردووە، لە کاتی توڕەییمدا ، من تەنها ئادەمیزادێکم توڕە دەبم وەك چۆن ئێوەش توڕە دەبن ، خوای گەورەش منی ناردووە بەبەزەیی بۆ هەموو جیهانەکان ، خوایە ئەوەیان بۆ بکە سۆز و بەزەیی لە ڕۆژی قیامەت دا .**

٣٩٨٣- تنام عيناي و لا ينام قلبي.

(صحيح) ( ابن سعد ) عن الحسن مرسلا . (الصحيحة ٦٩٦)

**٣٩٨٣- چاوەکانم دەخەون و ، دڵم ناخەوێت.**

٣٩٨٤- يا عائشة إن عيني تنامان و لا ينام قلبي.

(صحيح) ( خ ن ) عن عائشة. (صحيح أبي داود ١٢١٢)

**٣٩٨٤- ئەی عائیشە چاوەکانم دەخەون و دڵم ناخەوێت.**

٣٩٨٥- كان إذا عمل عملا أثبته.

(صحيح) ( م د ) عن عائشة. (صحيح أبي داود ١٢٣٨)

**٣٩٨٥- پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) ئەگەر کارێکی بکردبا بەردەوام دەبوو لەسەری[1].**

٣٩٨٦- كان إذا مشى مشى أصحابه أمامه و تركوا ظهره للملائكة.

(صحيح) ( ه ك ) عن جابر. (الصحيحة ٢٠٨٧)

**٣٩٨٦- پێغەمبەر ( ﷺ ) کە بەڕێگەدا دەڕۆیشت هاوەڵانی لە پێشیەوە دەڕۆیشتن و پشتی پێغەمبەریان بۆ فریشتەکان جێدەهێشت.**

٣٩٨٧- كان يكره أن يطأ أحد عقبه و لكن يمين و شمال.

(صحيح) ( ك ) عن ابن عمرو. (الصحيحة ١٢٣٩)

---

[1] سەیری کتێبی (( السراج المنير ب١ ل٦٤٨ ))

**٣٩٨٧- پێغەمبەر (ﷺ) پێی خۆش نەبوو کەس لە پشتیەوە بڕوات ، بەڵام لەلای ڕاست و چەپەوە.**

٣٩٨٨- و الله إني لأرجو أن أكون أخشاكم لله و أعلمكم بما أتقي.

(صحيح) ( م د ) عن عائشة. (الصحيحة ٣١٠٧)

**٣٩٨٨- سوێند بەخوا ئومێدم هەیە لە هەمووتان لەخواترسترېم و ، لەهەمووشتتان شارەزا ترنیم لەوەی پارێزی لێ دەکەم .**

٣٩٨٩- و الله لا تجدون بعدي أعدل عليكم مني.

(صحيح) ( طب ك ) عن أبي برزة ( حم ) عن أبي سعيد. (الصحيحة ٢٤٠٦)

**٣٩٨٩- سوێند بەخوا لەدوای من لە من دادگەر تران دەست ناکەوێت.**

٣٩٩٠- لا تقتسم ذريتي دينارا ما تركت بعد نفقة نسائي و مؤنة عاملي فهو صدقة.

(صحيح) ( حم ق د ) عن أبي هريرة. (الصحيحة ٢٠٣٨)

**٣٩٩٠- ئەوەی من دیناریکیان لە میراتی من نابێت دابەشی بکەن، ئەوەی بەجێی دێلم لە دوای خۆم جگە لە خەرجی خێزانەکانم و یارمەتی ئەوانەی ناردوومن بۆ ئیش و کار ، هەمووی خێر بێت.**

٣٩٩١- يا أم سليم ! أما تعلمين أني اشترطت على ربي فقلت: إنما أنا بشر أرضى كما يرضى البشر و أغضب كما يغضب البشر فأيما أحد دعوت عليه من أمتي بدعوة ليس لها بأهل أن تجعلها له طهورا و زكاة و قربة تقربه بها منك يوم القيامة.

(صحيح) ( حم م ) عن أنس. (الصحيحة ٨٤)

**٣٩٩١- ئەی دایکی سولەیم ! ئایا نەتزانیوە من مەرجم کردووە لەگەڵ خوای خۆم و وتوومە : من ئادەمیزادێکم ڕازی دەبم وەکو ئەوان چۆن مرۆڤ ڕازی دەبێت و، توڕەیش دەبم وەکو چۆن مرۆڤ توڕە دەبێت ، جا هەر کەسێك لە ئوممەتەکەم دوعایەکم لێ کردووە پێ ئەوەی شایستەی بێت ، خوایە ئەوەی بۆ بکەرە خاوێنکەرە و پاداشت و نزیکبوونەوە لە تۆ لە ڕۆژی قیامەتدا .**

٣٩٩٢- أعطيت فواتح الكلام و جوامعه و خواتمه.

(صحيح) ( ش ع طب ) عن أبي موسى . (الصحيحة ١٤٨٣)

**٣٩٩٢- سەرەتای ئاخاوتن و کۆکەرەوەی و کۆتاییم پێ بەخشراوە[1] .**

---

[1] **واتە وتە و بەرنامەی تەواو بێکەم و کوڕی زیادم پێ بەخشراوە تا ئەو سەری دونیا.**

٣٩٩٣- إن هذا بكى لما فقد من الذكر - يعني الجذع -.

(صحيح) ( حم خ ) عن جابر . (الصحيحة ٣٥٤٧)

**٣٩٩٣- هۆی گریانی ئەوە لە دەستدانی یادی خوایە[1]. - مەبەستی قەدی دارەکە بوو-**

٣٩٩٤- بعثت بجوامع الكلم و نصرت بالرعب و بينا أنا نائم أتيت بمفاتيح خزائن الأرض فوضعت في يدي.

(صحيح) ( ق ن ) عن أبي هريرة . (صحيح النسائي ٣٠٨٧)

**٣٩٩٤- بە کۆکەرەوەی قسەکان ڕەوانەکراوم و ، بەترس و بیم پشگیری کراوم ، لە کاتێکیشدا خەوتبووم کلیلی گە نجینەکانی سەر زەوییان بۆهێنام و خرایە دەستم.**

٣٩٩٥- بعثت بين يدي الساعة بالسيف حتى يعبد الله تعالى وحده لا شريك له و جعل رزقي تحت ظل رمحي و جعل الذل و الصغار على من خالف أمري و من تشبه بقوم فهو منهم.

(صحيح) ( حم ع طب ) عن ابن عمر . (الإرواء ١٢٥٦)

**٣٩٩٥- لە پێش هاتنی قیامەتدا بە شمشێرەوە ڕەوانەکراوم بۆ ئەوەی تەنها خوای گەورە بپەرسترێت و هاوبەشی بۆ پەیدانەکرێت ، ڕۆزیشم خراوەتە ژێر سایەی ڕمەکەم و، پێدەسلاتی و زەبونی بەسەر ئەو کەسەدا دراوە سەرپێچی فەرمانم بکات ، هەرکەسێکیش خۆی بە کەسانێك بچوێنێت لە ئەوانە.**

٣٩٩٦- لا تواصلوا إني لست كأحد منكم إني أطعم و أسقى.

(صحيح) ( خ ت ) عن أنس. (صحيح أبي داود ٢٣٦٠)

**٣٩٩٦- ڕۆژوی چەند ڕۆژ مەلکێنن بە یەکەوە، چونکە من وەکو ئێوە نیم من لەخواردن و خواردنەوە تێر دەگریم .**

٣٩٩٧- لا تواصلوا فأيكم أراد أن يواصل فليواصل حتى السحر إني لست كهيئتكم إني أبيت لي مطعم يطعمني و ساق يسقيني.

(صحيح) ( حم خ د ) عن أبي سعيد. (صحيح أبي داود ٢٣٦١)

**٣٩٩٧- ڕۆژو بە دەم یەکەوە مەدەن ، هەرکەسێکیش ویستی ڕۆژوەکان بەیەکەوە بلکێنێت با تا پارشێو، من وەکو شێوازی ئێوە نیم من دەمێنمەوە ناندەرێك نانم دەدات و ئاو گێڕێك ئاوم پێ دەدات.**

---

**[1] واتە: ئەو کۆلکە قەدە خورمایەی پێش دروست کردنی مینبەر پێغەمبەر لەسەر ئەو کۆلکە وتاری دەفەرموو کەچووە سەر مینبەرەکە و وازی لەو هێنا بۆی دەگریای و دینالانە و گیریان و فوغانی دەکرد.**

٣٩٩٨- أعطيت ما لم يعط أحد من الأنبياء قبلي نصرت بالرعب و أعطيت مفاتيح الأرض و سميت أحمد و جعل لي التراب طهورا و جعلت أمتي خير الأمم.

(صحيح) ( حم ) عن علي . (الصحيحة ٣٩٣٩)

**٣٩٩٨- ئەوەی بە من بەخشراوە بە هیچ لە پێغەمبەرانی پێش من نەبەخشراوە : بە ترس و بیم كۆمەكی كراوم، كلیلەكانی سەر زەویشم پێدراوە و، و ناونراوم ئەحمەد و ، خۆڵم بۆ بووەتە پاككەرەوە و ، ئوممەتەكەم كراوە بە باشترین ئوممەت.**

## بابەتی گەشەكردنی پێغەمبەر( ﷺ )

٣٩٩٩- شهدت غلاما مع عمومتي حلف المطيبين فما يسرني أن لي حمر النعم و أني أنكثه.

(صحيح) ( حم ك ) عن عبدالرحمن بن عوف. (الصحيحة ١٩٠٠)

**٣٩٩٩- كاتێك لاو بووم لەگەڵ ماموانم دا ئامادەی هاوپەیمانێتی چاكەخوازی بووم ، پێم خۆش نی یە ببمە خاوەنی ڕەوە ووشتری سور و ئەو هاوپەیمانە بشكێنم .**

٤٠٠٠- رأت أمي كأنه خرج منها نور أضاءت منه قصور الشام.

(صحيح) ( ابن سعد ) عن أبي أمامة. (الصحيحة ١٥٦٤)

**٤٠٠٠- دایكم لە خەودا بینی وەكو ئەوەی ڕووناكیەكی لێوە دەرچووبێت تەلارەكانی ڕۆشن كردۆتەوە.**

٤٠٠١- إني لأعرف حجرا بمكة كان يسلم علي قبل أن أبعث.

(صحيح) ( حم م ت ) عن جابر بن سمرة . (الصحيحة ٢٦٧٠)

**٤٠٠١- بەڕاستی من لە مەككە بەردێك دەناسمەوە، سەلامی لێدەكردم پێش ئەوەی ببمە پێغەمبەر .**

٤٠٠٢- ما بعث الله نبيا إلا رعى الغنم و أنا كنت أرعاها لأهل مكة بالقراريط.

(صحيح) ( خ ه ) عن أبي هريرة. (غاية المرام ١٦١)

**٤٠٠٢- خوای گەورە هیچ پێغەمبەرێكی نەناردووە شوانی نەكردبێت ، منیش شوانیم دەكرد بۆ خەڵكی مەككە بەسەرتە شوایتی چەند قیراتێك.**

٤٠٠٣- ولد لي الليلة غلام فسميته باسم أبي إبراهيم.

(صحيح) ( حم ق د ) عن أنس. (الصحيحة ٢٤٩٣)

**٤٠٠٣- ئەمشەو كوڕێكم لە دایك بوو بە ناوی باوكمەوە ناوم نا ئیبراهیم.**

٤٠٠٤- لو آمن بي عشرة من اليهود لآمن بي اليهود.

(صحيح) ( خ ) عن أبي هريرة. (الصحيحة ٢١٦٢)

**٤٠٠٤- ئەگەر دەکەس لە جوولەکە باوەڕی پێ بهێنامایە، هەموو جوولەکە باوەڕیان پێ دەهێنام.**

٤٠٠٥- لو لم احتضنه لحن الى يوم القيامة.

(صحيح) ( خ ) عن أبي هريرة. (الصحيحة ١٢٠٠)

**٤٠٠٥- ئەگەر لە باوەشم نەگرتایە[1] تا ڕۆژی قیامەت هەر بیریدەکردم و پیا هەڵدەونم.**

٤٠٠٦- لو لم تكله لأكلتم منه و لقام بكم.

(صحيح) ( م ) عن جابر. (الصحيحة ٢٦٢٥)

**٤٠٠٦- ئەگەر کێشانەت نەکردایە ، لێتان دەخوارد و بەشتانی دەکرد.**

٤٠٠٧- ليس على أبيك كرب بعد اليوم.

(صحيح) ( خ ) عن أنس. (المشكاة ٥٩٦١)

**٤٠٠٧- خەم لەمڕۆ بەدواوە باوکت گرفت و نارەحەتی لەسەر نابێت[2].**

٤٠٠٨- يا بني فهر ! يا بني عدي ! يا بني عبد مناف ! يا بني عبد المطلب ! أرأيتكم لو أخبرتكم أن خيلا بالوادي تريد أن تغير عليكم أكنتم مصدقي ؟ قالوا: ما جربنا عليك إلا صدقا قال: فإني نذير لكم بين يدي عذاب شديد.

(صحيح) ( ق ) عن ابن عباس. (المشكاة ٥٣٧٢)

**٤٠٠٨- ئەی نەوەی فیهر ،ئەی نەوەی عەدی ! ئەی نەوەی عەبدول مەناف ، ئەی نەوەی عەبدولموتتەلیب! ئایا ئەگەر پێتان بڵێم ئەسپ سوارگەلێك دەیانەوێت لەو دۆڵەوە هێرشتان بکەنە سەر باوەڕم پێدەکەن ؟ وتیان : ئێمە تەنها ڕاستی مان لە تۆ بینیوە فەرمووی: کەواتە من ئاگەدارکەرەوەم بۆ ئێوە پێش هاتنی سزایەکی سەخت.**

٤٠٠٩- يا صفية بنت عبد المطلب ! يا فاطمة بنت محمد ! يا بني عبد المطلب ! إني لا أملك لكم من الله شيئا سلوني من مالي ما شئتم.

(صحيح) ( ت ) عن عائشة. (صحيح النسائي ٣٧٢٠)

---

[1] **واتە: پێغەمبەر سەلات و سەلامی خوای لەسەر بێت فەرموویەتی ئەو کۆلکە دارە خورمایەکی پێش تر وتارم لەسەر ئەدا لە باوەشم نەگرتایە هەر دەگریا و دەکوڕوزایەوە هەتا ڕۆژی دوایی.**

[2] **بە فاتیمەی فەرموو کاتێك لە نەخۆشی باوکیدا فەرمووی ((ئاخ بۆ ژانی نەخۆشی باوکم)).**

**٤٠٠٩- ئـەی سـەفییەی کـچی عەبدولموتتـەلیب ! ئـەی فاتیمـەی کـچی موحەممـەد ! ئـەی نەوەی عەبدولموتەلیب! بەراستی لەلای خوا هیچم بێ ناگرێت بۆ ئێوە بەلام لە ماڵی دونیام هەر چەندتان دەوێت داوای بکەن.**

٤٠١٠- يا معشر قريش ! اشتروا أنفسكم من الله لا أغني عنكم من الله شيئا يا بني عبد مناف ! اشتروا أنفسكم من الله لا أغني عنكم من الله شيئا يا عباس بن عبد المطلب ! لا أغني عنك من الله شيئا يا صفية عمة رسول الله ! لا أغني عنك من الله شيئا يا فاطمة بنت محمد ! سليني من مالي ما شئت لا أغني عنك من الله شيئا.

(صحيح) ( ق ن ) عن أبي هريرة ( م ) عن عائشة. (فقه السيرة ١٠٢)

**٤٠١٠- ئەی کۆمەڵی قورەیش ! خۆتان لە پەروەردگارتان بکرنەوە من لەلای خوا هیچ لە دەست نایەت بۆ ئێوە ، ئەی نەوەی عەبدومەناف ! خۆتان لە پەروەردگارتان بکرنەوە من لەلای خوا هیچم لەدەست نایەت بۆ ئێوە ، ئەی نەوەی عەبباسی کوڕی موتتەلیب ! من لە لای خوا هیچم پێ ناکرێت بۆ تۆ ، ئەی سەفییەی پوری پێغەمبەر ! من لە لای خوا هیچم بۆ ناکرێت بۆ تۆ، ئەی فاتیمەی کچی موحەممەد ، هەرچیت لە ماڵم دەوێت داوام لێ بکە من لە لای خوا هیچم پێ ناکرێت بۆ تۆ.**

## بابەتی سیفەتەکانی پێغەمبەر( ﷺ )

٤٠١١- كان أبيض كأنما صيغ من فضة رجل الشعر.

(حسن) ( ت في الشمائل ) عن أبي هريرة. (الصحيحة ٢٠٥٢)

**٤٠١١- پێغەمبەر ( ﷺ ) سپی بوو ، دەتووت لەشانەی زیوین دارێژراوە.**

٤٠١٢- كان أبيض مشربا بحمرة ضخم الهامة أهدب الأشفار .

(حسن) ( البيهقي ) عن علي. (الصحيحة ٢٠٥٢)

**٤٠١٢- پێغەمبەر ( ﷺ ) سور و سپی بوو ، سەری گەورە بوو ، برژانگەکانی درێژ بوو.**

٤٠١٣- كان أبيض مشربا بياضه بحمرة و كان أسود الحدقة أهدب الأشفار.

(صحيح) ( البيهقي في الدلائل ) عن علي. (الصحيحة ٢٠٥٢)

**٤٠١٣- پێغەمبەر ( ﷺ ) سور و سپی بوو ، سپی سورباو بوو، چاو ڕەش و برژانگ درێژ بوو.**

٤٠١٤- كان أبيض مليحا مقصدا.

(صحيح) ( م ت في الشمائل ) عن أبي الطفيل. (الصحيحة ٢٠٥٢)

**٤٠١٤- پێغەمبەر ( ﷺ ) سپی و جوا نخاس و مامناوەندی بوو.**

٤٠١٥- كان أحسن الناس ...... ربعة إلى الطول ما هو بعيد ما بين المنكبين أسيل الخدين شديد سواد الشعر أكحل العينين أهدب الأشفار إذا وطئ بقدمه وطئ بكلها ليس له أخمص إذا وضع رداءه عن منكبيه فكأنه سبيكة فضة .

(حسن) ( البيهقي ) عن أبي هريرة. (الضعيفة ٤١٦١)

**٤٠١٥- پێغەمبەر ( ﷺ ) لە هەموو كەس جوانتر و ڕێك و پێكتر بوو بالا مامناوەندی مەیلە و بەرزبوو ، ناو شان پان و گۆنا ساف و ناسك بوو ، قژی زۆر ڕەش بوو ، چاو ڕەش و برژانگ درێژ و كەوانەیی بوو ، كە هەنگاوی دەنا پێی بەتەواوی دادەنا و بێی لە زەوی گیر نەدەكرد، كە پۆشاكەكەی لەسەر شانی دادەگرت دەتووت لەزیوداڕژاوە.**

٤٠١٦- كان أحسن الناس وجها و أحسنهم خلقا ليس بالطويل البائن و لا بالقصير.

(صحيح) ( ق ) عن البراء.

**٤٠١٦- لە هەموو كەس ڕووخساری جوانتر بوو، ڕەوشتیشی لە هەموویان جوانتر بوو ، نە درێژێكی دیار نە كورتێكی دیار نەبوو.**

٤٠١٧- كان إذا غضب احمرت وجنتاه.

(صحيح) ( طب ) عن ابن مسعود وعن أم سلمة. (الصحيحة ٢٠٧٩)

**٤٠١٧- پێغەمبەری خوا ( ﷺ ) كە توڕە دەبوو گۆناكانی سوور هەڵدەگەڕان .**

٤٠١٨- كان أزهر اللون كأن عرقه اللؤلؤ إذا مشى تكفأ.

(صحيح) ( م ) عن أنس. (المشكاة ٥٧٨٧)

**٤٠١٨- پێغەمبەر ( ﷺ )گوڵ ڕەنگی بوو ، ئارەقەكەی دەتووت دانەی مرواری یە ، كە ڕێی دەكرد لار دەبوویەوە[1].**

٤٠١٩- كان خاتم النبوة في ظهره بضعة ناشزة.

(صحيح) ( ت في الشمائل ) عن أبي سعيد. (الصحيحة ٢٠٩٣)

---

[1] كەسانێك كە زۆر بالایان بەرزە و بەلای پێشەوەدا وەكو شۆڕەبی كەمێك لاردەبنەوە.

**٤٠١٩- مۆری پێغەمبەرایەتی لەناو شانیدا پارچە گۆشتێکی بەرز بوو.**

٤٠٢٠- كان خاتمه غدة حمراء مثل بيضة الحمامة.

(صحيح) ( ت ) عن جابر بن سمرة. (الصحيحة ٢٠٩٣)

**٤٠٢٠- مۆرەکەی ئالوێکی[1] سور بوو وەکو هێلکەی کۆتر .**

٤٠٢١- كان ربعة من القوم ليس بالطويل البائن و لا بالقصير أزهر اللون ليس بالأبيض الأمهق و لا بالآدم و ليس بالجعد القطط و لا بالسبط.

(صحيح) ( ق ت ) عن أنس. (الصحيحة ٢٠٥٢)

**٤٠٢١- بالای مامناوەندی بوو لەناو خەڵکیدا ، نە درێژێکی دیار بوو ، نە کورتە بالایەکی بەرچاو بوو ، گوڵ ڕەنگ بوو نە زۆر سپی بوو نە گەنم ڕەنگیش بوو ، قژیشی نە زۆر لوول بوو ، نەزۆر خاویش بوو.**

٤٠٢٢- كان شبح الذراعين بعيد ما بين المنكبين أهدب أشفار العينين.

(حسن) ( البيهقي ) عن أبي هريرة. (الصحيحة ٢٠٩٥)

**٤٠٢٢ – باڵی درێژ و نا و شان پان بوو ، برژانگی چاوەکانی درێژ و کەوانەیی بوون.**

٤٠٢٣- كان شعره دون الجمة و فوق الوفرة.

(صحيح) ( ت في الشمائل ه ) عن عائشة. (المشكاة ٤٤٦٠)

**٤٠٢٣- قژی تاکو لای نەرمەی گوێچکەی بوو لە دوایشەوە لە سەر شانی بوو.**

٤٠٢٤- كان شيبه نحو عشرين شعرة.

(صحيح) ( ت في الشمائل ه ) عن ابن عمر. (الصحيحة ٢٠٩٦)

**٤٠٢٤- مووە سپییەکانی نزیکەی بیست تاڵ بوون.**

٤٠٢٥- كان ضخم الرأس و اليدين و القدمين.

(صحيح) ( خ ) عن أنس. (الصحيحة ٣٥٥٨)

**٤٠٢٥- پێغەمبەر (ﷺ) سەرو دەست و پێی گەورە و پتەو بوون.**

٤٠٢٦- كان ضخم الهامة عظيم اللحية.

(حسن) ( البيهقي ) عن علي. (الصحيحة ٢٠٥٢)

---

[1] **ئالۆ واتە((غدە)) بە زمانی عەرەبی، کە منالّ ملی خڕ دەبێت و دەئاوسێت دەڵێن ئالۆی گرتووە.**

**٤٠٢٦- پێغەمبەر (ﷺ) سەری گەورە بوو ڕیشی پڕ و گەورە بوو.**

٤٠٢٧- كان ضليع الفم أشكل العينين منهوس العقب.

(صحيح) ( م ت ) عن جابر بن سمرة. (المشكاة ٥٧٨٤)

**٤٠٢٧- پێغەمبەر (ﷺ) دەمی خشت[1] بوو ،سپێنەی چاوی سووری تیا بوو ، پاژنەی گۆشتی كەم بوو.**

٤٠٢٨- كان كثير العرق.

(صحيح) ( م ) عن أنس. (المشكاة ٥٧٨٨)

**٤٠٢٨- پێغەمبەر (ﷺ) ئارەقی زۆر دەكردەوە.**

٤٠٢٩- كان كثير شعر اللحية.

(صحيح) ( م ) عن جابر بن سمرة. (المشكاة ٥٧٧٩)

**٤٠٢٩- پێغەمبەر (ﷺ)ڕیشی زۆر و پڕ بوو.**

٤٠٣٠- كان وجهه مثل الشمس و القمر و كان مستديرا.

(صحيح) ( م ) عن جابر بن سمرة. (الصحيحة ٣٠٠٥)

**٤٠٣٠- ڕووخساری پێغەمبەر (ﷺ) وەكو خۆر و مانگ كەوانەیی بوو.**

٤٠٣١- بعثت من خير قرون بني آدم قرنا فقرنا حتى كنت من القرن الذي كنت فيه.

(صحيح) ( خ ) عن أبي هريرة . (الصحيحة ٨١٠)

**٤٠٣١- لە چاكترین چاخەكانی ئادەمیزادا لە دایك بووم چاخ بە چاخ تاكو گەیشتمە ئەو سەدەی تیای دا لە دایكبووم.**

## بابەتی خوو ڕەوشتەكانی پێغەمبەر ﷺ

٤٠٣٢- كان آخر ما تكلم به أن قال: قاتل الله اليهود و النصارى اتخذوا قبور أنبيائهم مساجد لا يبقين دينان بأرض العرب.

(صحيح) ( هق ) عن أبي عبيدة بن الجراح. (تحذير الساجد ٩)

**٤٠٣٢- كۆتایی قسەكانی پێغەمبەر ﷺ ئەوە بوو فەرمووی: نەفرینی خوا لەجوولەكەو گاورەكان گۆڕی پێغەمبەرەكانیان كردە پەرستگا، نابێت دوو ئایین بمێنێتەوە لەدورگەی عەرەبدا.**

[1] **واتە نە گەورە و فراوان و نە تەنگ و بچوك.**

٤٠٣٣- كان أحب الألوان إليه الخضرة.

(حسن) ( طس ابن السني أبو نعيم في الطب ) عن أنس. (الصحيحة ٢٠٥٣)

**٤٠٣٣- پەسەندترین ڕەنگ بەلای پێغەمبەرەوە ﷺ ڕەنگ سەوز بوو.**

٤٠٣٤- كان إذا استجد ثوبا سماه باسمه قميصا أو عمامة أو رداء ثم يقول: اللهم لك الحمد أنت كسوتنيه أسألك من خيره و خير ما صنع له و أعوذ بك من شره و شر ما صنع له.

(صحيح) ( حم د ت ك ) عن أبي سعيد. (الصحيحة ٤٣٤٢)

**٤٠٣٤- پێغەمبەر ﷺ کە جل و بەرگێکی تازەیی لەبەربکردایە ناوی خۆی لێدەنا کراس بووایە یان مێزەر یان عەبا، ئینجا دەیفەرموو: خوایە گیان ستایش بۆ تۆ ئەمەت پۆشی یە بەرم، داوات لێدەکەم پێم ببەخشێت لەچاکەی و چاکتری ئەوەی کەبۆی دروست کراوە، پانایش دەگرم پێت لەخراپییەکەی و لەخراپترینی ئەوەی بۆی دروست کراوە.**

٤٠٣٥- كان إذا اكتحل اكتحل وترا و إذا استجمر استجمر وترا.

(صحيح) ( حم ) عن عقبة بن عامر. (الصحيحة ١٢٦٠)

**٤٠٣٥- پێغەمبەر ﷺ کەچاوی دەڕشت بەتاك دەیڕشت، کەخۆشی پاك دەکردەوە بەتاك خۆی پاك دەکردەوە.**

٤٠٣٦-كان إذا بعث أحدا من أصحابه في بعض أمره قال: بشروا و لا تنفروا و يسروا و لا تعسروا.

(صحيح) ( د ) عن أبي موسى. (الصحيحة ٩٩٢)

**٤٠٣٦- پێغەمبەر ﷺ کە یەکێکی لەهاوەڵانی دەنارد بۆ هەندێ کارو باری خۆی، دەیفەرموو: مژدەدەربن و دوورخەرەوە مەبن، ئاسانکاری بکەن و کارەکانی قورس مەکەنەوە.**

٤٠٣٧- كان إذا تكلم بكلمة أعادها ثلاثا حتى تفهم عنه و إذا أتى على قوم فسلم عليهم سلم عليهم ثلاثا.

(صحيح) ( حم خ ت ) عن أنس. (الصحيحة ٣٤٧٣)

**٤٠٣٧- پێغەمبەر ﷺ کەقسەی یەکی بکردایە سێ جار دووپاتی دەکردەوە تاکو لێی تێبگەن، کەبیشهاتایەتە لای کەسێك سێ جار سەلامی دەکرد.**

٤٠٣٨- كان إذا جلس احتبى بيديه.

(صحيح) ( د هق ) عن أبي سعيد. (الصحيحة ٨٢٥)

**٤٠٣٨- پێغەمبەری خوا ﷺ کە دادەنیشت.**

٤٠٣٩- كان إذا رفعت مائدته قال: الحمد لله حمدا كثيرا طيبا مباركا فيه الحمد لله الذي كفانا و آوانا غير مكفي و لا مكفور و لا مودع و لا مستغنى عنه ربنا.

(صحيح) ( حم خ د ت ه ) عن أبي أمامة. (المشكاة ٤١٩٩)

**٤٠٣٩- پێغەمبەر ﷺ کە سفرەکەی هەڵدەگیرا دەیفەرموو: سوپاس بۆ خوای گەورە، سوپاسێکی زۆر و پاك وبێگەرد و پیرۆز، سوپاس بۆ ئەو خوایەی پێویستیەکانمان دابین دەکات و داڵدەمان دەدات، بێ ئەوەی پێویستی بەهیچ بێت، یان نکوڵی لەچاکەی بکرێت، یان وازی لێ بهێنرێت، یان لەوەی کەلەلایەتی بێ نیاز بین.**

٤٠٤٠- كان إذا سر استنار وجهه كأنه قطعة قمر.

(صحيح) ( ق ) عن كعب بن مالك. (المشكاة ٥٧٨٩)

**٤٠٤٠- پێغەمبەر ﷺ کەخۆشحاڵ بوایە ڕووی ڕۆشن دەبوویەوە وەکو پارچەیەك لەمانگ.**

٤٠٤١- كان إذا صلى الغداة جاءه أهل المدينة بآنيتهم فيها الماء فما يؤتى بإناء إلا غمس يده فيه.

(صحيح) ( حم م ) عن أنس. (الروض ١٨٧)

**٤٠٤١- پێغەمبەر ﷺ کەنوێژی بەیانی دەکرد، خەڵکی مەدینە دەهاتنە لای و قاپەکانیان دەهێنا ئاوی تیادا بوو، هەرچی قاپێکیان دەهێنا پێغەمبەر ﷺ دەستی دەخستە ناوی.**

٤٠٤٢- كان إذا عصفت الريح قال: اللهم إني أسألك خيرها و خير ما فيها و خير ما أرسلت به و أعوذ بك من شرها و شر ما فيها و شر ما أرسلت به.

(صحيح) ( حم م ت ) عن عائشة. (الصحيحة ٢٧٥٧)

**٤٠٤٢- کە با هەڵیدەکرد پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو: خوایە داوای باشی ئەم ڕەشەبات لێ دەکەم، باشترین ئەو شتەیش کە تیایدایە، باشترین شتیش کە پێی ڕەوانە کراوە، پەنایش دەگەم لێت لەخراپییەکەی، خراپترین ئەو شتەیش کەتیایدایەو، خراپترین شتیش کە پێی ڕەوانە کراوە.**

٤٠٤٣- كان إذا قدم من سفر تلقي بصبيان أهل بيته.

( حم م د ) عن عبدالله بن جعفر. (المشكاة ٣٩٠٠)

**٤٠٤٣- پێغەمبەر ﷺ کاتێك لە گەشتێك دەگەڕایەوە مناڵانی کەس و کاری دەچوونە پیرییەوە.**

٤٠٤٤- كان إذا قرب إليه طعام قال: بسم الله فإذا فرغ قال: اللهم إنك أطعمت و سقيت و أغنيت و أقنيت و هديت و اجتبيت اللهم فلك الحمد على ما أعطيت.

(صحيح) ( حم ) عن رجل. (الصحيحة ٧١)

**٤٠٤٤- پێغەمبەر ﷺ كاتێك خواردنێكی بۆ نزیك دەكرایەوە دەیفەرموو: ( بسم الله ) ئەگەریش تەواوی بكردایە دەیفەرموو: خوایە تۆ خواردن وخواردنەوەت بەخشی، دەوڵەمەندت كردین و قایلت كردین، ڕێنموونیت كردو كۆتكردەوە، خوایە سوپاس و ستایش بۆ تۆ لەسەر بەخشندەییت.**

٤٠٤٥- كان إذا كره شيئا رؤي ذلك في وجهه.

(صحيح) ( طس ) عن أنس. (الصحيحة ٢٠٨٥)

**٤٠٤٥- پێغەمبەر ﷺ كاتێك بەشێك ناڕەحەت بووایە لەڕوخساریدا دەردەكەوت.**

٤٠٤٦- كان إذا مشى أقلع.

(صحيح) ( طب ) عن أبي عتبة. (الإصلاح ١١٧)

**٤٠٤٦- پێغەمبەر ﷺ كەڕێی دەكرد بەتوندی ڕێی دەكرد.**

٤٠٤٧- كان إذا مشى كأنه يتوكأ.

(صحيح) ( د ك ) عن أنس. (الصحيحة ٢٢٨٣)

**٤٠٤٧- پێغەمبەر ﷺ كاتێك ڕێی دەكرد دەتووت پاڵدەداتەوە.**

٤٠٤٨- كان إذا مشى لم يلتفت.

(صحيح) ( ك ) عن جابر. (الصحيحة ٢٠٨٦)

**٤٠٤٨- پێغەمبەر ﷺ كەڕێی دەكرد ئاوڕی نەدەدایەوە.**

٤٠٤٩- كان إذا ودع رجلا أخذ بيده فلا يدعها حتى يكون الرجل هو الذي يدع يده و يقول: أستودع الله دينك و أمانتك و خواتيم عملك.

(صحيح) ( حم ت ن ه ك ) عن ابن عمر. (الصحيحة ١٤)

**٤٠٤٩- پێغەمبەر ﷺ كە خوا حافیزی لە كەسێك بكردایە دەستی دەكرد و بەرینەدەدا تا ئەو كەسە خۆی دەستی بەرنەدایە، دەیفەرموو: ئایینەكەت و ڕاسپاردەییت و كۆتایی كارەكانت بەخوای گەورە دەسپێرم.**

٤٠٥٠- كان تنام عيناه و لا ينام قلبه.

(صحيح) ( ك ) عن أنس. (الصحيحة ٣٥٥٧)

**٤٠٥٠- پێغەمبەر ﷺ چاوى دەخەوت و دڵى نەدەخەوت.**

٤٠٥١- كان خاتمه من فضة فصه منه.

(صحيح) ( خ ) عن أنس. (الإرواء ٨١٣)

**٤٠٥١- پێغەمبەر ﷺ ئەنگوستیلەی دەستی لەزیو بوو، نقێمەكەشی لەخۆی.**

٤٠٥٢- كان خاتمه من ورق و كان فصه حبشيا.

(صحيح) ( م ) عن أنس. (الإرواء ٨١٣)

**٤٠٥٢- ئەنگوستیلەكەی زیوو بوو، نقێمەكەشی بەردی حەبەشی بوو.**

٤٠٥٣- كان طويل الصمت قليل الضحك.

(حسن) ( حم ) عن جابر بن سمرة. (المشكاة ٥٨٢٦)

**٤٠٥٣- پێغەمبەر ﷺ زۆر بێدەنگ دەبوو كەم پێدەكەنی.**

٤٠٥٤- كان في كلامه ترتيل أو ترسيل.

(حسن) ( د ) عن جابر. (المشكاة ٥٨٢٧)

**٤٠٥٤- پێغەمبەر ﷺ لەسەرخۆ و بەشیكراوەیی قسەی دەكرد.**

٤٠٥٥- كان كلامه كلاما فصلا يفهمه كل من سمعه.

(حسن) ( د ) عن عائشة. (الصحيحة ٢٠٩٧)

**٤٠٥٥- پێغەمبەر ﷺ گفتوگۆی كۆتایی پێهێنەر بوو، هەموو كەسێك لێی حاڵی دەبوو.**

٤٠٥٦- كان لنعله قبالان.

(صحيح) ( ت ) عن أنس. (المشكاة ٤٤٠٨)

**٤٠٥٦- نەعلەكەی پێغەمبەر ﷺ دوو پەتی هەبوو دەخرایە نێو پەنجەكانی پێی.**

٤٠٥٧- كان له حمار اسمه عفير.

(صحيح) ( حم ) عن علي ( طب ) عن ابن مسعود. (الصحيحة ٢٠٩٨)

**٤٠٥٧- پێغەمبەر ﷺ گوێ درێژێكی هەبوو ناوی عوفەیر بوو.**

٤٠٥٨- كان مما يقول للخادم: ألك حاجة ؟

(صحيح) ( حم ) عن رجل. (الصحيحة ٢١٠٢)

**٤٠٥٨- پێغەمبەر ﷺ یەكێك لەو قسانەی بەخزمەتكارەكەی دەفەرموو: ئایا پێویستیت هەیە؟**

٤٠٥٩- كان لا يجد من الدقل ما يملأ بطنه.

(صحيح) ( طب ) عن النعمان بن بشير. (الصحيحة ٢١٠٦)

**٤٠٥٩- پێغەمبەر ﷺ خراپترین جۆری خورمای دەست نەدەكەوت تێری لێ بخوات.**

٤٠٦٠- كان لا يدخر شيئا لغد.

(صحيح) ( ت ) عن أنس. (الترغيب ٥٨٢٥)

**٤٠٦٠- پێغەمبەر ﷺ هیچی پاشەکەت نەدەکرد بۆ سبەی.**

٤٠٦١- كان لا يراجع بعد ثلاث.

(صحيح) ( ابن قانع ) عن زياد بن سعد. (الصحيحة ٢١٠٨)

**٤٠٦١- پێغەمبەر سەلات و سەلامی خوای لێ بێت لە سێ جار زیاتر وەڵامی کەسێکی نەئەدایەوە[1].**

٤٠٦٢- كان لا يضحك إلا تبسما.

(صحيح) ( حم ت ك ) عن جابر بن سمرة. (المشكاة ٥٧٩٦)

**٤٠٦٢- پێغەمبەر ﷺ پێکەنینی تەنها زەردەخەنە بوو.**

٤٠٦٣- كان لا يطرق أهله ليلا.

(صحيح) ( حم ق ن ) عن أنس. (المشكاة ٣٩٠٢)

**٤٠٦٣- پێغەمبەر ﷺ بەشەو نەدەگەڕایەوە لای کەس و کاری.**

٤٠٦٤- كان لا يلتفت وراءه إذا مشى ...

(صحيح) ( ابن سعد الحكيم ابن عساكر ) عن جابر. (الصحيحة ٢٠٨٦)

**٤٠٦٤- پێغەمبەر ﷺ لەکاتی ڕێکرپندا تەماشای دوای خۆی نەدەکرد.....**

٤٠٦٥-كان لا يمنع شيئا يسأله.

(صحيح) ( حم ) عن أبي أسيد الساعدي. (الصحيحة ٢١٠٩)

**٤٠٦٥- پێغەمبەر ﷺ داوای هەرچی لێبکرایە دەیبەخشی.**

٤٠٦٦- كان يؤتى بالصبيان فيبرك عليهم و يحنكهم و يدعو لهم.

(صحيح) ( ق د ) عن عائشة. (الكلم ٢١٢)

**٤٠٦٦- مناڵیان دەهێناوە لای پێغەمبەر ﷺ دەستی پیرۆزی دەهێنایە سەریان و شیرینی دەخستە دەمیان و بۆیان دەپاڕایەوە.**

٤٠٦٧- كان يأكل الهدية و لا يأكل الصدقة.

(صحيح) ( حم طب ) عن سلمان ( ابن سعد ) عن عائشة وعن أبي هريرة. (الصحيحة ٨٩٤)

**٤٠٦٧- پێغەمبەر ﷺ دیاری دەخوارد و صەدەقەی نەدەخوارد.**

---

[1] بۆ شەرحی ئەم فەرمودەیە لە فیض القدیر ج٥ ص٢٣٥.

٤٠٦٨- كان يأكل بثلاث أصابع و يلعق يده قبل أن يمسحها.

(صحيح) ( حم م د ) عن كعب بن مالك. (الإرواء ١٩٦٩)

**٤٠٦٨- پێغەمبەر ﷺ بەسێ پە نجە نانی دەخوارد دەستیشی دەلێسایەوە.**

٤٠٦٩- كان يأمر من أسلم أن يختتن .

(صحيح) ( طب ) عن قتادة الرهاوي. (الضعيفة ٤٢٦٠)

**٤٠٦٩- پێغەمبەر ﷺ فەرمانی دەكرد بەهەر كەسێك موسوڵمان بووایە خەتەنە بكات.**

٤٠٧٠- كان يأمر إذا أرادت إحداهن أن تنام أن تحمد ثلاثا و ثلاثين و تسبح ثلاثا و ثلاثين و تكبر ثلاثا و ثلاثين .

(صحيح) ( ابن مندة ) عن حابس.

**٤٠٧٠- پێغەمبەر ﷺ فەرمانی دەكرد، ئەگەر كەسێكیان بیویستایە بخەوتایە سی و سێ جار بڵێ ( الحمد الله ) و سی و سێ جار ( سبحان الله ) و سی و سێ جار ( الله اكبر ).**

٤٠٧١-كان يبدو إلى التلاع.

(صحيح) ( د حب ) عن عائشة. (الصحيحة ٥١٨)

**٤٠٧١- پێغەمبەر ﷺ دەردەچوو بۆ بیابان.**

٤٠٧٢- كان يبيت الليالي المتتابعة طاويا و أهله لا يجدون عشاء و كان أكثر خبزهم خبز الشعير.

(حسن) ( حم ت ه ) عن ابن عباس. (الصحيحة ٢١١٩)

**٤٠٧٢- شەو لەدوای شەو بەبێ شێو خۆی و خاوو خێزانەكەی دەنوستن، بەزۆریش نانیان نانی جۆ بوو.**

٤٠٧٣- كان يبيع نخل بني النضير و يحبس لأهله قوت سنتهم.

(صحيح) ( خ ) عن عمر. (الضعيفة ٦٧٤٤)

**٤٠٧٣- دار خورماكانی (بني النضير )ی دەفرۆشت و خۆراكی ئەو ساڵەی كەس و كاری گلدەدایەوە.**

٤٠٧٤- كان يتعوذ من الجان و عين الإنسان حتى نزلت المعوذتان فلما نزلتا أخذ بهما و ترك ما سواهما.

(صحيح) ( ت ن ه الضياء ) عن أبي سعيد. (المشكاة ٤٥٦٣)

**٤٠٧٤- پێغەمبەر ﷺ پەنای دەگرتە خوا لەجنوكەو چاوی ئادەمیزاد، تا ئەو كاتەی سورەتی ( الفلق و الناس ) دابەزین، لەو كاتەوە ئەوانەی وەرگرت و وازی لەوەكانی تر هێنا.**

٤٠٧٥- كان يحب العراجين و لا يزال في يده منها.

(صحيح) ( حم د ) عن أبي سعيد. (صحيح أبي داود ٤٩٩)

**٤٠٧٥- پێغەمبەر ﷺ حەزی لە پەلكی دارخورما دەكرد و زۆرجار چڵێكی بەدەستەوە بوو.**

٤٠٧٦- كان يحتجم.

(صحيح) ( ق ) عن أنس. (المشكاة ٤٥٤٢)

**٤٠٧٦- پێغەمبەر ﷺ كەڵە شاخی دەكرد.**

٤٠٧٧-كان يحدث حديثا لو عده العاد لأحصاه.

(صحيح) ( ق د ) عن عائشة. (المشكاة ٥٨٥١)

**٤٠٧٧- پێغەمبەر ﷺ گفتوگۆیەكی دەكرد ئەگەر كەسێك بیویستایە دەیژمارد.**

٤٠٧٨- كان يخيط ثوبه و يخصف نعله و يعمل ما يعمل الرجال في بيوتهم.

(صحيح) ( حم ) عن عائشة. (المشكاة ٥٨٢٢)

**٤٠٧٨- پێغەمبەر ﷺ جلی خۆی دەدوورییەوەو نەعلی خۆی چاك دەكردو، ئەو كارانەی پیاوان لەماڵ دەیانكرد ئەویش دەیكرد.**

٤٠٧٩- كان يدعى إلى خبز الشعير و الإهالة السنخة.

(صحيح) ( ت في الشمائل ) عن أنس. (الصحيحة ٢١٢٩)

**٤٠٧٩- پێغەمبەر ﷺ دەعوەت دەكرا بۆ نانی جۆ و بەزو خواردنی بۆن گۆڕاو.**

٤٠٨٠- كان يستحب أن يسافر يوم الخميس.

(صحيح) ( طب ) عن أم سلمة. (الصحيحة ٢١٢٨)

**٤٠٨٠- پێغەمبەر حەزی دەكرد لەڕۆژی پێنج شەممە سەفەر بكات.**

٤٠٨١- كان يشتد عليه أن يوجد منه الريح.

(صحيح) ( د ) عن عائشة. (صحيح أبي داود ٣٧١٥)

**٤٠٨١- قورس بوو لەسەر پێغەمبەر ﷺ بۆنی دەمی بهاتایە.**

٤٠٨٢- كان يعجبه الثفل.

(صحيح) ( حم ت في الشمائل ك ) عن أنس. (المشكاة ٤٢١٧)

**٤٠٨٢- پێغەمبەر ﷺ حەزی لەتێگوشە دەكرد.**

٤٠٨٣- كان يعجبه الذراع.

(صحيح) ( د ) عن ابن مسعود. (الصحيحة ٢٠٥٥)

**٤٠٨٣- پێغەمبەر ﷺ حەزی لەگۆشتی دەست دەكرد لەمەڕدا.**

٤٠٨٤- كان يعجبه العراجين أن يمسكها بيده.

(حسن ) ( ك ) عن أبي سعيد. (صحيح أبي داود ٤٩٩)

**٤٠٨٤- پێغەمبەر ﷺ حەزی لە پەلكە دارخورما دەكرد بیگرێتە دەستەوە.**

٤٠٨٥- كان يعجبه أن يلقى العدو عند زوال الشمس.

(صحيح) ( طب ) عن أبي أوفى. (الصحيحة ٢١٢٦)

**٤٠٨٥- پێغەمبەر ﷺ پێی خۆش بوو لەكاتی نیوەڕۆ ڕووبەڕووی دوژمن ببێتەوە.**

٤٠٨٦-كان يعرف بريح الطيب إذا أقبل.

(صحيح) ( ابن سعد ) عن إبراهيم مرسلا. (الصحيحة ٢١٣٧)

**٤٠٨٦- پێغەمبەر ﷺ بەبۆنی گوڵاوی دەناسرا بەرەو شوێنێك بڕۆشتایە.**

٤٠٨٧- كان يعيد الكلمة ثلاثا لتعقل عنه.

(صحيح) ( ت ك ) عن أنس. (الصحيحة ٣٤٧٣)

**٤٠٨٧- پێغەمبەر ﷺ سێ جار قسەی دووپات دەكردەوە بۆ ئەوەی زانراو بێت.**

٤٠٨٨- كان يقبل الهدية و يثيب عليها.

(صحيح) ( حم خ د ت ) عن عائشة. (الإرواء ١٦٠٢)

**٤٠٨٨- پێغەمبەر ﷺ دیاری وەردەگرت و پاداشتی لەسەری دەدایەوە.**

٤٠٨٩- كان يقوم إذا سمع الصارخ.

(صحيح) ( حم ق ت ن ه ) عن عائشة. (المشكاة ١٢٠٧)

**٤٠٨٩- پێغەمبەر ﷺ كەدەنگی كەڵەشێری دەبیست هەڵدەسا لەخەو.**

٤٠٩٠- كان يكثر الذكر و يقل اللغو و يطيل الصلاة و يقصر الخطبة و كان لا يأنف و لا يستكبر أن يمشي مع الأرملة و المسكين و العبد حتى يقضي له حاجته.

(صحيح) ( ن ك ) عن ابن أبي أوفى ( ك ) عن أبي سعيد. (الروض ٣٧١)

**٤٠٩٠- پێغەمبەر ﷺ یادی خوای زۆر دەكرد و، قسەی بێ سوودی كەم دەكردو، نوێژی درێژ دەكردەوەو، وتاری كورت دەكردەوەو، لەخۆبایی بوون و خۆ بەزلزانینی نەبوو، لەگەڵ بێوە ژن و هەژاردا ڕێی دەكرد، هەروەها لەگەڵ كۆیلە تا كارەكەی بۆ نە نجامدەدا.**

٤٠٩١- كان يلزق صدره و وجهه بالملتزم.

(حسن) ( هق ) عن ابن عمرو. (الصحيحة ٢١٣٨)

**٤٠٩١- پێغەمبەر ﷺ سنگی و ڕوومەتی دەنوسانە مولتەزەمەوە.**

٤٠٩٢- كان يمشي مشيا يعرف فيه أنه ليس بعاجز و لا كسلان.

(حسن) ( ابن عساكر ) عن ابن عباس. (الصحيحة ٢١٤٠)

**٤٠٩٢- پێغەمبەر ﷺ ڕێكردنێك ڕێی دەكرد دەزانرا كە ئەو كەسێك نییە بێ دەسەڵات و تەمەڵ بێت.**

٤٠٩٣- إنما بعثني الله مبلغا و لم يبعثني متعنتا.

(حسن) ( ت ) عن عائشة . (صحيح الترمذي ٣٣١٨)

**٤٠٩٣- خوای گەورە منی وەكو گەیەنەرێك ڕەوانە كردووە، نەك وەكو توند و تیژێك.**

٤٠٩٤- و الذي نفس محمد بيده ما أصبح عند آل محمد صاع حب و لا صاع تمر.

(صحيح) ( ه ) عن أنس. (الصحيحة ٢٤٠٤)

**٤٠٩٤- سوێند بەو كەسەی گیانی موحەممەدی بەدەستە ئەمڕۆ هیچ شتێك لەلای خاوو خێزانەكانی موحەممەد نییە، هیچ ئەندازەیەك نە لەدانەوێڵەو نە لە خورما.**

## بابەتی ئارامگرتنی پێغەمبەر لەسەر ئازاردان

٤٠٩٥- إن هذا اخترط سيفي و أنا نائم فاستيقظت و هو في يده صلتا فقال لي: من يمنعك مني؟ قلت: الله ؟ فها هو ذا جالسا !

(صحيح) ( حم ق ن ) عن جابر . (الصحيحة ٣٥٤٦)

**٤٠٩٥- ئەم پیاوە شمشێرەكەی هەڵكێشاوم لەو كاتەی كمن لەخەودا بوومە، ئاگام بوویەوە بەڕووتی بەدەستی یەوە بوو، پێی ووتم: كێ ئەتپارێزێ لەمن. ووتم: خوای گەورە؟ ئەوەتا دانیشتووە.**

٤٠٩٦- إنا معشر الأنبياء يضاعف علينا البلاء.

(صحيح) ( طب ) عن اخت حذيفة . (الصحيحة ١٤٤)

**٤٠٩٦- ئێمەی كۆمەڵی پێغەمبەران بەڵایان لەسەر چەند قات دەبێتەوە.**

٤٠٩٧- إني أوعك كما يوعك رجلان منكم.

(صحيح) ( حم م ) عن ابن مسعود . (فقه السيرة ٤٩٩)

**٤٠٩٧- من تا دەمگرێت وەکو دوو پیاو لەئێوە تابیانگرێت.**

٤٠٩٨- إن أشد الناس بلاء الأنبياء ثم الذين يلونهم ثم الذين يلونهم.

(صحيح) ( ك ) عن فاطمة بنت اليمان . (الصحيحة ١١٦٥)

**٤٠٩٨- سەختترین بەڵاو نارەحەتی دێتە سەر پێغەمبەران دا، ئینجا ئەوانەی دوای ئەوان، ئینجا ئەوانەی دوای ئەوان دێن.**

٤٠٩٩- لقد أوذيت في الله و ما يؤذى أحد و أخفت في الله و ما يخاف أحد و لقد أتت علي ثلاثون من بين يوم و ليلة و ما لي و لبلال طعام يأكله ذو كبد إلا شيء يواريه إبط بلال.

(صحيح) ( حم ت ه حب ) عن أنس. (المشكاة ٥٢٥٣)

**٤٠٩٩- لە پێناو خوادا ئازار دراوم و کەس ئازار نەدەدرا، لە پێناو خوا ترسێنراوم و کەس نەدەترسێنرا، سی ڕۆژو شەوم بەسەرچا تێپەڕی من و بیلال هیچمان بەبوو بخورێت.**

٤١٠٠- لقد لقيت من قومك و كان أشد ما لقيت منهم يوم العقبة إذ عرضت نفسي على ابن عبد ياليل بن عبد كلال فلم يجبني إلى ما أردت فانطلقت و أنا مهموم على وجهي فلم أستفق إلا و أنا بقرن الثعالب فرفعت رأسي فإذا أنا بسحابة قد أظلتني فنظرت فإذا فيها جبريل فناداني فقال: إن الله قد سمع كلام قومك لك و ما ردوا عليك و قد بعث إليك ملك الجبال لتأمره بما شئت فيهم فناداني ملك الجبال فسلم علي ثم قال يا محمد ! فقال ذلك فما شئت إن شئت أطبق عليهم الأخشبين قلت: بل أرجو أن يخرج الله من أصلابهم من يعبد الله وحده لا يشرك به شيئا.

(صحيح) ( حم ق ) عن عائشة. (المشكاة ٥٨٤٨)

**٤١٠٠- زۆرم بینی لەکەس و کارەکەت، بەڵام سەختترین ئازاردانیان بۆ من لەڕۆژی عەقەبە بوو، چوومە لای کوڕی عەبدولْ یالیل پەنام بدات بەڵام بەدەم داواکارییەکەوە نەهات، منیش بەخەم و پەژارەوە دەرچووم، ئاگام لەخۆم نەبوو تا گەیشتمە** (قرن الثعالب) **سەرم بەرزکردەوە پەڵە هەورێکم بینی سێبەر بۆ کردووم، تەماشام کرد جیبریلی تیایەو بانگم لێ دەکات، ووتی: ئەی خحوای گەورە گوێی لەقسەی قەومەکەت بوو چۆن وەڵامتیان دایەوە، ئێستایش فریشتەی شاخەکانی بۆ ناردوویت بۆ ئەوەی فەرمانی پێ بکەیت بەئارەزووی خۆت، ئەو فریشتەی بانگی لێ کردم ووتی: ئەی موحەممەد! بەئارەزووی خۆت، ئەگەر حەز دەکەن هەردوو شاخەکەیان بەسەردا دەدەم، ووتم: بەڵکو ئومێدم هەیە خوای گەورە لەپشتیان کەسێك دروست بکات کەتەنها خوای پەروەردگار بپەرستن و شەریکی بۆ پەیدا نەکەن.**

٤١٠١- لو دنا مني لخطفته الملائكة عضوا عضوا - يعني أبا جهل -.

(صحيح) ( حم م ) عن أبي هريرة. (الصحيحة ٣٢٩٦)

**٤١٠١- ئەگەر لێم نزیك بوایەتەوە فریشتەكان پارچە پارچەیان دەكرد - واتە: ئەبو جەهل-.**

٤١٠٢-ما أوذي أحد ما أوذيت.

(حسن) ( عد ابن عساكر ) عن جابر. (الصحيحة ٢٢٢٢)

**٤١٠٢- كەس ئەوەندەی من ئازاری نەچەشتووە.**

٤١٠٣- ما أوذي أحد ما أوذيت في الله.

(حسن) ( حل ) عن أنس. (الصحيحة ٢٢٢٢)

**٤١٠٣- كەس ئەوەندەی من ئازار نەدراوە لە پێناو خوا.**

٤١٠٤- ما زالت أكلة خيبر تعاودني كل عام حتى كان هذا أوان قطع أبهري.

(صحيح) ( ابن السني أبو نعيم في الطب ) عن أبي هريرة. (المشكاة ٥٩٦٥)

**٤١٠٤- تا ئێستاش خواردنەكەی خەیبەر، هەموو ساڵێك هەر بۆ دەگەڕێتەوە تاكو كاتی ئەوە هات شاخوێنبەری دڵم ببڕێت.**

٤١٠٥- من لكعب بن الأشرف ؟ فإنه قد آذى الله و رسوله.

(صحيح) ( خ ) عن جابر. (صحيح أبي داود ٢٧٦٨)

**٤١٠٥- كێ بۆ كەعبی كوڕی ئەشرەف؟ چونكە خوا پەی كردووە بەرامبەر خواو پێغەمبەرەكەی.**

٤١٠٦- هل أنت إلا إصبع دميت و في سبيل الله ما لقيت.

(صحيح) ( حم ق ت ن ) عن جندب البجلي. (الصحيحة ٣٢٨٢)

**٤١٠٦- ئایا تۆ تنها پەنجەیەك نیت خوێناوی بوویت، هەر چیشت تووش بووە لە پێناو خوایە.**

٤١٠٧- ويلك ! أولست أحق أهل الأرض أن يتقي الله ؟

(صحيح) ( ق ) عن أبي سعيد. (السنة ٩٢٣)

**٤١٠٧- وەی بۆ تۆ! ئایا تۆ شایستەترین كەس نیت لەسەر زەویدا لە خوا بترسێت.**

٤١٠٨- ويلك ! و من يعدل إذا لم أعدل ! قد خبت و خسرت إن لم أكن أعدل.

(صحيح) ( ق ) عن أبي سعيد. (المشكاة ٥٨٩٤)

**٤١٠٨- بەڵات لێ كەوێت! ئەگەر من دادگەر نەبم كێ دادگەرە! نەدار و خەسارۆمەندی ئەگەر من دادگەر نەبم.**

٤١٠٩- يا عائشة ! ما أزال أجد ألم الطعام الذي أكلت بخيبر فهذا أوان وجدت انقطاع أبهري من ذلك السم.

(صحيح) ( خ ) عن عائشة. (المشكاة ٥٩٦٥)

**٤١٠٩- ئەی عائیشە! تائێستاش هەست بەئازاری ئەو خواردنە دەکەم کە لە خەیبەر خواردم، ئێستا هەست دەکەم شاخوێنبەری دڵم خەریکە دەبڕێت بەکاریگەری ئەو ژەهرە.**

٤١١٠- ألا تأمنوني و أنا أمين من في السماء ؟ يأتيني خبر السماء صباحا و مساء.

(صحيح) ( حم ق ) عن أبي سعيد . (الإرواء ٨٥٦)

**٤١١٠- ئایا دڵنیا نین لەمن کەهەرچی لەئاسماندایە لەمن دڵنیایە؟ هەواڵ ئاسمانم بۆ دێت بەیانیان و ئێواران.**

## بابەتی فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ

٤١١١- إنما أنا مبلغ و الله يهدي و إنما أنا قاسم و الله يعطي.

(صحيح) ( طب ) عن معاوية . (الصحيحة ١٦٢٨)

**٤١١١- من ڕاگەیەنەرم لەلایەن خواوە و، خوای گەورە خۆی ڕێپیشاندەرە، من دابەشکەرم و خوای گەورە بەخشەرە.**

## بابەتی ئیسراو میعراج

٤١١٢- بينما أنا في الحطيم مضطجعا إذ أتاني آت فقد ما بين هذه إلى هذه فاستخرج قلبي ثم أتيت بطست من ذهب مملوءة إيمانا فغسل قلبي بماء زمزم ثم حشي ثم أعيد ثم أتيت بدابة دون البغل و فوق الحمار أبيض يقال له البراق يضع خطوه عند أقصى طرفه فحملت عليه فانطلق بي جبريل حتى أتى السماء الدنيا فاستفتح قيل من هذا ؟ قال: جبريل قيل: و من معك ؟ قال: محمد قيل: و قد أرسل إليه ؟ قال: نعم قيل: مرحبا به فنعم المجيء جاء ففتح فلما خلصت فإذا فيها آدم فقال: هذا أبوك آدم فسلم عليه فسلمت عليه فرد السلام ثم قال: مرحبا بالنبي الصالح و الابن الصالح " ثم صعد بي حتى أتى السماء الثانية فاستفتح فقيل: من هذا ؟ قال: جبريل قيل: و من معك ؟ قال: محمد قيل و قد أرسل إليه ؟ قال: نعم قيل مرحبا به فنعم المجيء جاء

ففتح فلما خلصت إذا بيحيى و عيسى و هما ابنا الخالة قال: هذا يحيى و عيسى فسلم عليهما فسلمت فردا ثم قالا: مرحبا بالأخ الصالح و النبي الصالح " ثم صعد بي إلى السماء الثالثة فاستفتح قيل: من هذا ؟ قال: جبريل قيل: و من معك ؟ قال: محمد قيل: و قد أرسل إليه ؟ قال: نعم قيل: مرحبا به فنعم المجيء جاء ففتح فلما خلصت إذا يوسف قال: هذا يوسف فسلم عليه فسلمت عليه فرد ثم قال: مرحبا بالأخ الصالح و النبي الصالح " ثم صعد بي حتى أتى السماء الرابعة فاستفتح قيل: من هذا ؟ قال: جبريل قيل: و من معك ؟ قال: محمد قيل: و قد أرسل إليه؟ قال: نعم قيل: مرحبا به فنعم المجيء جاء ففتح فلما خلصت إذا إدريس قال: هذا إدريس فسلم عليه فسلمت فرد ثم قال: مرحبا بالأخ الصالح و النبي الصالح " ثم صعد بي إلى السماء الخامسة فاستفتح قيل: من هذا ؟ قال: جبريل قيل: و من معك ؟ قال: محمد قيل: و قد أرسل إليه ؟ قال: نعم قيل: مرحبا به فنعم المجيء جاء فلما خلصت إذا هارون قال: هذا هارون فسلم عليه فسلمت عليه فرد ثم قال: مرحبا بالأخ الصالح و النبي الصالح " ثم صعد بي إلى السماء السادسة فاستفتح قيل: من هذا ؟ قال: جبريل قيل: و من معك ؟ قال: محمد قيل: و قد أرسل إليه ؟ قال: نعم قيل: مرحبا به فنعم المجيء جاء فلما خلصت فإذا موسى قال: هذا موسى فسلم عليه فسلمت عليه فرد ثم قال: مرحبا بالأخ الصالح و النبي الصالح فلما تجاوزت بكى قيل له: ما يبكيك ؟ قال: أبكي لأن غلاما بعث بعدي يدخل الجنة من أمته أكثر ممن يدخل من أمتي " ثم صعد بي إلى السماء السابعة فاستفتح قيل: من هذا ؟ قال: جبريل قيل: و من معك ؟ قال محمد قيل: و قد بعث إليه ؟ قال: نعم قيل: مرحبا به فنعم المجيء جاء فلما خلصت إذا إبراهيم قال: هذا أبوك إبراهيم فسلم عليه فسلمت عليه فرد السلام فقال: مرحبا بالابن الصالح و النبي الصالح " ثم رفعت لي سدرة المنتهى فإذا نبقها مثل قلال هجر و إذا ورقها مثل آذان الفيلة قال: هذه سدرة المنتهى و إذا أربعة أنهار نهران باطنان و نهران ظاهران قلت: ما هذان يا جبريل ؟ قال: أما الباطنان فنهران في الجنة و أما الظاهران فالنيل و الفرات ثم رفع لي البيت المعمور فقلت: يا جبريل ! ما هذا ؟ قال: هذا البيت المعمور يدخله كل يوم سبعون ألف ملك إذا خرجوا منه لم يعودوا إليه آخر ما عليهم ثم أتيت بإناء من خمر و إناء من لبن و إناء من عسل فأخذت اللبن فقال: هي الفطرة التي أنت عليها و أمتك " ثم فرض علي خمسون صلاة كل يوم فرجعت فمررت على موسى فقال: بم أمرت ؟ قلت: أمرت بخمسين صلاة كل يوم قال: إن أمتك لا تستطيع خمسين صلاة كل يوم و إني و الله قد جربت الناس قبلك و عالجت بني إسرائيل أشد

المعالجة فارجع إلى ربك فسله التخفيف لأمتك فرجعت فوضع عني عشرا فرجعت إلى موسى فقال مثله فرجعت فوضع عني عشرا فرجعت إلى موسى فقال مثله فرجعت فوضع عني عشرا فرجعت إلى موسى فقال مثله فرجعت فوضع عني عشرا فأمرت بعشر صلوات كل يوم فقال مثله فرجعت فأمرت بخمس صلوات كل يوم فرجعت إلى موسى فقال: بم أمرت ؟ قلت: أمرت بخمس صلوات كل يوم قال: إن أمتك لا تستطيع خمس صلوات كل يوم و إني قد جربت الناس قبلك و عالجت بني إسرائيل أشد المعالجة فارجع إلى ربك فسله التخفيف لأمتك قلت: سألت ربي حتى استحييت منه و لكن أرضى و أسلم فلما جاوزت ناداني مناد أمضيت فريضتي و خففت عن عبادي.

(صحيح) ( حم ق ن ) ن مالك بن صعصعة . (فقه السيرة ٦٤)

**٤١١٢- وا ڕێكەوتبوو من لە ( الحطيم ) حوتەيم ڕاكشا بووم كەسێك هات بۆ لام نێوان ئێرە و ئێرەی دا پۆشیم و دڵی دەرهێنام ، ئینجا تەشتێكی ئاڵتونی پڕ لە باوەڕی هێنا و بە ئاوی زەم زەم شۆردی ئینجا وولاغێكی سپی هێنا لە ئێستر بچوكتر و لە گوێدرێژ گەورەتر بوو پێ ی دەوترا بوراق، هەنگاوی دەنا ئەوەندەی چاوی بڕی دەكرد، منی سوار كرد جبريل بردمی هەتا گەیاندمیە ئاسمانی یەكەم لە دەرگایدا ، وترا : ئەوە كێ یە ؟ فەرمووی : جبريل ، وترا : كێت لەگەڵە؟ فەرمووی محمد ، وترا : ئایا لە دوی نێردراوە؟ ووتی : بەڵێ ، وترا : خۆشهات و بەخێر بێت باشترین كەس هاتووە ، دەرگا كرایەوە ، كاتێك لەم گفتوگۆیە بونەوە و چونە ناو ئاسمان كە ئادەم لەوێ بوو ، فەرمووی : ئەوە باوكە ئادەمتە سەلامی لێ بكە ، سەلامم لێ كرد ، سەلامی سەندەوە ئینجا ئادەم فەرمووی: خۆش هات پێغەمبەری چاكەخواز و كوڕی چاكەخواز ، ئینجا بردمیە سەرەوە هەتا گەیاندمیە ئاسمانی دووهەم لە دەرگای دا وترا : ئەوە كێ یە ؟ فەرمووی : جبريل، وترا : كێت لەگەڵە؟ فەرمووی محمد ، وترا : ئایا لە دوی نێردراوە؟ ووتی : بەڵێ ، وترا : خۆشهات و بەخێر بێت باشترین كەس هاتووە ، دەرگا كرایەوە ، كە لە گفتوگۆ بونەوە یحیی و عیسی لەوێدا بوون كە پورزای یەكتر بوون ، فەرمووی : ئەوە یحیی و عیسان سەلامیان لێ بكە، سەلامم لێ كردن ، سەلامیان سەندەوە ، ئینجا ووتیان: خۆشهات برای چاك و پێغەمبەری چاكەخواز ، ئینجا بردمیە سەرەوە بۆ ئاسمانی سێهەم، لە دەرگای دا ، وترا : ئەوە كێ یە ؟ فەرمووی : جبريل ، وترا : كێت**

لەگەڵدایە؟ فەرمووی محمد ، وتـرا : ئایا لـە دوی نێردراوە؟ ووتـی : بـەڵێ ، وتـرا : خۆشهات و بەخێر بێت باشترین کەس هاتووە ، دەرگا کرایەوە ، کاتێ لە گفتوگۆ بونەوە یوسف لەوێدا بـوو ، فـەرمووی ئـەوە یوسفە سـەلامی لێ بکـە ، سـەلامم لێ کـرد سـەلامی سەندەوە ، ئینجا فەرمووی بەخێربێیت خۆشهاتی برای چاك و پێغەمبـەری چاکەخواز ، ئینجـا بردمیـە سـەرەوە بـۆ ئاسمـانی چـوارەم، لـە دەرگـای دا ، وتـرا : ئـەوە کـێ یـە ؟ فـەرمووی: جبریـل ، وتـرا : کێـت لەگەڵدایـە؟ فـەرمووی محمـد ، وتـرا : ئایـا لـە دوی نێردراوە؟ ووتی : بەڵێ ، وترا : خۆشهات و بەخێر بێت باشـترین کـەس هـاتووە ، دەرگـا کرایەوە ، کاتـێ لە گفتوگۆ بونـەوە ئیـدریس لەوێـدا بـوو ، فـەرمووی سـەلامی لێ بکـە ، سەلامم لێ کرد سەلامی سەندەوە ، ئینجا فـەرمووی بـەخێربێیت خۆشـهاتی بـرای چـاك و پێغەمبەری چاکەخواز ، ئینجا بردمیـە سـەرەوە بـۆ ئاسمـانی پێنجـەم، لـە دەرگـای دا ، وترا : ئەوە کێ یە ؟ فەرمووی : جبریل ، وترا : کێت لەگەڵدایە؟ فەرمووی محمد ، وترا : ئایا لە دوی نێـردراوە؟ ووتـی : بـەڵێ ، وتـرا : خۆشـهات و بـەخێر بێـت باشـترین کـەس هاتووە ، دەرگا کرایەوە ، کاتێ لە گفتوگۆ بونەوە لەوێدا هارونم بـوو ، فـەرمووی ئـەوە هارونە سەلامی لێ بکە ، سەلامم لێ کرد سەلامی سەندەوە ، ئینجا فـەرمووی بـەخێربێیت خۆشهاتی بـرای چـاك و پێغەمبـەری چـاکەخواز ، ئینجـا بردمیـە سـەرەوە بـۆ ئاسمـانی شەشـەم، لـە دەرگـای دا ، وتـرا : ئـەوە کـێ یـە ؟ فـەرمووی : جبریـل ، وتـرا : کێـت لەگەڵدایـە؟ فـەرمووی محمـد ، وتـرا : ئایـا لـە دوی نێـردراوە؟ ووتـی : بـەڵێ ، وتـرا : خۆشهات و بەخێر بێت باشترین کەس هاتووە ، دەرگا کرایەوە ، کاتێ لە گفتوگۆ بونـەوە موسا لەوێدا بـوو ، فـەرمووی ئـەوە موسـایە سـەلامی لێ بکـە ، سـەلامم لێ کـرد سـەلامی سـەندەوە ، ئینجـا موسـا فـەرمووی بـەخێربێیت خۆشـهاتی بـرای چـاك و پێغەمبـەری چاکەخواز ، کاتێـك تێپـەڕیم موسـا گریـا ، پـێ ی وتـرا بۆچـی گریـای ؟ فـەرموی بۆیـە دەگریم لاوێك لـە دوای مـن ڕەوانـەکراوە بـە پێغەمبەرایـەتی لـە ئوممەتەکـەی ئـەو زۆر زیـاتر دەچـنە بەهەشـتەوە لـە ئومەتەکـەی مـن ، ئینجـا بردمیـە سـەرەوە بـۆ ئاسمـانی حەوتـەم، لـە دەرگـای دا ، وتـرا : ئـەوە کـێ یـە ؟ فـەرمووی : جبریـل ، وتـرا : کێـت لەگەڵدایـە؟ فـەرمووی محمـد ، وتـرا : ئایـا لـە دوی نێـردراوە؟ ووتـی : بـەڵێ ، وتـرا : خۆشهات و بەخێر بێت باشترین کەس هاتووە ، دەرگا کرایەوە ، کاتێ لە گفتوگۆ بونـەوە

ئیبراهیم لەوێدا بوو ، جبریل فەرمووی ئەوە ئیبراهیمی باوکتە سەلامی لێ بکە ، سەلامم لێ کرد سەلامی سەندەوە و فەرمووی خۆشهاتی کوڕی چاك و پێغەمبەری چاکەخواز ، ئینجا سیدرەتول مونتەهام نیشاندرا میوەکەی وەکو گۆزەی هەجەر[1] وابوو ، گەڵاکانیشی وەکو گوێچکەی فیل وابوون ؛ فەرمووی: ئەمە ( سدره المنتهى ) یە لەوێدا چوار ڕووباری لێ بوو ، دوو پەنهانی و دوو ڕووباری ئاشکرا ، ووتم ئەی جبریل ئەمە چین؟ فەرمووی : دوو پەنهانەکە دوو ڕووباری بەهەشتن دوو ئاشکراکەش نیل و فوراتن ، ینجا بەرزکرامەوە بۆ بیت المعمور ، وتم : ئەی جیبریل ! ئەمە چییە؟ فەرمووی : ئەوە ( بیت المعمور ) ە هەموو ڕۆژێك حەفتا هەزار فریشتە دەچنە ناویەوە و کە هاتنە دەرەوە جارێکی تر ناچنەوە ناوی[2] ، ئیجا قاپێك مەی ( عارەق ) و قاپێك شیر و هەنگوینم بۆ هێنرا ، قاپە شیرەکەم هەڵگرت ، جبریل فەرمووی: ئەوە سروشتی یە کە خۆت و ئوممەتەکەت لەسەری گۆش بوون ، ئینجا پە نجا نوێژم لەسەر پێویست کرا بۆ هەر شەوو ڕۆژێك ئیتر گەڕامەوە و بەلای موسادا تێپەڕیم و، پێ فەرمووم فەرمانت بە چی پێکراوە ؟ وتم: فەرمانم پێکراوە بە کردنی پە نجا نوێژ لە هەموو ڕۆژێکدا ، موسی فەرموی : بەڕاستی ئوممەتەکەت توانای کردنی پە نجا نوێژی نیە لە هەموو ڕۆژێکدا ، والله بەڕاستی و بێگومان من پێش تۆ ئەزمونم هەبوو لەگەڵ خەڵکی و داکۆکی بێنە و بەرەی زۆرم لەگەڵ بەنی ئیسرائیل کرد ، بگەڕێرەوە بۆ لای پەروەردگارت و داوای بارسوکی و کەمکردنەوەی لێ بکە بۆ ئوممەتەکەت ، گەڕامەوە دە نوێژی لەسەر هەڵگرتم ، گەڕامەوە بۆ لای موسا هەمان قسەی کردەوە ، گەڕامەوە دە نوێژی تری لەسەر هەڵگرتم گەڕامەوە لای موسا هەمان قسەی کردەوە ، گەڕامەوە دە نوێژی تری لەسەر هەڵگرتم، گەڕامەوە لای موسا هەمان قسەی کردەوە دە نوێژی تری لەسەر هەڵگرتم ، فەرمانم پێکرا بە دە نوێژ لەهەر ڕۆژێکدا و موساش هەمان قسەی کردەوە ، گەڕامەوە فەرمانم پێکرا بە کردنی پێنج نوێژ لەهەر ڕۆژێکدا ، گەڕامەوە لای موسا فەرموی چیت پێ کرا ؟ ووتم : فەرمانم پێ کرا بە کردنی پێنج نوێژ لە هەموو ڕۆژێکدا فەرموی: بەڕاستی ئوممەتەکەت ناتوانان هەموو ڕۆژێك پێنج نوێژ بکەن ، بێگومان من خەڵکم تاقی کردۆتەوە لە پێش تۆدا داکۆکی و بێنە و بەرەی زۆرم کردوە لەگەڵ بەنی ئیسرائیل ، بگەڕێرەوە بۆ لای

---

[1] قلال هجر: واتە گۆزەی گوندی هەجەر کە لە گەورەیدا نمونەی پێ هێنراوەتەوە السیرة النبویە للصلابي ج١ ص٣٩٠

[2] واتە: بەریان ناکەوێت هەرگیز بچنەوە ناوی

**پەروەرگارت داواى ئاسانكارى لێ بكە بۆ ئوممەتەكەت وتم: ئەوەندەم داوا لەخوا كرد ئيتر شەرمى لێ دەكەم لەوە زياتر بەڵكو ڕازى دەبم و سەلامەت دەبم ، كاتێك تێپەڕيم بانگدەرێك بانگى كردم: فەرزەكانم پێويست كردن و ئاسانكاريشم بۆ بەندەكانم كرد.**

٤١١٣- رأيت ليلة أسري بي موسى رجلا آدم طوالا جعدا كأنه من رجال شنوءة و رأيت عيسى رجلا مربوع الخلق إلى الحمرة و البياض سبط الرأس و رأيت مالكا خازن النار و الدجال.

(صحيح) ( حم ق ) عن ابن عباس. (المشكاة ٥٧١٥)

**٤١١٣- ئەوى شەوەى ئەو ڕەوم پێكرا موسام بينى پياوێكى گەنم ڕەنگى بالا بەرزى قژ لوول بوو دەتووت يەكێكە لە پياوانى شەنوئە، هەروەها، عيسام بينى پاوێك بوو بالا مام ناوەندى بوو بەلاى سوورو سپى دا، قژى خاو بوو، ماليكى دۆزەخەوان و دەججاليشم بينى.**

٤١١٤- أتيت بالبراق و هو دابة أبيض طويل يضع حافره عند منتهى طرفه فلم نزايل ظهره أنا و جبريل حتى أتيت بيت المقدس ففتحت لي أبواب السماء و رأيت الجنة و النار.

(حسن) ( حم ع حب ك الضياء ) عن حذيفة . (الصحيحة ٨٧٤)

**٤١١٤- بوراقيان بۆ هێنام وڵاخێكى سپى بەرز بوو، سمى لەئەسەو سەرى بڕ كردنى چاوى دادەنێ، لەسەر پشتى دانەبەزين من و جيبريل تاكو گەيشتينە بەيتولمەقديس و، دەرگاكانى ئاسمانم بۆ كرايەوە و، بەهەشت و دۆزەخيشم بينى.**

٤١١٥- أتيت ليلة أسري بي فانطلق بي إلى زمزم فشرح عن صدري ثم غسل بماء زمزم ثم أنزل.

(صحيح) ( م ) عن أنس . (الصحيحة ٣٩٥٦)

**٤١١٥- لەشەو ڕەوەكەمدا هاتنە لام و بردميان لاى زەمزەم، سنگيانم هەڵدڕيم و بەئاوى زەمزەم شۆرديان و دوايى دابەزێنرا.**

٤١١٦- رفعت إلى سدرة المنتهى منتهاها في السماء السابعة نبقها مثل قلال هجر و ورقها مثل آذان الفيلة فإذا أربعة أنهار نهران ظاهران و نهران باطنان فأما الظاهران: فالنيل و الفرات و أما الباطنان: فنهران في الجنة و أتيت بثلاثة أقداح قدح فيه لبن و قدح فيه عسل و قدح فيه خمر فأخذت الذي فيه اللبن فشربت فقيل لي: أجبت الفطرة أنت و أمتك.

(صحيح) ( خ ) عن أنس. (الصحيحة ١١٢)

**٤١١٦-** (سدرة المنتهى)**م بۆ بەرز كرايەوە، كۆتاييەكەى لەئاسمانى حەوتەم بوو، كونارەكەى وەكو گۆزەكانى هوجەر دەبوو، گەڵاكانى وەكو گوێى فيل بوون، لەوێ چوار**

**ڕوبارم بینی: دوو دیار و دوو شاراوە، دوو ڕووبارە دیارەکان نیل و فورات،دوو شاراوەکانیش، دوو ڕووبارن لەبەھەشتدا، سێ پەرداخیان بۆ ھێنام لەشیرو ھەنگوین و مەی، ئەو پەرداخەم وەرگرت کەسیرەکەی تیادا بوو، پێم ووترا: وەڵامی فیترەتت دایەوە خۆت و ئوممەتەکەت.**

٤١١٧- عرج بي حتى ظهرت بمستوى أسمع فيه صريف الأقلام.

(صحيح) ( خ طب ) عن ابن عباس وأبي حبة البدري. (الإسراج والمعراج ١١)

**٤١١٧- بەرز کرامەوە تاکو گەیشتمە ئاسمانێك گوێم لەدەنگی پێنووسەکان بوو لەکاتی نووسیندا.**

٤١١٨- فرج سقف بيتي و أنا بمكة فنزل جبريل ففرج صدري ثم غسله بماء زمزم ثم جاء بطست من ذهب ممتلئ حكمة و إيمانا فأفرغها في صدري ثم أطبقه " ثم أخذ بيدي فعرج بي إلى السماء الدنيا فلما جئنا السماء الدنيا قال جبريل لخازن السماء الدنيا: افتح قال من هذا ؟ قال: هذا جبريل قال هل معك أحد ؟ قال: نعم معي محمد قال: فأرسل إليه ؟ قال نعم فافتح " فلما علونا السماء الدنيا فإذا رجل عن يمينه أسودة و عن يساره أسودة فإذا نظر قبل يمينه ضحك و إذا نظر قبل شماله بكى فقال: مرحبا بالنبي الصالح و الابن الصالح قلت: يا جبريل من هذا ؟ قال: هذا آدم و هذه الأسودة عن يمينه و عن شماله نسم بنيه فأهل اليمين أهل الجنة و الأسودة التي عن شماله أهل النار فإذا نظر قبل يمينه ضحك و إذا نظر قبل شماله بكى " ثم عرج بي جبريل حتى أتى السماء الثانية فقال لخازنها: افتح فقال له خازنها مثل ما قال خازن السماء الدنيا ففتح فلما مررت بإدريس قال: مرحبا بالنبي الصالح و الأخ الصالح فقلت: من هذا ؟ قال: هذا إدريس ثم مررت بموسى فقال: مرحبا بالنبي الصالح و الأخ الصالح فقلت: من هذا ؟ قال: هذا موسى ثم مررت بعيسى فقال: مرحبا بالنبي الصالح و الأخ الصالح قلت: من هذا ؟ قال: هذا عيسى بن مريم ثم مررت بإبراهيم فقال: مرحبا بالنبي الصالح و الابن الصالح قلت: من هذا ؟ قال: هذا إبراهيم " ثم عرج بي حتى ظهرت بمستوى أسمع فيه صريف الأقلام ففرض الله عز و جل على أمتي خمسين صلاة فرجعت بذلك حتى مررت على موسى فقال موسى: ماذا فرض ربك على أمتك ؟ قلت: فرض عليهم خمسين صلاة قال لي موسى: فراجع ربك فإن أمتك لا تطيق ذلك فرجعت ربي فوضع شطرها فرجعت إلى موسى فأخبرته فقال: راجع ربك فإن أمتك لا تطيق ذلك فراجعت ربي فقال: هن خمس و هن خمسون لا يبدل القول لدي فرجعت إلى موسى فقال: راجع ربك قلت: قد استحييت من ربي " ثم انطلق بي حتى انتهى إلى سدرة المنتهى و نبقها

مثل قلال هجر و ورقها كآذان الفيلة تكاد الورقة تغطي هذه الأمة فغشيها ألوان لا أدري ما هي ؟ ثم أدخلت الجنة فإذا فيها جنابذ اللؤلؤ و إذا ترابها المسك.

( ق ) عن أبي ذر إلا قوله: ثم عرج بي حتى ظهرت بمستوى اسمع فيه صريف الأقلام فإنه عن (صحيح)ابن عباس وأبي حبة البدري. (المشكاة ٥٨٦٢)

**٤١١٨- سابیتەی ژوورەكەم كرایەوە لەمككە و جیبرىلی لێوە دابەزی، سنگی كردمەوەو، بەئاوی زەمزەم شۆردی، ئینجا تەشتێكی هێنا پڕ بوو لەدانایی و ئیمان و بەتاڵی كردە ناو سنگم و جارێكی تر دا یخستەوە، وای دەستی گرتم و بەرزیكردمەوە بۆ ئاسمانی دونیا، گەیشتینە ئەو ئاسمانەی جیبریل بەئاسمانەوانی دونیا وت: بەڵێ، بیكەرەوە: كاتێك بەرز بووینە لەئاسمانی دونیا پیاوێكمان بینی لەلای ڕاست چە پیدا ڕەشاییە، كەتەماشای لای ڕاستی دەكرد پێدەكەنی و تەماشایی لای چە پی دەكرد دەگریا، وتی: بەخێربێی ئەی پێغەمبەری چاك كوڕی چاك، ووتم: جیبریل ئەوە كێ یە؟ ووتی: ئەوە ئادەمە، ئەو ڕەشایی لای ڕاست و چە پیشی گیانی نەوەكانییەتی، لای ڕاست بەهەشتی یەكانن و لای چە پی دۆزەخییەكانن، كەتەماشای لای ڕاستی دەكات پێدەكەنێ و تەماشای لای چە پی دەكات دەگریێ، ئینجا بەرز كرایەنەوە تا گەیشتیەنە ئاسمانی دووەم بەئاسمانەوانەكەی وت: بیكەرەوە: وەكو ئەوەی پێوت لەئاسمانی یەكەم پێی وتراو، كرایەوە، كاتێك بەلای ئیدریس دا تێپەڕیم وتی: بەخێر بێی ئەی پێغەمبەری چاك و برای چك، وتم: ئەوە كێ یە؟ وتی: ئەوە ئدریسە، دوای بەلای موسا تێپەڕیم، وتی: بەخێر بێی ئەی پێغەمبەری چاك و برای چاك، وتم ئەوە كێ یە؟ ووتی: ئەوە موسایە، ئینجا بەلای عیسادا تێپەڕیم، وتی: بەخێر بێی پێغەمبەری چاك و برای چاك، وتم ئەوە كێ یە؟ ووتی: ئەوە عیسای كوڕی مەریەمە، ئینجا بەلای ئیبراهیم دا تێپەڕیم وتی: بەخێر بێیئەی برای باش و كوڕی باش، وتم: ئەوە كێ یە؟ وتی: ئەوە ئیبراهیمە، ئینجا بەرز كرامەوە تاكو گەیشتمە ئاسمانێك گوتم لەدەنگی پێنوسەكان بوو، خوای گەورەیش پە نجا نوێژی فەرز كردە سەر ئوممەتەكەمدا، منیش بەو فەرمانەگەڕامەوە تاكو گەیشتمە لای موسا، وتی: پەروەردگار چی فەرز كردە سەر ئومەتەكەت؟ وتم: پە نجا نوێژ، موسا پێی وتم: بگەڕێرەوە لای پەروەردگارت ئوممەتی تۆ ئەوەندەی پێ ناكرێت، منیش گەڕامەوە لای خواو نیوەی بۆ لابردم، گەڕامەوە لای موسا و ئاگادارم كردەوە، ووتی: بگەڕێرەوە لای پەروەردگارت ئوممەتی تۆ ئەوەندەی**

**نوێژ پێ ناکرێت، منیش گەڕامەوە لای خواو ، نیوەی تری لابرد، گەڕامەوە لای موسا ووتم : نیوەی لابرد، وتی بگەڕێرەوە لای پەروەردگارت ئوممەتت ناتوانن ئەوەندە نوێژ بکەن، گەڕامەوە لای خواو نیوەی تریلا لابرد، گەڕامەوە، وتی : بگەڕێرەوە لای پەروەردگارت، ئوممەتی تۆ ئەوەی پێ ناکرێت، گەڕامەوە لای و فەرمووی : پێنجن و پەنجان، قسەی لەلای من ناگۆڕێت، گەڕامەوە لای موسا وتی : بگەڕێرەوە لای پەروەردگارت، وتم : شەرمم کرد لە پەروەردگارم، ئینجا بردمی تاکو گەیشتینە، ( السدرە المنتهی )و کوناارەکەی وەکو گۆزەکانی هوجەر بوو، گەڵاکانیشی وەکو گوێی فیل بوو، نزیک بوو گەڵایەکی ئەم ئوممەتەی دا پۆشییایە، چەند ڕەنگێکی تیادا بوو نازانم چی بوون؟ دوای خرامە بەهەشتەوە، بینیم بەرزترین جۆرەکانی مرواری تیادایە و خاکەکەی میسکە.**

٤١١٩- لقد رأيتني في الحجر و قريش تسألني عن مسراي فسألتني عن أشياء من بيت المقدس لم أثبتها فكربت كربا ما كربت مثله قط فرفعه الله لي أنظر إليه ما يسألوني عن شيء إلا أنبأتهم به و قد رأيتني في جماعة من الأنبياء فإذا موسى قائم يصلي فإذا رجل جعد ضرب كأنه من رجال شنوءة و إذا عيسى ابن مريم قائم يصلي أقرب الناس به شبها عروة ابن مسعود الثقفي و إذا إبراهيم قائم يصلي أشبه الناس به صاحبكم - يعني نفسه - فحانت الصلاة فأممتهم فلما فرغت من الصلاة قال قائل: يا محمد ! هذا مالك صاحب النار فسلم عليه فالتفت إليه فبدأني بالسلام.

(صحيح) ( م ) عن أبي هريرة (الإسراء و المعراج ٨)

**٤١١٩- لەحیجرادا بووم، قوڕەیش پرسیاری شەو ڕەوەکەیان دەکردم و، پرسیاری هەندێ شتیان لێ کردم لەبەیتولمەقدیس نەمزانی، ئیتر خەم و پەژارە دایگرتم بەشێوەییەک پەژارەی وام نەبینیوە پێشتر، ئینجا خوای گەورە بۆی بەرز کردمەوە، پرسیاری هەر چییەکیان لێ دەکردم وەڵامم دەدایەوە، ئینجا من لەناو کۆمەڵێک لە پێغەمبەران بووم بینیم موسا بە پێوە نوێژ دەکات، پیاوێکی قژ لوولە دەڵێی یەکێکە لە پیاوانی شەنوئە، دوایی عیسای کوڕی مەریەمم بینی نوێژی دەکرد، زۆر لەعوروەی کوڕی مەسعوودی سەقەفی دەچوو، ئینجا ئیبراهیمم بینی نوێژ دەکات زۆر لەهاوەڵەکانی دەکرد – مەبەستی خۆی بوو- کاتی نوێژ هات و پێش نوێژیم بۆ کردن، کاتێک لەنوێژەکە بوومەوە، کەسێک ووتی : ئەی موحەممەد! ئەو مالیکە خاوەنی دۆزەخ سڵاوی لێ بکە، ئاوڕم دایەوە، ئەو پێشم کەوت لەسەلام کردندا.**

٤١٢٠- لما انتهينا إلى بيت المقدس ليلة أسري بي قال جبريل بأصبعه فخرق بها الحجر و شد به البراق.

(صحيح) ( ت حب ك ) عن بريدة. (الصحيحة ٣٤٨٧)

**٤١٢٠- کاتێك گەیشتینە بەیتولمەقدیس لەشەوڕەوەکەدا، جیبریل بە پەنجەی بەردەکەی کون کرد و بوراقەکەی پێوەبەست.**

٤١٢١- لما كذبتني قريش حين أسري بي إلى بيت المقدس قمت في الحجر فجلى الله لي بيت المقدس فطفقت أخبرهم عن آياته و أنا أنظر إليه.

(صحيح) ( حم ق ت ن ) عن جابر. (فقه السيرة ١٤٥)

**٤١٢١- کاتێك قورەیش بەدرۆیان خستمەوە لەشەوڕەوەکەمدا بۆ بەیتولمەقدیس، لەحیجردا بووم خوای گەورە بەیتولمەقدیسی بۆ ئاشکرا کردم منیش باسی شوێنەکانم بۆ دەکرد و تەماشام دەکرد.**

٤١٢٢- ليلة أسري بي رأيت موسى و إذا هو رجل ضرب كأنه من رجال شنوءة و رأيت عيسى فإذا هو رجل ربعة أحمر كأنما خرج من ديماس " و رأيت إبراهيم و أنا أشبه ولده به " ثم أتيت بإناءين في أحدهما لبن و في الآخر خمر فقيل لي: اشرب أيهما شئت فأخذت اللبن فشربته فقيل لي: أصبت الفطرة أما إنك لو أخذت الخمر غوت أمتك.

(صحيح) ( ق ن ) عن أبي هريرة. (المشكاة ٥٧١٦)

**٤١٢٢- لەشەوڕەوەکەمدا موسام بینی یەکێك بوو لە پیاوەنی شەنوئە، هەروەها عیسام بینی پیاوێکی مام ناوەندی بوو سوور دەتووت لەگەرماو دەرچووە، ئیبراهیم میشم بینی من لەهەموو ئەوەکەی زیاتر لێی دەچم، ئینجا دوو پەرداخیان بۆ هێنام یەکێکیان شیری تیا بوو، ئەویتریان مەیی تیا بوو، وتیان: کامیان حەز دەکەیت بخۆرەوە، منیش شیرەکەم خواردەوە، وتیان: فیترەتت هەڵبژارد، ئەگەر ئارەقەکەت ببردایە ئوممەتەکەن گومڕا دەبوون.**

٤١٢٣- مررت ليلة أسري بي بالملأ الأعلى و جبريل كالحلس البالي من خشية الله تعالى.

(حسن) ( طس ) عن جابر. (الصحيحة ٢٢٨٩)

**٤١٢٣- لەشەو ڕەوەکەمدا بەلای کەسە بەرزەکاندا تێپەڕیم و جیبریل م بینی وەکو پۆشاکی داڕزاوی پێ هاتبوو لەترسی خوای گەورە.**

٤١٢٤- مررت ليلة أسري بي على موسى قائما يصلي في قبره.

(صحيح) ( حم م ن ) عن أنس. (الصحيحة ٢٦٢٧)

**٤١٢٤- لەشەو ڕەوەکەمدا بەلای مووسدا تێپەڕیم، بینیم لەگۆڕەکەیدا نوێژی دەکرد**

# پەڕاوى چاكەكان

## بابەتى وەچاغزادەيى و چاكەى هاوەڵان

٤١٢٥- احفظوني في أصحابي ثم الذين يلونهم ثم الذين يلونهم ثم يفشوا الكذب حتى يشهد الرجل و ما يستشهد و يحلف و ما يستحلف

( صحيح ) ( هـ ) عن عمر .

**٤١٢٥- بم پارێزن لەهاوەڵا نمداو، ئەوانەى دواى ئەوان دێن و، ئەوانەى دواى ئەوان دێن، ئينجا درۆ بڵاو دەبێتەوە، تاكو وايليدێت پياوێك شايەتى دەدات بێ ئەوەى داواى شايەتى ليكرابێت، سوێند دەخوات بێ ئەوەى داواى سوێند خواردنى ليكرابێت.**

**( الصحيحه ١١١٦ )**

٤١٢٦- أوصيكم بأصحابي ثم الذين يلونهم ثم يفشو الكذب حتى يحلف الرجل و لا يستحلف و يشهد الشاهد و لا يستشهد ألا لا يخلون رجل بامرأة إلا كان ثالثهما الشيطان عليكم بالجماعة و إياكم و الفرقة فإن الشيطان مع الواحد و هو مع الاثنين أبعد من أراد بحبوحة الجنة فليلزم الجماعة من سرته حسنته و ساءته سيئته فذلكم المؤمن

( صحيح ) ( حم ت ك ) عن عمر .

**٤١٢٦- واتە : ڕاسپارتان دەسپێرم دەربارەى هاوەڵەكانم و، ئەوانەى دواى ئەوان دێن، ئينجا درۆ بڵاو دەبێتەوە، تاكو پياوێك سوێند دەخوات بێ ئەوەى داواى سوێند خواردنى ليكرابێت و، شايەتى دەدات بێ ئەوەى داواى شايەتى ليكرابێت، دروست نييە پياوێك بە تەنيا لەگەڵ ئافرەتێكدا بێت، چونكە سێ يەميان شەيتانە[1]، دەست بەكۆمەڵەوە**

[1] ( بەدڵە ڕاوكێ و وروژاندنى ئارەزوو و، لابردنى شەرم )

**بگرن[1]، خۆتانیش بەدوور بگرن لەجیاجیایی، چونكە شەیتان لەگەڵ یەك كەسدایەو، لەدوو كەسەوە دوورترە، هەركەسێك ناوەڕاستی بەهەشتی بوێت بادەست بەكۆمەڵی موسوڵمانەوە بگرێت، هەر كەسێك دڵخۆش بوو بەكاری چاكەی خۆی و، دڵتەنگ بوو بەكاری خراپەی خۆی، ئەو كەسە باوەڕدارە.**

(الصحيحه ١١١٦)

٤١٢٧- بحسب أصحابي القتل

( صحيح ) ( حم طب ) عن سعيد بن زيد .

**٤١٢٧- واتە : هاوەڵانم بەسیانە كەكوژران[2].**

(الصحيحه ١٣٤٦)

٤١٢٨- خير الناس قرني ثم الذين يلونهم ثم الذين يلونهم ثم يجيء أقوام تسبق شهادة أحدهم يمينه و يمينه شهادته

( صحيح ) ( حم ق ت ) عن ابن مسعود .

**٤١٢٨- چاكترینی خەڵكی ئەوانەی سەدەی خۆمن، ئینجا ئەوانەن كە بەدوایاندا دێن و ، ئەوانەن كە بە دوایاندا دێن ، ئینجا كەسانێك دێن شایەتی كەسێكیان دەكەوێتە پێش سوێند خواردنی و، سوێند خواردنی دەكەوێتە پێش شایەتییەكەی.[3]**

(الصحيحه ٧٠٠)

٤١٢٩- خير الناس قرني، ثم الذين يلونهم ثم الذين يلونهم ثم يأتي من بعدهم قوم يتسمنون و يحبون السمن يعطون الشهادة قبل أن يسألوها

( صحيح ) ( ت ك ) عن عمران بن حصين .

---

[1] ( زۆرینەی ئەهلی سوننەت، واتە : دەست بەڕێنمونیانەوە بگرە، پێویستە شوێن كەوتوویان بێت لە بیروباوەڕو حوكمەكانی ئایین دا )

[2] ( واتە : ئێوەیش قسەیان پێ مەڵێن )

[3] ( واتە :زۆر سورن لەسەر سوێند خواردن و شاهیدی دان حەزدەكەن ڕەواجی پێ بدرێت،كە شاهیدیەكەیان بەسەردا درایەوە سوێند دەخۆن )

**٤١٢٩- چاکترین خەڵکی ئەوانەی( سەدەی ) سەردەمی خۆمن،ئینجا ئەوانەی بەدوایاندا دێن،ئینجا ئەوانەی بەدوای ئەواندا دێن،هەر خۆیان قەڵەودەکەن و حەزیان لەقەڵەوییە،شایەتی دەدەن پێش ئەوەی داوایان لێ بکرێت.**

**(الصحيحه ٦٩٩)**

٤١٣٠- خير الناس قرني، ثم الثاني ثم الثالث ثم يجيء قوم لا خير فيهم

( حسن ) ( طب ) عن ابن مسعود .

**٤١٣٠- چاکترین خەڵکی سەردەمی خۆمە، ئینجا دووەم و، ئینجا سێ هەم ، دوای ئەوان کەسانێك دێن خێریان تیا نییە.**

٤١٣١- دعوا لي أصحابي فوالذي نفسي بيده لو أنفقتم مثل أحد ذهبا ما بلغتم أعمالهم

( صحيح ) ( حم ) عن أنس .

**٤١٣١- واتە: واز لەهاوەڵانم بێنن بۆ خۆم، سوێند بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە، ئەگەر ئەوەندەی کێوی ئوحود ئاڵتوون ببەخشن ناگەنە کردەوەکانی ئەوان.**

**(الصحيحه ١٩٢٣)**

٤١٣٢-لعن الله من سبب اصحابى.

**٤١٣٢- نەفرینی خوا لەکەسێك جنێو بەهاوەڵانم دەدات.[1]**

**(الصحيحه ٣٣٤٠)**

٤١٣٣- ليأتين على أمتي ما أتى على بني إسرائيل حذو النعل بالنعل ( حتى إن كان منهم من أتى أمه علانية لكان في أمتي من يصنع ذلك و إن بني إسرائيل تفرقت على ثنتين و سبعين ملة و تفترق أمتي على ثلاث و سبعين ملة كلهم في النار إلا ملة واحدة ما أنا عليه و أصحابي)

( حسن ) ( ت ) عن ابن عمرو

**٤١٣٣- ئەوەی بەسەر بەنی ئیسرائیل دا هات، بەسەر ئوممەتەکەی منیش دێت شوێن پێ[2] بەشوێن پێ، تەنانەت ئەگەر کەسێکیان بەئاشکرا چوو بێتە لای دایکی خۆی لەئوممەتی من کەسی وا دەبێت هەمان کار ئە نجام ئەدات، ئینجا بەنی ئیسرائیل پەرتەوازە بوون بۆ**

---

[1] ( چونکە ئەوان ئاپیینیان سەرخست، بۆیە جنیو دان بەئەو هاوەڵانە لەگەورەترین تاوانەکانە و خراپترین جۆرەکانی بەدڕەوشتیە،هەندێك لەزانایانیش پێیان وایە هەرکێ جنیو بەئەبو بەکرو عومەر بدات دەکوژرێت )

[2] ( واتە :هەنگاو بە هەنگاو )

**حەفتا و دوو كۆمەڵ بەڵام ئوممەتى من دەبنە حەفتاو سێ بەشەوە، هەموويان لەدۆزەخدان يەك كۆمەڵيان نەبێت، ئەوەی من و هاوەڵانم لەسەرين.**[1]

(المشكاة ١٧١)

٤١٣٤- من سب أصحابي فعليه لعنة الله و الملائكة و الناس أجمعين

( حسن ) ( طب ) عن ابن عباس

**٤١٣٤- هەر كەسێ جنێو بەهاوەڵانم بدات، نەفرينى خواو فريشتەكان و هەموو خەڵكى لێ بێت.**

(الصحيحه ٢٣٤٠)

٤١٣٥- النجوم أمنة للسماء فإذا ذهبت النجوم أتى السماء ما توعد و أنا أمنة لأصحابي فإذا ذهبت أتى أصحابي ما يوعدون و أصحابي أمنة لأمتي فإذا ذهب أصحابي أتى أمتي ما يوعدون

( صحيح ) ( حم م ) عن أبي موسى

**٤١٣٥- ئەستێرەكان ئەميندار و پارێزەرى ئاسمانن[2]، كاتێك ئەستێرەكان نەمان ئەوەی كە هەڕەشەی پێ دەدرا ئەسمان دەيهێنێ، منيش پارێزەرم بۆ هاوەڵانم، كاتێك من ڕۆيشتم ئەوەی جێگای مەترسيە دێتە جێ[3]، هاوەڵەكانيشم پارێزەرن بۆ ئوممەتەكەم، ئەگەر ئەوان نەمان ئەو هەڕەشەی لەئوممەتەكەم كراوە دێتە جێ.**[4]

(الروض ٨٧٥)

٤١٣٦- لا تسبوا أصحابي فوالذي نفسي بيده لو أن أحدكم أنفق مثل أحد ذهبا ما بلغ مد أحدهم و لا نصيفه

( صحيح ) ( حم ق د ت ) عن أبي سعيد ( م هـ ) عن أبي هريرة

**٤١٣٦- جنێو بەهاوەڵانم مەدەن سوێند بەوەی گيانی منی بەدەستە، ئەگەر يەكێكتان ئەوەندەی كێوی ئوحود ئاڵتوون ببەخشن ئەوەندەی مشتێك يان نيوەی مشتی ئەوانتان دەست ناكەوێت.**

(السنة ٩٨٨)

---

[1] ( مەناوی دەڵێت: ڕزگار بوو ئەو كەسەيە دەست بگرێت بە ڕێنمونی ئەوانەوە، شوێن پێيان هەڵبگرێت لەبنچينەو لقەكاندا )

[2] ( واتە : هۆكارن بۆ ئاسايش و هێمنی ئاسمان، تاكو ئەستێرەكان مابێتن شەق نابێت و خەڵكەكەی نامرن )

[3] ( وەكو ئاژاوەو جەنگ )

[4] ( وەكو دەركەتنی بيدعە و زاڵبوونی ئارەزوو و جياوازی بيرو باوەڕ)

٤١٣٧- لا تمس النار مسلما رآني أو رأى من رآني

( حسن ) ( ت الضياء ) عن جابر

**٤١٣٧- ئاگر كەسێك ناگرێتەوە منی[1] بینیبێت، یان كەسێكی بینیبێت لەوانەی منیان بینیە.**

**(المشكاة ٦٠٠٤)**

٤١٣٨- يأتي على الناس زمان يغزو فئام من الناس فيقال: فيكم من صاحب الرسول ؟ فيقولون: نعم فيفتح لهم ثم يأتي على الناس زمان فيغزوا فئام من الناس فيقال لهم: هل فيكم من صاحب أصحاب الرسول ؟ فيقولون: نعم فيفتح لهم ثم يأتي على الناس زمان فيغزو فئام من الناس فيقال لهم: هل فيكم من صاحب من صاحب أصحاب الرسول؟ فيقولون:نعم فيفتح لهم

( صحيح ) ( حم ق ) عن أبي سعيد

**٤١٣٨- سەردەمێك دێت بە سەر خەڵكیدا، كۆمەڵێكیان غەزا دەكەن، پێیان دەوترێت: هاوەڵانی پێغەمبەرتان تیایە؟ دەڵێن: بەڵێ، ئیتر سەردەكەون، ئینجا سەردەمێك دێت بە سەر خەڵكیدا، كۆمەڵێكیان غەزا دەكەن، پێیان دەوترێت: هاوەڵانی هاوەڵانی پێغەمبەرتان لەگەڵدایە؟ دەڵێن: بەڵێ، ئیتر سەردەكەون، ئینجا سەردەمێك دێت بە سەر خەڵكیدا، كۆمەڵێكیان غەزا دەكەن، پێیان دەوترێت: هاوەڵنی هاوەڵی هاوەڵانی پێغەمبەرتان تێدایە؟ دەڵێن: بەڵێ، ئیتر سەردەكەون.**

**(المشكاة ٦٠٠٠)**

٤١٣٩- أما إنه لا يدرك قوم بعدكم صاعكم و لا مدكم

( صحيح ) ( ك ) عن أبي سعيد .

**٤١٣٩- كەسانێك دوای ئێوە دێن (صاع) و (مد)[2] یان ناگاتە كێشانەو پێوانەی ئێوە.**

**(الصحيحه ١٥٤٧)**

٤١٤٠- إن بحسبكم القتل

( صحيح ) ( د ) عن سعيد بن زيد .

---

**[1] ( واتە :بەزۆری –واتە زۆر كەم لەوانەی منیان بینیوە مسوڵمان بوون دەچنە ئاگرەوە چونكە كەسی وا هەیە دواتر پاشگەز بۆتەوە )**

**[2] ( دوو ئەندازەن بە پێوانە )**

**٤١٤٠- بەراستی کوژرانتان بەستانە.**

**(الصحيحه ١٣٤٦)**

٤١٤١- أرأيتكم ليلتكم هذه ؟ فإن على رأس مئة سنة منها لا يبقى من هو على ظهر الأرض أحدا

( صحيح ) ( حم ق د ت ) عن ابن عمر .

**٤١٤١- ئاگادارتان بکەم ئەمە کام شەوەیە؟ بێگومان لە پاش سەد ساڵ یەك کەس لەوانەی ئێستا لەسەر زەوین نامێنن.**

**(صحيح ابي داود ٤٣٤٨)**

٤١٤٢- ما على الأرض نفس منفوسة - يعني اليوم - يأتي عليها مائة سنة

( صحيح ) ( ت ) عن جابر

**٣١٤٢- ئەمڕۆ هیچ کەسێك نییە لەژیاندا بێت، واتە: لە رۆژێکی وەکو ئەمڕۆدا دوای سەد ساڵ.**

**(صيحيح ابی داود ٤٣٤٨)**

٤١٤٣- ما من نفس منفوسة اليوم يأتي عليها مائة سنة و هي يومئذ حية

( صحيح ) ( حم ق ت ) عن جابر

**٤١٤٣- لە رۆژێکی وەك ئەمڕۆدا هیچ کەسێك نییە لەژیاندا بێت، دوای سەد ساڵ.**

**(المشكاة ٥٥١٠)**

٤١٤٤- لا تأتي مائة سنة و على الأرض نفس منفوسة اليوم

( صحيح ) ( م ) عن أبي سعيد

**٤١٤٤- سەد ساڵ تێپەڕ نابێت وکەسێك لەوانەی ئەمڕۆ لەسەر گۆی زەوین زیندوو بێت.**

**(المشكاة ٥٥١١)**

# بابەتی پلەو پایەی بەشداربووانی بەدر

٤١٤٥- إن الله تعالى اطلع على أهل بدر فقال: اعملوا ما شئتم فقد غفرت لكم

( صحيح ) ( ك ) عن أبي هريرة .

**٤١٤٥- خوای گەورە تەماشای خەڵکی بەدری کرد[1]، فەرمووی: ئەوەی ئەتانەوێت ئەنجامی بدەن چونکە من لەگوناهەنتان خۆش بووم.[2]**

(الارواء ١٤٠١)

٤١٤٦- إني لأرجو أن لا يدخل النار أحد إن شاء الله ممن شهد بدرا و الحديبية

( صحيح ) ( حم هـ ) عن حفصة .

**٤١٤٦- ئومێدەوارم کەسێك لەوانەی بەشداری بەدر و حودەیبیەیان کردووە نەچنە دۆزەخەوە.**

(ظلال الجنة ٨٦٠)

٤١٤٧- جاء جبريل فقال: ما تعدون من شهد بدرا فيكم ؟ قلت: خيارنا قال و كذلك من شهد بدرا من الملائكة هم عندنا خيار الملائكة

( صحيح ) ( حم خ هـ ) عن رفاعة بن رافع الزرقي ( حم هـ حب ) عن رافع بن خديج .

**٤١٤٧- جیبریل هات فەرمووی: ئەو کەسانەی بەشداری بەدریان کردووە چۆنیان دادەنێن؟ وتمان: لەچاکەکانمانن. وتی هەروەها ئەوانەش لەئێمەش ئەو فریشتانەی بەشداری بەدریان کردووە لەفریشتەهەڵبژێردراوەکانن.**

(صيحيح ابن ماجه ٢٣٢)

٤١٤٨- لن يدخل النار رجل شهد بدرا و الحديبية

( صحيح ) ( حم ) عن جابر

**٤١٤٨- هەرگیز پیاوێك ئامادەی بەدرو حودەیبیە بوو بێتناچێتە دۆزەخ.[3]**

(الصحيحه ٢١٦٠)

---

[1] ( ئەوانەی ئامادەی جەنگی بەدر بوون لەگەڵ پێغەمبەر (ﷺ) ، سێ سەد و چواردە کەس بوون )

[2] ( رواه احمد )

[3] ( (ابن حجر) دەڵێت: ئەمە مژدەیەکی گەورەیە بەکەسی تر نەدراوەجگە لەوان )

٤١٤٩- و ما يدريك ؟ لعل الله قد اطلع على أهل بدر فقال: اعملوا ما شئتم فقد غفرت لكم.

( صحيح ) ( حم ق د ت ) عن علي ( د ) عن أبي هريرة ( حم ) عن ابن عباس وعن جابر.

**٤١٤٩- تــۆ چــوزانی؟ لەوانەیــە خــوای گــەورە تەماشــای خــەڵکی بــەدری کــرد بێــت و فەرمووبێتی: هەرچی ئەکەن بیکەن بە ڕاستی لێتان خۆش بووم.**

(المشكاة ٦٢١٦)

## بابەتی پلەوپایەی ئامادەبوانی بەیعەتی (رضوان) پەیمانی ڕەزامەندی

٤١٥٠- لن يلج النار أحد شهد بدرا أو بيعة الرضوان

( صحيح ) ( البغوي ابن قانع ) عن سعد مولى حاطب بن أبي بلتعة

**٤١٥٠- هەرگیز ناچێتە ئاگرەوە کەسێك ئامادەی بەدرو بەیعەتی (ڕچوان) بووبێت.**

(الصحيحه ٢١٦٠)

٤١٥١- من يصعد الثنية ثنية المرار فإنه يحط عنه ما حط عن بني إسرائيل

( صحيح ) ( م ) عن جابر

**٤١٥١- هەر کەسێك سەرکەوێتە سەر (پنیە المرار)هەورازی حودەیبیە، ئەوەی لەسەر بەنی ئیسرائیل لابرا لەسەر ئەویش لا دەبرێت.**[1]

(المشكاة ٦٢٢٠)

٤١٥٢- لا يدخل النار أحد ممن بايع تحت الشجرة

( صحيح ) ( حم د ت ) عن جابر ( م ) عن أم مبشر

**٤١٥٢- هەرکەسێك لەژێر دارەکەدا پەیمانی دابێت ناچێتە ئاگرەوە.**

(الصحيحه ٢١٦٠)

---

[1] ( گوناهو تاوانی لەسەر لا دەچێت هەروەکو گوناهو تاوان و خەشمی خوا لەسەر بەنی ئیسرائیل لاچوو )

# بابەتی پلەوپایەی ئەنصارەکان

٤١٥٣- إن الناس يهاجرون إليكم و لا تهاجرون إليهم و الذي نفسي بيده لا يحب الأنصار رجل حتى يلقى الله إلا لقي الله و هو يحبه و لا يبغض الأنصار رجل حتى يلقى الله إلا لقي الله و هو يبغضه.

( حسن ) ( حم طب ) عن الحارث بن زياد الأنصاري .

**٤١٥٣- خەڵكی كۆچ دەكەن بۆ لای ئێوەو، ئێوە كۆچ ناكەن بۆ لایان، سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە، هیچ كەسێكیش ( ئەنصار ) یاریدەدەرەكان خۆش ناوێت تا كە بگاتە خوای گەورە و ئەوی خۆشی نەوێت، هیچ كەسێكیش ڕقی لە( ئەنصار )یاریدەدەرەكان نابێتەوە كە كە گەیشتە خوای گەورە ڕقی لێی نەبێتەوە.**

**(الصحيحه ١٦٧٢)**

٤١٥٤- آية الإيمان حب الأنصار و آية النفاق بغض الأنصار.

( صحيح ) ( حم ق ن ) عن أنس

**٤١٥٤- نیشانەی باوەر خۆشەویستی ( ئەنصارەكان )ە یاریدەدەرەكانە[1]و، نیشانەی دووڕویش ڕق لێبوونی یاریدەدەرەكانە.**

**(الصحيحه ٦٦٨)**

٤١٥٥- أحسنوا إلى محسن الأنصار و اعفوا عن مسيئهم.

( صحيح ) ( طب ) عن سهل بن سعد وعبدالله بن جعفر معا .

**٤١٥٥- چاكە بكەن لەگەڵ چاكەكاری یاریدەدەرەكان و لە خرا پەكاریان خۆش بن.[2]**

**(الصحيحه ٩١٣)**

٤١٥٦- استوصوا بالأنصار خيرا.

( صحيح ) ( حم ) عن أنس .

**٤١٥٦- ڕاسپاردەی چاكە بكەن بەئەنصارەكان**

**(الصحيحه ٩١٣)**

---

**[1]( چونكە بەئەمەك بوون بەرانبەر ئەو پەیمانەی دایانە خوای گەورە، لە دالدەدانی پێغەمبەرەكەی و پشتگیری كردنی لەدژ دوژمنەكانی لەكاتی لاوازی وتەنگانەدا و، هەروەها لەبەر چاكی دراوسێتیان و پتەوی )**

**[2]( ئەگەر هەڵەیەكیان كرد، چونكە چاكەی زۆریان هەیە لەسەرخستنی ئاینی ئیسلام )**

٤١٥٧- أما بعد أيها الناس ! فإن الناس يكثرون و يقل الأنصار حتى يكونوا في الناس بمنزلة الملح في الطعام فمن ولي منكم أمرا يضر فيه أحدا و ينفع فيه أحدا فليقبل من محسنهم و يتجاوز عن مسيئهم.

( صحيح ) ( خ ) عن ابن عباس .

**٤١٥٧- پاشان ئەی خەڵكینە! بەراستی خەڵكی زۆر دەبن و، یاریدەدەرەكان كەم دەبنەوە، تاكو وەكو خوێی ناو چێشتیان لێدێت، جا ئەگەر كەسێكتان كارێكتان گرتە كە زیانی بۆ كەسێك یان سودی بۆ كەسێك تیابوو، با لە چاكە كاریان وەربگرێت و، لەخرا پەكاریان چاو پۆشی بكات.**

**(الصحيحە ٣٤٣٠)**

٤١٥٨- إن الأنصار قد قضوا الذي عليهم و بقي الذي عليكم فاقبلوا من محسنهم و تجاوزوا عن مسيئهم.

( صحيح ) ( الشافعي هق في المعرفة ) عن أنس .

**٤١٥٨- بەراستی ئەنصارەكان ئەوەی لەسەریان بوو كردیان، ماوەتەوە ئێوە ئەوەی لەسەرتانە بیكەن، لەچاكەكاریان وەربگرن و، لەخرا پەكاریان چاوپۆشی بكەن.**

**(الصحيحە ٩١٣)**

٤١٥٩- إن قريشا حديثو عهد بجاهلية و مصيبة و إني أردت أن أحبوهم و أتألفهم أما ترضون أن يرجع الناس بالدنيا و ترجعون برسول الله إلى بيوتكم ؟ لو سلك الناس واديا أو شعبا لسلكت وادي الأنصار و شعبهم.

( صحيح ) ( ت ) عن أنس .

**٤١٥٩- قورەیش تازە دەرچوون لەنەفامی و كارەسات، منیش ویستم خۆشەویستیان پێ بدەم و دڵیان هۆگربكەم، ئایا رازی نابن بەوەی خەڵكی بەماڵی دونیاوە بگەڕێنەوە، ئێوەیش بە پێغەمبەری خواوە بگەڕێتەوە بۆ ماڵەكانتان، ئەگەر خەڵكی شیوێك یان دۆڵێك بگرنەبەر ، بەراستی من شیوو دۆڵی یاریدەدەرەكان دەگرمەبەر.**

**(الصحيحە ٣٥٩٠)**

٤١٦٠- أوصيكم بالأنصار فإنهم كرشي[1] و عيبتي و قد قضوا الذي عليهم و بقي الذي لهم فاقبلوا من محسنهم و تجاوزوا عن مسيئهم.

( صحيح ) ( خ ) عن أنس .

---

**[1] (واتە :دارو دەستە-دەست و پێوەند و كارگێر و كەسە تايبەتیەكانی قاموسی رستە ج٤ ص٢٢٥٧ )**

**٤١٦٠- ڕاسپاردەتان پێ دەدەم دەربارەی یاریدەدەرەکان چونکە کۆمەڵ و پێری تایبەتی منن، ئەوەی لەسەریان بوو کردیان، ماوەتەوە ئەوەی مافی خۆیانە بیاندرێتی، چاکە کاریان وەربگرن و چاوپۆشی لەخراپەکاریان بکەن.** (الصحیحە ٣٦٠٦)

٤١٦١- ألا أخبركم بخير دور الأنصار ؟ دار بني النجار ثم دار بني عبد الأشهل ثم دار بني الحارث ثم الخزرج ثم دار بني ساعدة و في كل دور الأنصار خير.

( صحيح ) ( حم ق ت ن ) عن أنس ( حم ق ن ) عن أبي أسيد الساعدي ( حم ق ) عن أبي حميد الساعدي ( حم م ) عن أبي هريرة .

**٤١٦١- ئایا ئاگادارتان بکەمەوە لەچاکترین ماڵی یاریدەدەرەکان؟ ماڵی بەنی نەجار، ئینجا ماڵی عەبدولئەشهەل، ئینجا ماڵی (بنو الحارث)، ئینجا خەزرەج، ئینجا ماڵی بەنی ساعیدە، هەموو ماڵی یاریدەدەرەکان هەر چاکن.**

(الصحیحە ٣٤٥٩)

٤١٦٢- الأنصار شعار و الناس دثار و لو أن الناس استقبلوا واديا أو شعبا و استقبلت الأنصار واديا لسلكت وادي الأنصار و لو لا الهجرة لكنت امرءا من الأنصار

( صحيح ) ( هـ ) عن سهل بن سعد .

**٤١٦٢- یاریدەدەرەکان کەسە تایبەتەکانی منن و خەڵکی تر وەکو ئەوان نین، ئەگەریش خەڵکی ڕوویان کردە شیوو دۆڵێك و یاریدەدەرەکانیش ڕوویان کردە دۆڵێك، من دۆڵی یاریدەدەرەکان دەگرم، ئەگەر کۆچیش نەبوایە من یەکێ دەبووم لە یاریدەدەرەکان.**

(الصحیحە ١٧٩٨)

٤١٦٣- الأنصار كرشي و عيبتي و إن الناس سيكثرون و هم يقلون فاقبلوا من محسنهم و تجاوزوا عن مسيئهم

( صحيح ) ( ن ) عن أسيد بن حضير ( ق ت ن ) عن أنس .

**٤١٦٣- یاریدەدەرەکان دەست و دایەرەو خەڵکی تایبەتی منن، خەڵکی زۆر دەبن و ئەوان کەم دەکەن، لەچاکەکاریان وەربگرن و، چاوپۆشی لەخراپەکاریان بکەن.**

(الصحیحە ٣٦٠٦)

٤١٦٤- حب الأنصار آية الإيمان و بغض الأنصار آية المنافق

( صحيح ) ( ن ) عن أنس .

**٤١٦٤- خۆشەویستی یاریدەدەرەکان نیشانەی ئیمانە و، ڕق لێبوونیشیان نیشانەی دوو ڕوویيە.**

(صحيح النسائى ٥٠١٩)

٤١٦٥- خير ديار الأنصار بنو النجار

( صحيح ) ( ت ) عن جابر .

**٤١٦٥- چاکترین ماڵی یاریدەدەرەکان[1]- ( بنو النجار)ن.**

(صحيح النسائى ٣٩١٢)

٤١٦٦- خير ديار الأنصار بنو عبد الأشهل

( صحيح ) ( ت ) عن جابر .

**٤١٦٦- چاکترین ماڵی یاریدەدەرەکان نەوەی ( عبدالاشهل )ن.**

(صحيح النسائى ٣٩١٣)

٤١٦٧- يا معشر الأنصار ! ألم أجدكم ضلالا فهداكم الله بي و كنتم متفرقين فألفكم الله بي و كنتم عالة فأغناكم الله بي ؟ أما ترضون أن يذهب الناس بالشاة و البعير و تذهبون بالنبي إلى رحالكم ؟ لولا الهجرة لكنت امرءا من الأنصار و لو سلك الناس واديا و شعبا لسلكت وادي الأنصار و شعبها الأنصار شعار و الناس دثار إنكم ستلقون بعدي أثرة فاصبروا حتى تلقوني على الحوض

( صحيح ) ( حم ق ) عن عبدالله بن زيد بن عاصم

**٤١٦٧- ئەی کۆمەڵی یاریدەدەرەکان! ئایا ئێوە گومڕانەبوون خوای گەورە بەهۆی منەوە ڕێنوێنی کردن، پەرتەوازە نەبوون ، بەهۆی منەوە هۆگری یەکی کردن، هەژار نەبوون بەبۆنەی منەوە دەوڵەمەندی کردن؟ ئایا رازی نابن خەڵکی بە بزن و مەڕو وشترەوە بگەڕێنەوە، ئێوەیش بە پێغەمبەری خواوە بگەڕێنەوە بۆ ماڵەکانتان؟ ئەگەر کۆچکردن نەبوایە منیش یەکێك دەبووم لە یاریدەدەرەکان ، ئەگەر خەڵکی شیوو دۆڵێك بگرنەبەر، من دۆڵو ڕێگەی یاریدەدەرەکان دەگرمەبەر، یاریدەدەرەکان کەسی تایبەتی منن[2] و خەڵکی پۆشاکن بەگشتی، ئێوە لەدوای من ڕوویەڕووی خۆ ویستی دەبنەوە، بۆیە ئارام بگرن تاکو چاوتان بەمن دەکەوێت لەسەر حەوزەکە.**

(الصحيحه ١٧٦٨)

---

[1] ( واتە : چاکترین هۆزو تیرەکانیان )

[2] ( شعار:واتە : جلی ژێرەوە کە یەکەم جار لەشی دادەپۆشن و دەیپارێزن و هەرگیز لێیان بێ نیاز نابێ.
دپار:واتە :جلی سەرەە ئەوانەی کە زۆر پێویست نەبوو دادەنرێت )

٤١٦٨- يا معشر الأنصار ! ما حديث أتاني عنكم ؟ ألا ترضون أن يذهب الناس بالأموال و تذهبون برسول الله حتى تدخلوه في بيوتكم ؟ لو أخذت الناس شعبا و أخذت الأنصار شعبا أخذت شعب الأنصار.

( صحيح ) ( حم ق ن ) عن أنس.

**٤١٦٨- ئەی کۆمەڵانی یاریدەدەرەکان ، ئەو قسانەتان چی یە چین پێم گەیشتوونەوە؟ ئایا ڕازی نابن خەڵکی بەماڵ و سامان بگەڕێتەوەو، ئێوە بە پێغەمبەری خواوە بگەڕێنەوە بۆماڵەکانی خۆتان؟ ئەگەر خەڵکی ڕێگەیەك بگرنە بەرو، یاریدەدەرەکان ڕێگەیەکی تر بگرنە بەرر من ڕێگەی یاریدەدەرەکان دەگرمەبەر.**

(الصحيحه ٣٥٩٠)

٤١٦٩- لكل نبي تركة و ضيعة و إن تركتي و ضيعتي الأنصار فاحفظوني فيهم.

( حسن ) ( طس ) عن أنس.

**٤١٦٩- هەموو پێغەمبەرێك میراتی ماڵ سامانی هەیە، میراتی و سەروەت و سامانی منیش یاریدەدەرەکانن، بۆیە بمپارێزن لەئەواندا.**

٤١٧٠- لولا الهجرة لكنت امرءا من الأنصار و لو سلك الناس واديا أو شعبا لسلكت وادي الأنصار و شعبهم.

( صحيح ) ( ق ) عن أنس ( حم خ ) عن أبي هريرة.

**٤١٧٠- ئەگەر کۆچ کردن نەبوایە من یەکێك دەبووم لە یاریدەدەرەکان ، ئەگەر خەڵکی دوڵ و ڕێگەیەکیان بگرتایەتە بەر من دۆڵ و ڕێگەی یاریدەدەرەکانم دەگرتەبەر.**

(الصحيحه ١٧٦٨)

٤١٧١- لولا الهجرة لكنت امرءا من الأنصار و لو سلك الناس واديا أو شعبا لكنت مع الأنصار.

( صحيح ) ( حم ت ك ) عن أبي

**٤١٧١- ئەگەر کۆچ کردن نەبوایە من یەکێك دەبووم لە یاریدەدەرەکان ، ئەگەر خەڵکی شیوێك یان دۆڵێك بگرنە بەر من لەگەڵ یاریدەدەرەکاندا دەبووم.**

(الصحيحه ١٨٦٨)

٤١٧٢- من أحب الأنصار أحبه الله و من أبغض الأنصار أبغضه الله

( صحيح ) ( حم تخ ) عن معاوية ( هـ حب ) عن البراء.

**٤١٧٢-هەر کەسێك یاریدەدەرەکانی خۆش بوێت خوای گەورە خۆشی دەوێت، هەر کەسێکیش ڕقی لێیان بێت خوای گەورە ڕقی لێی دەبێت.**

**(الصحيحه ٩٩١)**

٤١٧٣- لا يبغض الأنصار رجل يؤمن بالله و اليوم الآخر.

( صحيح ) ( م ) عن أبي هريرة ( حم ت ن ) عن ابن عباس ( حم حب ) عن أبي سعيد.

**٤١٧٣- کەسێك باوەڕی بەخواو ڕۆژی دوایی هەبێت ڕقی لەیاریدەدەرەکان نابێت.**

**(الصحيحه ١٢٣٤)**

٤١٧٤- لايحب الأنصار إلا مؤمن و لا يبغضهم إلا منافق من أحبهم أحبه الله و من أبغضهم أبغضه الله.

( صحيح ) ( حم ق ت ن ) عن البراء.

**٤١٧٤- کەسێك ئیماندار نەبێت یاریدەدەرەکانی خۆش ناوێت، ڕقیشی لێیان نابێت تەنها دوورو نەبێت، ئەوەی خۆشی بوێن خوای گەورەش خۆشی دەوێت، هەر کەسیش ڕقی لێیان بێت خوای گەورە ڕقی لێی دەبێت.**

**(الصحيحه ١٩٧٥٢)**

٤١٧٥- لقد هممت أن لا أقبل هدية إلا من قرشي أو أنصاري أو ثقفي أو دوسي.

( صحيح ) ( ن ) عن أبي هريرة.

**٤١٧٥- خەریك بوو دیاری وەرنەگرم لەکەسێکی قورەیشی یان یاریدەدەر یان سەقیفی یان دەوسی نەبێت(١).**

**(الصحيحه ١٦٨٤)**

## بابەتی پلەوپایەی کۆچکارە هەژارەکان

٤١٧٦- إن للمهاجرين منابر من ذهب يجلسون عليها يوم القيامة قد أمنوا من الفزع

( حسن ) ( البزار ك ) عن أبي سعيد .

**٤١٧٦- کۆچکردووکان مینبەری زێڕینیان هەیە لەڕۆژی قیامەتدا لەسەری دادەنیشن وبێگومان دڵنیا بوون لەڕاچەڵەکاندن.**

**(الصحيحه ٣٥٨٤)**

٤١٧٧- فقراء المهاجرين يدخلون الجنة قبل أغنيائهم بخمسمائة عام.

( صحيح ) ( ت ) عن أبي سعيد

**٤١٧٧-كۆچكردووە هەژارەكان بە پێنج سەد ساڵ پێش دەوڵەمەندەكان دەچنە بەهەشتەوە.**

**(المشكاة ٥٢٤٣)**

٤١٧٨- إن فقراء المهاجرين يسبقون الأغنياء يوم القيامة إلى الجنة بأربعين خريفا

( صحيح ) ( م ) عن ابن عمرو .

**٤١٧٨- بەراستی كۆچكردووە هەژارەكان پێشی دەوڵەمەندەكان دەدەنەوە بەرەو بەهەشت لەرۆژی قیامەتدا بەچل ساڵ.**[1]

**(المشكاة ٥٢٥٨)**

٤١٧٩- حوضي من عدن إلى عمان البلقاء ماؤه أشد بياضا من اللبن و أحلى من العسل و أكوابه عدد نجوم السماء من يشرب منه شربة لم يظمأ بعدها أبدا أول الناس ورودا عليه فقراء المهاجرين الشعث رءوسا الدنس ثيابا الذين لا ينكحون المتنعمات و لا تفتح لهم السدد

( صحيح ) ( ت ك ) عن ثوبان .

**٤١٧٩- حەوزەكەم لەعەدەنەوە بۆ عەممانە، ئاوەكەی لەشیر سپی ترەو، لەهەنگوین شیرینترەو، پەرداخەكانی بەژمارەی ئەستێرەكانی ئاسمانن، هەركەسێك جارێك ئاوی لێ بخواتەوە هەرگیز تینووی نابێتەوە، یەكەمین كەسێكیش دەچنە سەر حەوزەكەم هەژارانی كۆچكردووەكانن ، سەریان ئاڵۆزكاوو، جلو بەرگەكانیان چڵكن وكوڵكن لە دونیا، ئافرەتە خۆشگوزەرانەكان مارە ناكەن و، دەرگاشیان لێ ناكەنەوە.**[2]

**(المشكاة ١٠٨٢)**

## بابەتی پلەوپایەی خەلیفەكانی جێنشین( ڕاشیدین )

٤١٨٠- إن أهل الدرجات العلى يراهم من هو أسفل منهم كما ترون الكوكب الطالع في أفق السماء و إن أبا بكر و عمر منهم و أنعما.

( صحيح ) ( حم ت هـ حب ) عن أبي سعيد( طب ) عن جابر بن سمرة ( ابن عساكر ) عن ابن عمرو وعن أبي هريرة .

---

[1] ( جیاوازی ئەم فەرموودانە ئاماژە دەكات بۆ جیاوازی حاڵی هەژارو دەوڵەمەندەكانیش )

[2] ( چونكە ڕێزیان لێ ناگیردرێت )

**٤١٨٠- خەڵكی پلە بەرزەكان ئەوانی خوارەوەی خۆیان دەیانبینن وەكو چۆن ئێوە هەسارەی هەڵاتوو لەئاسماندا دەبینن، ئەبو بەكرو عومەریش لەوانەن و بەرزتریشن.**

**(الروض النضير ٩٧٠)**

٤١٨١- اقتدوا باللذين من بعدي: أبي بكر و عمر

( صحيح ) ( حم ت هـ ) عن حذيفة .

**٤١٨١- شوێنكەوتووی ئەو دووانەی دوای من بن: ئەبو بەكر و عومەر.**

**(الصحيحە ١٢٣٣)**

٤١٨٢- اقتدوا باللذين من بعدي: أبي بكر و عمر و اهتدوا بهدي عمار و ما حدثكم ابن مسعود فاقبلوه

( صحيح ) ( ع ) عن حذيفة .

**٤١٨٢- شوێنكەوتووی ئەو دووانەی دوای من بن: ئەبو بەكر و عومەر، ڕەچاوی ڕێنوێنی عەممارِیش بكەن و، ئەوەی ئیبنو مەسعود بۆی باسكردن وەریبگرن.**

**(الصحيحە ١٢٣٣)**

٤١٨٣- أبو بكر و عمر: سيدا كهول أهل الجنة من الأولين و الآخرين إلا النبيين و المرسلين

( صحيح ) ( حم ت هـ ) عن علي ( هـ ) عن أبي جحيفة ( ع الضياء في المختارة ) عن أنس ( طص ) عن جابر وعن أبي سعيد .

**٤١٨٣- ئەبو بەكرو عومەر: سەرداری خەڵكی كامڵی بەهەشتن لەسەرەتاكان و دواییەكان، تەنها پێغەمبەران و رەوانەكراوەكان نەبێت.**

**(الصحيحە ٨٢٢)**

٤١٨٤- هذان السمع و البصر - يعني أبا بكر و عمر -

( صحيح ) ( ت ك ) عن عبدالله بن حنطب

**٤١٨٤- ئەو دووانە بیستن و بینایین - واتە: ئەبو بەكر وعومەر- .**

**(الصحيحە ٨١٤)**

٤١٨٥- هذان سيدا كهول أهل الجنة من الأولين و الآخرين إلا النبيين و المرسلين لا تخبرهما يا علي - يعني أبا بكر و عمر -

( صحيح ) ( ت ) عن أنس وعلي

**٤١٨٥- ئەو دووانە سەرداری پیاوانی کاملی بەهەشتن لەسەرەتاکان و دواییینەکان، تەنها پێغەمبەران نەبێت، ئەی عەلی ئاگاداریان مەکەرەوە[1]- واتە: ئەبو بەکرو عومەر-.**

**(الصحيحه ٨٢٢)**

٤١٨٦- القائم بعدي في الجنة و الذي يقوم بعده في الجنة و الثالث و الرابع في الجنة.

( صحيح ) ( ابن عساكر ) عن ابن مسعود.

**٤١٨٦- ڕاگری کار لە پاش خۆم لەبەهەشتدایە[2]، ئەوەشی لەدوای ئەو دێت لەبەهەشتدایە[3]، سێیەم و چوارەمیش لەبەهەشتدایە.[4]**

**(الضعيفة ٢٣١٩)**

٤١٨٧- بينما أنا على بئر أنزع منها إذ جاء أبو بكر و عمر فأخذ أبو بكر الدلو فنزع ذنوبا أو ذنوبين و في نزعه ضعف فغفر الله له ثم أخذها ابن الخطاب من يد أبي بكر فاستحالت في يده غربا فلم أر عبقريا من الناس يفري فريه حتى ضرب الناس بعطن.

( صحيح ) ( حم ق ) عن ابن عمر .

**٤١٨٧- لەکاتێکدا من لەسەر بیرێك بووم ئاوم هەڵدەکێشا ئەبو بەکرو عومەر هاتن، ئەبو بەکر دۆڵچەکەی بردو یەك، دوو دۆڵچە ئاوی پێ هەڵکێشاو، لاوازی تیادا بوو خوای گەورەش لێی خۆش بوو، ئینجا کوڕی خەتاب لەدەستی وەرگرت و،بە دەستیەوە بوو بەدۆڵچەیەکی گەورە، من کەسم نەبینیوە ئەو کارەی عومەر بکات، تاکو خەڵکی وشترەکانیان ئاودا و بردنیەوە بۆ جێگای مۆڵگینەکەیان.[5]**

**(الصحيحه ٣٦١٤)**

---

[1]( واتە: پێش من ئاگاداریان مەکەرەوە، با خۆم یەکەم کەس بم مژدەیان پێ بدەم )

[2]( واتە: خەلیفەی دوای خۆم کەئەبو بەکرە )

[3]( واتە: عومەری کوڕی خەتتاب )

[4]( مەناوی وتوویەتی: لەسەنەدی ئەم فەرموودەیە کەسێك هەیە بەناوی عبدالله بن سلمه بن عبيده )( الذهبي ) وتوویەتی: دارمقوتنی لاوازیکردووە ( وەرگێڕ ) )

[5]( ئەوە هێمایە بۆ فراوان بوون و بلاو بوونەوەی ئیسلام لە سەردەمی جێنشینی عومەردا رزگارکردنی ولاتان و دەسکەوتی زۆر.السراج المنير: ج٢ ص٦٨٣ )

٤١٨٨- بينما أنا نائم رأيتني على قليب عليها دلو فنزعت منها ما شاء الله ثم أخذها ابن أبي قحافة فنزع بها ذنوبا أو ذنوبين و في نزعه ضعف و الله يغفر له ضعفه ثم استحالت غربا فأخذها ابن الخطاب فلم أر عبقريا من الناس ينزع نزع عمر ثم ضرب الناس بعطن.

( صحيح ) ( ق ) عن أبي هريرة .

**٤١٨٨- لە كاتێكدا خەوتبووم خۆمم بینی لەسەر ( بیرێك )چاڵەئاوێكم دۆڵچەیەكی لەسەرە، ئەوەندەی خوای گەورە ویستی ئاوم هەڵكێشا، ئینجا ئیبنو ئەبی قوحافە وەریگرت و دۆڵچەیەك یا دوو دۆڵچەی هەڵێشاو، لەهەڵكێشانەكەیدا لاوازی هەبوو، خوای گەورەیش لێی خۆش دەبێت، ئینجا بوو بە دۆڵچەیەكی گەورە، بۆیە كوڕی خەتتاب وەریگرت، من بلیمەتێكم نەبینیوە لەگەڵ خەڵكی بەوشێوە ئاو هەڵكێشێت، تەنانەت خەڵكی وشترەكانیان ئاوداو، بردیاننەوە بۆ جێگای مۆڵكینیان.**

(المشكاة ٦٠٣١)

٤١٨٩- بينما رجل راكب على بقرة التفتت إليه فقالت: إني لم أخلق لهذا إنما خلقت للحرث فإني أومن بهذا أنا و أبو بكر و عمر و بينما رجل في غنمه إذ عدا الذئب فذهب منها بشاة فطلبه حتى استنقذها منه فقال له الذئب: هنا استنقذتها مني فمن لها يوم السبع يوم لا راعي لها غيري فإني أومن بهذا أنا و أبو بكر و عمر

( صحيح ) ( حم ق ن ) عن أبي هريرة .

**٤١٨٩- لەكاتێكدا پیاوێك سواری مانگایەك بوو، مانگاكە ئاوڕی دایەوە بۆ پیاوەكە و، وتی: من بۆ ئەوە دروست نەكراوم، بەڵكو بۆ جووتكردن دروستكراوم، من باوەڕ بەم قسە دەكەم، من و ئەبو بەكر و عومەریش، لەكاتێكیشدا پیاوێك لەناو مەڕەكانیدا بوو، لەو كاتە گورگێك هات و مەڕێكی برد، پیاوەكەیش دوای كەوت تاكو لێی سەندەوە، گورگە كە وتی: لێرە مەڕەكەت لە دەستم ڕزگار كرد، ئەی لە ڕۆژی ئاشوب درندە ئاسا كە بێ خاوەن دەبێت كێ ڕزگاری دەكات، لەڕۆژێكدا شوانی نییە جگە لە من، من باوەڕم بەم قسە هەیە، من و ئەبو بەكرو عومەریش.**

(الارواء ٥٢٤٣)

٤١٩٠- اثبت أحد ! فإنما عليك نبي و صديق و شهيدان

( صحيح ) ( خ م ت ) عن أنس ( ت ) عن عثمان ( حم ع حب ) عن سهل ابن سعد .

**٤١٩٠- خۆت ڕاگرە ئەی ئوحود! پێغەمبەرێك و ڕاستگۆیەك و، دوو شەهیدت لەسەرە.**

**(الصحيحه ٨٧٥)**

٤١٩١- اثبت حراء ! فإنما عليك نبي أو صديق أو شهيد.

( صحيح ) ( حم د ت هـ ) عن سعيد بن زيد ( حم ) عن أنس وعن بريدة ( طب ) عن ابن عباس.

**٤١٩١- خۆت ڕاگرە ئەی حیرا، پێغەمبەرێکت لەسەرە، یان ڕاستگۆیەك، یان شەهیدێکیش.**

**(الصحيحه ٨٧٥)**

## بابەتی پلە پایەی ئەبو بەکر

٤١٩٢- إن أمن الناس علي في ماله و صحبته أبو بكر و لو كنت متخذا خليلا لاتخذت أبا بكر خليلا و لكن أخوة الإسلام لا يبقين في المسجد خوخة إلا خوخة أبي بكر.

( صحيح ) ( م ت ) عن أبي سعيد .

**٤١٩٢-بەڕاستی ئەوەی لەهەموو کەس زیاتر چاکەی هەبێت لەسەرم بەماڵی و هاوڕێیەتی ئەبو بەکرە، ئەگەر کەسێکیشم بەدۆستی هەرە نزیکم بگرتایە ئەبو بەکرم دەکردە دۆستی خۆم، بەڵام تەنها برایەتی ئیسلام بەسە، با هیچ دەرگایەك لەناو مزگەوتدا نەمێنێتەوە جگە کەلێن و دەرگای ئەبو بەکر.**

**(المشكاة ٦٠١٠)**

٤١٩٣- أبى الله و المؤمنون أن يختلف عليك يا أبا بكر.

( صحيح ) ( حم ) عن عائشة .

**٤١٩٣- خوا و باوەڕداران ڕازی نابن ناکۆکی لەسەر تۆ هەبێت ئەی ئەبو بەکر.**

**(الصحيحه ٦٩٠)**

٤١٩٤- أحب الناس إلي عائشة و من الرجال أبوها.

( صحيح ) ( ق ت ) عن عمرو بن العاص ( ت هـ ) عن أنس .

**٤١٩٤- خۆشەویسترین کەس بەلامەوە عائیشەیە، لە پیاوانیشدا باوکی.**

**(الطحاوية ٥٣٦)**

٤١٩٥- ادعي أبا بكر أباك و أخاك حتى أكتب كتابا فإني أخاف أن يتمنى متمن و يقول قائل: أنا أولى و يأبى الله و المؤمنون إلا أبا بكر

( صحيح ) ( حم م ) عن عائشة .

**٤١٩٥- بانگی باوکت و براکەتم بۆ بکە، تاکو نووسراوێك بنووسم، چونکە دەترسم کەسێك خۆزگە بخوازێت و بڵێت: من لە پێشترم و، خوای گەورە و باوەردارانیش ڕازی نەبن بەئەبو بەکر نەبێت.**

**(الصحيحه ٦٩٠)**

٤١٩٦- أنت عتيق الله من النار - قاله لأبي بكر -.

( صحيح ) ( ت ك ) عن عائشة .

**٤١٩٦- تۆ ڕزگار کراوی خوای لەئاگر – بە ئەبو بەکری فەرموو-.**

**(الصحيحه ١٥٧٤)**

٤١٩٧-إنه ليس من الناس احد أمن علي في نفسه ماله من ابى بكر ابن ابى قحافة و لو كنت متخذا من الناس خليلا لاتخذت أبا بكر خليلا و لكن خلة الإسلام أفضل سدوا عني كل خوخة في هذا المسجد غير خوخة أبي بكر.

( صحيح ) ( حم خ ) عن ابن عباس .

**٤١٩٧- کەس نییە لەنێو خەڵکی ئەوەندەی ئەبو بەکری کوڕی ئەبو قوحافە چاکەی هەبێت لەسەرم بەخۆی و گیان ومالی، ئەگەر کەسێکیشم بکردایە بەدۆستی خۆم ئەبو بەکرم دەکرد، بەڵام خۆشەویستی ئیسلام باشترە، هەموو دەرگاو کەلێنێك لەناو ئەم مزگەوتە کراوەتەوە بیگرن دەرگاو کەلێنی ئەبی بەکر نەبێت.**

**(الضعيفة ٢٠٨٥)**

٤١٩٨- ألا إني أبرأ إلى كل خل من خلته و لو كنت متخذا خليلا لاتخذت أبا بكر خليلا و إن صاحبكم خليل الله.

( صحيح ) ( م ن هـ ) عن ابن مسعود .

**(الصحيحه ٣٥٩٨)**

**٤١٩٨- من واز دەهێنم لەدۆستیی هەموو دۆستێك ، ئەگەر بێت و دۆستێکیشم هەڵبژاردایە ئەبو بەکرم هەڵدەبژارد. ئەو هاوەڵەی ئێوەیش دۆست و خۆشەویستی خوایە.**

٤١٩٩- لقد هممت أن أرسل إلى أبي بكر و أنبه فأعهد أن يقول القائلون أو يتمنى المتمنون ثم قلت: يأبى الله و يدفع المؤمنون

( صحيح ) ( خ ) عن عائشة

**٤١٩٩- خەریك بوو بنێرم بەدوای ئەبی بەكرو كوڕەكەی بۆ ئەوەی ئاگاداری بكەم ڕایسپێرم[1]، نەوەك كەسێك قسەیەك بكات، یان شتێك بە ئاواتی بخوازێت، ئینجا وتم: خوای گەورە ڕازی نابێت و باوەڕدارانیش بەرگری دەكەن.**

**(الصحيحه ٦٩٠)**

٤٢٠٠- لو كنت متخذا من أهل الأرض خليلا لاتخذت ابن أبي قحافة خليلا و لكن صاحبكم خليل الله

( صحيح ) ( م ) عن ابن مسعود

**٤٢٠٠- ئەگەر لەدانیشتوانی سەر زەوی دۆستێكم هەڵبژاردایە، ئەبو بەكری كوڕی قوحافەم هەڵدەبژارد، بەڵام هاوەڵی ئێوە خۆشەویستی خوایە.**

٤٢٠١- لو كنت متخذا من أمتي خليلا دون ربي لاتخذت أبا بكر خليلا و لكن أخي و صاحبي

( صحيح ) ( حم خ ) عن ابن الزبير ( خ ) عن ابن عباس

**٤٢٠١- ئەگەر كەسێكم لەئومەتی خۆم بكردایە بە دۆست جگە لە پەروەردگارم، ئەبو بەكرم دەگرت بەدۆستی خۆم، بەڵام برامەو هاوەڵمە.**

**(فقه السيرة ١٩٣)**

٤٢٠٢- لو كنت متخذا خليلا لاتخذت أبا بكر خليلا و لكنه أخي و صاحبي و قد اتخذ الله صاحبكم خليلا

( صحيح ) ( م ) عن ابن مسعود

**٤٢٠٢- ئەگەر كەسێكم بەدۆستی خۆم بكردایە، ئەبو بەكر دەبوو، بەڵام ئەو براو هاوەڵمە. خوای گەورەیش هاوەڵەكەی ئێوەی كردووە بەخۆشەویستی خۆی.**

**(المشكاة ٦٠١١)**

٤٢٠٣- ما أحد أعظم عندي يدا من أبي بكر واساني بنفسه و ماله و أنكحني ابنته

( حسن ) ( طب ) عن ابن عباس

---

[1] ( واتە: ڕاسپێری بكەم بە خیلافەت بۆ ئەبو بەكر )

**٤٢٠٣- كەس ئەوەندەی ئەبو بەكر چاكەی لەسەرم نییە، پارێزگاریی كردم بەگیان و ماڵی خۆی، كچەكەشی لێ مارەكردم.**

**(الصحيحه ٢٢٤١)**

٤٢٠٤- ما لأحد عندنا يد إلا و قد كافأناه ما خلا أبا بكر فإن له عندنا يدا يكافئه الله بها يوم القيامة و ما نفعني مال أحد قط ما نفعني مال أبي بكر و لو كنت متخذا خليلا لاتخذت أبا بكر خليلا ألا و إن صاحبكم خليل الله

( صحيح ) (ت) عن أبي هريرة

**٤٢٠٤- كەس چاكەيەكی لەگەڵ نەكردووين و حەقمان بۆ نەكردبێتەوە، تەنها ئەبو بەكر نەبێت، چاكەی ئەو خوای گەورە خۆی پاداشتی دەداتەوە، ماڵی هيچ كەسێكيش بەكەڵكم نەهاتووە ئەوەندەی ماڵی ئەبو بەكر بەكەڵكم هاتووە، ئەگەر بێت كەسێكيشم بكردايە بەدۆستی خۆم ئەبو بەكرم دەكردە دۆستی خۆم، بەلام هاوەڵی ئێوە خۆشەويستی خوايە.**

٤٢٠٥- ما نفعني مال قط ما نفعني مال أبي بكر

( صحيح ) ( حم هـ ) عن أبي هريرة

**٤٢٠٥- ماڵی هيچ كەسێك ئەوەندەی ماڵی ئەبو بەكر بەكەڵكم نەهاتووە.**

**(الصحيحه ٣١٤٤)**

٤٢٠٦- مروا أبا بكر فليصل بالناس

( صحيح ) ( حم ق ت هـ ) عن عائشة ( ق ) عن أبي موسى ( خ ) عن ابن عمر ( هـ ) عن ابن عباس وسالم بن عبيد

**٤٢٠٦- فەرمان بكەن بە ئەبو بەكر با پێشنوێژيی بكات بۆ خەڵكی.**[1]

**(الارواء ٥٤١)**

---

[1] ( لەكاتی سەخت بوونی نەخۆشييەكەيدا ئەمەی فەرموو )

# بابەتی پلەوپایەی عومەری کوڕی خەتتاب

٤٢٠٧- البس جديدا و عش حميدا و مت شهيدا و يرزقك الله قرة عين في الدنيا و الآخرة -قاله لعمر بن الخطاب-

( صحيح ) ( حم هـ ) عن ابن عمر .

**٤٢٠٧- هەر جلی تازە لەبەربکەیت، هەر ژیانیشت لەسوپاسکردنی خوا بەسەربەریت، بەشەهیدی بمریت، خوای گەورەش فێنکی چاوت پێ دەبەخشێت و دڵت خۆش دەکات لەدونیاو دوارۆژدا، -بەعومەری کوڕی خەتتابی فەرموو-.**

٤٢٠٨- إن الشيطان ليفرق منك يا عمر

( صحيح ) ( حم ت حب ) عن بريدة .

**٤٢٠٨- شەیتان لێت دەسڵەمێتەوە ئەی عومەر.**

**(الصحيحه ١٦٠٩)**

٤٢٠٩- إن الله جعل الحق على لسان عمر و قلبه

( صحيح ) ( حم ت ) عن ابن عمر ( حم د ك ) عن أبي ذر ( ع ك ) عن أبي هريرة ( طب ) عن بلال وعن معاوية

**٤٢٠٩- خوای گەورە هەقی خستووەتە سەر زمان و دڵی عومەر.**

**(المشكاة ٦٠٤٢)**

٤٢١٠- إن الله وضع الحق على لسان عمر يقول به

( صحيح ) ( هـ ) عن أبي ذر .

**٤٢١٠- خوای گەورە هەقی خستووەتە سەر زمانی عومەرو قسەی پێ دەکات.**

**(المشكاة ٦٠٤٣)**

٤٢١١- إني لأنظر إلى شياطين الجن و الإنس قد فروا من عمر

( صحيح ) ( ت ) عن عائشة .

**٤٢١١- من تەماشای شەیتانەکانی جنۆکەو ئادەمیزاد دەکەم لەعومەر هەڵدێن.**

**(المشكاة ٦٠٤٩)**

٤٢١٢- إيه يا ابن الخطاب ! و الذي نفسي بيده ما لقيك الشيطان قط سالكا فجا إلا سلك فجا غير فجك

( صحيح ) ( ق ) عن سعد .

**٤٢١٢- ئێی کوڕی خەتتاب! سوێند بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە، هەرگیز شەیتان تۆ نابینێت ڕێگەیەکت گرد بێت ئەویش ڕێگەیەکی تر نەگرێتە بەر.**

(الصحيحه ٣٦٠٣)

٤٢١٣- بينا أنا نائم إذ أتيت بقدح لبن فشربت منه حتى لأرى الري يجري في أظفاري ثم أعطيت فضلي عمر بن الخطاب قالوا: فما أولته يا رسول الله ؟ قال: العلم

( صحيح ) ( حم ق ت ) عن ابن عمر .

**٤٢١٣- لەكاتێكدا من خەوتبووم پەرداخێك شیریان بۆ هێنام و لێم خواردەوە، تاكو بینیم لەنینۆكەكا نمەوە دەتكا، ئینجا پاشماوەكەم دایە عومەری كوڕی خەتتاب، وتیان: ئەو خەونەت چۆن لێكدایەوە؟ وتی: زانستە.**

(صحيح الترمذي ٢٢٨٤)

٤٢١٤- بينا أنا نائم رأيت الناس يعرضون علي و عليهم قمص منها ما يبلغ الثدي و منها ما يبلغ أسفل من ذلك و عرض علي عمر بن الخطاب و عليه قميص يجره قالوا: فما أولته يا رسول الله ؟ قال: الدين

( صحيح ) ( حم ق ت ن ) عن أبي سعيد .

**٤٢١٤- لەخەونمدا بینیم خەڵكم پیشان دەدرا و كراسیان لەبەردا بوو، هەندێكیان تاسەر سنگیان بوو، هەندێكیان شۆڕتر بوون، عومەری كوڕی خەتتابیشم پێ پیشاندرا كراسەكەی دووی دەخشا، وتیان: ئەو خەونەت بەچی لێكدایەوەئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی: ئایین پەروەریی.**

(الصحيحه ٣٦١٢)

٤٢١٥- بينا أنا نائم رأيتني في الجنة فإذا أنا بامرأة تتوضأ إلى جانب قصر فقلت: لمن هذا القصر ؟ قالوا: لعمر بن الخطاب فذكرت غيرتك فوليت مدبرا

( صحيح ) ( ق هـ ) عن أبي هريرة .

**٤٢١٥- لەخەونمـدا بینـیم لەبەهەشـتدام و، بینـیم ئافـرەتێك دەسـت نوێـژ دەگرێـت لەتەنیـشت تەلارێکـدا، وتم: ئـەوە تـەلاری کـێ یـە؟ وتیـان تـەلاری عومـەری کـوڕی خەتتـابە، منیش غیرەتی تۆم بیرکەوتەوەو، لەو جێگایە روم وەرگێرا و دوورکەوتمەوە.**

(ظلال الجنة ١٢٧٠)

٤٢١٦- دخلت الجنة فإذا أنا بقصر من ذهب فقلت: لمن هذا القصر ؟ قـالوا: لـشاب مـن قـريش فظننت أني أنا هو فقلت: و من هو ؟ قالوا: عمر بن الخطاب فلولا ما علمت من غيرتك لدخلته

( صحيح ) ( حم ت حب ) عن أنس ( حم ق ) عن جابر ( حم ) عن بريدة ومعاذ .

**٤٢١٦- چوومە بەهەشتەوەو، کۆشکێکی زێڕینم بینی، وتم: ئەوە کۆشکی کێیـە؟ وتیـان: کۆشکی لاوێکە لەقورەیش، گومانم برد من ئەو کەسە بم، وتم: ئەو لاوە کێیـە؟ وتیـان: عومەری کوڕی خەتتـابە، ئەگەر شارەزای غیرەتی تۆ نەبوایەم دەچوومە ناو کۆشکەکەوە.**

(الصحیحە ١٤٠٥)

٤٢١٧- رأيت شياطين الإنس و الجن فروا من عمر.

( حسن ) ( عد ) عن عائشة.

**٤٢١٧- من بینیم شەیتانەکانی ئادەمیزاد و جنۆکە هەڵدێن لەعومەر.**

(اداب الزفاف ٢٠٢)

٤٢١٨- قد كان فيما مضى قبلكم من الأمم أناس محدثون فـإن يـك في أمـتي أحـد مـنهم فهـو عمر بن الخطاب.

( صحيح ) ( حم خ ) عن أبي هريرة ( حم م ت ن ) عن عائشة.

**٤١١٨- لەئومەتانی پێش خۆتـان کەسانێك بـوون خـوا شـتی دەخـستە دڵیانـەوە[1]، ئەگـەر کەسێکی لەو جۆرە هەبێت لەئوممەتی من عومەری کوڕی خەتتابە.**

(المشکاة ٦٠٢٦)

٤٢١٩- لو كان بعدي نبي لكان عمر بن الخطاب.

( حسن ) ( حم ت ك ) عن عقبة بن عامر ( طب ) عن عصمة بن مالك.

**٤٢١٩- ئەگەر پاش من پێغەمبەرێك هەبوایە عومەری کوڕی خەتتـاب دەبوو.**

(الصحیحە ٣٢٧)

---

[1] واتە :وەکو کەرامەت و رێزو بەرچاوو روونی بەهۆی ئیمان و دلسۆز بەوە بۆ خوا... وەرگێر)

## بابەتی پلەوپایەی عوسمانی کوڕی عەففان

٤٢٢٠- أشد امتي حياء:عثمان بن عفان.

( صحيح ) ( حل ) عن أبي عمر.

**٤٢٢٠- بەشەرمترین کەس لەم ئوممەتم: عوسمانی کوڕی عەففانە.**

(الصحيحه ١٢٢٤)

٤٢٢١- إن أشد هذه الأمة بعد نبيها حياء: عثمان.

( صحيح ) ( أبو نعيم في فضائل الصحابة ) عن أبي أمامة .

**٤٢٢١- بەشەرمترین کەسی ئەم ئوممەتە پاش پێغەمبەرەکەی: عوسمانە.**

٤٢٢٢- إن عثمان حيي ستير تستحي منه الملائكة.

( صحيح ) ( ع ) عن عائشة .

**٤٢٢٢- بەڕاستی عوسمان بەشەرم و نهێنی پۆشە[1]، فریشتەکان شەرمی لێ دەکەن.**

(الصحيحه ١٦٨٧)

٤٢٢٣- إن عثمان رجل حيي و إني خشيت إن أذنت له و أنا على تلك الحال أن لا يبلغ إلي في حاجته.

( صحيح ) ( حم م ) عن عائشة .

**٤٢٢٣- عوسمان پیاوێکی بەشەرمە، ئینجا منیش ترسام ئەگەر لەوحاڵەتەدا مۆڵەتی بدەم پێویستیی خۆیم بۆ باس نەکات.**

(الصحيحه ١٦٨٧)

٤٢٢٤- ألا أستحي من رجل تستحي منه الملائكة ؟ - يعني عثمان -

( صحيح ) ( حم م ) عن عائشة .

**٤٢٢٤- ئایا شەرم نەکەم لە پیاوێك فریشتەکان شەرمی لێ دەکەن- واتە: عوسمان-.**

(الصحيحه ١٦٨٧)

٤٢٢٥- الحياء من الإيمان و أحيى أمتي عثمان.

( صحيح ) ( ابن عساكر ) عن أبي هريرة .

---

[1] ( السِّتِّير:نهێنی پۆش-داوێن پاك.قاموسی رستە ج٢ ص١١٢٩. )

**٤٢٢٥- شەرم كردن لەباوەڕەوەيە، بەشەرمترين ئوممەتى منيش عوسمانە.**

**(الصحيحه ١٨٢٨)**

٤٢٢٦- عثمان أحيا أمتي ( و أكرمها .

( صحيح ) ( حل ) عن ابن عمر.

**٤٢٢٦- عوسمان بەشەرمترينى ئوممەتمە....( وە بەڕێزترينيانە ).**

**(الصحيحه ١٢٢٤)**

٤٢٢٧- عثمان حيي تستحيي منه الملائكة .

( صحيح ) ( ابن عساكر ) عن أبي هريرة.

**٤٢٢٧- عوسمان شەرمنە و فريشتەكان شەرمى لێدەكەن.**

**(المشكاة ٦٠٦٠)**

٤٢٢٨- عثمان في الجنة

( صحيح ) ( ابن عساكر ) عن جابر

**٤٢٢٨- عوسمان لەبەهەشتدايە.**

**(الصحيحه ١٤٣٥)**

٤٢٢٩- يا عثمان ! إن الله مقمصك قميصا فإن أرادك المنافقون على خلعه فلا تخلعه حتى تلقاني

( صحيح ) ( حم ت هـ ك ) عن عائشة

**٤٢٢٩- ئەى عوسمان! خواى گەورە كراسێكت لەبەر دەكات[1] ئەگەر مونافيقەكان ويستيان دايكەنيت بەقسەيان مەكە تاكو چاوت بەمن دەكەوێتەوە.**

**(المشكاة ٦٠٧٧)**

## بابەتى پلەوپايەى عەلى كوڕى ئەبو تاليب

٤٢٣٠- اجلس يا أبا تراب ! - قاله لعلي -

( صحيح ) ( خ ) عن سهل بن سعد .

**٤٢٣٠- دانيشە ئەى ئەبو توراب[2]! – بە عەلى فەرمو-.**

**(الصحيحه ١٧٤٣)**

---

**[1] مەبەست لە خيلافەتە( جێنشينيە ))**

**[2] ( واتە: ئەى خۆڵاوى )**

٤٢٣١- أنت مني بمنزلة هارون من موسى إلا أنه لا نبي بعدي

( صحيح ) ( م ت ) عن سعد ( ت ) عن جابر .

**٤٢٣١- تۆ بۆ من لە پلەو مانزڵی هاروندای بۆ موسا، بەڵام ئەوەندە هەیە لەدوای من پێغەمبەر نییە.**

**(المشكاة ٦٠٧٨)**

٤٢٣٢- أنت مني و أنا منك - قاله لعلي -

( صحيح ) ( ق ) عن البراء ( ك ) عن علي .

**٤٢٣٢- تۆ لەمنی و من لەتۆم – بە عەلی فەرموو-.**

**(المشكاة ٦٠٨٠)**

٤٢٣٣- إنه لا يحبك إلا مؤمن و لا يبغضك إلا منافق - قاله لعلي -

( صحيح ) ( ت ن هـ ) عن علي .

**٤٢٣٣- بەراستی تۆی خۆش ناوێت باوەردار نەبێت، رِقی لەتۆش نابێت تەنها دووروو نەبێت -بە عەلی فەرموو-.**

**(الصحيحه ١٨٢٠)**

٤٢٣٤- ألا أحدثكم بأشقى الناس رجلين ؟ أحيمر ثمود الذي عقر الناقة و الذي يضربك يا علي على هذه حتى يبل منها هذه

( صحيح ) ( طب ك ) عن عمار بن ياسر .

**٤٢٣٤- ئایا باسی بەدبەخترین کەستان بۆ بکەم؟ دوو پیاون: پیاوە سورەکەی ( ثمود ) کە وشترەکەی کوشت، ئەو کەسەش[1] کە ئالێرەت دەدا[2] ، تاکو ئەوەت تەڕ دەکات.[3]**

**(الصحيحه ١٧٤٣)**

٤٢٣٥- عادى الله من عادى عليا

( صحيح ) ( ابن مندة ) عن رافع مولى عائشة

**٤٢٣٥-دوژمنایەتی خوای کردووە ئەوەی دوژمنایەتی عەلی بکات.**

**(الصحيحه ١٧٥٠)**

---

[1] ( مەبەست لە ( عبدالرحمن بن ملجم المرادى )یە )

[2] ( واتە: سەرت )

[3] ( بەخوێن ڕیشت تەڕ دەکات )

٤٢٣٦- علي بن أبي طالب مولى من كنت مولاه

( صحيح ) ( المحاملي في أماليه ) عن ابن عباس

**٤٢٣٦- عەلی کوڕی ئەبو تالیب سەردار و سەرپەرشتیاری کەسێکە من سەرپەرشتیاری بم.**

**(الصحيحه ٧٥٠)**

٤٢٣٧- علي مني بمنزلة هارون من موسى إلا أنه لا نبي بعدي

( صحيح ) ( أبو بكر المطيري في جزئه ) عن أبي سعيد

**٤٢٣٧- عەلی بۆ من لە پلەو پایەی هاروندایە بۆ موسا، بەڵام ئەوەندە هەیە لەدوای من پێغەمبەر نیە.**

**(المشكاة ٦٠٧٨)**

٤٢٣٨- علي مني و أنا من علي و لا يؤدي عني إلا أنا أو علي .

( حسن ) ( حم ت ن هـ ) عن حبشي بن جنادة.

**٤٢٣٨- عەلی لەمنەو، من لە عەلی م، کەسیش لەجیاتی من مافەکانی ناداتەوە، مەگەر خۆم یان عەلی نەبێت.**

**(المشكاة)**

٤٢٣٩- علي يقضي ديني .

( حسن ) ( البزار ) عن أنس.

**٤٢٣٩- عەلی قەرزی من دەداتەوە.**

**(الصحيحه ١٩٨٠)**

٤٢٤٠- ما تريدون من علي ؟ ما تريدون من علي ؟ ما تريدون من علي ؟ إن عليا مني و أنا منه و هو ولي كل مؤمن بعدي.

( صحيح ) ( ت ك ) عن عمران بن حصين.

**٤٢٤٠- چیتان دەوێت لە عەلی؟ چیتان دەوێت لە عەلی؟چیتان دەوێت لە عەلی؟ عەلی لەمنەو،من لە عەلی م، ئەویش سەرداری هەموو موسوڵمانێکە لەدوای خۆم.**

**(الصحيحه ٢٢٢٣)**

٤٢٤١- من آذى عليا فقد آذاني.

( صحيح ) ( حم تخ ك ) عن عمرو بن شاس.

**٤٢٤١- هەرکەسێك ئازاری عەلی بدات ئازاری منی داوە.**

**(الصحيحه ٢٢٩٥)**

٤٢٤٢- من أحب عليا فقد أحبني و من أبغض عليا فقد أبغضني.

( صحيح ) ( ك ) عن سلمان.

**٤٢٤٢- هەر کەسێك عەلی خۆش بوێت بەراستی منی خۆشویستووە، هەر کەسێکیش یش ڕقی لە عەلی بێت ڕقی لەمنە.**

(الصحيحه ١٢٩٩)

٤٢٤٣- من كنت مولاه فعلي مولاه.

( صحيح ) ( حم هـ ) عن البراء ( حم ) عن بريدة ( ت ن الضياء ) عن زيد بن أرقم.

**٤٢٤٣- هەر کەسێك من سەرداری بم، عەلیش سەرداریەتی.**

(الصحيحه ١٧٥٠)

٤٢٤٤- من كنت وليه فعلي وليه.

( صحيح ) ( حم ن ك ) عن بريدة.

**٤٢٤٤ هەر کەسێك من سەرداری بم، عەلیش سەرداریەتی.**

(الروض ١٧١)

٤٢٤٥- يا علي ! أما ترضى أن تكون مني بمنزلة هارون من موسى ؟ إلا أنه ليس بعدي نبي.

( صحيح ) ( حم ق ت هـ ) عن سعد.

**٤٢٤٥- ئەی عەلی! ئایا ڕازی نابیت تۆ بۆ من، وەکو هارون بیت بۆ موسا؟ بەڵام پێغەمبەر لە پاش من نایەت.**

(الضعيفة ٤٩٣٧)

## بابەتی پلەوپایەی دە کەسە مژدەپێدراوەکان بەبەهەشت

٤٢٤٦- أبو بكر في الجنة و عمر في الجنة و عثمان في الجنة و علي في الجنة و طلحة في الجنة و الزبير في الجنة و عبد الرحمن بن عوف في الجنة و سعد بن أبي وقاص في الجنة و سعيد بن زيد في الجنة و أبو عبيدة بن الجراح في الجنة.

( صحيح ) ( حم الضياء ) عن سعيد بن زيد ( ت ) عن عبدالرحمن بن عوف .

**٤٢٤٦- ئەبو بەکر لەبەهەشتدایە و، عومەر لەبەهەشتدایە و، عوسمان لەبەهەشتدایە و، عەلی لەبەهەشتدایە و، تەڵحە لەبەهەشتدایە و، زوبێر لەبەهەشتدایە و،**

**( عبدالرحمن بن عوف ) لەبەهەشتدایە و، ( سعد بن ابى وقاص ) لەبەهەشتدایە و، سەعیدی کوڕی زەید لەبەهەشتدایە و،ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەڕڕاح لەبەهەشتدایە.**

(المشكاة ٦١٠٩، الطحاوية ٣٨٨)

٤٢٤٧- أرأف أمتي بأمتي أبو بكر و أشدهم في دين الله عمر و أصدقهم حياء عثمان و أقضاهم علي و أفرضهم زيد بن ثابت و أقرؤهم أبي و أعلمهم بالحلال و الحرام معاذ بن جبل ألا و إن لكل أمة أمينا و أمين هذه الأمة أبو عبيدة بن الجراح

( صحيح ) ( ع ) عن ابن عمر .

**٤٢٤٧- بەسۆزترین کەسی ئوممەتم بۆ ئوممەتەکەم ئەبو بەکرە، توندترینیشیان لەسەر ئایینی خوا عومەرە، ڕاستگۆترینیشیان لەشەرمدا عوسمانە و، دادوەرترینیان عەلی یە، شارەزاترینیان لەدابەشکردنی میراتدا ( زید بن ثابت )ە و، قورئان خوێنترینیان ئوبەییە و، شارەزاترینیان لە حەڵاڵ و حەرام ( معاذ بن جبل )، هەموو ئوممەتێکیش ئەمین و دەست پاکێکی هەیە، دەستپاك و ئەمینی ئەم ئوممەتەش ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەڕراحە.**

(الصحيحه ١٢٢٤)

٤٢٤٨- أرحم أمتي بأمتي أبو بكر و أشدهم في أمر الله عمر و أصدقهم حياء عثمان و أقرؤهم لكتاب الله أبي بن كعب و أفرضهم زيد بن ثابت و أعلمهم بالحلال و الحرام معاذ بن جبل و لكل أمة أمين و أمين هذه الأمة أبو عبيدة بن الجراح

( صحيح ) ( حم ت ن هـ حب ك هق ) عن أنس .

**٤٢٤٨- بەسۆزترینی کەسی ئوممەتم بۆئوممەتم ئەبو بەکرە، توندترینیشیان لەسەر فەرمانی خوا عومەرە، ڕاستگۆترینیشیان لەشەرمدا عوسمانە، خوێنەرترینیانیش بۆ کتابی خوا ئوبەی کوڕی کەعبە، شارەزاترینیشیان لەدابەشکردنی میراتی ( زید بن ثابت )ە و، شارەزاترینیان بەحەڵاڵ و حەرام ( معاذ بن جبل )ە، هەموو ئوممەتێکیش ئەمین و دەست پاکێکی هەیە،ئەمین و دەستپاکی ئەم ئوممەتەیش ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەڕڕاحە.**

(الصحيحه ١٢٢٤)

٤٢٤٩- عشرة في الجنة: النبي في الجنة و أبو بكر في الجنة و عمر في الجنة و عثمان في الجنة و علي في الجنة و طلحة في الجنة و الزبير بن العوام في الجنة و سعد بن مالك في الجنة و عبد الرحمن بن عوف في الجنة و سعيد بن زيد في الجنة

( صحيح ) ( حم د هـ الضياء ) عن سعيد بن زيد

**٤٢٤٩- دە کەس لەبەهەشتدان: پێغەمبەر لەبەهەشتدایە، ئەبو بەکر لەبەهەشتدایە، عومەر لەبەهەشتدایە، عوسمان لەبەهەشتدایە، عەلی لەبەهەشتدایە، تەڵحە لەبەهەشتدایە، زوبێری کوڕی عەوام لەبەهەشتدایە، سەعدی کوڕی مالیک لەبەهەشتدایە، عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوف لەبەهەشتدایە، سەعیدی کوڕی زەید لەبەهەشتدایە.**

**(الروض ٤٢٥)**

## بابەتی پلەوپایەی ئەبو عوبەیدە

٤٢٥٠- أمين هذه الأمة أبو عبيدة بن الجراح.

( صحيح ) ( حم ) عن خالد بن الوليد .

**٤٢٥٠- ئەمین و دەست پاکی ئەم ئوممەتە ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەڕڕاحە.**

**(الصحيحە ١٢٢٤)**

٤٢٥١- إن لكل أمة أمينا و إن أمين هذه الأمة أبو عبيدة بن الجراح.

( صحيح ) ( خ ) عن أنس .

**٤٢٥١- هەموو ئوممەتێك دەستپاکێکی هەیە، دەستپاکی ئەم ئوممەتەیش ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەڕڕاحە.**

**(الصحيحە ١٢٣٧)**

٤٢٥٢- إن لكل نبي أمينا و أميني أبو عبيدة بن الجراح.

( صحيح ) ( حم ) عن عمر .

**٤٢٥٢- هەموو پێغەمبەرێك ئەمین و دەستپاکێکی هەیە، ئەمین و دەستپاکی منیش ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەڕڕاحە.**

**(المشكاة ٦١٠٦)**

٤٢٥٣- لكل أمة أمين و أمين أمتي أبو عبيدة بن الجراح

( صحيح ) ( ق ن ) عن أنس

**٤٢٥٣- هەموو ئوممەتێك دەستپاكێكی هەیە، دەستپاكی ئوممەتی منیش ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەڕڕاحە.**

**(المشكاة ٦١٠٦)**

## بابەتی پلەوپایەی تەڵحەی کوڕی عوبەیدوڵلا

٤٢٥٤- أوجب طلحة حين صنع برسول الله صلى الله عليه وسلم ما صنع.

( حسن ) ( حم ت حب ك ) عن الزبير .

**٤٢٥٤- تەڵحە بوو بەشایستەی بەهەشت کاتێك ئەو کارەی لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ کرد.[١]**

**(الصحيحه ٩٤٣)**

٤٢٥٥- طلحة شهيد يمشي على وجه الأرض .

( صحيح ) ( هـ ) عن جابر ( ابن عساكر ) عن أبي هريرة وأبي سعيد.

**٤٢٥٥- تەڵحە شەهیدە، بەسەر زەویدا دەڕوات.**

**(الصحيحه ١٢٥)**

٤٢٥٦- طلحة ممن قضى نحبه .

( صحيح ) ( ت هـ ) عن معاوية ( ابن عساكر ) عن عائشة.

**٤٢٥٦- تەڵحە یەکێکە لەوانەی گرەوی بردەوە بەوەی لە پێناوی خوادا ئەوپەری خۆی ماندوو کرد( خوای گەورە دەربارەیان فەرموویەتی: (( ومنهم من قضى نحبه ))).**

**(الصحيحه ١٢٩٩)**

٤٢٥٧- من أحب أن ينظر إلى شهيد يمشي على وجه الأرض فلينظر إلى طلحة بن عبد الله.

( صحيح ) ( ت ك ) عن جابر.

**٤٢٥٧- هەر کەسێك حەز دەکات تەماشای شەهیدێك بکات کە بەسەر زەویدا دەڕوات با تەماشای تەڵحەی کوڕی عوبەیدوڵلا بکات.**

**(الصحيحه ١٢٥)**

---

[١] پارێزگاریکردن بۆ پێغەمبەر ﷺ و ،دانیشتنی بۆ پێغەمبەر ﷺ تاکو سەرکەوتە سەر پشتی و چووە سەر تاوێرە بەردەکە )

٤٢٥٨- هذا ممن قضى نحبه - يعني طلحة -.

( صحيح ) ( ت ) عن طلحة.

**٤٢٥٨- ئەوە یەکێکە لەوانەی( گرموی بردەوە ) لە پێناو خوادا دەمرن – واتە : تەڵحە-.**

٤٢٥٩- لو قلت بسم الله لرفعتك الملائكة و الناس ينظرون إليك حتى تلج بك في جو السماء.

( صحيح ) ( ن ) عن جابر ( طب ) عن أبي طلحة وأنس.

**٤٢٥٩- ئەگەر بتوتایە بەناوی خوا[1] فریشتەکان بەرزیان دەکردیتەوە و، خەڵکی تەماشاتیان دەکردی تاکو دەیانبردیتە نێو کەشی ئاسمانەوە.**

**(الصحیحە ٢١٧١)**

## بابەتی پلەوپایەی زوبەیری کوڕی عەووام

٤٢٦٠- إن لكل نبي حواريا و إن حواري الزبير.

( صحيح ) ( خ ت ) عن جابر ( ت ك ) عن علي .

**٤٢٦٠- هەموو پێغەمبەرێك وەزیرو یاریدەدەرێکی هەیە، یاریدەدەرو وەزیری منیش زوبەیرە.**

**(الصحیحە ١٨٧٧)**

٤٢٦١- الزبير ابن عمتي و حواريي من أمتي.

( صحيح ) ( حم ) عن جابر

**٤٢٦١- زوبەیر پورزای منە و، یاریدەدەرو پشتیوانمە لەنێو ئوممەتەکەم.**

**(الصحیحە ١٨٧٧)**

## بابەتی پلەوپایەی سەعدی کوڕی ئەبو وەققاص

٤٢٦٢- هذا خالي فليرني امرؤ خاله.

( صحيح ) ( ت ك ) عن جابر.

**٤٢٦٢- ئەوە خاڵۆی منە[2]، جا با کەسێك هەبێت خاڵۆی خۆیم پیشان بدات.**

**(المشکاة ٦١٢٧)**

---

**[1] ( کاتێك لەئوحود درا لەدەستی و پەنجەکانی قرتان )**

**[2] ( واتە : سەعدی کوڕی ئەبو وەققاص )**

٤٢٦٣- يا سعد ! ارم فداك أبي و أمي.

( صحيح ) ( خ ) عن علي.

**٤٢٦٣- ئەی سەعد! تیر بهاوێژە باوك و دایكم بەقوربانت بن.**

(المشكاة ٦١٠٣)

٤٢٦٤- إنك لن تخلف بعدي فتعمل عملا صالحا إلا ازددت به درجة و رفعة ثم لعلك أن تخلف حتى ينتفع بك أقوام و يضر بك آخرون اللهم أمض لأصحابي هجرتهم و لا تردهم على أعقابهم لكن البائس سعد بن خولة.

( صحيح ) ( حم ق د ت ) عن سعد .

**٤٢٦٤- بەراستی هەرگیز تۆ لە پاش من نامێنیتەوەو کردەوەیەکی چاك بکەیت، تاکو پلەو پایەت پێی بەرز نەبێتەوە، لەوانەشە هەندێك کارت پێ بسپێردرێت تاکو کەسانێك سوودمەند بن لێت و، کەسانێکیش زیانت پێ بگەیەنن، خوایە کۆچی هاوەڵانم بژمێرە بۆیان و پاشگەزیان مەکەرەوە جارێکی تر، بەڵام داماو سەعدی کوڕی خەولە بوو.** [1]

## بابەتی پلەو پایەی عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود

٤٢٦٥- إذنك علي أن يرفع الحجاب و أن تستمع لسوادي حتى أنهاك.

( صحيح ) ( حم م هـ ) عن ابن مسعود .

**٤٢٦٥- مۆڵەتت لەسەرمن ئەوەیە پەردە لە نێوا نماندا نەبێت و، گوێ لەنهێنی من بگریت تاکو لێت قەدەغە دەکەم.**

(الصحيحه ١٣٢٧)

٤٢٦٦- اقتدوا باللذين من بعدي من أصحابي: أبي بكر و عمر و اهتدوا بهدي عمار و تمسكوا بعهد ابن مسعود:

( صحيح ) ( ت ) عن ابن مسعود ( الروياني ) عن حذيفة ( عد ) عن أنس .

**٤٢٦٦- شوێنکەوتووی ئەو دوو کەسە بن لەدوای خۆم: ئەبو بەکرو عومەر، بە پێی ڕووناکی ڕێنمونی عەممار بڕۆن، پابەندیش بن بە پە یمانی ئیبنو مەسعودەوە.** [2]

---

[1] ( چونکە لە مەککە مردوو فریای کۆچکردن نەکەوت و پێغەمبەریش ﷺ زۆری خەفەت خوارد )

[2] ( واتە : بەڕاسپاردەکانی ئیبنو مەسعودەوە )

٤٢٦٧- رضيت لأمتي ما رضي لها ابن أم عبد.

( صحيح ) ( ك ) عن ابن مسعود

**٤٢٦٧- ڕازی بووم بەوەی ( ابن ام عبد ) پێی ڕازییە بۆ ئوممەتەکەم.**

**(الصحيحه ١٢٢٥)**

٤٢٦٨- من أحب أن يقرأ القرآن غضا كما أنزل فليقرأ على قراءة ابن أم عبد.

( صحيح ) ( حم هـ ك ) عن أبي بكر وعمر.

**٤٢٦٨- هەرکەسێك حەز دەکات قورئان بخوێنێتەوە وەکو خۆی چۆن دابەزیوە با وەکو خوێندنەوەی ( ابن ام عبد )[1] بیخوێنێتەوە.**

**(الصحيحه ٢٣٠١)**

## بابەتی پلەوپایەی سەلمانی فارسی

٤٢٦٩- إن الجنة لتشتاق إلى ثلاثة: علي و عمار و سلمان.

( حسن ) ( ت ك ) عن أنس .

**٤٢٦٩-بەهەشت ئارەزوومەندی سێ کەسە : عەلی و، عەممار و، سەلمان.**

(المشكاة ٦٢٣٤)

## بابەتی پلەوپایەی فەزلی بیلال

٤٢٧٠- أريت الجنة فرأيت امرأة أبي طلحة ثم سمعت خشخشة أمامي فإذا بلال.

( صحيح ) ( م ) عن جابر .

**٤٢٧٠- بەهەشتم پیشاندرا و، هاوسەرەکەی ئەبو تەڵحەم بینی، ئینجا گوێم لەخشەیەك بوو لەپێشمدا، تەماشام کرد بیلالە.**

**(الصحيحه ١٤٠٥)**

٤٢٧١- دخلت الجنة فسمعت خشفة بين يدي قلت: ما هذه الخشفة ؟ فقيل: هذا بلال يمشي أمامك.

( صحيح ) ( طب عد ) عن أبي أمامة .

---

[1] ( واتە : عەبدوڵڵای کوڕی مسعود )

**٤٢٧١- چوومە بەهەشتەوە گوێم لەخشە خشێك بـوو لە پێشی خۆمـەوە، وتم: ئـەوە چـی یە؟ وتیان ئەوە بیلالە لە پێشەوەت دەڕوات.**

٤٢٧٢- دخلت الجنة فسمعت خشفة فقلت: ما هذه ؟ قالوا: هذا بلال ثم دخلت الجنة فسمعت خشفة فقلت: ما هذه ؟ قالوا: هذه الغميصاء بنت ملحان

( صحيح ) ( عبد بن حميد ) عن أنس ( الطيالسي ) عن جابر .

**٤٢٧٢- ڕۆشتمە بەهەشتەوە گوێم لەخشەیەك بـوو، وتم: ئـەوە چـی یـە؟ وتیـان: ئـەوە بیلالە، ئینجا چوومە بەهەشتەوە دیسان گوێم لـە خشەیەك بـوو، وتم: ئـەوە چـی یـە؟ وتیـان: ئەوە (الغمَیصاء)ی كچی میلحانە.**

(الصحيحه ١٤٠٥)

٤٢٧٣- دخلت الجنة ليلة أسري بي فسمعت في جانبها وجسا فقلت: يا جبريل ما هذا ؟ قال: هذا بلال المؤذن.

( صحيح ) ( حم ع ) عن ابن عباس .

**٤٢٧٣- لەشەو ڕەویەكەمدا ڕۆیشتمە بەهەشتەوە و، لەلایەكیدا گـویم لەچـرپەیەك بـوو وتم: ئەی جیبریل ئەوە كێ یە؟ وتی: ئەوە بیلالە بـانگ دەدا.**

(الصحيحه ١٤٠٥)

٤٢٧٤- يا بلال ! بم سبقتني إلى الجنة ؟ ما دخلت الجنة قط إلا سمعت خشخشتك أمامي إني دخلت البارحة الجنة فسمعت خشخشتك أمامي فأتيت على قصر مربع مشرف من ذهب فقلت: لمن هذا القصر ؟ قالوا: لرجل من قريش فقلت: أنا قرشي لمن هذا القصر ؟ قالوا لرجل من أمة محمد فقلت: أنا محمد لمن هذا القصر ؟ قالوا: لعمر بن الخطاب.

( صحيح ) ( حم ت حب ك ) عن بريدة

**٤٢٧٤- ئـەی بـیلال! بەچـی پێـشم كـەوتی بـۆ بەهەشـت؟ هـەموو جارێـك چـوویێتمە بەهەشتەوە، خشپەی ڕۆیـشتنی تـۆم گـوێ لێبـووە لـە پێش خۆمـەوە، ئینجـا هاتمـە لای تەلارێكی چوارگۆشەی زێڕین وتم كۆشكی كێی؟وتیان هی پیـاوێكی قورەیـشە، وتم: مـن قورەیشیم، ئەوە تەلاری كێ یە؟ وتیان: بۆ پیاوێكـە لەئوممـەتی موحەممـەد، وتم: مـن موحەممەدم، ئەوە تەلاری كێ یە؟ وتیان بۆ عومەری كوڕی خەتتابە.**

(صحيح الترمذي ٣٦٨٩)

## بابەتی پلەوپایەی[1] (الرميصاء)ی خێزانی ئەبو تەڵحە

٤٢٧٥- رأيتني دخلت الجنة فإذا أنا بالرميصاء امرأة أبي طلحة و سمعت خشفا من أمامي فقلت: من هذا يا جبريل ؟ قال: هذا بلال و رأيت قصرا أبيض بفنائه جارية فقلت: لمن هذا القصر ؟ قالوا: لعمر بن الخطاب فأردت أن أدخله فأنظر إليه فذكرت غيرتك.

( صحيح ) ( حم ق ) عن جابر.

**٤٢٧٥- لەخەونمدا چوومە بەهەشتەوەو لەوێ (الرميصاء)ی خێزانی ئەبو تەڵحەم بینی، لە پێشی خۆیشمەوە خشپەیەکم بیست، وتم ئەی جیبریل ئەوە کێ یە، وتی: ئەوە بیلالە، کۆشکێکی سپیشم بینی کچێکی تیدا بوو، وتم : ئەوە کۆشکی کێ یە؟ وتیان: کۆشکی عومەری کوڕی خەتتابە، ویستم بچمە ژوورەوە و تەماشای بکەم، ئیتر غیرەتەکەی تۆم بیرکەوتەوە.**

٤٢٧٦- دخلت الجنة فسمعت خشفة بين يدي فقلت: ما هذه الخشفة ؟ فقيل: الغميصاء بنت ملحان.

( صحيح ) ( حم م ن ) عن أنس .

**٤٢٧٦- چوومە بەهەشتەوەو، گوێم لەخشپەیەك بوو لەبەردەممدا، وتم: ئەوە کێ یە؟ وتیان: ئەوە (الغميصاء)ی کچی ملیحانە.**

**(الصحيحه ١٤٠٥)**

## بابەتی پلەوپایەی حاریسەی کوڕی نوعمان

٤٢٧٧- دخلت الجنة فسمعت فيها قراءة فقلت: من هذا ؟ قالوا:حارثة بن النعمان كذلكم البر كذلكم البر!.

( صحيح ) ( ت ك ) عن عائشة .

**٤٢٧٧- چوومە ناو بەهەشتەوە و، گوێم لە قورئان خوێندن بوو، وتم: ئەوە کێ یە؟ وتیان( حارثە ) حاریسەی کوڕی نوعمانە[2]، چاکە ئاوهایە چاکە ئاوهایە.**

**(الصحيحه ٩٠٩)**

---

[1] ( الرميصاد هاوسەری ابو گلحە کە پێشی وتراوە الغمصاء کچی میلحان )

[2] ( زۆر چاکە کار بوو لەگەڵ دایکی )

## بابەتی پلەوپایەی ئەبو تەڵحە

٤٢٧٨- لصوت أبي طلحة في الجيش خير من ألف رجل.

( صحيح ) ( ك ) عن جابر.

**٤٢٧٨- دەنگی ئەبو تەڵحە لەسوپادا چاکترە لەهەزار پیاو.[1]**

**(الصحيحە ١٩١٦)**

٤٢٧٩- لصوت أبي طلحة في الجيش خير من فئة.

( صحيح ) ( حم ك ) عن أنس.

**٤٢٧٩- دەنگی ئەبو تەڵحە لەسوپادا چاکترە لەدەستەیەك.**

**(الصحيحە ١٩١٦)**

٤٢٨٠- صوت أبي طلحة في الجيش خير من ألف رجل .

( صحيح ) ( سمويه ) عن أنس.

**٤٢٨٠- دەنگی ئەبو تەڵحە لەسوپادا چاکترە لەهەزار پیاو.**

## بابەتی پلەوپایەی ( اسید بن حضیر )

٤٢٨١- نعم الرجل أبو بكر نعم الرجل عمر نعم الرجل أبو عبيدة بن الجراح نعم الرجل أسيد بن حضير نعم الرجل ثابت بن قيس بن شماس نعم الرجل معاذ بن جبل نعم الرجل معاذ بن عمرو بن الجموح نعم الرجل سهيل بن بيضاء.

( صحيح ) ( تخ ت ك ) عن أبي هريرة.

**٤٢٨١- باشترین پیاو ئەبو بەکرەو، باشترین پیاو عومەرەو، باشترین پیاو ئەبو عوبەیدیە، باشترین پیاو ئوسەیدی کوڕی ( حچیر )ەو، باشترین پیاو ( ثابت )ی کوڕی قەیسی کوڕی شەمماسە و، باشترین پیاو ( معاذ )ی کوڕی جەبەلە و، باشترین پیاو سوهەیلی کوڕی ( بیضاء )ە.**

**(الصحيحە ٨٧٣)**

---

[1] ( واتە :دەنگی لەسوپادا لەدەنگی هەزار کەس ترسناکترو سامناکترە لەلای بت پەرستەکان )

## بابەتی پلەوپایەی عەبدوڵڵای کوڕی عومەر

٤٢٨٢- نعم الرجل عبد الله لو كان يصلي من الليل.

( صحيح ) ( حم ق ) عن حفصة.

**٤٢٨٢- عەبدوڵڵا چاكترين پياوه ئەگەر شەو نوێژی بكردايه.**

٤٢٨٣- إن عبد الله رجل صالح لو كان يكثر الصلاة من الليل.

( صحيح ) ( ق هـ ) عن حفصة .

**٤٢٨٣- بەراستی عەبدوڵڵا پياوێكی چاكه ئەگەر شەو نوێژی زۆر بكردايه.**

**(الصحيحه ٣٥٢٣)**

## بابەتی پلەوپایەی عەممارى كوڕی یاسر

٤٢٨٤- أبشر عمار ! تقتلك الفئة الباغية.

( صحيح ) ( ت ) عن أبي هريرة .

**٤٢٨٤- مژدەت لێ بێت ئەی عەممار! دەستەيەكی ياخی بوو[1] دەتكوژن.**

**(الصحيحه ٧١٠)**

٤٢٨٥- عمار تقتله الفئة الباغية .

( صحيح ) ( حل ) عن أبي قتادة.

**٤٢٨٥- عەممار دەستەيەكی ياخی بوو دەيكوژن.**

**(الصحيحه ٧١٠)**

٤٢٨٦- عمار ما عرض عليه أمران إلا اختار الأرشد منهما .

( صحيح ) ( هـ ) عن عائشة.

**٤٢٨٦- عەممار هەر كاتێك دوو بابەتی بۆ پێشنياز كرا بێت چاكترينيانی هەڵبژاردووه.**

**(الصحيحه ٨٣٣)**

---

**[1] ( ئەوانه كه لەدژی پێشەوا دەرچوون و، كۆمەڵی موعاويه بوون، بەڵام هەر چەندە ستەمكارن بەڵام گوناهبار نين چونكه كوششيان كردووه و بەڵگەيان داتاشيوه هەرچەند هەڵەيان كردووه، وەكو چەند زانايەك فەرموويانه )**

٤٢٨٧- عمار ملئ إيمانا إلى مشاشه .

( صحيح ) ( حل ) عن علي.

**٤٢٨٧- عەممار پڕە لەباوەڕ تا سەر ئێسقان.**

**(الصحيحه ٨٠٧)**

٤٢٨٨- قاتل عمار و سالبه في النار.

( صحيح ) ( طب ) عن عمرو بن العاص وعن ابنه.

**٤٢٨٨- بکوژو تاڵانکەری عەممار لەدۆزەخدایە.**

**(الصحيحه ٢٠٠٨)**

٤٢٨٩- إني لا أدري ما قدر بقائي فيكم فاقتدوا باللذين من بعدي: أبي بكر و عمر و تمسكوا بهدي عمار و ما حدثكم ابن مسعود فصدقوه.

( صحيح ) ( حم ت هـ حب ) عن حذيفة .

**٤٢٨٩- من نازانم چەنێك لەنێواتاندا دەمێنمەوە، بۆیە شوێنکەوتووی دوو کەسەکەی دوای خۆم بن، ئەبو بەکرو عومەر، دەستیش بگرن بەڕێنموونی عەممارەوە، ئەوەشی ئیبنو مەسعود بۆی باسکردن باوەڕی پێبکەن.**

**(الصحيحه ١٢٣٠)**

٤٢٩٠- بؤسا لك يا ابن سمية تقتلك الفئة الباغية.

( صحيح ) ( حم م ) عن أبي قتادة .

**٤٢٩٠- نەهامەتی بۆ تۆ ئەی کوڕی سومەییە، دەستە یاخی بووەکە دەتکوژێن.**

**(الصحيحه ١٢٣٠)**

٤٢٩١- ويح عمار تقتله الفئة الباغية يدعوهم إلى الجنة و يدعونه إلى النار.

( صحيح ) ( حم خ ) عن أبي سعيد.

**٤٢٩١- هاوار بۆ عەممار دەستە یاخی بووەکە دەتکوژێن ، بانگیان دەکات بۆ بەهەشت و،ئەوانەی بانگی دەکەن بۆ دۆزەخ.**

**(الصحيحه ٧١٠)**

٤٢٩٢- ما خير عمار بين أمرين إلا اختار أرشدهما.

( حسن ) ( ت ك ) عن عائشة.

**٤٢٩٢- عەممار لەنێوان دوو بابەتدا سەرپشك نەكراوە، چاكترینیانی هەڵبژاردبێت.**

٤٢٩٣- ملئ عمار إيمانا إلى مشاشه.

( صحيح ) ( هـ ) عن علي ( ك هق ) عن ابن مسعود.

**٤٢٩٣- عەممار پڕە لەباوەڕ تاسەر ئێسقانی.**

(الصحيحه ٨٠٧)

٤٢٩٤- من عادى عمارا عاداه الله و من أبغض عمارا أبغضه الله.

( صحيح ) ( حم ن حب ك ) عن خالد بن الوليد.

**٤٢٩٤- هەر كەسێك دژایەتی عەممار بكات خوای گەورە دژایەتی دەكات، هەر كەسێكیش ڕقی لەعەممار بێت، خوای گەورە ڕقی لێیەتی.**

(المشكاة ٦٢٥٦)

٤٢٩٥- ابن سمية ما عرض عليه أمران قط إلا اختار الأرشد منهما.

( صحيح ) ( حم ك ) عن ابن مسعود .

**٤٢٩٥- كوڕی سومەییە هەر كاتێك دوو بابەتی بۆ پێشنیار كرا بێت چاكترینیانی هەڵبژاردووە.**

(الصحيحه ٨٣٤)

## بابەتی پلەوپایەی هشام و عەمرو هەردوو كوڕەكەی عاص

٤٢٩٦- ابنا العاص مؤمنان: هشام و عمرو.

( صحيح ) ( ابن سعد حم ك طب ) عن أبي هريرة .

**٤٢٩٦- هەر دوو كوڕانی ( العاص ) باوەڕدارن : هیشام و عەمر.**

(الصحيحه ٣٥٦)

٤٢٩٧- أسلم الناس و آمن عمرو بن العاص.

( حسن ) ( حم ت ) عن عقبة بن عامر .

**٤٢٩٧- خەڵكی موسوڵمان بوون، بەڵام عەمری كوڕی عاص باوەڕی هێنا.**

(الصحيحه ١٥٥)

٤٢٩٨- عمرو بن العاص من صالحي قريش .

( صحيح ) ( ت ) عن طلحة؟

**٤٢٩٨- عەمری كوڕی عاص لە پیاوەچاكەكانی قوڕەیشە.**

**(الصحيحە ٦٥٣)**

## بابەتی پلەوپایەی ئەبو سوفیانی كوڕی حاریس( الحارث ) [1]

٤٢٩٩- أبو سفيان بن الحارث خير أهلي.

( حسن ) ( طب ك ) عن أبي حبة البدري .

**٤٢٩٩- ئەبو سوفیانی كوڕی حاریس چاكترینی كەس و كارمە.**

**(الصحيحە ٨١٨)**

## بابەتی پلەوپایەی موعازی كوڕی جەبەل

٤٣٠٠- إذا حضر العلماء ربهم يوم القيامة كان معاذ بن جبل بين أيديهم بقذفة حجر.

( صحيح ) ( ابن عساكر ) عن عمر .

**٤٣٠٠- ئەگەر زانایان ئامادە بن لەڕۆژی قیامەتدا لەلای خوای خۆیان موعازی كوڕی جەبەل لە پێشیانەوە دەبێت بەدووری بەرد هاویژێك.**

**(الصحيحە ١٠٩٠)**

٤٣٠١- إن العلماء إذا حضروا ربهم كان معاذ بن جبل بين أيديهم رتوة بحجر.

( صحيح ) ( حل ) عن عمر .

**٤٣٠١- كاتێك زانایان ئامادەی لای خوای خۆیان دەبن موعازی كوڕی جەبەل لە پێشیانەوەیە بە دووری بەرد هاویژێك.**

**(الصحيحە ١٠٩٠)**

[1] (الحارث )مامی پێغەمبەر بووە و كوڕی عبد المطلب بووە سوفیانی كوڕیشی ئامۆزای برای شیری پێغەمبەر بووە ﷺ دژایەتی پێغەمبەری دەكردوو لە فە تحدا مسوڵمان بوو،ج٢ ص٩٨ السراج المنير )

٤٣٠٢- معاذ بن جبل أعلم الناس بحلال الله و حرامه.

( صحيح ) ( حل ) عن أبي سعيد.

**٤٣٠٢- موعازی کوڕی جەبەل شارەزاترینی خەڵکە بەحەڵاڵ و حەرام.**

٤٣٠٣- معاذ بن جبل أمام العلماء يوم القيامة برتوة.

( صحيح ) ( حل طب ) عن محمد بن كعب مرسلا.

**٤٣٠٣- موعازی کوڕی جەبەل لە پێش زانایاندایە لەڕۆژی قیامەت بەدووری هاویشتنی تیرێك.**

(الصحيحه ١٠٩٠)

## بابەتی پلەو پایەی ئوسامەی کوڕی زەید

٤٣٠٤- أسامة أحب الناس إلي.

( صحيح ) ( حم طب ) عن ابن عمر .

**٤٣٠٤- ئوسامە خۆشەویسترین کەسە لەلای من.**

(الصحيحه ٧٤٥)

٤٣٠٥- أما و الله لو كان أسامة جارية حليتها و زينتها حتى أنفقها.

( صحيح ) ( ابن سعد ) عن أبي السفر مرسلا .

**٥٣٠٥-سوێند بەخوا ئەگەر ئوسامە کچێك بوایە خشڵ ڕێژم دەکردو، دەمڕازاندەوە تاکو پێشم دەخست.**[1]

(الصحيحه ١٠١٩)

٤٣٠٦- إن تطعنوا في إمارته فقد كنتم تطعنون في إمارة أبيه من قبل و ايم الله إن كان لخليقا بالإمارة و إن كان لمن أحب الناس إلي و إن هذا لمن أحب الناس إلي بعده و أوصيكم به فإنه من صالحيكم - يعني أسامة بن زيد -.

( صحيح ) ( حم ق ) عن ابن عمر .

**٤٣٠٦- ئەگەر ڕەخنە دەگرن لەفەرمانڕەوایەتی ئوسامە، پێشتر پێش ڕەخنەتان لەفەرمانڕەوایەتی باوکی دەگرت، سوێند بەخوا شایستەی ئەو کارە بوو هەرچەندە، خۆشەویسترین کەسیشە بەلای منەوە، کوڕەکەشی خۆشەویسترین کەسە بەلامەوە دوای خۆی، ڕاسپاردەتان دەکەم دەربارەی ئوسامە چونکە لە پیاو چاکەکانی ناو ئێوەیە.**

(الصحيحه ٣٤٩٦)

---

[1] ( واتە :هەتا ڕەواجم ئەدایە پێش خەڵکم دەخستەوە )

٤٣٠٧- لو كان أسامة جارية لكسوته و حليته حتى أنفقه

( صحيح ) ( حم هـ ) عن عائشة

**٤٣٠٧- ئەگەر ئوسامە كچێك بوايە پۆشاكم لەبەر دەكردو دەمڕازاندەوە تاكو رەواجم پێ ئەداو پێشم دەخست.**

(الصحيحه ١٠١٩)

٤٣٠٨- من أحبني فليحب أسامة

( صحيح ) ( م ) عن فاطمة بنت قيس

**٤٣٠٨- هەركەسێك منى خۆش دەوێت با ئوسامەشى خۆش بوێت.**

(صحيح النسائي ٣٥٢٧)

## بابەتى پلەوپايەى ماعيزى كوڕى ماليك

٤٣٠٩- استغفروا لماعز بن مالك لقد تاب توبة لو قسمت بين أمة لوسعتهم

( صحيح ) ( م د ن ) عن بريدة .

**٤٣٠٩- داوى لێخۆش بوون بكەن بۆ ماعيزى كوڕى ماليك بكەن بەراستى تەوبەيەكى كردووە گەر دابەش بكرايە بەسەر ئوممەتێكدا لێيان زياد دەبوو.**

(المشكاة ٣٥٦٢)

## بابەتى پلەوپايەى ديحيەى كەلبى

٤٣١٠- أشبه من رأيت بجبريل دِحية الكلبي

( صحيح ) ( ابن سعد ) عن ابن شهاب .

**٤٣١٠- كەسێكم بينيبێت زۆر لە جبريل بچێت ديحيەى كەلبى يە[1].**

(الصحيحه ١١١١)

---

[1] ( واتە : لەجيبريل دەچێت لەو كاتەى جيبريل دەچێتە سەر وێنەى ئادەميزاد )

## بابەتی پلەوپایەی زەیدی کوڕی سابیت

٤٣١١- أفرض أمتي زيد بن ثابت

( صحيح ) ( ك ) عن أنس .

**٤٣١١- شارەزاترینی ئوممەتم بەدابەشکردنی میراتا زەیدی کوڕی سابیتە.**

(الصحيحه ١٢٢٤)

## بابەتی پلەوپایەی عەمری کوڕی تەغلیب

٤٣١٢- أما بعد فوالله إني لأعطي الرجل و أدع الرجل و الذي أدع أحب إلي من الذي أعطي و لكني أعطي أقواما لما أرى في قلوبهم من الجزع و الهلع و أكل أقواما إلى ما جعل الله في قلوبهم من الغنى و الخير منهم عمرو بن تغلب

( صحيح ) ( خ ) عن عمرو بن تغلب .

**٤٣١٢- پاشان: سوێند بەخوا من بە کەسێك دەبەخشم و لەکەسێك دەگرمەوە، ئەوەشی کەلێی دەگرمەوە خۆشەویستره لام لەوەی پێی دەبەخشم، بەلاّم من مالّ بەکەسانێك دەبەخشم چونکە بەبێ ئارام و چاوچنۆکیان دەبینم بەرامبەر هەژاری، خەلّکانێکیش دەدەمە دەستی ئەو دەولّەمەندییەی هەیە لەدلّیاندا وەکو عەمری موڕی تەغلیب.**

(الصحيحه ٣٤٩٤)

٤٣١٣- إني أعطي قوما أخاف ظلعهم و جزعهم و أكل قوما إلى ما جعل الله في قلوبهم من الخير و الغنى منهم عمرو بن تغلب

( صحيح ) ( خ ) عن عمرو بن تغلب .

**٤٣١٣- مالّ بەکەسانێك دەبەخشم لە لادان و بێ ئارامیان دەترسم، خەلّکانێکیش دەدەمە دەستی ئەو دەولّەمەندییەی لەدلّیاندا هەیە وەکو عەمری کوڕی تەغلیب.**

(الصحيحه ٣٥٩١)

## بابەتی پلەوپایەی زەیدی کوڕی حاریسە

٤٣١٤- أنت أخونا و مولانا - قاله لزيد بن حارثة -

( صحيح ) ( ق ) عن البراء ( ك ) عن علي .

**٤٣١٤- تۆ براو سەروەری ئێمەی – بەزەیدی کوڕی حاریسەی فەرموو-.**

(المشكاة ٣٣٧٧)

٤٣١٥- دخلت الجنة فاستقبلتني جارية شابة فقلت: لمن أنت ؟ قالت: لزيد بن حارثة.

( صحيح ) ( الروياني الضياء ) عن بريدة .

**٤٣١٥- چوومە بەهەشتەوە کچێکی لاو پێشوازیکردم، وتم: کێ خاوەنی تۆیە؟ وتی: زەیدی کوڕی حاریسە.**

(الصحيحه ١٨٥٩)

٤٣١٦- أما أنت يا جعفر فأشبه خلقك خلقي و أشبه خلقي خلقك و أنت مني و شجرتي و أما أنت يا علي فختني و أبو ولدي و أنا منك و أنت مني و أما أنت يا زيد فمولاي و مني و إلي و أحب القوم إلي.

( صحيح ) ( حم طب ك ) عن أسامة بن زيد .

**٥٣١٦- بەڵام تۆ ئەی جەعفەر ڕەوشتت لەڕەوشتی من دەچێت و، ڕوواڵەت و ڕەوشتت لەڕوواڵەت و رەوشتی من دەکات، تۆ لەمنی و بنچینەی منی، بەڵام تۆ ئەی عەلی زاواو باوکی کوڕمی، منیش لەتۆم و تۆ لەمنی، بەڵام تۆ ئەی زەید هاوکاری منی و، لەمنی و بۆ منی و خۆشەویسترین کەسی بەلامەوە.**

(الصحيحه ١٥٥٠)

## بابەتی پلەوپایەی زاهیری کوڕی حەرام[1]

٤٣١٧- إن زاهرا باديتنا و نحن حاضروه.

( صحيح ) ( البغوي ) عن أنس .

**٤٣١٧- زاهیر بیابانی ئێمەیەو[2]، ئێمەیش شاری ئەوین[3].**

## بابەتی پلەوپایەی ئەبو موسای ئەشعەری

٤٣١٨- إن عبد الله بن قيس أعطي مزمارا من مزامير آل داود.

( صحيح ) ( حم خد م ن ) عن بريدة .

**٤٣١٨- عەبدوڵڵای کوڕی قەیس[4] ئاوازێکی لە ئاوازەکانی خانەوادەی داود پێ بەخشراوە.**

**(الصحيحه ٣٥٣٢)**

٤٣١٩- لقد أوتي أبو موسى مزمارا من مزامير آل داود.

( صحيح ) ( حل ) عن أنس.

**٤٣١٩- ئەبو موسا ئاوازێکی دەنگ خۆشی لەوێنەی خانەوادەی داوود پێ بەخشراوە.**

٤٣٢٠- لقد أوتي أبو موسى من أصوات آل داود.

( صحيح ) ( محمد بن نصر ) عن البراء.

**٤٣٢٠- ئەبو موسا لەدەنگی خانەوادەی داوود بەشی دراوە.**

**(الصحيحه ٣٥٣٢)**

---

[1] ( ئەو پیاوێکی زەکراو بوو، بەڵام پێغەمبەر ﷺ خۆشی دەویست، لەو کاتەی شتومەکی دەفرۆشت پێغەمبەر ﷺ هاتە لای و باوەشی پیا کرد لە پشتەوەو ئەو پێغەمبەر ﷺ ی نەبینی، ئیتر هەر دەیووت: بەرمدە تۆ کێی؟ بەڵام کاتێك ناسی پێی خۆش بوو پشتی بەسنگی پێغەمبەرەوە بێت ﷺ، ئینجا پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو: کێ ئەم کۆیلەم لێ دەکڕێت؟ وتی: کەواتە ئەی پێغەمبەری خوا تۆ من بەبێ کەڵك دادەنێیت، فەرمووی: نەخێر تۆ لەلای خوا بێ کەڵك نیت )

[2] ( واتە دانیشتووی بیبانی ئێمەیە، یان لەجۆرەکانی ڕووەك و بەرهەمەکانی بیابانمان بۆ دەهێنێ، ئیتر وەکو ئەوەیە بیابانی ئێمە بێت )

[3] ( واتە: ئێمەیش ئەوەی پێویستی بێت لەشتی شار پێی دەدەین )

[4] ( واتە: ئەبو موسای ئەشعەری )

٤٣٢١- لقد أوتي هذا من مزامير آل داود - يعني أبا موسى -.

( صحيح ) ( حم ن هـ ) عن أبي هريرة ( ن ) عن عائشة.

**٤٣٢١- بەراستی ئەوە دەنگ خۆشییەکی لە ئاوازەکانی خانەوادەی داودی پێ بەخشراوە. -واتە ئەبو موسا-.**

(صحيح النسائي ١٠٢٠)

٤٣٢٢- لو رأيتني و أنا أستمع قراءتك البارحة فقد أوتيت مزمارا من مزامير آل داود.

( صحيح ) ( م ) عن أبي موسى.

**٤٣٢٢- ئەگەر دەتبینم دوێنی چۆن گوێم لەقورئان خوێندنت گرتبوو، لەڕاستیدا تۆ دەنگ و ئاوازێکت پێ بەخشراوە لە دەنگ و ئاوازی خانەوادەی داود.**

(صنه الصلاة الصحيحة ٣٥٣٢)

٤٣٢٣- يا أبا موسى ! لقد أوتيت مزمارا من مزامير آل داود

( صحيح ) ( خ ت ) عن أبي موسى

**٤٣٢٣- ئەی ئەبو موسا![1] تۆ ئاوازو دەنگ خۆشییەکت پێ بەخشراوە لەوێنەی دەنگ خۆشی خانەوادەی داود.**

(المشكاة ٦١٩٤)

## بابەتی پلەوپایەی (المنذر بن عائذ اشج عبدالقيس)

٤٣٢٤- إن فيك لخصلتين يحبهما الله تعالى: الحلم و الأناة

( صحيح ) ( م ت ) عن ابن عباس .

**٤٣٢٤- تۆ دوو خسڵەتت تیایە خوای گەورە خۆشی دەوێن: دامەزراوی و و هێمنی.**

(الروض النضير ٤٠٦)

٤٣٢٥- يا أشج ! إن فيك لخصلتين يحبهما الله: الحلم و التؤدة

( صحيح ) ( هـ ) عن أبي سعيد

**٤٣٢٥- ئەی (اشبع) دوو خسڵەتت تیایە خوای گەورە خۆشی دەوێن: دامەزراوی و و هێمنیو لەسەر خۆیی.**

(صحيح ابن ماجه ٤١٨٧)

---

[1] ( مامۆستامان وتوویەتی: ((معلقاً)) واتە بەموعەللەقی ڕیوایەتی کردووە)

## بابەتی پلەوپایەی فوراتی کوڕی حەییان

٤٣٢٦- إن منكم رجالا لا أعطيهم شيئا أكلهم إلى إيمانهم منهم فرات بن حيان

( صحيح ) ( حم د ك هن ) عن الفرات بن حيان ( حم ) عن بعض الصحابة .

**٤٣٢٦- بەڕاستی کەسانێکتان تێدایە هیچیان پێ نابەخشم، دەیاندەمە دەست ئیمانەکەیان وەکو فوراتی کوڕی حەییان.**

**(الصحيحه ١٧٠١)**

## بابەتی پلەوپایەی (سعد بن معاذ)

٤٣٢٧- اهتز عرش الرحمن لموت سعد بن معاذ

( صحيح ) ( حم م ) عن أنس ( حم ق ن هـ ) عن جابر .

**٤٣٢٧- عەرشی خوای گەورە راچڵەکی و لەریەوە لە پێشوازی مردنی (سعد بن معاذ).**

**(المشكاة ٦١٩٧)**

٤٣٢٨- هذا الذي تحرك له العرش و فتحت له أبواب السماء و شهده سبعون ألفا من الملائكة لقد ضم ضمة ثم فرج عنه

( صحيح ) ( ن ) عن ابن عمر

**٤٣٢٨- ئەوەیە کەعەرش بۆی راچڵەکی، دەرگاکانی ئاسمانی بۆ کرایەوەو، حەفتا هەزار فریشتە ئامادەی بوون، لە گۆڕەکەیدا یەکجار گوشراو ئیتر وازی لێ هێنرا(١).**

**(الصحيحه ١٦٩٥)**

## بابەتی پلەوپایەی سەعدی کوڕی عوبادە

٤٣٢٩- جزى الله الأنصار عنا خيرا و لا سيما عبد الله بن عمرو بن حرام و سعد بن عبادة

( صحيح ) ( ع حب ك ) عن جابر .

**٤٣٢٩- خوای گەورە لەجیاتی ئێمە پاداشتی چاکەی یاریدەدەرەکان بداتەوە، بەتایبەتی عەمری کوڕی حەرام و سەعدی کوڕی عوبادە.**

**(الصحيحه ٤٦٠١)**

## بابەتی پلەوپایەی خالیدی کوڕی وەلید

٤٣٣٠- خالد بن الوليد سيف من سيوف الله

( صحيح ) ( البغوي ) عن عبدالله بن جعفر .

**٤٣٣٠- خالیدی کوڕی وەلید شمشێرێکە لەشمشێرەکانی خوای گەورە.**

**(الجنائز ١٦٦)**

٤٣٣١- خالد بن الوليد سيف من سيوف الله سله الله على المشركين

( صحيح ) ( ابن عساكر ) عن عمر .

**٤٣٣١- خالیدی کوڕی وەلید شمشێرێکە لەشمشێرەکانی خوای گەورە هەڵکێشراوە لەدژی بت پەرستان.**

**(الصحيحه ١٢٣٧)**

٤٣٣٢- خالد سيف من سيوف الله و نعم فتى العشيرة.

( صحيح ) ( حم ) عن أبي عبيدة .

**٤٣٣٢- خالیدی کوڕی وەلید شمشێرێکە لەشمشێرمکانی خوای گەورە، چاکترین لاوی هۆزیشە.**

**(الصحيحه ١٨٢٦)**

٤٣٣٣- نعم عبد الله خالد بن الوليد سيف من سيوف الله.

( صحيح ) ( حم ت ) عن أبي هريرة.

**٤٣٣٣- بەڵێ باشترین بەندەی خوا خالیدی کوڕی وەلیدە، شمشێرێکە لەشمشێرمکانی خوا.**

**(الصحيحه ١٢٣٧)**

## بابەتی پلەوپایەی سالمی مەولای ئەبو ( حذيفة )

٤٣٣٤- استقرءوا القرآن من أربعة: من عبد الله بن مسعود و سالم مولى أبي حذيفة و أبي بن كعب و معاذ بن جبل.

( صحيح ) ( ق ) عن ابن عمرو .

**٤٣٣٤- خوێندنی قورئان لەچوار کەسەوە وەربگرن: لەعبدوڵڵای کوڕی مسعود و، سالیمی (مەولای)کۆیلەی ئەبو حوزەیفە و، ئوبەی کوڕی کەعب و، موعازی کوڕی جەبەل.**

(المشكاة ٦١٩٠)

٤٣٣٥- خذوا القرآن من أربعة من ابن مسعود و أبي بن كعب و معاذ بن جبل و سالم مولى أبي حذيفة.

( صحيح ) ( ت ك ) عن ابن عمر .

**٤٣٣٥- قورئان لەچوار کەس وەرگرن[1]: (ابن مسعود) و (ابن بن كعب) و (معاذ بن جبل) و (سالم مولى ابى حڗيفه).**

(الصحيحه ١٨٢٧)

## بابەتی پلەوپایەی عوروەی کوڕی مەسعود

٤٣٣٦- دحية الكلبي يشبه جبريل و عروة بن مسعود الثقفي يشبه عيسى بن مريم و عبد العزى يشبه الدجال.

( صحيح ) ( ابن سعد ) عن الشعبي مرسلا .

**٤٣٣٦- دیحیەی کەلبی لەجیبریل دەچێ و، عوروەی کوڕی مەسعود لەعیسای کوڕی مریەم دەچێت و، عەبدولعوززاش لەدەججال[2] دەچێت.**

(الصحيحه ١٨٥٧)

## بابەتی پلەوپایەی زەیدی کوڕی عەمری کوڕی نەفەیل

٤٣٣٧- دخلت الجنة فرأيت لزيد بن عمرو بن نفيل درجتين.

( حسن ) ( ابن عساكر ) عن عائشة .

**٤٣٣٧- چوومە بەهەشتەوە، دوو پلەم بینی بۆ عەمری کوڕی نوفەیل.**

(الصحيحه ١٤٠٦)

---

[1] واتە: فێربن)

[2] ( (عبدالعزى بن قطن) )

## بابەتی پلەو پایەی حەمزەی کوڕی عەبدولموتتەلیب

٤٣٣٨- حمزة سيد الشهداء يوم القيامة.

( صحيح ) ( الشيرازي في الألقاب ) عن جابر .

**٤٣٣٨- حەمزە سەرداری شەهیدەکانە لەڕۆژی قیامەتدا.**

**(الصحیحە ٣٧٤)**

٤٣٣٩- حمزة بن عبد المطلب أخي من الرضاعة.

( صحيح ) ( ابن سعد ) عن ابن عباس وأم سلمة .

**٤٣٣٩- حەمزەی کوڕی عەبدولموتتەلیب برای شیریمە.**[1]

**(المشكاة ٣١٦٢)**

٤٣٤٠- رأيت الملائكة تغسل حمزة بن عبد المطلب و حنظلة بن الراهب.

( حسن ) ( طب ) عن ابن عباس.

**٤٣٤٠- فریشتەکانم بینی حەمزەی کوڕی عەبدولموتتەلیب و حەنزەلەی کوڕی ڕاهیبیان دەشۆردەوە.**

**(الارواء ٧٠٤)**

٤٣٤١- سيد الشهداء عند الله يوم القيامة حمزة بن عبد المطلب.

( حسن ) ( ك ) عن جابر ( طب ) عن علي.

**٤٣٤١- سەرداری شەهیدان لەڕۆژی قیامەتدا حەمزەی کوڕی عەبدولموتتەلیبە.**

**(الصحیحە ٣٧٤)**

٤٣٤٢- سيد الشهداء حمزة بن عبد المطلب و رجل قام إلى إمام جائر فأمره و نهاه فقتله

( حسن ) ( ك الضياء ) عن جابر

**٤٣٤٢- سەرگەورەی شەهیدان حەمزەی کوڕی عەبدولموتتەلیبە و، پیاوێکە بوەستێت لەڕووی سەرۆکێکی ستەمکارو فەرمانی پێبکات بە چاکە و قەدەغەی خراپەی لێ بکات، ئەویش بیکوژێت.**

**(الصحیحە ٣٧٤)**

---

[1] ( موسلیم ڕیوایەتی کردووە بەم شێوە: ( ان حمزه أخی من الرچاعه ) واتاکەشی لەبوخاریدا هەیە )

٤٣٤٣- لقد رأيت الملائكة تغسل حمزة

( حسن ) ( ابن سعد ) عن الحسن مرسلا

**٤٣٤٣- فریشتەكانم بینی تەرمی حەمزەیان دەشۆردەوە.**

**(الضعيفة ١٩٩٣)**

٤٣٤٤- لولا أن تجد صفية في نفسها لتركته حتى تأكل العافية حتى يحشر من بطونها - يعني حمزة -

( حسن ) ( حم د ت ) عن أنس

**٤٣٤٤- ئەگەر لەبەر صەفییە نەبوایە كە لە دڵیدا شتێك درووست ببێت تەرمی حەمزەم بەجێ دەهێشت تاكو ئاژەڵە دڕندەكان و پەلەوەر دەیا نخوارد و، لەناو سكی ئەواندا زیندوو بكرایەوە – واتە : حمزە-.**

**(الجنائز ٦٠)**

## بابەتی پلەوپایەی جەعفەری كوڕی ئەبو تالیب

٤٣٤٥- دخلت الجنة البارحة فنظرت فيها فإذا جعفر يطير مع الملائكة و إذا حمزة متكئ على سرير.

( صحيح ) ( طب عد ك ) عن ابن عباس .

**٤٣٤٥- دوێنێ چوومە بەهەشتەوە و، تەماشام كرد جەعفەر لەگەڵ مەلەكاندا هەڵدەفڕێت و، حەمزەش لەسەر قەنەفەیەك پاڵیدابوەوە.**

**(الصحيحه ١٢٢٦)**

٤٣٤٦- رأيت جعفر بن أبي طالب ملكا يطير في الجنة مع الملائكة بجناحين

( صحيح ) ( ت ك ) عن أبي هريرة

**٤٣٤٦- جەعفەری كوڕی ئەبو تالیب م بینی وەكو فریشتەیەك بەدوو باڵ دەفڕی لەگەڵ فریشتەكاندا.**

**(الصحيحه ١٢٢٦)**

٤٣٤٧- أما أنت يا جعفر فأشبهت خلقي و خلقي و أما أنت يا علي فمني و أنا منك و أما أنت يا زيد فأخونا و مولانا و الجارية عند خالتها فإن الخالة والدة

( صحيح ) ( حم ) عن علي .

**٤٣٤٧- بەڵام تۆ ئەی جەعفەر لەخۆم دەچی لەڕووالەت و ڕەوشتدا، تۆیش ئەی عەلی لەمنی و من لەتۆم، تۆیش ئەی زەید براو پشتگیرمانی، کچەکەیش لەلای پورێتی چونکە خۆشکی دایك وەکو دایکە.**

**(الارواو ٢١٩١)**

٤٣٤٨- إن الله قد جعل لجعفر جناحين مضرجين بالدم يطير بهما مع الملائكة

( صحيح ) ( الدارقطني في الأفراد ك ) عن البراء .

**٤٣٤٨-خوای گەورە دووباڵی دروستکردووە بۆ جەعفەر کە خەڵتانی خوێنن و پێیان دەفڕێت لەگەڵ فریشتەکاندا.**

**(الصحيحه ١٨٢٧)**

## بابەتی پلەوپایەی (ابي الدحداح)[1]

٤٣٤٩- كم من عذق معلق لابن الدحداح في الجنة.

( صحيح ) ( حم م د ت ) عن جابر بن سمرة.

**٤٣٤٩- چەندین لقی دارخورما هەڵواسراوە بۆ ئەبو دەحداح لەبەهەشتدا.**

**(الجنائز ٧٥)**

٤٣٥٠- رب عذق مذلل لابن الدحداحة في الجنة.

( صحيح ) ( ابن سعد ) عن ابن مسعود.

**٤٣٥٠- چەندین لقی خورمای شۆڕبووموە هەیە لەبەهەشتدا بۆ ئەبو دەحداح.**

**(مشكلة الفقر ١٢٠)**

## بابەتی پلەوپایەی (ابي ذر الغفاري)

٤٣٥١- ما أظلت الخضراء و لا أقلت الغبراء من ذي لهجة أصدق من أبي ذر.

( صحيح ) ( حم ت هـ ك ) عن ابن عمرو.

**٤٣٥١- ئاسمانی سەوزکەسی دانە پۆشیوە، یان زەوی کەسی هەڵنەگرتووە، خاوەن زمان بێت و ،ڕاستگۆتر بێت لە (ابو ذر).**

**(المشكاة ٦٢٣٩)**

---

[1] ( هاوەڵێکی ئەنصارییە بەباوکی یەوە نەبێت ناناسرێت، لەژیانی پێغەمبەر ﷺ دا وەفاتی کرد )

٤٣٥٢- ما أظلت الخضراء و لا أقلت الغبراء من ذي لهجة أصدق و لا أوفى من أبي ذر شبه عيسى ابن مريم.

( حسن ) ( ت حب ك ) عن أبي ذر.

**٤٣٥٢-ئاسمانی سەوز سێبەری بۆ کەس نەکردووە و زەوی کەسی هەڵنەگرتووە لە خاوەن کرمانجە و زاراوەکان کە راستگۆتر و بە ئەمەکتر بێت لە (ابو ذر) هەر لە عیسى ی کوری مریم دەچێت.**

٤٣٥٣- من سره أن ينظر إلى تواضع عيسى فلينظر إلى أبي ذر.

( صحيح ) ( ع ) عن أبي هريرة.

**٤٣٥٣- هەر کەسێك حەز دەکات تەماشای خۆ بەکەمزانینی عیسا بکات باتەماشای (ئەبو ذر) بکات.**

**(الصحيحه ٢٣٤٣)**

## بابەتی پلەوپایەی (بشير بن الخصاصية)

٤٣٥٤- يا ابن الخصاصية ! ما أصبحت تنقم على الله ؟ أصبحت تماشي رسول الله.

( صحيح ) ( حم هـ) عن بشير بن الخصاصية.

**٤٣٥٤- ئەی کوری (الخصاصية)! لەوە زیاتر چیت لە خوا دەوێت ، لەگەڵ پێغەمبەرەکەیدا رێدا دەرۆی.**

**(الجنائز ١٣٦)**

## بابەتی پلەوپایەی (عبدالله بن عمرو بن حرام)

٤٣٥٥- يا جابر ! ألا أبشرك بما لقي الله به أباك ! ما كلم الله أحدا قط إلا من وراء حجاب و كلم أباك كفاحا فقال: يا عبدي تمن علي أعطك قال: يا رب تحييني فأقتل فيك ثانية فقال الرب تبارك و تعالى: إنه سبق مني أنهم إليها لا يرجعون قال: يا رب فأبلغ من ورائي.

( صحيح ) ( ت هـ) عن جابر.

**٤٣٥٥- ئەی جابیر! ئەرێ موژدەت ئەدەمێ، چۆن خوای گەورە پێشوازی باوکتی کرد؟ خوای گەورە قسەی لەگەڵ کەس نەکردووە لە پشت پەردەوە نەبێت، بەلام لەگەڵ باوکت، رووبەڕوو قسەی کرد، فەرمووی: بەندەکەم: ئاواتی خۆت لە خوا بخزازە با پێت بدەم،**

